


ڤینسێنت ڕایان ڕۆگیرۆ

# لەودیو هەستەکانەوە

## ڕێبەرێك بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی

وەرگێڕانی هەرێم هادی



ڤینسێنت ڕایان ڕۆگیرۆ

# لەودیو هەستەکانەوە

## ڕێبەرێك بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی



وەرگێڕانی هەرێم هادی

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام




ناوی کتێب: لەودیو هەستەکانەوە (ڕێبەرێک بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی)
ناوی نووسەر: ڤینسێنت ڕایان ڕۆگیرۆ
پرۆفیسۆری خانەنشینکراو، زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی نیو یۆرک — دەلهی
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: هەرێم هادی
بابەت: بیرکردنەوەی ڕەخنەیی
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (١٥٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٣٤٢)ـی ساڵی (٢٠١٥)ـی پێدراوە.



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی–شەقامی مەولەوی–تەلاری سیروانی نوێ–نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

وەرگێرانی ئەم کتێبە بە باوکم پێشکەشە.
پیاویك دەوڵەمەند بە سیفەتە باڵاکان.

# ناوەڕۆك

# وتەیەکی کورت

ڤینسنت ڕایان ڕۆگیرۆ کێیە؟ باشترین پێناسە بۆ ئەو، برتییە لە "نووسەری هونەری بیکردنەوەی ڕەخنەیی." ئەم حوکمەشم بەرمەبنای ئەو ڕاستییەیە، کە نووسەر خاوەنی ٢٢ کتێب و زیاتر لە ٢٠٠ وتار و لێکۆڵینەوەیە، کە بەشی هەرە زۆریان لەسەر هونەری بیرکردنەوەی ڕەخنەییە. کارەکانی ئەم پیاوە بە ئەندازەیەک جێی بایەخی وڵاتێکی وەکوو ئەمەریکایە، کە کەم کتێبی هەیە چەندان جار چاپ نەکرابنەوە. بۆ نموونە ئەم کتێبەی بەردەستتان، لە ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی چاپ دەکرێتەوە، من چاپی حەوتەمیم وەر گێڕاوە. جگە لە هەموو ئەمانەش، ٤ لە کتێبەکانی وەکوو تێکست بووک، واتە کتێبی مەنهەج لە ٣٣ ساڵی ڕابووردا لە ناوەندە پەروەردەییەکانی ئەمەریکادا دەخوێنرێت. بە خۆشحاڵییەوە ئەم کتێبەی بەردەستت یەکێک لەو بەرهەمە گرنگانە.

ئەم کتێبە بە پلەی یەکەم، کتێبێکە بۆ قوتابییان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کتێبێکە بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێت باڵاترین بەشی خۆیان، کە ئەقڵیانە، پەروەدە بکەن. ئەقڵ وەک دڵ نییە خۆبەخۆ ئیش بکات. نا، ئەو دەبێت سەرەتا پەروەدە بکرێت، تا دواتر دەستمان بگرێت بەرەو ئاسۆیەکی ڕوونتر. ئەم کتێبەی بەردەستت، هەوڵێکە بۆ پەروەدەکردنی ئەقڵت بە شێوەیەکی تەندروست. دەرفەتەێکە تا هەر هیچ نەبێت، لە بەرامبەر ئەو هەموو سووکایەتییەی کە بە ناوی پەروەردەکردنەوە، بەرامبەر بە

ئەقڵی هەریەک لە ئێمە کراوە، لەلایەن خێزانەوە تا مزگەوت و تا زانکۆ و تا حیزب و ڕاگەیاندن و تا دوایی، ئێستا ڕێزی بۆ بگێڕینینەوە و ئاشنای بکەین بە ڕاقیترین شێوازی بیکردنەوە، کە بیکردنەوەی ڕەخنەیییە. پرسیارە جەوهەرییەکە ئەوەیە: ئایە ئەگەر بۆ وڵاتێکی پیشەنگی وەکوو ئەمەریکا، قسەکردن لەسەر هونەری بیکردنەوەی ڕەخنەیی هێندە گرنگ بێت، ئەبێت بۆ میللەتێکی وەکوو کورد، کە لە قەیراندا غەرق بووە، گرنگییەکەی چەندئەوەندە بێت؟

من بۆ ماوەی زیاتر لە ٢ ساڵ ئیشم لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەکدا کردووە. ئومێد ئەکەم بە بارتەقای ماندووبوونی و نووسەر و وەرگێڕی ئەم کتێبە، بەجیدی وەر بگیرێت و بخوێنرێتەوە.

## چەند تێبینییەکی گرنگ:

١. هەموو ئەو وشە و ڕستانەی لەناو ئەم جۆرە کەوانەیەدا {} نووسراون، لەلایەن وەرگێڕەوەن.

٢. هەموو ئەو وشە و ڕستانەی لەناو ئەم کەوانەیەدا ( ) نووسراون، لەلایەن نووسەرەوەن. هەروەها هەموو ئەو وشە و بڕگانەی بە ئیتالیک، واتە بە لاری نووسراون، جەختکردنەوەی نووسەرن نەک وەرگێڕ.

٣. نووسەر ئەم هێمایە _ بەکار دێنێت بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئایدیای پێش هێماکە.

# پێشەکی

کاتێک لە ساڵی ١٩٧٥دا چاپی یەکەمی ئەم کتێبە بڵاو کرایەوە، تا ئەو کاتەش گوتاری ڕۆشنبیری بە شێوەیەکی بەربڵاو جەختی لەسەر خودێتی {subjectivity بەسەنگیمەحەکردنی هەست و بیروڕاکانی خود بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو شتێک}، *هەستەکان* دەکردەوە. ئەم جەختکردنەوەیە کە لە ١٩٦٠ەوە درێژ دەبێتەوە، لە ڕاستیدا پەرچەکردارێکی پێویست بوو دژ بە ئەقڵانییەت و ڕەفتارگەرایی behaviorism، کە لە ڕووی زەمەنییەوە پێش ئەم کەوتبوون. ئەم جووڵەیە {خودێتی} ڕای گەیاند کە "مرۆڤەکان ڕۆبۆت نین." ئەوان شتێکن زیاتر لە کۆبوونەوەی کۆمەڵێک ئەندامی فیزیکی. ئەوان خاوەن هیوا و خەون و سۆزەکانن. هیچ دوو مرۆڤێک وەک یەک نین ـ هەریەکەیان خاوەن دونیابینییەکی تایبەتەن، ڕێگەیەکی دەگمەنی وردبوونەوە لە جیهان. هەر سەیرکردنێکی مۆرڤایەتیش، ئەم ڕەهەندە خودێتییەی مرۆڤ فەرامۆش بکات، شێواو و ناڕاستە.

لەپاڵ گرنگکییەکەیدا، بەڵام جەختکردنەوە لەسەر گرنگیی هەستەکان، زیادەڕۆییی تێدا کرا. وەکوو زۆر لە بزوتنەوەکانی تر، ئەوەی دژی بیرێکی پەڕگیر دەبێتەوە، خۆشی دەبێتە بیرێکی پەڕگیر. دەرئەنجامی ئەم پەڕگیرێتییە Extremism بریتی بوو لە فەرامۆشکردنی بیرکردنەوە. ئەم کتێبەی بەردەستتان، هاتنەدەنگە دژ بەو فەرامۆشکردنە. لە پێشەکیی

چاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا، بەم شێوەیەی خوارەوە مەبەست و نیازەکانی کتێبەکە خراوەتە ڕوو:

جەختکردنەوە لەسەر خودێتی، خۆیەتی {وەک جۆریک لە پەرچەکردار دژ بە لەگرنگیخستنی هەستەکان} کۆمەکی کرد لە ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی ترسناک، کە زۆر سادەکردنەوەیە oversimplification. بەڵام ئەمە جۆرێکە لە پەرچەکردار، کە ناتوانێت بەردەوام بێت بۆ ماوەیەکی زۆر، بەبێ دروستکرنی حاڵەتێکی زۆر خراپتر _ فەرامۆشکردنی بیرکردنەوە. خراپتر لەبەر دوو هۆ، یەکەم، لەبەر ئەوەی ئێمە لە سەردەمی بەهەڵەدابردن، هەڵخەڵەتاندندا دەژین. لەشکرێک لە کادیرانی ڕیکلام و دیماگۆکەکان پشتئەستوور بە سەرچاوەی دەوڵەمەندی دەروونزانی ئامادە و حازرن، تا ئیش لەسەر عاتیفە و نائاگاییمان بکەن، تا قایلمان بکەن کە ڕووکەش، سەتحییەت بریتییە لە قووڵی، زیانبەخش بریتییە لە سوودبەخش، بەدکاری باڵاییە evil is virtuous. هەستەکانیش نێچیرێکی دەستەمۆن بۆ ئەم بەهەڵەدابردن و هەڵخەڵتاندنانە.

دووەم، لەبەر ئەوەی بە نزیکەیی لە هەموو کایە گرنگەکانی ژیانی مۆدرێن _ یاسا، تەندروستی، حکومەت، پەروەردە، زانست، بزنس و کێشە جڤاتییەکان community affair _ ئێمە ڕووبەڕووی دەیان کێشەی جیدی و بابەتی ئاڵۆز دەبینەوە، کە پێوستییەکی زۆریان بە کۆکردنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆچوونە پشتڕاستکراوەکان و بیرکردنەوەی ورد لە دەرئەنجام یان کردارە جیاوەزەکانە، هەروەها هەڵبژاردنی حەکیمانەی باشترین دەرئەنجام و گونجاوترین کردار...

(خوێندکارانی ئەمڕۆی زانکۆ) وا ڕاهێنراون، کە نەک بە کەم سەیری خودێتی نەکەن، بەڵکوو زیاد لە پێویست بە گرنگی بزانن. هەر بۆیە ئەو

{قوتابی} پێویستی بەوە نییە بەر بۆ هەستەکانی بەرەڵڵا بکات. بەڵکوو ئەو پێویستی بەوەیە، کە فێر بکرێت چۆن هەستەکانی ڕێک بخات، بڕیار بدات تا چ ڕادەیەک هەستەکانی بە هۆی هۆکارە دەرەکییەکانەوە فۆرمیان گرتەووە، هەروەها بە وریاییەوە هەڵیان بسەنگێنێت کاتێک لەناو خۆیاندا یان لەگەڵ هەستەکانی ئەوانی تردا تووشی ڕووبەڕووبوونەوە و کرژی دێن. بەکورتی، ئەو پێویستی بەوەیە فێر بکرێت بە شێوەیەکی ڕەخنەیی بیر بکاتەوە.

زۆر کەس بۆچوونێکیان هەیە، کە مەحاڵە هەستەکان و بیرکردنەوە پێکەوە هەڵبکەن و پێویستیشە دانەیەکیان هەڵبژێردرێت، ئەم بۆچوونە کاریگەریی نەرێنیی هەیە. بە بڕوای ئەوان، ئەگەر ئێمە گرنگی بە دانەیەکیان بدەین، ئەوا پێویستە دەستبەرداری ئەوی تریان بین. بەڵام ئەم بۆچوونە هەڵەیە. هەست، عاتیفە و بیرکردنەوە، تەواوکەرێکی زۆر باشی یەکترین. هەستەکان ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە سەرەتای پرۆسەکەدا {پرۆسەی بیرکدنەوە بۆ گەیشتن بە دەرئەنجام}، بیرکرندەوەش ڕۆڵ دەگێڕێت لە دەستنیشانکردن و ناسینەوەی باشترین هەستەکان.

بیرکردنەوە کەمتر لە هەستەکان خۆبەخۆیە، ئۆتۆماتیکە. پێویستی بە شێوازێکی سیتەماتیکی و بەرچاوڕوونییەکی عەمەلی هەیە، بۆ ئەوەی بەباشی ڕوو بدات.

هەڵوێستی گشتی دەربارەی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕاوە. ئەو دیدەی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی سکیلێکی گرنگە، کە پەروەردە پێوستە گرنگییەکی زۆری پێ بدا، چیدی دیدی کەمینە نییە. سەدان کەس دەچنە پاڵ ئەوانەی

داوا دەکەن کۆرسی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی بخرێتە سەر کۆرسەکانی خوێندن، تەنانەت داوا دەکەن کۆرسی تایبەت دابهێنرێن بۆ بیرکردنەوە. ناڕازیبوونێکی کەم هەیە لەسەر ئەوەی ئەم هەزارە تازەیە داوای ئەقڵێک دەکات، کە بتوانێت ئەودیو هەست ببینێت، تا بتوانێت بە شێوەیەکی ڕوون و بابەتی و ڕەخنەیی، کێشەکان چارەسەر بکات و بڕیار بدات.

## سوپاس و پێزانین

حەز دەکەم پێزانینی خۆم بۆ هەموو ئەوانە دەر ببڕم، کە بەشدارییان کردووە لە ئامادەکردنی ئەم چاپەدا. سوپاسێکی تایبەت بۆ هەموو ئەوانەی بە دەستنووسەکەدا چوونەتەوە:

Laura Hamline, UtahValley state College; Ron Leonard, University of Nevada, Las Vegas; Debra McGinnis, California state university at Long Beach; and Marshal Osman, University of La Verna.

هەروەها سوپاسی ئەمانەی لای خوارەوەش دەکەم:

Joel Brouwer, Montcalm Community College; Cynthia Gobatia, Riverside Community College; Anne Benvennti, Cerro Coso College; Fred Heifner, Jr. , Cumberland university ; and Phyllis Toy, university of southern Indianna.

# ناساندن

*لەوديو هەستەوە* نووسراوە، تا بە كايەی بيركردنەوەی ڕەخنەييت بناسێنێت. ئەم بابەتە ڕەنگە تازە بێت بۆت، چونكە لە قۆناغەكانی سەرەتايي و ناوەنديدا، جەختی لەسەر نەكراوەتەوە. لە ڕاستيدا تا ئەم دواييەش بيركردنەوەی ڕەخنەيی لە كۆلێژەكاندا نەدەخوێندرا. بەدرێژايی چوار دەيەی پێشوو، جەختكردنەوەی يەكەم لەسەر خودێتی subjectivity بووە، وەک لەسەر بابەتيبوون objectivity، لەسەر هەستەكان بووە، وەک لە بيركردنەوەكان.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەدرێژايی ٢٠ ساڵی ڕابردوو، لە ژمارەيەک لێكۆڵينەوەدا، فەرامۆشكردنی بيركردنەوە لە قوتابخانە ئەمەريكييەكان ڕەخنەی لێ گيراوە، ژمارەيەكيش كە لە زۆربووندايە، لە پەروەردەكاران و ڕێبەرانی بزنز و پيشەسازی و كەسە پرۆفيشناڵەكان، پشتگير و داواكاری كۆرس و بابەتی نوێ بوون بۆ قوتابخانەكان، تا چيدی بيركردنەوە فەرامۆش نەكرێت.

زيادەڕۆيی نييە ئەگەر بڵێين لە هەر بەشێک بێت، بيركردنەوەی ڕەخنەيی يەكێكە لە هەرە گرنگترين ئەو بابەتانەی لە كۆلێژدا دەيخوێنيت {بەم ڕستەيەدا گرنگی ئەم كتێبە خۆی بەيان دەكات، چونكە هەموو

دەزانین، لە زانکۆکانی کوردستاندا، بێجگە لە زانکۆی کوردستان و زانکۆی ئەمەریکی، وشەیەک لەسەر ئەم کایەیە ناخوێندرێت}. ڕادەی باش، ئەنجامدانی کارەکانی خوێندنت، هەوڵەکانت لە پیشەکەتدا، بەشداریت لە ژیانی جڤاتدا، مامەڵەکردنت لە پەیوەندییە کەسییەکاندا، هەموو ئەمانە دەوەستنەوە سەر توانا و لێهاتوویی تۆ لە چارەسەرکردنی کێشەکان و بەئەنجامگەیاندی بڕیارەکان.

سێ بەشی سەرەکی لەم کتێبەدا هەیە، یەکەم، بریتییە لە "کۆنتێکست،" کە یارماتیت دەدات تێبگەیت لە کۆمەڵێ چەمکی گرنگی وەکوو *تاککەرایی، بیرکردنەوە، حەقیقەت، مەعریفە، بۆچوون، بەڵگە و ئارگومێنت*، هەروەها زاڵبوون بەسەر ئەو ڕەفتار و ئایدیانەدا، کە ڕێگرن لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا. بەشی دووەم، بریتییە لە "داو- pitfall،" ئەم بەشە فێرت دەکات باوترین هەڵەکانی بیرکردنەوە بناسیت و لێشیان دوور بکەویتەوە. بەشی سێیەم، بریتییە لە "ستراتیژ،" ئەم بەشە هاوکاریت دەکات تا ئەو سکێڵ، توانا جۆربەجۆرانە بەدەست بێنیت، کە لە مامەڵەکردن لەتەک کێشە و بابەتەکاندا بەکار دێن. ئەم بەشە زیانیاریی بەسوودی لەسەر زۆر بابەت تێدایە، وەکوو دەستنیشانکردن و زاڵبوون بەسەر لایەنە لاواز و کەموکوورییەکانی ڕۆشنبیریی خودی خۆت. هەروەها ئەو تەکنیکانەی تێدایە، کە گرنگن بۆ بوونەچاودێرێکی بەدیقەتتر، بۆ باشتر شیکردنەوەی کێشەکان، بۆ ئاراستەکردنی ئارەزووی زانین، بۆ هەڵسەنگاندی بەڵگەکان، بۆ شیکردنەوەی بۆچوونی ئەوانی دی، هەروەها ئەو تەکنیکانەی دەستمان دەگرن تا ئاقڵانە بڕیار بدەین.

لە کۆتاییی هەر چاپتەرێکدا، ژمارەیەک ڕاهێنان هەیە، کە مەبەست لێیان تاقیکردنەوەی توانای بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و ڕاهێنانە بە

تواناكانت. ئـەم ڕاهێنانانـە كۆماڵێک كێشـە و بابەتيـان لەخـۆ گرتـووە، كـە هەندێكيان كاتين و هەندێكيشيان لـە دەرەوەی كاتـن {واتـە كێشـە و بابەتـی شـوێنێک يـان كاتێـک نيـن، بەڵكـوو گەردوونيـن}.

قوتابييـان هەندێـک كات پێيـان دەوترێـت پێويسـتە كتێـب پـەرە لـەدوای پـەرە بخوێندرێتـەوە، هەروەهـا پێشـێلكردنی هەندێـک ڕێسـای نووسـينە، ئەگـەر بەشـەكان يـەک لـەدوای يـەک نەخوێندرێنـەوە. ئـەم بۆچوونـە هەڵەيـە. باككگراوەنـدی مەعريفيـی قوتابييـان زۆر لەيەكـەوە جيـاوازە، ڕەنگـە ئـەوەی قوتابييەک پێی ئاشنايە، ئەوی تريان زۆر بەكەمی شـتێكی لەسـەر بزانێت و سـێيەم قوتابيشـيان هـەر هيچـی لـێ نەزانێت. هەركاتێـک ويسـتت يـان پێوسـتت بـە بـازدان بـوو بـۆ چاپتەرەكانـی پێشـەوە، بـۆ ڕوونكردنـەوەی زياتـر، ئـەوا بێ دوودڵی بيكـە. بۆ نموونـە، با بڵێن تۆ بۆچوونێک دەڵێيت، هاوڕێكەت دەڵێت "ئەوە بۆچوونێكی ڕێژەگەرايانەيە، زۆر ڕوون و سـادەيە." ئەگـەر تێنەگەيشـتی مەبەسـتی چييـە لـە ڕێژەگەرايی، ئـەوا تەماشـای پێرسـت بكـە، تـا بزانيت لـە چ چاپتەرێكدا باسـی ڕێژەگەرايی دەكات، لـەم نموونەيـەدا چاپتـەری نۆيـە.

بـازدان بـۆ ئـەوە بەشـەی دەزانيـت گرنگـە بـۆت، هەنگاوێكـی ئاقڵانييـە، بەتايبـەت بـۆ گـەڕان بـۆ مانـای چەمكـەكان، يـان ئـەو شـتانەی پێويسـتە بيانزانيـت بـۆ وەڵامدانـەوەی پرسـياری ڕاهێنانـەكان. يەكێکِ لـەو چەمكانـە، قۆپيـە plagiarism. ئەگـەر بەتەواوەتـی دڵنيـا نيـت لـەوەی چەمكـی پلەيجەريـزم چـی و چـی دەگرێتـەوە، بۆچـی قبـوڵ نەكـراوە لـە كۆليژەكانـدا، هەروەهـا چـۆن بتوانـی خۆتـی لـێ ڕزگار بكەيـت، ئـەوا هـەر ئێسـتا چەنـد خولەكێكی بۆ تەرخان بكە، تـا بـەو چەمكـە ئاشـنا بيت. بڕوانـە ناونيشـانی "دووركەوتنـەوە لـە پلەيجەريـزم" لـە كۆتاييـی چاپتـەری دوودا. بـە هەمـان

شێوە، ئەگەر دەزانیت وەک پێویست شارەزا نیت لە چۆنێتیی گەڕان لە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، ئەوا فکرەیەکی زۆر باشە هەر ئێستا چاپتەری حەڤدە بخوێنیتەوە. ئەگەر بەم شێوەیە باز بدەیت بۆ ئەو بەشەی دەزانیت پێویستت پێیەتی، ئەوا هەم بڕێکی باش لە کات و هەم لە ماندووبونت بۆ دەگەڕێتەوە، لە کاتی بەئەنجامگەیاندنی ئەرکەکانی خوێندندا.

# بەشی یەکەم
# کۆنتێکست

هەرکەسێک بیەوێت فێری چالاکییەک ببێت، پێویستە لەپێشدا بە ئامراز و ڕێساکانی ئەو چالاکییە ئاشنا بێت. ئەمە چۆن بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی ڕاستە، ئاواش بۆ گۆلف، دارتاشی، لێخوڕینی فڕۆکە و نەشتەرگەریی دەماخیش ڕاستە. بەڵام لە بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا، ئامرازەکان ماددین، بەڵکوو چەمکەکانن کە نامادین، ڕێساکانیش بۆ بەڕێوەبردنی چالاکیی ئەقڵین نەوەک چالاکیی فیزیکی.

لە بەشی یەکەمدا، حەوت چەمکی گرنگ دەپشکنرێت: *ئاگەرایی، بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، حەقیقەت، بۆچوون، بەڵگە و ئارگومێنت*، بۆ هەریەکەیان، چاپتەرێک تەرخان کراوە. زۆر لەم چەمکانە ئەوەندە بیستراون، کە ڕەنگە لە خۆت بپرسیت ئایا پێوست دەکات شی بکرێنەوە. وەڵام: بەڵێ، پێویست دەکات، لەبەر سێ هۆ یەکەم، بەشی زۆری ئەو تێگەی شتنەباوەی لەسەر ئەم چەمکانە هەیە، هەڵەیە. دووەم، هەرکەسێک بە ئاگاییەوە لەم چەمکانە بکۆڵێتەوە، هەمیشە لەوسەرەوە بە تێگەیشتنی نوێوە دێتە دەرەوە. سێیەم، هەتا مەعریفەت لەسەر ئەم چەمکانە زیاتر بێت، کارامەتر دەبیت لە بیرکردنەوەدا.

# چاپتەری یەکەم
# تۆ کێیت؟

وای دابنێ کەسێک لێت ئەپرسێت "تۆ کێت؟" زۆر ئاساییە گەر ناوی خۆتی پێ بڵێت. بەڵام ئەگەر کەسەکە ویستی هەموو چیرۆکی ژیانت بزانێت، ئەوکات پرسیارەکە سەختترە بۆ وەڵامدانەوە. ئاشکرایە لەم کاتەدا دەبێت زۆر شتی تر بخەیتە سەر وەڵامەکەت، وەکوو درێژیی باڵات، تەمەنت، کێشت. هەروەها دەبێت باسی هەموو هەستەکان و شتە پەسەندکراوەکانیشت بکەیت، تەنانەت ئەوانەشی تا ئێستا بە کەست نەوتووە _ هەست و سۆزت بۆ خۆشەویستەکەت؛ ئارەزووت بۆ دڵخۆشکردنی ئەوانەی مامەڵەت لەگەڵدا کردوون؛ ڕقت لە خوشکەگەورەی مێردەکەت؛ حەزت بۆ ئەو خواردنەوە و جلوبەرگ و میوزیکەی پەسەندیان دەکەیت.

ناکرێت لە وەڵامەکەتدا ئاماژە بە ڕەفتارەکانیشت نەکەیت _ بێئارامیت کاتێک کێشەیەک ئاڵۆزدەبێت، ڕقت لە کورسێکی دیاریکراو، ترست لە شوێنی بەرز و لە سەگ و لە قسەکردن لە شوێنە گشتییەکاندا. لیستەکە ڕەنگە بەردەوام بێت. بۆ ئەوەی وەڵامەکە تەواو بێت، دەبێت باسی هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆت بکەیت، ئەویش تەنها تایبەتمەندییە جەستەییەکانت نا، بەڵکوو تایبەتمەندییە عاتیفی و عەقڵییەکانیشت.

بەڕاستی کاریکی وەرسکەر دەبێت، ئەگەر بتەوێت وەلامەکەت هەموو زانیارییەکان لەخۆ بگریت. بەلام وای دابنی پرسیارکەرەکە دەیەوێت زیاتر بزانێت و دەپرسیت، "چۆن بووی بەوەی کە هەیت؟" ئەگەر هێشتا ئارامت مابێت، ئەوا ڕەنگە بلێیت، "چونکە خۆم بڕیاری ئەم شێوەبوونەی خۆمم داوە، چونکە هەستەکانی تر و شتە پەسەندکراوەکان و ڕەفتارەکانی تریشم لە بەرچاوگرتووە و لەناو هەموویاندا هەڵبژاردنی خۆم کردووە. ئەوەش کە هەڵم بژاردووە، بە باشترین شێوە ئەگونجێت لەگەڵ ستایڵ و کەسایەتیمدا." ئەم وەلامە ئاساییە و تا ڕادەیەکیش ڕاستە. بەلام لە سیاقێکی گەورەتردا، هەڵەیە. کاریگەریی جیهان لەسەر هەریەکە لە ئێمە، زۆر لەوە گەورەترە کە درکمان پێ کردوە.

## کاریگەریی کات و شوێن

تۆ هەر تەنها ئەندامێک نیت لە جۆریکی دیاریکراو لە گیاندار _ *homo sapience* {مرۆڤ بەگشتی وەک جۆرێک لە ئاژەڵ پۆلێن کراوە، کە ناو نراوە هۆمۆ سەپیەنس}. بەڵکوو بوونیشت دەکەوێتە ساتێکی دیاریکراوی مێژووی ئەو جۆرەوە. ژیان ئەمرۆ جیاوازە لە ٣٠ ساڵ لەمەوپێش، زۆریش جیاوازە لە ژیانی ١٥٠٠ ساڵی زایینی یان ١٠٠٠٠ ساڵی پێش زایین. حاڵەتی پێشکەوتنی جیهان جیاوازە، وەک چۆن مەعریفە و بڕوا و بەهاکانیش جیاوازن، بوارەکانی فێربوون و ئیشکردن و پشوودان وەک یەک نین، هەروەها بیرکردنەوە و ڕەفتاری ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیش جیاوازە.

هەر وەکوو کات لە شوێن و باردۆخیشیدا دەتوانی جیاوازی دروست بکات. ئەگەر تۆ لە شارێکی گەورە بژیت، ئەگەری ئەوە هەیە تێڕوانینت بۆ زۆر شت جیاواز بێت، وەک لە کەسێک کە لە لادێیەکدا دەژی. کەسێک

کە ۱۸ ساڵە لە نیو یۆرک یان لۆس ئەینجلس دەژی، بە ئەزموونێکی قورسدا تێپەڕ دەبێت ئەگەر بچێتە کۆلیژێک لە شارۆچکەیەکی ۳۰۰۰ کەسیدا. بە هەمان شێوە، بۆ کەسێکیش ئەزموونەکە قورسە ئەگەر لە کێڵگەیەکی دوورەدەستەوە بڕوات، بەڵام ئەمیان ڕەنگە لەبەر هۆیەکی پێچەوانە بێت!

ئەگەر ئەمەریکییەکی پەرۆش بیت بۆ وەرزش، ئەوا ڕەنگە حەزت لە تۆپی پێ، تۆپی سەلله، یان بەیسبۆڵ بێت. بەڵام ئەگەر خەڵکی ئاسیا بیت، ئەوا زیاتر کەیفت بە تێنسی سەر مێز یان ڕیشە دێت؛ ئەگەریش ئینگلیز بیت، ئەوا وەرزشەکە بریتی ئەبیت لە کریکت. ئەگەر یەکیک لە باوانت {دایک و باوک} میکانیکی ئۆتۆمۆبیل بێت، ئەوا تۆ زیاتر دەربارەی ئۆتۆمۆبیل زانیاریت دەبێت وەک لە کەسێک کە باوانی پیشەیەکی جیاوازیان هەیە. ئەگەریش یەکێکیان مامۆستا بێت، ئەوا بە چاوێکی جیاوازەوە دەڕوانیتە قوتابخانە و مامۆستاکان، بەراورد بە قوتابییەکانی تر.

بە هەمان شێوە، سیفەتەکانی ئەندامەکانی تری خێزانەکەت بەژدارن لەو کەسایەتییەی تۆ هەتە. ئایینەکەیان، نەژادەکەیان، قەومیەتیان، وەلائی سیاسییان، ئاستی ئابوورییان، ڕەفتاریان بەرامبەر بە یەکتر، هەموو ئەمانە بەشدارن لە دروستکردنی شووناسی تۆدا.

بەدڵنیاییەوە ڕەنگە بەهاکان و بڕواکانی باوانت ڕەت بکەیتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی کە دایک و باوکت تێکۆشاون تا فێرتی بکەن، کاریگەریی خۆی هەیە و گۆشەنیگای ئێستات لەو شتانەوە گەشە دەکات، کە فێریان کردوویت. فۆرمگرتنی گۆشەنیگاکانت ڕەنگدانەوەی ئەو شێوازەیە، کە تۆی تێدا پەروەدە کراویت. ئەگەر دایک و باوکت خاوەن کولتوور و بەهای

جیاواز بوونایە _ بۆ نموونە تۆ لە ئیستانبول گەورە کرایتایە وەک لە دوبیوک، ئەوا بەناچاری تێڕوانینەکانت ڕەنگدانەوەی ئەو ژینگەیەی پێوە دیار دەبوو. کەواتە لەم حاڵەتەدا تۆ هەمان کەسی ئێستا نەدەبوویت.

## کاریگەریی کولتووری مێگەل

لە سەدەکانی ڕابردوودا، باوان و مامۆستاکان کاریگەریی سەرەکییان هەبووە لەسەر منداڵەکان، تەنانەت هەنێک کات، تەنها کاریگەریش بوون لەسەر منداڵ. بەڵام ئەمڕۆ ئەو کاریگەرییە کە کولتووری مێگەل Mass Culture (پرۆگرامەکانی میدیا، ڕۆژنامە، گۆڤار، میوزیکە بەناوبانگەکان) لەسەر منداڵ دای دەنێت، زۆر جار گەورەترە لە کاریگەریی باوان و مامۆستاکان.

لە تەمەنی ۱۸ ساڵیدا، بە شێوەیەکی گشتی هەر گەنجێک ۱۱۰۰۰ کاتژمێری لە پۆلەکانی قوتابخانەدا بەسەر بردووە، هەروەها ۲۲۰۰۰ کاتژمێری لە بەدەرەم شاشەی تەلە{زیۆندا دا بەسەر بردووە. ئەو {کوڕ یان کچە گەنجەکە} بە نزیکەی ۱۳۰۰۰ ئەرکی قوتابخانەی بەئەنجام گەیاندووە، بەڵام تەماشای زیاتر لە ۷۵۰۰۰۰ ڕیکلامی بازرگانیی کردووە. هەمان کەس لە تەمەنی ۳۵ ساڵیدا، لە کەمتر لە ۲۰۰۰۰ وانەدا بەشداریی کردووە، بەڵام بە نزیکەیی، ٤٥۰۰۰ کاتژمێر لە بەردەم تەلەڤزیۆندا دانیشتووە و بە نزیکەیی ۲ ملیۆن بانگەشەی بازرگانیی بینیوە.

ئەو کاریگەرییانە چییە کە کولتووری مێگەل لەسەر ئێمە دای دەنێت؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئەوەندە بەسە ئەو شێواز و ئامێرانە لە بەرچاو بگرین، کە بە شێوەیەکی بەربڵاو لە میدیادا بەکار دێن. ڕیکلامی مۆدرێن بە شێوەیەکی باو کۆمەڵانی خەڵک Public دادەگرێتەوە، بە

دروشم و وەسف و پیاهەڵدانی کەلوپەل و کەسە ناودارەکان. ئەم میتۆدە، شێوازە بە شێوەیەک دیزاین کراوە، تا لە ڕێی عاتیفەوە پێداویستیی زۆڵ، ناپێویست بەرهەم بهێنێت بۆ کەلوپەل و خزمەتگوزارییەکان {واتە میدیا لە ڕێی ڕیکلامەوە هەستەکانمان بەکار دەهێنن، تا قەناعەتمان پێ بکات، پێوستمان بە زۆر شتە و دەبێت بەدەستیان بهێنین، لە کاتێکدا ئەو شتانە پێویستیش نین}. دەرئەنجام، زۆر کەس وەک خوویەک بەدەم بانگەشەکانی میدیاوە دەچن، بە شێوەیەکی عاتیفی و بێ بیرکردنەوە و خۆشباوەڕانە وەڵامی ئەو بانگەشانە دەدەنەوە. هەروەها مەیلی بەدستهێنانی کۆمەڵێ بەها دەکەن، کە زۆر جیاوازە لەوانەی لە ماڵ و قوتابخانەدا فێری بوون. هەروەها ڕیکلام وا وێنەی یاری و کاتبەسەربردن دەکات، وەک ئەوەی لە ئیشکردن زیاتر هەستکرن بە قانعبوون بەرهەم بهێنێن، هەروەها وەک ئەوەی خۆڕازیکردن باشتر بێت لە خۆکۆنترۆلکردن و ماددەگەراییش materialism ماناداترر بێت لە ئایدیالیزم.

دانەرانی پرۆگرامەکانی تەلەڤزیۆن ئەو گرتانە بەکار دەهێنن، کە کورتن و خێرا دەگۆڕێن و لە ڕووی هەستییەوە سەرنجڕاکێشن، وەکوو پێکدادانی ئۆتۆمۆبیل، توندوتیژی، دیمەنی سێکسی بۆ ئەوەی بینەر بە پرۆگرامەکانەوە بهێڵنەوە. ئینجا زووزوو ڕیکلامی بازرگانی دەخەنە ناو پرۆگرامەکانەوە. ئەم نووسەر {ڤینسێنت}، ئەو گواستنەوەی تەرکیزانەی ڕوون کردۆتەوە attiontion shifts، کە بینەرانی تەلەڤزیۆن بابەتێکن بۆی. لە پرۆگرامێکی سەرنجڕاکێشدا، گواستنەوەی تەرکیز ڕەنگە لەم ڕێگەیانەوە ڕوو بدات: گۆڕانی گۆشەی وێنەگرتن*؛ گۆڕان لە هێڵی چیرۆکەکەدا لە کارەکتەرێکەوە بۆ ئەوی دییان (چیرۆکی لاوەکی)، یان لە دیمەنێکی ئێستاوە بۆ ڕابردوو (فلاش باک) یان بۆ خایاڵ؛ ئینجا گۆڕان

* گۆڕانی گۆشەی وێنەگرتن، عادەتەن بە بەکارهێنانی دوو کامێرا یان زیاتر بەکار دێت.

بۆ هەواڵەکان؛ بۆ ڕیکلامی بازرگانی، لەویشەوە بۆ ڕیکلامێکی تر، دواتر گەڕانەوە بۆ پرۆگرامەکە. هەروەها گواستنەوەی تەرکیز، تەنانەت *لەناو* ریکلامە بازرگانییەکانیشدا ڕوو دەدات. من ٧٨ گواستنەوەم لە کاتژمێریکدا بینیوە، بێجگە لە ڕیکلامە بازرگانییەکان. ژمارەی گواستنەوەکان، گۆڕانەکان لە ڕیکلامەکاندا لە ٦ەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ٥٤، تێکرا بە نزیکەیی دەکاتە ١٧ گواستنەوە لە هەر ١٥ چرکەی ڕیکلامەکاندا. تێکڕای گۆاستنەوەی تەرکیزەکان دەکاتە ٨٠٠ لە هەر سەعاتێکدا، یان زیاتر لە ١٤ بۆ هەر دەقەیەک*.

ئەم هەڵخەڵەتاندنە ڕێگە لە خەڵک دەگرێت تا گەشە بە دووری، مەسافەیەکی ئەقڵانی بدەن لەنێوان خۆیان و ئەو گۆڕان و گواسنەوانەی لە تەرکیزدا ڕوو دەدات {بە مانایەکی تر، ئەوەی کە حەقیقییە و ئەوەی وەهمە}. ئیدی بینەر بە هۆی ڕیکلامەکانەوە چاوەڕێ دەکەن پۆلەکەنی خوێندن و ئیشەکەیان هەمان ئەو خۆشییە بەردەوامەی تیا بێت، کە لە تەلەڤزیۆنەوە پیشان دەدرێت. کە ئەمە بەدڵنیاییەوە داوایەکی مەحاڵە، کاتێکیش ئەو چاوەڕوانییەیان بەدی نایەت، گلەیی دەکەن و بە مامۆستاکانیان دەڵێن بێزارکەر و بە ئیشەکانیان دەڵێن لە ئاستی تموحدا نییە. لەبەر ئەوەی خەڵک بەدەگمەن دان بە خۆیاندا دەگرن تا کتێبێک بخوێننەوە، کە داویان لێ دەکات بیر بکەنەوە، هەر بۆیە خانەی بڵاوکەرەوەکان لەبری کتێبە جیدییەکان، ئەو بابەتە تەرفیاتانە بڵاو دەکەنەوە، کە لەسەر خاوەن ناوبانگەکان نووسراون.

---

* لە هەر کاتژمێریکدا ١١ خولەکی تەرخان کراوە بۆ ڕیکلامەکان، دیارە ئەو کاتە بەپێی کەناڵەکە و پرۆگرامەکە دەگۆڕێت. کەواتە بە ڕێژەی ٤ لە خولەکێکدا، تێکڕای ڕیکلامە بازرگانییەکان دەکاتە ٤٤ بۆ هەر کاتژمێرێک. ئەمەش دەکاتە ٧٨ گۆڕان لە دەرەوەی ڕیکلامەکان لەگەڵ ٧٤٨ گۆڕانی ناو ڕیکلامەکاندا(١٧ گۆڕان بۆ هەر ڕیکلامێک، ٤٤ ڕیکلام لە هەر کاتژمێریکدا) کەواتە تێکرا دەکاتە ٨٢٦

تەنانەت ئەگەر نووسەرە جیدییەکان توانییان بەرهەمەکانیان بڵاو بکەنەوە، ئەوا زۆر جار لە چاوپێکەوتنە دیعایەکارییەکاندا داوایان لێ دەکرێت وەڵامی کورت و یەکلاکەرەوە بدەنەوە، هەندێک جار ئەمە لەسەر دیقەتی، وردیتی وەڵامەکە دەکەوێت. پێشکەشکارێک جارێکیان ئاوا ئامۆژگاریی نووسەریکی کرد: "ئەگەر لێم پرسیت ئایا کورتهێنانی بودجە شتێکی باشە یان خراپ، تۆ باشترە نەڵێیت، 'لە ڕاستیدا باشە بۆ گەشەکردنی، هاندانی ئابووری، بەڵام ئەمە ئەرکێکی قورسە.' تۆ دەبێت بڵێت، 'ئەمە شتێکی زۆر نایابە!' یان 'ئەمە شتێکی زۆر خراپە!' گرنگ نییە کامیان دەڵێیت." (بەکورتی ــ وەڵامێکی بابەتی و هاوسەنگ مەدەرەوە. وەڵامێکی زۆر سادە و ڕووکەشی بدەرەوە، چونکە ئەمە وات لێ دەکات بناسرێیت.)

ڕۆژنامەگەری چاپکراویش ئیش لەسەر دواندنی هەستەکان دەکات، واتە sensationalism

وروورژاندنخوازی. سەرنووسەری ڕۆژنامەیەک ئاوا ئاماژە بەم حاڵەتە دەدات: "ڕۆژنامەنووسەکان بە بەردەوامی لە هەوڵی دۆزینەوەی ئەو خەڵکەدا کە لە پێوەری ١ بۆ ١٠ لەسەر خاڵی١ و ٩ وەک لەوانەی لەسەر خاڵی ٣ بۆ ٧تن {خاڵە مامناوەندییەکان}، کە لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی لەوێدان." ڕۆژنامەنووسێکی تر دەڵێت، "لەم ڕۆژگارەدا هەواڵ زیاتر بۆچوونە وەک لەوەی پشتڕاستکردنەوە فاکتەکان، ڕاستییەکان بێت. ڕۆژنامەنووسەکان ئەمڕۆ گرنگی بە بابەتەکانی خۆشی و ڕابواردن Entertainment دەدەن، وەک لە پشتڕاستکردنەوەی ئەو فاکتانەی پێویست دەکات بیانزانین."

سیاسییەکانی ئەمڕۆ، زۆر خراپتر لە ڕۆژنامەنووسەکان سەرقاڵی

هەڵخەڵتاندن و گەمژەکرنی خەڵکن. لەبری ئەوەی گوزارشت لە ئایدیاکانی خۆیان بکەن، کەچی سیاسییەکان هەوڵ دەدەن بزانن خەڵک چۆن بیر دەکاتەوە، تا وای پیشان بدەن ئەمانیش لەگەڵ بۆچوونەکانی خەڵکدان. زۆر لە سیاسییەکان خەڵک بە پارە دەگرن، تا راپرسییان بۆ بکەن و هەروەها گروپی چاودێریش بەکری دەگرن، تا بزانن چی پەیامیک "دەفرۆشرێت." سیاسییەکان ئەوەندە لە هەوڵی گەمژاندنی خەڵکدان، تەنات بیر لەوەش دەکەنەوە کە کام وشە کاریگەریی زۆری دەبێت _ هەر بۆیە ئێمە زۆر گوێبیستی "متمانە، خێزان،" مرۆڤی خاوەن کارەکتەر،" "بەهاکان" دەبین لەم رۆژگارەدا. Larry sabato پرۆفیسۆری زانستی سیاسی دەڵیت، لە ماوەی دادگاییکردنی کلینتۆندا، راوێژکارەکانی سەرۆک تێرمی *ژیانی تایبەتییان* دەوت و دەوتەوە - لە وتاردانێکی چوار خولەکیدا، جەیمس کراڤیل شەش جار ئەم چەمکەی بەکار هێنا - چونکە دەیانزانی رەنگە خەڵک قایل بکات بەوەی درۆکردنی سەرۆک لە کاتی سوێندخواردنی مەحکەمەدا، شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە.

## "زانست"ی هەڵخەڵەتاندن

هەوڵدان بۆ کاریگەریدانان لەسەر بیرکردنەوە و کرداری ئەوانی تر، زۆر زۆر کۆنە، بەلام هەڵخەڵتاندن manipulation نەبوو بە زانستێک، هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم، کە سایکۆلۆجستی رووسی، پرۆفیسۆر ئیڤان پاڤلۆڤ لێکۆڵینەوەکەی بەچاپ گەیاند دەربارەی کاردانەوەی مەرجدارکراو (فێرکراو) conditioned reflexe. پاڤلۆڤ ئەوەی دۆزییەوە، کە دەتوانی لیکرژانی سەگەکەی مەرجدار بکات، ئەوەش بەوەی هەرکاتێک کە زەنگی لێدەدا، خواردنی دەدا بە سەگەکە، بەلام تەنانەت ئەو کاتانەشی خواردن ئامادە نەبوو، هەر کە سەگەکە گوێی لە زەنگەکە دەبوو، لیک بە دەمیدا ئەهاتە خوارەوە. دەروونناسی ئەمەریکی، جۆن واتسن بەم دۆزینەوەیەی

پاڤلۆڤ سەرسام بوو، هەروەها لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ جێبەجێی کرد. لە بەناوبانگترین تاقیکردنەوەیدا، واتسن لێگەڕا منداڵێک دەست لە جرجێکی تاقیکردنەوەوە بدات. لە سەرەتادا منداڵەکە نەدەترسا. بەڵام دواتر، هەرکاتێک منداڵەکە لەوەدا بوو دەست لە جرجەکە بدات، واتسن چەکوشێکی ئەکێشا بەپارچەکانزایەکدا، بەمەش منداڵە ئەترسا و ئەگریا. دواتر منداڵەکە وای لێ هاتبوو، هەرکاتێک نەک هەر بە بینینی جرجەکە، بەڵکوو بە بینینی هەرشتێکی کوڵکاوی دەترسا، وەکوو یارییەکانی منداڵان. بە هۆی ئیشەکانییەوە، واتسن بە "باوکی بیهەیڤەریزم" ناسرا.

ئیتیکی مۆدێرن ڕێ نادات منداڵ لە وەها تاقیکردنەوەیەکدا بەکار بهێنرێت.

واتسن پرنسیپەکانی بیهەیڤەریزمی بەکار هێنا لە بواری ڕیکلامکردندا، کە ئەمیان کەمتر لە تاقیکردنەوەیەکی پێشووتر ناسراوە. ئەو لە بەشی دواتری کارەکەیدا، سەرقاڵی کاروباری ڕیکلام بوو، هەر زوو بۆی دەر کەوت سەرکەوتووترین ڕێگە بۆ پەلکێشکردنی بەکاربەرەکان، کڕیارەکان لە ڕێگەی عاتیفەیانەوەیە، نەک لە ڕێگەی ئەقڵیانەوە. ئەو ئامۆژگاریی ڕیکلامکارانی دەکرد، کە "شتێک بە (بەکاربەرەکان) بڵێن، کە بیانبەستێتەوە بە ترسەوە، شتێک، کە خۆف و ترسێکیان تیادا بچێنن، کە داوای سۆز یان خۆشەویستی بکات، یان بە قووڵی پێداویستییە دەروونی و خوولەسەرگرتووەکانیان بهەژێنێت." ڕەنگە بۆچوونی واتسن دەربارەی بەکاربەران بە باشترین شێوە گوزارشتی لێ کرابێت لەو موحازەرەیەدا، کە بۆ بەڕێوبەرانی مەخزەنەکان پێشکەشی کرد: بەکاربەرەکان بۆ بەرهەمهێنەرەکان، مەخزەنەکان و ڕیکلامکاران، وەکوو بۆقی سەوز وان بۆ زانایانی زیندەوەرناسی."

واتسن ئەم ستراتیژییانەی لە ١٩٢٠ و ١٩٣٠یەکاندا پێشکەش کردووە، کە ئەوکات سەردەمی رۆژنامە و رادیۆ بوو. بە هاتنی تەلەڤزیۆن ستراتیژییەکانی ریکلامکردن گەشەیان کردووە، زۆر زانستیتر و کاریگەرتر بوون، بە شێوەیەک، کە زۆر تاک و گروپ بە ئەجێندای سیاسی و کۆمەڵایەتیی جیاوازەوە بەکاریان دەهێنن. ستراتیژەکان کاریگەرن لەبەر ژمارەیەک هۆ، سەرەکیترینیان ئەو قەناعەتەی خەڵکە، کە گوایە ئەمان ناکرێت هەڵبخەتێندرین، بەهەڵەدا ببرێنن. ئەم قەناعەتە بەهەڵدا چووە، دەیان لێکۆڵینەوەش ئەم بەهەڵداچوونەی سەلماندووە. بۆ نموونە، سۆلۆمۆن ئاچ پیشانی داوە کە وەڵامدانەوەی کەسەکان بە گۆرانی، شوێنی وشەکان لە زنجیرەیەکدا دەگۆرێت. ئەو داوای لە بەشداربووەکانی لێکۆڵینەوەکەی کرد، کە کەسێک هەڵبسەنگێنن لە رێی کۆمەڵێک ئاوەڵناوەوە. کاتێک سۆلمۆن ئاوەڵناوە باشەکانی لە سەرەتاوە دانا _ "زیرەکی، ئیشکەر، سەرکێش، رەخنەگر، کەللەرەقی، بەخیل." بەشداربووان بە شێوەیەکی ئەرێنی positive کەسەکایان هەڵدەسەنگاند. بەڵام کاتێک تەسەسولی وشەکانی دەگۆری، "بەخیل" لە پێشەوە دەهات و "زیرەکی" لە کۆتاییدا، بەشداربووان بە شێوەیەکی نەرێنی negative کەسەکەیان هەڵدەسەنگاند.

بە هەمان شێوە، لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە، کە یادەوەریی ئینسان دەتوانرێت بەهەڵەدا ببرێت. شێوازی کردنی پرسیارەکە دەتوانێ دیتەیڵی زانیارییەکان بگۆرێت لە یادەوەریی کەسەکەدا، بگرە دەتوانێ وای لێ بکات، شتێکی بیر بکەوێتەوە، *کە هەرگیز رووی نەداوە!*

بەدڵنیاییەوە ریکلامکاران و کەسە خاوەن ئەجێندا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، بەوە قانیع نابن کە تەنها ختووکەی عاتیفەمان بدەن

و/یان ئایدیا لە سەرماندا بچێنن. بەڵکوو ئەوان بە بەردەوامی لە هەوڵداندان، تا کاریگەریی پەیامەکانیان بەزیندوویی بمێنێتەوە، ئەویش بە بەردەوام-دووبارەکردنەوەی پەیامەکان. هەتا زیاتر خەڵک دروشمێک یان "مەسەلەیەک" ببیستن، زیاتر پێی ئاشنا دەبن. هەر زوو وای لێ دێت ئەو دروشمە، مەسەلەیە جیا نەکرێتەوە لەو ئایدیایەی لە دەرئەنجامی بیرکردنەوەیەکی وردەوە قبوڵ کراوە. بەداخەوە، "پێچانەوەی بۆچوون {ڕێک وەک پێچانەوەی لەفەیەکی سەفەری} زۆر جار ئەوەندە بە سەرکەوتووانە دەکرێت، کە بینەر، بیسەر، خوێنەر ناتوانێ هەرگیز بڕیاری خۆی بدات. لەجیاتی ئەوە، ڕەئی ئامادەکراو دەخاتە کەللەیەوە، وەکوو ئەوەی کاسێتێک بخەتە سەر تەسجیلێک. دواتر هەرکاتێک کە گونجاو بوو، پەنجە دەنێت بە "پلەی باکدا،" تا بۆچوونەکە، ڕەئەکە بڵێتەوە. ئەمەش وای لێ دەکات قسە بکات، بەبێ ئەوەی بیری لێ کردبێتەوە." زۆر لەو بیروڕایانەی لەلامان ئازیزن و بەتوندی بەرگرییان لێ دەکەین، ڕەنگە ڕێک بەم شێوەیە خرابێتە سەرمانەوە.

## کاریگەریی سایکۆلۆژیا

تیۆرە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژییەکانی سەردەمەکەمان، ئەوانیش کاریگەرییان هەیە لەسەر بیروباوەڕەکانمان. پێش چەند دەیەیەک، خەڵکی تەشویق دەکران بۆ دانبەخۆداگرتن، ڕەخنەلەخۆگرتن و بێفیزی. ئەوان تەشویق دەکران بۆ خۆنەویسی، هان ئەدران بۆ خۆناسین، بۆ ڕەفتارنواندنێک، کە هاوەڵە لەگەڵ ڕێزگرتنی خودا. خۆپەرستی، خود-کردنە-سەنتەر، وەک بەدکاری و ڕەزیلی سەیر دەکرا. ئەوان دەیانوت "کاری گران، دەستکەوت بەداوی خۆیدا دەهێنێت، دەستکەوتیش قانیعبوون و بڕوابەخۆبوون بەرهەم دەهێنێت." زۆربەی زۆری باوانی باوانمان، ئەو ئامۆژگارییانەیان قبوڵ کردووە و شوێنی کەوتوون. ئەگەر

لە ڕەفتارەکانیاندا ڕەنگی بدایەتەوە، هەستیان بە شانازی دەکرد، کاتێکیش لە ڕەفتارەکانیاندا دەر نەکەوتایە، هەستیان بە خەجاڵەتی دەکرد.

ئەمڕۆ تیۆرییەکان گۆڕاون _ لە ڕاستیدا بەتەواوەتی پێچەوانە بوونەتەوە. بڕوابەخۆبوون، بەهای خۆ Self esstem، بە شکۆی خۆ، کە نووسەری گاڵتەجاڕی سەدەی نۆزدە Ambrose Bierce پێناسەی دەکرد بە "پیاهەڵدان بە هەڵەدا" ئەمڕۆ زۆر بە گرنگ دادەنرێت. خۆپەرستی، خۆ-کردنە- سەنتەر لە خراپەوە vice گۆڕاوە بۆ چاکە virture، ئەو خەڵکەی ژیانی خۆیان تەرخان دەکرد بۆ یارمەتیدانی ئەوانی تر، بە پیاوچاک و پیرۆز دەدەنران، لێ ئەمڕۆ پێیان دەڵێن تووشبووەکان بە "نەخۆشیی دڵخۆشکردن." پێکهاتەی سەرکەوتن و بەختەوەربوون بەستراوەتەوە بە هەستی لەخۆڕازیبوونەوە. ئەو قوتابییانەی لە قوتابخانەدا لاوازن، ئەو کرێکارانەی لە ئاست داواکاریی ئیشەکادا نین، ئالوودەبووانی ماددە هۆشبەرەکان، یاساشکێنەکان _ هەموو ئەمانە وەک دەرهاویشتەی نەبوون و کەمیی باوەڕ بە بەهای-خۆ-بوون لێک دەدرێتەوە.

هەروەها، هەر وەک چۆن نەوەکانی پێش ئێمە شوێنی تیۆرییە کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژییەکان کەوتوون، بە هەمان شێوە ئەمەریکییە هاوچەرخەکانیش شوێن پەیامی بڕوابوون-بە-خۆ کەووتون self-esteem. ئێمە گوێمان لێ دەبێت خەڵک لە کاتی خواردنەوەی قاوەدا باسی دەکەن، بێکۆتا لە بەرنامە گفتوگۆکانەوە گوێمان لێ دەبێت. هەر بۆیە ڕەخنەگرتن لەو چەمکە، بۆ شوێنکەوتووانی نەخوازراوە.

بەلام ئایا تیۆریی بڕوابەخۆبوون، خۆی بۆخۆی بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە؟ نەخێر. بەدڵنیاییەوە تێڕوانینی نێگەتڤانە بۆ تواناکانمان،

چالاکییەکانمـان تووشـی شـەلەل دەکات. دکتـۆر ماکسـویڵ مالتـز، لێکدانەوەیەکـی سەرنجڕاکێشـی کـردووە بـۆ تاقیکردنـەوەی مامۆسـتایەک، کە لە ڕێی گۆڕانی خودوێناکردنەوە، وێناکردنی خود بۆ خۆی توانیویێتی نمرەکانی قوتابییەکانی باش بکات. مامۆستاکە سەرنجی ئەوەی دا، کاتێک قوتابییـەکان خۆیـان وەک تەمـەڵ دەبینـی لـە وانەیەکدا (یـان لـە هەمـوو وانەکانـدا) بێئاگایانـە ئـەو خۆوێناکردنەیـان پیـادە دەکـرد. ئـەوان پێیـان وا بـوو تەمـەڵ بـن، هـەر بۆیـە وەک تەمەڵێـک ڕەفتاریـان دەکـرد. مامۆسـتاکە بـۆی دەر کـەوت هـۆی لاوازییـان ئـەو وێنـە لاوازکەرەیـە، کـە قوتابییـەکان بـۆ خۆیـان هەیانـە، نـەک کەمتوانایییـان، بۆیـە هەوڵـی دا وێنـەی قوتابییـەکان دەربـارەی خۆیـان بگۆڕێـت. پـاش ئـەوەی مامۆسـتاکە کارەکـەی بەئەنجـام گەیانـد، بینیـی چیـدی *قوتابییـەکان تەمـەڵ نیـن!* مالتـز لـەم نموونـە و لـە نموونـەی تریشـەوە گەیشـتە ئـەو دەرئەنجامـە کـە ئەزموونەکانمـان {کـە بەرئەنجامـی تێڕوانینێکـی دیاریکـراوە بـۆ خـودی خۆمـان} وەک جۆرێـک لـە خۆخەوانـدن وایـە self-hypnotism، دەرئەنجامێـک دەربـارەی خـودی خۆمـان پێشـنیار دەکات، پاشـان پاڵمـان پێـوە دەنـێ تـا ئـەو دەرئەنجامـە پێشـنیارکراوە بـە کـردەوە بەئەنجـام بگەیەنیـن.

لێکۆڵینەوەکـەی مالتـز ئـەوەی پشتڕاسـت کـردەوە، کـە کەمیـی باوەڕبەخۆبـوون دەبێتـە هـۆی لاوازکردنـی چالاکییەکانمـان، ئەمـەش تێگەیشـتنێکی بەهـادارە. بـەڵام ئـەم لێکۆڵینەوەیـە تەفسـیری ئـەوە نـاکات، کە بۆچی چەمکی بڕوابوون-بە-خۆ، بە بەهـای خۆ لەسـەر ئاسـتی جیهان قورسـایی و پێگـەی خـۆی پەیـدا کـردووە. وەڵامـی ئـەم پرسـیارە وا لەنـاو بەناوبانگبوونـی کارەکانـی سایکۆلۆجیسـتێکی مرۆڤدۆسـتی وەکـوو ئەبراهـام ماسـلۆ Abraham Maslow. ماسلۆ پێداویسـتییەکانی مرۆڤی بەپێی ئاسـتی گرنگییـان لـە شـێوەی هەرەمێکـدا پۆلێـن کـرد، سـەرەکیترین، بنەڕەتتریـن

ئاست بریتییە لە پێداویستییە فیزیۆلۆژییەکان، جەستەییەکان (خواردن و خواردنەوە).

لەدوای ئەوانەوە، بە شێوەیەکی یەک لەدوای یەک بریتین لە پێداویستیی ئاسایش، سەیفتی، دواتر پێداویستیی بوونی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا و خۆشەویستی، دواتر پێداویستیی ڕێزلیگرتن و پێزانین {یان بڕوابوون بە بەهای خۆ}، دواتریش پێداویستییەکانی جوانناسی و پەروەردە و فێرکردن (مەعریفە، تێگەشتن. هتد). لووتکەی هەرەمەکەش بریتییە لە پێداویستیی خودتەحقیقکردن، یان هێنادەرەوەی توانا زاتییەکان. لە دیدی ماسلۆدا، پێداویستییەکان دەبێت بە شێوەیەکی یەک لەداوی یەک بەدەست بهێنرێن. ئاسانە ببینین لە تیۆرەکەی مۆسلۆوە، کە چۆن پێویستە بەدەستهێنانی ئایدیای بڕوابوون-بە-خۆ، بە بەهای خۆ، پێش ئەوانی تر بکەوێت {بەدەستهێنانی پێداویستیی جوانناسی و مەعریفە و تێگەیشتن، خۆتەحقیقکردن}.

لەگەڵ ئەوەشدا، چەند تیۆرییەکی تریش قبوڵ کراون و شوێنکەوتووی خۆشیان هەبووە. دیارترینیان تیۆرەکەی سایکۆلۆجیستی ئوستورالی، ڤیکتۆر فرانکڵ Viktor frankl، کە بە نزیکەیی، لە هامان کاتی تیۆرەییەکەی مۆسلۆدا هاتە دەرەوە، ئەم تیۆرییە هەم لەسەر کاری پرۆفیشناڵی فرانکڵ خۆی و هەم لەسەر ئەزموونی لە کەمپە زۆرەملێکانی هیتلەردا دامەزراوە. فرانکل ئارگۆمێنتی ئەوە دەکات، کە پێداویستییەکی مرۆڤ هەیە لە تەحقیقکردنی خود بالاترە، ئەویش *خودبالای* {یان بالابوونی خود، بەرزبوونەخودە - و}پێداویستیی بەرزبوونەوە لە بازنەی تەسکی گرنگیدان تەنها بە خود. لە دیدی فرانکلەوە، "فاکتێکی ئەنرۆپۆلۆجی بنچینەیی {بریتییە لە} بوون-بە-مرۆڤ، بریتییە لە بوونێک، کە بەردەوام ئاراستە کراوە بۆ شتێکی تر، یان کەسێکی تر، جیاواز لە خودی

خـۆی: بـۆ کامڵبوونـی مانایـەک، یـان بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی مرۆڤێکـی تـر، پرنسـیپێک بـۆ خزمەتکـردن، یـان مرۆڤێـک بـۆ خۆشویسـتن. "کەسـێک بەتەواوەتـی دەبێتـە مـرۆڤ" بـە فەرامۆشـکردنی خـۆی، بـە خۆتەرخانکـردن بـۆ ئـەوی دی، و جەختکردنـەوە لەسـەر دەرەوەی خـۆی."

تەحقیقکردنـی خـود (یـان بەختـەوەری)، کـە ئامانجـی یەکەمـە لەپشـت هـەوڵ و کۆششـەکانمانەوە، لـە دیدی فرانکلـەوە لـە دواجـاردا بریتییـە لـە خۆوێرانکـردن؛ وەهـا ئەنجامێـک {تەحقیقکردنـی خـود، یان بەختەوەربوون} تەنها کاتێک بەدەست دێت، ئەویش بریتییە لە "هەوڵێکی بێنیاز، بێمەبەست بـۆ خودبالایـی." دیدی گونجاو دەربـارەی ژیـان، فرانـکل پێـی وایـە، ئـەوە نییە کە ئێمە چی لە ژیان چاوەڕێ دەکەین، بەڵکوو ئەوەیە کە ئەو چی *لە* ئێمە چاوەڕێ دەکات؛ ژیـان ڕۆژانـە _ بگرە کاتژمێربەکاتژمێر _ تاقیمـان دەکاتـەوە، تەحادامـان دەکات تـا "بەرپرسـیارێتی دۆزینەوەی وەڵامـی ڕاسـت بـۆ کێشـەکانی قبـوڵ بکەیـن، ئـەو ڕاهێنانانـەش بەئەنجام بگەیەنیـن، کـە بـە بەردەوامـی {بـۆ هەریەکێک لـە ئێمـە} دانـراوە.

دۆزینـەوەی مانـا، بەپێـی تیۆرییەکـەی فرانـکل، دەزگیربـوون و "هەسـتکردنە، درککردنـە بـەو ئەگەرانـەی لـە واقیعـدا چێنـراوە "reality گەڕانـە بـەدوای تاقیکردنـەوە پـڕ لـە تەحەدییەکانـدا کـە بەئەنجامگەیاندنیـان ڕەنگـە مانـا بـە ژیانـی {کەسـێک} بـدات. بـەڵام ئـەم هەسـتکردنە، درککردنـە و گەڕانـە بـە لاڕێـدا دەبرێـت، سـەری لـێ دەشـێوێنرێت بـە جەختکردنـەوە لەسـەر خـود: "هەتاکوو ئەدەبی مۆدرێن خۆی قەتیس بکات و ڕازی بێت بـە گوزارشـتکردن لـە خـود _ نـەک بـە خۆنمایشـکردن _ ڕەنگدانـەوەی تێگەیشـتنی نووسـەرە لـە بێهودەیی و بێمانایی، ئەمیش هەروەهـا بێمانایـی بەرهـەم دەهێنێـت. ئەمـە شـتێکە قابیلـی تێگەیشـتنە، لەبـەر ڕۆشـناییی ئـەو

راستییەدا، کە مانا دەبێت کەشف بکرێت، نەوەکوو دابهێنرێت. مانا ناتوانرێت دروست بکرێت، دابهێنرێت، بەڵکوو ئەوەی کە ڕەنگە دروست بکرێت، بریتییە لە بێمانایی."

ئەگەر بەتەواوەتی لەگەڵ فرانکدا کۆک بین یان نا، شتێک بەڕوونی دەمێنێتەوە: کولتووری هاوچەرخی ئەمەریکی بە شێوەیەکی بەرچاو جیاواز دەبوو، ئەگەر بهاتایە جەختکردنەوەی ئەم چەند دەیەیەی پێشوو لەسەر تیۆرەکەی فرانکل بووایە وەک لە مۆسلۆ سایکۆلۆجیستە مرۆڤدۆستەکانی تر. هەر هەمووومان _ بە شێوەیەکی زۆر قووڵ _ لە مامەڵەکردن و بەها و بیروباوەڕەکانماندا دەکەوتینە ژێر کاریگەریی تیۆرەکەی فرانکلەوە.

## بوون بە تاك becoming an individual

لەبەر ڕۆشناییی ئەوەی باسمان لێوە کرد، ئێمە دەبێت چۆن لە تاککەرایی بڕوانین؟ وەک شتێک نا کە ئێمە پێوەی لەدایک بووین، بەڵکوو وەک شتێک، کە بەدەست هاتووە _ یان بە شێوەیەکی وردتر بڵێین، شتێک کە *فێر کراوین*. تاککەرایی بەو پێزانینە، درککردنە دەست پێ دەکات، کە مەحاڵە هەڵبێن لەو کاریگەریانەی ئەوانی تر و بارودۆخ لەسەرمانی دادەنێن. جەوهەری تاککەرایی بریتییە لە هۆشیاری، وتووریایی vigilance. ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە هاوکاریت دەکەن لە بەدەستهێنانیدا:

١. *کاردانەوەی یەکەمت بۆ هەر کەس و کێشە و حاڵەتێک، با گومانلاوی* بێت. مەهماکان سەرنجراکێش بێت، قبوڵی مەکە، هەتاکوو لێی نەکۆڵیتەوە.

٢. تێبگە بۆچی *ئەو جۆرە کاردانەوەیەت هەڵبژارد*. وای دانێ کاردانەوەکەت لە کەسێکی ترەوە وەر گرتووە _ لە دایک و باوکت، یان هەوڕێیەکت، ڕەنگە لە کەسێکی بەناوبانگ یان لە کاریکتەرێکی دروستکراوی تەلەڤزیۆنەوە وەرت گرتبێت. ئەگەر توانیت، بزانە چ

ئەزموونێکی دیاریکراو وای لێ کردوویت بەو شێوەیە وەڵام بدەیتەوە.

٣. *بیر لەو کاردانەوە ئیحتیمالییانە بکەرەوە، کە دەکرا تۆ بۆ کەسەکە، کێشەکە، حاڵەتەکەت هەتبایە.*

٤. *لە خۆت بپرسە ئاخۆ یەکێک لەو کاردانەوانەی تر زیاتر گونجاوتر نەدەبوو لە کاردانەوەی یەکەمت.* کاتێک وەڵامت دایەوە، ئیدی بەرگری بکە لەو هێزەی وا ئاراستەی کردوویت، کە وا ڕای هێناویت.

بۆ ئەوەی دڵنیا بیت، کە بەڵێ تۆ تاکێکیت، نەک تەنها بانگەشەی ئەوە بکەیت، ئەم ڕێنماییانە بەدرێژایی ئەم کتێبە و هەروەها لە ژیانی ڕۆژانەی خۆشتدا بەکار بهێنە.

# ڕاهێنانەکان

*تێبینی: یەکێک لە باشترین ڕێگەکانی گەشەکردنی توانای بیرکردنەوە (و نووسین)، بریتییە لە تۆمارکردنی وردبوونەوە و پرسیار و ئایدیاکانت لە دەفتەرێکدا، دواتر بەپێی هەبوونی کات، بۆ کاردانەوە و بیرکردنەوە لەوەی تۆمارت کردووە _ مانا و کاریگەرییەکانی وردبوونەوەکەت لە بەرچاو بگرە، وەلامی پرسیارەکانت بدەرەوە، ئایدیاکانت تەفسیر بکە، (و لە هەرشوێنێکدا کە گونجاو بوو، ڕووبەڕوویان ببەرەوە)، دواجار تێگەیشتنەکانت بنووسەرەوە. لە دەفتەرێکی گەورەدا دەتوانی ئەم کارە بکەیت. ڕێگەیەکی باش بۆ تۆمارکردنی وردبوونەوە و پرسیار و ئایدیا سەرەتاییەکانت ئەوەیە، لەلای ڕاست بینووسیت و لای چەپ بەجێ بهێڵیت بۆ شیرکردنەوە و سەرنجەکانی دواترت. گرنگیی ئەم پرۆسەی کاردانەوەیە ئەوەندە زۆرە، کە تەنانەت ئەگەر مامۆستاکانیش ئیجباریان نەکرد، ئەوا پێویستە خۆت بەردەوام ئەم دەفتەرەت لەگەڵدا بێت و بەکاری بهێنیت.*

١. لێکۆڵینەوەیەکی کورت بکە لەسەر گۆڕانی تەرکیز، attention shifts وەک ئەوەی لەم چاپتەرەدا پێشان درا. بە هۆی ئامێری VCR {ئامێری تۆمارکردن لە تەلڤزیۆنەوە بۆ سەر کاسێت} ماوەی نیوکاتژمێر، لە بەرنامەیەک تۆمار بکە. پاشان دوو جار کاسێتەکە لێبدەرەوە، جاری

یەکەم ژمارەی گۆرانەکان بەبێ ڕیکلامە بازرگانییەکان تۆمار بکە، جاری دووەمیش تەنها گۆرانی ناو ڕیکلامەکان تۆمار بکە. کردارە بیرکارییەکەی ئەنجام بدە و ئامادە بە لە پۆلدا بیخەیتە ڕوو.
٢. بیر لە دۆزینەوەکانی خاڵی یەکەمی ڕاهێنانەکە بکەرەوە. چەند پارەگرافێک لەسەر کاریگەرییەکانی ئەو دۆزینەوانە لەسەر بوارەکانی پەروەردە، بزنز، ژیانی خێزان بنووسە.

٣. تەسەوری ئەوە بکە، کە ئەمەریکا چەند جیاواز دەبوو ئەگەر بهاتایە لە ماوەی ئەم ٣٠ ساڵەی ڕابردوودا جەختکردنەوە و گرنگیپێدانەکە بە پلەی یەکەم لەسەر پێداگرییەکەی فرانکل بووایە دەربارەی خودباڵایی (و بەرپرسیارێتیی کەسی)، وەک لە پێداگرییەکی مۆسلۆ لەسەر خودتەحقیقکرن و پێداگری کولتووری لەسەر شانازیبەخۆوەکردن، ڕێزلەخۆنان self esstem. لیستێک لەو جیاوازییانەی تۆ لە کۆمەڵگەکەماندا {مەبەست کۆمەڵگەی ئەمەریکییە} هەستت پێ دەکرد، بنووسە و سەرنج لەسەر هەریەکەیان بدە، کە ئایا سوودبەخش دەبوو یان زیانبەخش. ئامادە بە تا لە پۆلدا بتوانی گوزارشت لە گۆشەنیگاکانی خۆت بکەیت.

٤. سەیری یەکێک لە کەناڵەکانی گۆرانی بکە _ MTV,VHI,CMT,BET _ بە لایەنی کەمەوە بۆ ماوەی کاتژمێرێک. چۆنێتیی دەرکەوتنی ژن و پیاوەکان لە گۆرانییەکاندا شی بکەرەوە. زانیارییە گرنگەکان لای خۆت تۆمار بکە. بۆ نموونە سەرنج بدە، بزانە ئایا پیاوان زیاتر لە ژنان لە مەوقیعی دەسەڵاتدا پیشان دراون، ئایا ژنان وەک بابەتێک بۆ چێژی پیاوان خراونەتە ڕوو. بڕیار بدە ئاخۆ چ جۆرە هەڵسوکەوت و بەهایەک دەخرێنە ڕوو. (ڕەنگە حەز بکەیت گۆرانییەکان لای خۆت تۆمار بکەیت، تا دووبارە سەیری بکەیتەوە، بەشە گرنگەکان بوەستێنی، تا زیاتر لێی

ورد بیتەوە، لێوردبوونەوەکانت تۆمار بکە، تا بەکاری بهێنیتەوە لە گفتوگۆکانی پۆلدا.)

٥. وای دانێ ئەم پرسیارە لە هاورێکەت دەکەیت، "چۆن بوویتە خاوەنی شووناسی تایبەت بە خۆت _ هەستەکانت، شتە پەسەندکراوەکانت، هەڵسوکەوتەکانت؟" دواتر وای دانێ هاورێکەت دەڵێت، "من تاکێکم. هیچکەس کاریگەریی لەسەرم نەبووە. شتەکانی تایبەت بە خۆم دەکەم، هەروەها هەستەکان و شتە پەسەندکراوەکان و هەڵسوکەوتەکانی خۆم هەڵدەبژێرم، کە لەگەڵ کەسێتیی مندا دەگونجێن." ئەوەی لەم چاپتەرەدا فێر بوویت، چۆن بۆ هاورێکەتی باس دەکەیت؟

٦. ئەم پرسیارە لە خۆت بکە، من کێم؟ دە وەڵام لەسەر دە پارچە کاغەزی جیا بنووسە. سێ پارەگرافی یەکەمی ئەم چاپتەرە بەکار بهێنە، تا هاوکارت بکات لە دارشتنی وەڵامەکانت. وەڵامەکان بەپێی گرنگییان بۆ خۆت پۆلێن بکە. کام لەو پێناسانەی خۆت بە گرنگترین دەزنیت؟ بۆچی؟

٧. ئەو کاریگەرییە، هێزە نێگەتڤ و پۆزەتڤە جۆربەجۆرانە دەستنیشان بکە، کە رۆڵیان هەبووە لە دروستکردنی تۆدا. دڵنیا بە لەوەی کاریگەرییە تایبەتی و گشتییەکان و کاریگەرییە بچووک و گەورەکان هەر هەموویت ئەژمار کردووە. کام لەو هێزانە زۆرترین کاریگەریی لەسەرت جێ هێشتووە؟ چەندێک دەتوانی، ئەوەندە بەوردی کاریگەرییەکان شی بکەرەوە.

٨. کاردانەوەی دەستبەجێ، کتوپڕ بۆ هەریەک لەم گوزارانە تۆمار بکە. دواتر ئەو چوار رێنماییەی بۆ بەدەستهێنانی تاکێتی خراوەتە روو، لەم

چاپتەرەدا بەکار بهێنە.

A. کارمەندەکانی بواری خزمەتگوزاریی تەندروستی دەبێتە تێستی HIV\ AIDSیان بۆ بکرێت.

B. پێشبرکێی جوانی و بەهرەداری بۆ منداڵان دەبێت قەدەغە بکرێت.

C. گرووپە دەمارگیرەکانی وەکوو کو کلوکس کلان ku klux klan، دەبێت ڕێیان پێ بدرێت لە شوێنە گشتییەکاندا کۆبوونەوەی خۆیان ببەستن، یان بە شێوەکی ڕەسمی، ڕێیان پێ بدرێت لە شەقامەکانی شاردا نمایشی خۆیان بکەن.

D. کۆرسی بەهێزکرنی توانای نووسین دەبێت بۆ هەموو قوتابییەکان بێت، نەک تەنها بۆ فرێشمانەکان، واتە ئەو قوتابییانەی یەکەم ساڵیانە.

E. وەرزشکاران دەبێت تێستی ماددە وزەبەخشەکانیان بۆ بکرێت.

F. کریەیشنیزم {ئەو تیۆرەی دەڵێت خودا دروستکەری بوونە} دەبێت لە قۆناغی ئامادەییدا لە وانەی زیندەوەرزانیدا بخوێنرێت.

G. فرەژنی دەبێت بە یاسایی بکریت.

H. ساڵی یاسای دەنگدان، دەبێت کەم بکریەوە بۆ ١٦ ساڵی.

I. سیستەمی زیندانیکردن، دەبێت زیاتر جەخت بکاتەوە سەر زیندانیکردن ئەو تاوانبارانەی نەخۆشیی ئەقڵییان هەیە، وەک لە داخڵکردنیان لە سەنتەرەکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی.

J. دەبێت دکتۆرەکان و دەرمانسازەکان داوای ڕەزامەندیی دایک و باوک لەو گەنجانە بکەن، کە لەخوار تەمانی یاسایی سێکسکردنەوەوەن، داوای کڕینی ئامرازەکانی ڕێگری لە سکپڕی دەکەن.

K. شکۆی پیاوێک بەقورسی بریندار دەبێت، ئەگەر هاوسەرەکەی زیاتر لە ئەو پارە پەیدا بکات.

L. ژنان پێیان خۆشە پشت بە پیاوان ببەستن.

٩. ڕاهێنانی گفتوگۆ بە شێوەی گروپ: لەگەڵ یەک و هاوپۆلتدا گفتوگۆ

لەسەر هەندێک لە خاڵەکانی ڕاهێنانی ژمارە ٨ بکەن، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو چوار ڕێنماییەی لە سەرەوە بوون، بە تاک باس کران. خۆت ئامادە بکە بۆ ئەوەی ڕای گروپەکەت لەگەڵ گروپەکانی تری پۆلەکەدا ئاڵوگۆڕ بکەیت.

## ڕای جیاواز

ئەم پارەگرافەی خوارەوە، پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی یەکپۆشی لە قوتابخانەکاندا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە ماقولییەتی تێدایە، *کە لە زۆربەری حاڵەتەکانیشدا هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرامبەر کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

**ئایا دەبێت سیستەمی یەکپۆشی بەسەر قوتابخانە حکومییەکاندا بسەپێنرێت؟**

ژمارەیەکی بەرچاو لە قوتابخانە حکومەییەکان بڕیاریان داوە پەیڕەوی لە سیستەمی یەکپۆشی بکەن. بەڕێوبەرانی قوتابخانەکان هۆی

ئـەم بڕیـارە دەگەڕێننـەوە بـۆ ئـەوەی کـە یەکپۆشـی کۆمەڵێـک سـوودی هەیـە، لەوانـە، تەرکیـزی قوتابییـەکان ئەهێنێتـەوە سـەر خوێنـدن، دووریـان دەخاتـەوە لـە خەمـی بەردەوامیـی مۆدێـل. هەروەهـا یەکپۆشـی دیـاردەی گروپگروپینـە ناهێڵێت لـە قوتابخانەکاندا، کە هەریەکەیان جلێکی تایبەت بـە خۆیـان دەپۆشـن. هـەر بۆیـە زۆر لـە دایـک و بـاوکان بڕیارەکەیـان پەسـەند کـرد. بـەلام هەندێکـی تریـان وەک پێشـێلکردنی مافـی خۆیـان و منداڵەکانیـان سـەیری دەکـەن و دژی ئـەم بڕیـارە دەوەسـتنەوە.

## چاپتەری دووەم

# بیرکردنەوەی ڕەخنەیی چییە؟

کاتێک ئارسەر Arthur لە قۆناغی یەکەم بوو، مامۆستاکەیان داوای لێ کردن "بیر بکەنەوە." "دەی قوتابیان،" ئەو وتی، "ئەزانم ئەم ڕاهێنانە کەمێک گرانترە لەوانەی تا ئێستا کردوومانە، هەر بۆیە من چەند خولەکێکی زیاترتان ئەدەمێ، بۆ ئەوەی بیری تیا بکەنەوە. ئێستاش دەست بکەن بە بیرکردنەوە."

ئەوە یەکەم جار نەبوو ئارسەر ئەو وشەیەی بیستبێت. ئەو زۆر جار ئەو وشەیەی لە ماڵەوە بیستبوو، بەڵام هەرگیز بەم شێوەیە نا. وا دیار بوو مامۆستا داوای جۆرێکی تایبەتی ڕاهێنانی کردبێت. شتێک، کە دەبوو ئەو بزانێت چۆن دەست پێ دەکا و تەواو دەبێت، وەکوو سەیارەکەی باوکی.

"ڤڤنن-نن،" لەبەر خۆیەوە بۆڵانی. لەبەر ئەوەی خەیاڵی ڕۆشتبوو، ئارسەر ئاگای لەو بۆڵەبۆڵە نەبوو، کە ئەیکرد. مامۆستاکەی پێی وت، "ئارسەر، تکایە دەنگەدەنگ مەکە و دەست بکە بە بیرکردنەوە."

سوور بۆوە و نەیئەزانی دەبێ بەتەواوەتی چی بکات، سەری شۆڕ کردەوە بۆ سەر مێزەکەی. پاشان بە تیلەچاو سەرنجی لەو کچە بچووکەی تەنیشتی دا، کە لە بنمیچەکە ورد ئەبۆوە. "لەوانەیە بەم ڕێگەیە دەست

بکەیت بە بیرکردنەوە،" ئارسەر بە خۆی وت. وای بۆ چوو، کە لەوانەیە ئەوانی تر پارساڵ فێر بوو بێتن چۆن بیر بکەنەوە، ئەوکات کە ئەو بە هۆی سوورێژەوە لە ماڵەوە بوو. بۆیە ئەویش چاوی بڕییە بنمیچەکە.

کاتێک ئارسەر بە قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیدا تێپەڕی، سەدان جاری تر هەمان فەرمان {بیر بکەرەوە}ی ئەبیست. "نا، ئەوە وەڵامەکە نییە، تۆ بیر ناکەیتەوە، دەی ئێستا بیر بکەرەوە!"

"هەندێک جار گوێی لەو مامۆستایانە ئەبوو، کە بەزەییان بە خۆیاندا ئەهاتەوە و لەبەر خۆیانەوە بە دەنگێکی بەرز دەیانگوت، "من چیم کردووە تا شیاوی ئەمە بم؟ باشە مامۆستاکان لە قۆناغەکانی پێشتردا هیچیان فێر نەکردون؟ ئێوە ئەی خەڵکینە، ئایدیاکانتان بەلاوە گرنگ نییە؟ بیر بکەنەوە، نەفرەت، بیر بکەنەوە."

بۆیە ئارسەر هەستی بە جۆرێک لە تاوان کرد بەرامبەر بە سەرلەبەری فەرمانەکە {ڕاهێنانەکە}. ئاشکرا بوو، ئەم بیرکردنەوەیە ڕاهێنانێکی گرنگ بوو، ئەمیش سەرکەوتوو نابێت لە بەئەنجامگەیاندنیدا. ڕەنگە ئەو توانای ئەقڵیی کەم بێت. بەڵام تا ڕادەی پێویستیش بەتوانا بوو. سەیری قوتابییەکانی تری دەکرد و ئەوەی دەکرد، کە ئەوانی تر دەیانکرد. هەرکاتێک مامۆستا دەستی پێ ئەکردەوە، لەبارەی بیرکردنەوەوە، ئەم لۆچ ئەکەوتە دەموچاویەوە، بڕۆی ئەهێنایەوە یەک، سەری دەخوراند {بە هەموو توانایەوە بیری لێ دەکردەوە}، دەستی دەهێنا بە چەناگەیدا، چاوی دەبڕییە سەقفەکە، بە بێدەنگی بە خۆی دەگوت، "دەی، با بزانین، من دەبێ بیری لێ بکەمەوە، بیر بکەرەوە، بیر بکەرەوە (خۆزگە مامۆستا ناوی نەدەهێنام)، بیر بکرەوە." هەرچەندە ئارسەر نەیدەزانی بیر بکاتەوە، بەڵام قوتابییەکانی تریش ڕێک ئەوەیان بە خۆیان دەگوت.

ڕەنگە ئەزموونی تۆش هاوشێوەی ئەوەی ئارسەر بێت. بە مانایەکی تر، ڕەنگە زۆر کەس داوایان لێ کردبێتیت بیر بکەیتەوە، بەبێ ئەوەی هەرگیز ڕوونیان کردبێتەوە، کە مەبەستیان چییە لە بیرکردنەوە، ئەو تایبەتمەندییانەش چییە، کە بیرکەرەوەی باش خاوەنیانە و بیرکەرەوەی خراپ بێبەرییە لێیان. ئەگەر ئەمە دۆخەکە بێت، کەواتە تۆ هاوەڵت زۆرە. مەشقکردنێکی چالاک و چڕوپڕ لە بیکردنەوەدا هەڵاودێرە، پتر لەوەی شتێکی باو بێت. ئەم ڕاستییە و دەرئەنجامە نەویستراوەکانی گوزارشتی لێ کراوە، لە ڕێی ئەم تێبینییانەی چاودێرە بەهرەمەندەکانی بارودۆخی مرۆڤایەتییەوە:

سەرنجڕاکێشترین و سەیرترین ناکۆکی لە ژیاندا بۆ من، بریتییە لەو پێداگرتنەی زۆرینەی خەڵک لەسەر "لۆژیک، " "لێکدانەوەوی لۆژیکیی، " "ژیربوون" (sound reasoning)، لە لایەک و لە لایەکی تریش، بێتواناییانە لە جێبەجێکردنیان، هەروەها حەزنەکردنە بە قبوڵکردنیان، کاتێک ئەوانی تر جێبەجێیان دەکەن."

زۆربەی ئەوەی پێی دەڵێن لێکدانەوەی ئەقڵی، بریتییە لە دۆزینەوەی ئارگۆمێنت بۆ درێژکردنەوەی قەناعەتمان بەوەی دەیکەین.

بیرکردنەوەی بێخەوش (clear thinking ) شتێکیی زۆر دەگمەنە، بگرە تەنانەت بیرکردنەوەی سادەش plain thinking دەگمەنە. زۆر لە ئێمە، زۆربەی کات بە هیچ شێوەیەک بیر ناکەینەوە. ئێمە بڕوا دێنین و هەست دەکەین، بەڵام بیر ناکەینەوە.

تەمەڵیی ئەقڵی یەکێکە لە دیارترین سیفەتەکانی مرۆڤ.

ئەو چالاکییە چییە، کە هەموو کەس دەڵێن گرنگە و بەلام کەم کەس پێی هەڵدەستن؟ بیرکردنەوە چەمکێکی بەرفراوانە و زۆر چالاکی هەر لە خەیاڵپڵاوییەوە بۆ بیرکردنەوەی قووڵ و شیکارکردن دەگرێتە خۆ. ئەمانە تەنها هەندێک هاوماناکانی بیرکردنەوەن، کە لە فەرهنگی هاومانای ڕۆگێت (Roget’s thesaurus) بۆ بیرکردنەوە ڕیز کراون:

پێزانین (هەستپێکردن)
باوەڕکردن
بیرکردنەوە (مێشکبەکارهێنان) cerebrate
لێکۆڵینەوە cogitate
ئەندێشەکردن conceive
لێوردبوونەوە consider
ڕاوێژپێکردن consult
بەوردی-سەیرکردن contemplate
تێڕامان-بەوردی deliberate
تێگەیشتن digest
گفتوگۆکردن discuss
خەونبینین؟
خەیاڵ-چاو fancy
وێناکردن imagine
هێمنبوونەوە meditate
داڵغەلێدان muse
هەڵسەنگاندن ponder
درککردن realize

هۆش reason
کاردانەوە reflect
بیرلێکردنەوە بۆ ماوەیەکی درێژ ruminate
خەملاندن speculate
گریمانەکردن suppose
ڕەچاوکردن weigh

هەموو ئەوانە تەنها *ناون*، کە بیرکردنەوە بە هۆیانەوە دەشاردرێتەوە، لە ڕاستیدا ئەوان ناتوانن گوزارشت لە بیرکردنەوە بکەن. ڕاستییەکە ئەمەیە، دوای هەزاران ساڵ لە ئەزموونی مرۆڤ و بیرکردنەوە و لێدوان و نووسین دەربارەی بیرکردنەوە، ئەو {واتە بیرکردنەوە} وەکوو یەکێک لە گەورەترین نهێنییەکانی بوونی ئێمە دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا زۆر شت ماوە فێری بین دەربارەی بیرکردنەوە، بەڵام هەنووکە بڕێکی باشیش زانراوە.

## ڕۆح، مێشك یان هەردووکیان؟

لێکۆڵەرەوە پۆست-مۆدرێنەکان وشەی *ڕۆح mind* وەک هاوواتای مێشک *brain* بەکار دەهێنن، وەکوو ئەوەی ئەو ئەندامە مادییەی لە کەللەسەری مرۆڤدایە، تەنها بەرپرسیار بێت لە بیرکردنەوە. ئەم بەکارهێنانە {هاوواتاکردنی ڕۆح و مێشک _ و} بە شێوەیەکی ڕێژەیی گریمانەی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە دەکات (کێشەی نێوان ڕۆح و ماددە) کە هەزاران ساڵە بیرمەندەکانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، ئیدی هیچکەس ئاوڕی لێ نەدایەوە. بەڵام کێشەکە خۆی و ئەو کەسانەشی ژیانیان بە زۆرانبازیکردن لەگەڵیدا تێپەڕاندووە، شیاوی ئاوڕدانەوەیەکی باشترن.

نیورۆسـایـنس neuroscience {زانسـتی لێکۆڵینـەوەی هەسـتـەدەمار} ژمارەیـەک لـە تێگەیشـتنی مانـاداری فەراهـەم کـردووە دەربـارەی چالاکییـە لێکۆڵینـەوەکان یان بیکردنەوەکانـی مێشـک. ئەم زانسـتە ئەوەی سـەلماندووە، کـە نیوەگـۆی لای چەپـی مێشـک بـە شـێوەیەکی سـەرەکی بەرپسـارە لـە پرۆسـەی فێربوونـی زمـان و شـیکردنەوەوە و بیرکردنـەوەی لۆجیکـی، بـەڵام نیوەگۆی لای ڕاسـت بـە شـێوەیەکی سـەرەکی بەرپرسـیارە لـە وێنـەی هەسـتی sensory image، ئینتیوشـن و بیرکردنـەوەی داهێنەرانـە. هەروەها ئـەم زانسـتە ئەوەشـی پیشـان داوە، کـە دەسـتـەیەک دەمـاری بچـووک هـەن، کە درێژ دەبنـەوە لەنێوان هـەردوو نیوەگۆکـەی مێشـکدا، کە پێیـان دەوترێت کۆرپـس کەلـوزم corps callosum، ئـەم دەسـتـەیە وا دەکات هـەردوو نیوەگۆکـەی مێشـک هەمەئاهەنگانـە بـە زنجیرەیـەک چالاکـی هەڵسـن.

ئـەو زانسـتە (نیرۆسـاینس) ئـەوەی سـەلماندووە، کـە مێشـک *بەناچاری* بـۆ بیرکردنەوەیـە، بـەڵام ئـەوەی پیشـان نـەداوە، کـە مێشـک بەتەنها *کافییە* بـۆ بیرکردنـەوە. لـە ڕاسـتیدا هەندێـک فەیلەسـوف بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن، کـە هەرگیـز ناتوانێـت ئـەوە پیشـان بـدات. ئـەوان داکۆکـی لـەوە دەکـەن، کـە ڕۆح و مێشـک بـە شـێوەیەک کـە شـیاوی سـەلماندنە، لـە یەکتـری جیـاوازن. لەبـەر ئـەوەی مێشـک بوونێکـی بەرجەسـتەیە و لـە مـاددە پێـک هاتـووە، هـەر بۆیەشـە قابیلـی دارزیـن و فەوتانـە، بـەڵام ڕۆح بوونێکـی میتافیزیکیانـەی هەیـە. ئەگـەر خانەکانـی مێشـک بـە هـۆی بەهێزتریـن مایکرۆسـکۆپەوە بپشـکنیت، تـۆ هەرگیـز ئایدیایـەک یـان چەمکێـک نابینیـت، بـۆ نموونـە، جوانـی، حکومـەت، یەکسـانی، یـان خۆشـەویستی، چونکـە ئایدیـا و چەمکـەکان مـاددە نیـن، هـەر بۆیـە هیـچ پێکهاتەیەکـی بەرجەسـتەیان نییـە. ئـەی باشـە ئـەم شـتە نامادییانـە لەکوێـدا نیشـتەجێن؟ لـە ڕۆحـی نامادیـدا.

فەیلەسوفی ئەمەریکیی کۆن، ولیام باریّت William Barrett ئەوەی بەدی کردووە، کە "مێژوو بە شێوەیەکی بنەڕەتی بریتییە لە موئامەرەی هۆشی مرۆڤ ( human consciousness )،" و "بەشی بنەڕەتیی مێژووی مرۆڤایەتی، بریتییە لە مێژوی ڕۆح." لە دیدی ئەودا، "یەکێک لە گەورەترین سوخرییەکانی ironies مێژووی مۆدرێن،" بریتییە لەو بێباکبوون و نکۆڵیکردنەی زانست بەرامبەر بە ڕۆح، ئەمە لە کاتێکدا بەشی هەرە زۆری زانست، قەرزاربارى ڕۆحە. هەر وەک خۆی دەڵێ، "منداڵ نکۆڵی لە باوانی دەکات."

ئارگۆمێنتکردن لەسەر ئەوەی کە ئایا ڕۆح بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە یان نا، تەنها کێشە نییە لەسەر ڕۆح، کە بەدرێژاییی سەدەکان بە شێوەیەکی گەرموگوڕانە بابەتی دیالۆگ وگفتوگۆ بووە. بەڵکوو یەکێک لەو کێشانەی کە گرنگییەکی تایبەتیان هەیە، ئەوەیە کە ئایا ڕۆح *ناچالاکە* *passive*تەختەڕەشێکی پاکە، "کە ئەزموون لە سەری دەنووسێ، هەر وەک جۆن لۆک ئاماژەی پێ کردووە، یان" *چالاکە* *active* و ئیمە لە ڕێیەوە مومارەسەی ئیرادەی ئازادیی خۆمان دەکەین، کە ج. و. لێبنیتز g. w. Leibnitz داکۆکی لێ کردووە. ئەم کتێبە لەسەر تێگەیشتنی دووەمیان بۆ ڕۆح نووسراوە.

## پێناسەکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی

سەرەتا بە جیاکردنەوەیەکی گرنگ لەنێوان بیرکردنەوە و هەستکردندا دەست پێ دەکەین. *من هەست دەکەم و من بیر دەکەمەوە*، هەندێک جار لەبری یەکتری بەکار دەهێنرێن. ئەم بەکارهێنانە بۆتە هۆی نارۆشنی. هەستکردن وەڵامێکی زاتییە، کە ڕەنگدانەوەی هەست و سۆز و ((emotion، سێنتیمێنتە sentiment {هەموو ئەو هەڵوێستانەی

لەسەر سۆز بنایات نراون}، یان ڕەنگدانەوەی ویستە desire. بە شێوەیەکی گشتی، بە شێوەیەکی کتوپڕ ڕوو دەدات، وەک لەوەی بە هۆی کردارێکی ئاگایانەی ئەقڵییەوە ڕوو بدات. ئێمە پێویست ناکات بە مێشکمان بڵێین تووڕە بە، کە سووکایەتیمان پێ دەکرێت، بترسە، کاتێک هەڕەشەمان لێ دەکرێت، یان بەزەییت بە منداڵدا بێتەوە، کاتێک وا لە برسا دەمرێت. نا، بەڵکوو هەستکردن بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی سەر هەڵدەدات.

هەستکردن بۆ ئاراستەکردنی ئاگاییمان (attention)، پێویستە بۆ لای ئەو کێشانەی کە دەبێ بیریان لێ بکەینەوە. هەروەها دەتوانێ ئەو گەرموگوڕی و ئامەدەگییە فەراهەم بکات، کە پێوستن بۆ تەواوکردنی مەشقە ئەقڵییە پڕکۆششەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەستکردن هەرگیز جێگرەوەیەکی گونجاو نییە بۆ بیرکردنەوە، لەبەر ئەوەی باش زانراوە کە جێی متمانە نییە.

هەندێک لە هەستەکان بەسوودن، شەرەفمەندانەن، تەنانەت باڵاشن، بەڵام ئەوانی تر وا نیین، ئەزموونی ژیانی ڕۆژانەش ئەوە پیشان دەدات. ئێمە زووزوو "هەست دەکەین حەزمان لە کردنی شتێکە،" کە زیانبەخشە بۆمان، بۆ نموونە، جگەرەکێشان، ڕاکشان لەژێر تیشکی خۆردا، بەبێ بەکارهێنانی کرێمی دژەخۆر، ئەوەی لە دڵماندایە، بە پرۆفیسۆر یان خاوەن کارەکەمانی بڵێن. یان خەرجکردنی پارەی قەرز لە کڕینی بلیتی یانسیبدا.

بەپێچەوانەوە، بیرکردنەوە پرۆسەیەکی ئەقڵییە، کە ئەنجام دەدرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەک، بڕیاڕدانێک، یان بۆ بەدەستهێنانی تێگەیشتن. لە کاتێکدا هەستکردن هیچ مەبەستێکی لەودیو گوزارشتکردن لە خۆیەوە نییە، بیرکردنەوە لەپشت خۆیەوە چاو دەبڕێ لە حیکمەت

و کردار. بەڵام ئەوە بەو مانایە نایەت، کە بیرکردنەوە بەڕەهایی ڕاستە و خاڵییە لە هەڵە. لە ڕاستیدا بەشێکی گەورەی ئەم کتێبە تەرخان کراوە بۆ خستنەڕووی هەڵەکانی بیرکردنەوە، هەروەها چۆنێتیی دوورکەوتنەوە لێیان. لەگەڵ هەموو کەموکوورییەکانیشیدا، بیرکردنەوە جێمتمانەترین ڕێبەرە بۆ کردار، کە ئێمەی مرۆڤ خاوەنی بین. بەکورتی، پەیوەندیی نێوان هەستکردن و بیر کردنەوە، بریتییە لە هەستەکان، دەبێت پێش ئەوەی متمانەیان پێ بکرێت، بپشکندرێن، بیرکردنەوەش هۆشمەندانەترین و بڕواپێکراوترین ڕێگەیە بۆ پشکنینی هەستەکان.

بە شێوەیەکی گشتی، دوو جۆر لە بیرکردنەوە هەیە: داهێنەرانە creative و ڕخنەییانە critical.

مەبەستی ئەم کتێبە جۆری دووەمیانە. جەوهەری بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، بریتییە لە *هەڵسەنگاندن*. لەبەر ئەوە، بیرکردنەوەی ڕەخنەیی دەکرێت پێناسە بکرێت بە پرۆسەیەک، کە بۆچوونەکان claims {ئەو بۆچوونانەی کە پشتئەستوور نەکراون بە بەڵگە و شوێنی هەڵوێستەن} و ئارگۆمینتەکان تێیدا دەپشکندرێن، هەروەها دیاریکردنی ئەوەی کامیان چاک و نایابە merit و کامیان نا. بە مانایەکی تر، بیرکردنەوەی ڕەخنەیی گەڕانە بۆ وەڵامەکان، گەڕانێکی دژوار و پرکۆشش. بەدڵنیاییەوە، یەکێک لە گرنگترین تەکنیکە بەکارهاتووەکان لە بیرکردنەوەی ڕخنەییدا، بریتییە لە کردنی *پرسیارە دروستەکان*. ئەوانەی کە خاوەن بیکردنەوەیەکی ڕەخنەیی نین، تێگەیشتنە سەرەتاییەکانی خۆیان و بۆچوونەکانی ئەوانی تر وەک شتێکی بەهادار قبوڵ دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا، بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان ڕووبەڕووی هەموو ئایدیاکان دەبنەوە، بەم شێوەیە:

| بۆچوون | پرسیار (هەڵسەنگاندن) **question** |
|---|---|
| پرۆفیسۆر ڤالی غەدری لێ کردووم لە هەڵسەنگاندی دارشتنەکەمدا. بایەخی زۆری داوە بە هەندێ برگە لەچاو ئەوانی تردا. | ئایا بە هامان پێوەر و ستاندارد دارشتنەکانی تریشی هەڵسەنگاندووە؟ ئایا پاساو هێنراوەتەوە بۆ ئەو بایەخە زۆرەی دراوە بە هەندێ برگە. |
| پێش ئەوەی ژن لە دەرەوەی ماڵ ئیش بکات، رێژەی تەڵاق کەمتر بوو، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە شوێنی ژن ناو ماڵە، نەک دەرەوەی ماڵ. | تۆ چۆن دەیسەلمێنی کە ئەم هۆیە {ئیشکردنی ژن لە دەرەوەی ماڵ} نەک هۆی تر، بەرپرسیارە لە زیادبوونی رێژەی تەڵاق؟ |
| خوێندنی زانکۆ ئەوە ناهێنێ پارەی پێ بدەی. هەندێ کەس ئەو پارەیەی بە هۆی بڕوانامەوە بەدەستی دێنن، زیاتر نییە لەو پارەیەی بەبێ بڕوانامەش دەیانتوانی بەدەستی بێنن. | ئایا پارە تەنها پێوەرە بۆ هەڵسەنگاندی خوێندی زانکۆ؟ باشە ئەی زیادبوونی تێگەیشتن دەربارەی خود و ژیان، هەروەها زیادبوونی توانای مامەڵەکردن بەرامبەر گرفت و تەنکوچەڵەمەکان؟ |

بیرکردنەوەی رەخنەیی پرسیارەکان بەکار دەهێنێ بۆ شیکارکردنی کێشەکان issues، بۆ نموونە، با بابەتی بەها value لەبەرچاو بگرین. کاتێک گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، هەندێک کەس دەڵێن، "وڵاتەکەمان زۆر بەهای نەریتیی هەیە traditional values" و "تاوان، بەتایبەتی تاوانە توندوتیژەکان، کەمتر دەبوون، ئەگەر بێت و بهاتایە دایک و باوک و مامۆستاکان جەختیان لەسەر بەها رەوشتییەکان moral values بکردایە." بیرکردنەوەی رەخنەیی کۆمەکمان دەکات تا بپرسین:

١. پەیوەندیی نێوان بەهاکان و بڕواکان beliefs چییە؟ هەروەها پەیوەندیی

لەنێوان بەهاکان و تاوانکردندا conviction چییە؟
٢. ئایا هەموو بەهاکان بەهادارن؟
٣. کەسی ئاسایی تا چ ڕادەیەک بەئاگایە لە بەهاکانی؟ ئایا دەگونجی زۆر خەڵک خۆیان هەڵخەڵەتێنن دەربارەی بەها ڕاستەقینەکانیان؟
٤. بەهاکانی کەسێک لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ لە تاک خۆیەوە یان لە دەرەوە {واتە تاک خۆی بڕیار لەسەر بەهاداربوونی بەهایەک دەدات، یان هێزەکانی دەرەوەی تاک، بۆ نموونە، خێزان، ئاداب و تەقالید، دین، حیزب، ئەو بڕیارە لەبری تاک دەدەن}؟ ئایا سەرچاوەی بەهاکان بیرکردنەوەن یان هەست و سۆزن؟
٥. ئایا پەروەردەکردن education بەهاکانی کەسێک دەگۆڕێت؟ ئەگەر وایە، ئایا ئەم گۆڕانە هەمیشە بەرەو باشتربوونە؟
٦. ئایا دەبێت باوان (دایک و باوک) و مامۆستاکان هەوڵ بدەن بەهاکانی منداڵێک لەقاڵب بدەن؟

## تایبەتمەندییەکانی بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان

ژمارەیەک لە تێگەیشتنی هەڵە بوونیان هەیە لەسەر بیرکردنەوەی ڕەخنەیی. یەکێکیان ئەوەیە، کە توانای پشتگیریکردنی بیروڕاکان بە بەڵگە، هۆی ئەقڵیی reasons کەسێک دەکات بە بیرکەرەوەی ڕەخنەیی. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە لاوازیش بن، بەڵام بە نزیکەیی هەموو کەس خاوەن بەڵگە و هۆیە. ئیشی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی ئەوەیە، کە ئایا ئەم بەڵگە و هۆیانە چاک و کافین. {واتە ئەرکی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی تەنها هێنانەوەی بەڵگە و هۆ نییە بۆ بیروڕاکان، بەڵکوو هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگە و هۆیانەن، هەروەها چاوبڕینە لەوەی کە ئایا چاک و نایابن merit } هەڵەتێگەیشتنێکی تر ئەوەیە، کە بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان هەرگیز چاو لە یەکتری ناکەن لە بیرکردنەوە و بڕیارەکانیاندا. ئەگەر ئەمە حاڵەتەکە بێت، ئەوا هەرکەس

کە خاوەن بیرکردنەوە و ڕەفتارێکی سەیر بێت eccentric، دەبووە بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەیی. بیرکردنەوەی ڕەخنەیی واتە تەندروست بڕیار بدرێت، بێ گوێدانە ئەوەی چەندێک ئەم بڕیارانە باون.

هەڵەتێگەیشتنی سێیەم بریتییە لە هاوماناکردنی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی بە هەبوونی زۆرترین وەڵامی ڕاست لە مێشکی کەسێکدا. بەدڵنیاییەوە، گرفتێک لە هەبوونی وەڵامە ڕاستەکاندا نییە. بەڵام بیرکردنەوەی ڕەخنەیی بە پرۆسەی دۆزینەوەی وەڵامە نەدۆزراوەکانەوە سەرقاڵە.

یەکێک لە هەڵەتێگەیشتنەکانی تر ئەوەیە، کە بیرکردنەوەی ڕەخنەیی ناتوانرێت فێر بکرێت، کەسێک یا ئەوەتا هەیەتی یان نییەتی. بەپێچەوانەوە، بیرکردنەوەی ڕەخنەیی مەسەلەی خووە. بێدەربەستترین و تەمەڵترین بیرکەرەوە بە دەستڕاگرتنی تایبەتمەندی و سیفەتەکانی بیرکەرەوەی ڕەخنەیی دەتوانێ ببێت بە بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەیی.

ئێمە لەپێش ئێستادا یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی بیرکەرەوەی ڕەخنەییمان بەدی کرد، ئەویش مەهارەتی کردنی پرسیارە دروستەکانە. تایبەتمەندییەکی تر، بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی چالاکییە ئەقڵییەکان.

جۆن دیوی تێبینیی ئەوەی کرد، کە زۆربەمان زۆرتر لەو کاتەی دەمانەوێ بەسەری بەرین لە "یاریکردن بە وێنە خەیاڵییەکان، یادکردنەوە هەڕەمەکییەکان، خەونە شیرینە بەڵام ناکامەکان، وێنە ڕاگوزەرەکانی زەین flitting، حەزلێکردنە کامڵنەبووەکان" {واتە زۆربەمان بێ ئەوەی ئاگادار بین، کاتێکی زۆر لەو چالاکییە زەینیەیانەدا بەسەر دەبەین}. بیرکەرەوە باشەکان نائاسایی نین. بەڵام، ئەوان چاکتر دەزانن لە بیکەرەوە

لاوازەکان {نارەخنەییەکان -و-} کە چۆن سنووریک بۆ ئەو خەیاڵە کاتی و نەستییانە دانێن، هەروەها چۆن ئەقڵیان لەسەر یەک بابەتی دیارکراو جێگیر بکەن و بە وریاییەوە لێی بکۆڵنەوە، هەروەها حوکمێکی لەسەر بدەن. بە مانایەکی تر، ئەوان {بیرکەرەوە رەخنەگرەکان} فێر بوون چۆن ببنە *بەرپرسی بیرکردنەوەکانی خۆیان*، کاتێک ئەقڵیان بە شێوەیەکی چالاکانە و actively ناچالاکانەش passively بەکار دەهێنن.

ئەمانەی خوارەوە هەندێکی ترن لە تایبەتمەندییەکانی بیرکەرەوە رەخنەگرەکان، کە بەراورد کراون بە تایبەتمەدییەکانی بیرکەرەوە نارەخنەگرەکان:

| بیرکەرەوە رەخنەگرەکان | بیرکەرەوە نارەخنەگرەکان |
| --- | --- |
| ئەوان لەگەڵ خۆیاندا راستگۆن، دان بەو شتانەدا دەنێن، کە نایزانن، سنوورداریی خۆیان دەناسنەوە و چاودێرن بەسەر هەڵەکانی خۆیانەوە. | ئەوان وا پیشان دەدەن کە زیاتر لەوە دەزانن، کە دەیزانن، سنووردارییی خۆیان ناناسنەوە، وای بۆ چوون حوکمەکانیان خاڵین لە هەڵە. |
| گرفتەکان و کێشە ئاڵۆزەکان وەک رووبەرووبوونەوەیەکی خۆش دادەنێن. | گرفتەکان و کێشە ئاڵۆزەکان وەک پەستکەر و هەرەشە دادەنێن بۆ سەر خۆپەسەندییان ego. |
| لەخۆبووردووانە هەوڵ دەدەن بۆ تێگەیشتن، حەزی زانین بەزیندوویی دەهێڵنەوە، بەئارامی دەمێننەوە لەگەڵ ئاڵۆزییەکاندا و ئامادەن کات تەرخان بکەن تا زاڵ بن بەسەر شڵەژان و راراییدا. | نائارام و بێسەبرن لەگەڵ ئاڵۆزییەکاندا، هەر بۆیە زیاتر بە شڵەژاوی و دەستەپاچەیی دەمیننەوە، وەک لەوەی هەوڵ بدەن تێبگەن. |

حوکمەکانیان بەرمەبنای بەڵگەن
نەک پەسەندکردنی شەخسی،
حوکمەکانیان دوا دەخەن، هەرکاتێک
بەڵگەکان وەک پێوست نەبوون.
بە حوکمەکانیاندا دەچنەوە کاتێک
بەڵگەیەکی نوێ هەڵەیەکی دەر خست.

حوکمەکانیان بەرمەبنای یەکەم
بەریەککەوتن first impression و
کاردانەوەی نائەقڵانین. gut reaction
ئەوان لە خەمی بڕ یان چۆنێتیی
بەڵگەکانیدا نین. ئەوان بەردەوام
لەسەر بۆچوونەکانیان کڕ کەوتوون.

ئەوان گرنگی بە ئایدیای ئەوانی
تر دەدەن، بۆیە بە تەشویقەوە
دەیانخوێننەوە و گوێیان لێ دەگرن،
تەنانەت ئەگەر ناکۆکیش بن لەگەڵیاندا.

ئەوان پێشوەخت لەلایەن خۆیان
و بۆچوونەکانیانەوە داگیر
کراون preoccupied، هەر بۆیە
ئارەزوویەکیان نییە تا بزانن ئەوانی
دیکە چۆن بیر دەکەنەوە. هەر لەگەڵ
یەکەم هێمای ناکۆکبووندا بە خۆیان
دەڵێن، "ئەمە چۆن ڕەت بکەمەوە."

دەزانن بۆچوونی دەمارگیرانە
viewsextreme (و کۆنەپەرستانە
conservative و ئازادانە liberal)
بەدەگمەن ڕاستن، هەر بۆیە لێیان
دوور دەکەونەوە، بابەتین (-fair
mindedness و بەدوای تێگەیشتنێکی
هاوسەنگدا دەگەڕێن.

پێویستیی هاوسانگی لەبەرچاو ناگرن
و دەبنە لایەنگری ئەو بۆچوونانەی
پشتگیریی بۆچوونە چەسپیوەکەیانیان
دەکەن.

هەستەکانیان سنووردار و
کۆنترۆڵ دەکەن، نەک هەستەکان
ئەمان کۆترۆل بکەن و بیر دەکەنەوە
پێش کردارنواندن.

هەستەکان کۆنترۆڵیان دەکەن و
هەڕەمەکی و بێ بیرکردنەوە کردار
دەنوێنن.

لـە باشـترین حالّەتـدا، بیرکردنـەوەی ڕەخنەیـی پشـت دەبەسـتی بـە دیسـیپلینی {پێودانگـی} ئەقلّـی. بیرکـەرەوە چالاکـەکان مەشـق دەکـەن تـا ژیانـی ئەقلّییـان کۆنتـرۆڵ بکـەن، بیرکردنەوەکانیـان thoughts ئاراسـتە دەکـەن، نـەک ئـەوەی ئاراسـتە بکریـن لەلایـەن ئەوانـەوە. هیـچ ئایدیایـەک ناخەنـە ڕوو _ تەنانـەت ئەوانـەی خۆشـیان _ تـا نەیپشـکنن و لێـی دڵنیـا نەبن. جۆن دیوی john Dewey ئەم دیسپلینە ئەقلّییەی یەکسـان کـردووە بـە ئـازادی. ئـەو ئارگومێنتـی ئـەوە سـەرڕێ دەخـات، کـە ئـەو خەڵکـەی بێبەریـن لـەم دیسـپلینە، کەسـی ئـازاد نیـن، بەڵکـوو کۆیلـەن:

ئەگەر کردەوەکانی مرۆڤ ڕێنومایی نەکران لەلایەن دەرەئەنجامێکی بیرلێکراوەوە thoughtful conclusions، کەواتـە ڕێنومایـی دەکریـن لەلایـەن پاڵنەرێکـی نەپشـکندراوەوە inconsiderable impulse، حەزێکـی زیاد لـە پێویسـت unbalanced appetite، حەزێکی کتوپڕ و گەمژانـە، یان بارودۆخـی هەنووکە. هاندانـی کارێکـی نامۆی بێبەربەسـت و بیرلێنەکراوە، بـڕی پێدانـی کۆیلایەتییـە، چونکـە کەسـەکە لـە ئاسـت شـەهوەت و حـەز و دۆخـی دەوروبەریـدا سـجن دەکات.

## ڕۆڵی لەخۆووەزانین The role of intuition

لەخۆوەزانیـن، حـدس بـە شـێوەیەکی گشـتی پێناسـە کـراوە بـە زانیـن یـان تێگەیشـتن لـە شـتێک بـە شـیوەیەکی کتوپـڕ و بەبـێ بەکارهێنانـی *بیرکردنـەوەی عەقلـی*. لـە ژیانـی ڕۆژانـەدا، شـتگەلێک ڕوو دەدەن کـە ئـەم پێناسـەیە پشتڕاسـت دەکەنـەوە. ڕەنگـە یەکـەم جـار بێـت کەسـێک ببینیـت، بـەلام یەکسـەر هەسـتت کـردووە دەبنـە دوو هاوڕێـی گیانییەگیانـی. یـان کاتێک کابـرای خـاوەن ئۆتۆمۆبیلەکە دەڵێت ئەمـە کوتـا نرخـە و لەمـە کەمتر بە هیچ شـێوەیەک نایفرۆشـم، تۆ هـەر کـە سـەیری چـاوت کـردووە، زانیوتـە

کابرا ڕاست ناکات. یان هەر لە یەکەم ڕۆژی کۆرسێکەوە، تۆ هەستت کردووە سەرکەوتوو نابیت لەو کۆرسەدا.

زۆر دۆزینەوەی گرنگ هەن لە مێژوودا، ڕەنگە بەم شێوەیە دۆزرابێتنەوە. بۆ نموونە، کیمیازانی ئەڵمانی، کیکلو ڕێک بەم شێوەیە کێشەیەکی کیمیاییی چارەسەر کرد. ڕۆژێکیان لەبەر ماندوویتی چاوی دەچێتە خەو و وێنەی مارێکی دێتە بەرچاو، کە قەپی کردووە بەکلکی خۆیدا. وێنەی ئەم مارە سەرەداوێکی گرنگ بوو بۆ کیکلو، تا بزانێت پێکهاتەی گەردەکانی بەنزین کۆمەڵێک گەردی ئەلقەیین، نەک بە شێوەی زنجی. شاعیری ئەڵمانی، گۆتە، بە هۆی خۆکوشتنی هاوڕێیەکی نزیکییەوە، بەرهەمێکی گەورە و دووروودرێژی نووسی، بەڵام کێشەی هەبوو لەسەر چۆنێتیی ڕێکخستنی کارەکەی، بەڵام لەناکاو، بێ ئەوەی خۆشی بزانێت چۆن، هەموو دێرەکانی نووسینەکەی ڕێک خست. جارێکیان نووسەری بەریتانی، سامویێل تەیلەر کۆلێرج، هەر کە لەخەو رابوو، ٣٠٠ دێڕی هۆنراوەیەکی درێژی، بە هەموو وردەکارییەکانیەوە لە خەیاڵدا بوو، هەر ئەوەندە مابوو خێرا بیانخاتە سەر کاغەز.

ئەم نموونانە ئەوە پیشان دەدەن، کە لەخۆوەزانین زۆر جیاوزە لە بیکردنەوەی ئەقڵانی و بەرمەبنای ئەو نییە. بەڵام پێش ئەوەی ئەم حوکمە قبوڵ بکەیت، چاوێک بەم فاکتانەی خوارەوەدا بخشێنە:

بەدەستخستن و دۆزینەوەی ئایدیای نوێ و گرنگەکان، لە ئەقڵە چالاک و ڕاهێنراوەکانەوە دێنە دەرەوە. لە ڕاستیدا مەحاڵە کەسێک بەتەواوەتی بێئاگا بێت لە کایەیەکدا و لە هەمان کاتدا خاوەن دۆزینەوەی گرنگ بێت لەو کایەیەدا. ئەگەر کیکلو وەستای مەجاری بووایە و گۆتە کتێبفرۆش

و تایلەر سەرتاش، ئایا ئەو داهێنانە گەورانەیان دەکرد، کە ناوبانگ و مێژووی بۆ تۆمار کردن.

هەندێک لەو شتانەی سەرچاوەکەیان لەخۆوەزانینە، دەشێت هەڵە بن. ئەو کەسەی بۆ یەکەم جارە قسەی لەگەڵ دەکەیت، دەشێت نەک ببێتە هاوڕێی گیانیبەگیانیت، بەڵکوو ببێتە کەسێک، کە تا مردن ڕقت لێی ببێتەوە. کابرای خاوەن ئۆتۆمۆبیل ڕەنگە یەک دینار کەمتر لەوە نەیفرۆشێت، کە وەکوو دوانرخ دای ناوە. هەروەها ئەو کۆرسەی لە سەرەتادا تیایدا خراپ بوویت، ڕەنگە لە کۆتاییدا یەکێک بێت لە باشترین قوتابییەکانی.

ئاسان نییە خۆمان هەڵسەنگاندنێکی گشتگیر بۆ لەخۆوەزانینەکانمان بکەین، چونکە لەم کاتەدا، ئێمە مەیلی ئەوە دەکەین ئەوانەیان لەبەرچاو نەگرین، کە ڕاست دەر نەچوون.

لێکۆڵەرەوەکان بەرمەبنای ئەو فاکتانەی ئاماژەمان پێ دان، دەڵێن لە خۆوەزانین هیچ نییە، جگە لە بەرهەمی بیرکردنەوە. ئەوان دەڵێن، ئەو کەسەی یەکەم جار بینیوتە، دواتر بوون بە هاوڕێ، حەتمەن شتێکت تێدا بینیوە، کە سەرنجت بۆ خۆی ڕابکێشێت، یان ئەو کاتەی کابرای فرۆشیار نرخە ناڕاستەکەی وتووە، تۆ شتێکت تێدا بینیوە، کە پێت بڵێت کابرا درۆ دەکات، بە هەمان شێوە بۆ نموونەکانی تریش. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا، تۆ بڕیارەکانت دەرئەنجامی بیرکردنەوەت بوون، بەڵام ئەوەندە بەخێرایی گەیشتوویت بە دەرئەنجامەکان، کە وات هەست کردووە ئەمە هەر لەخۆیەوە و بێ بیرکردنەوە هاتوون. لە حاڵەتی دۆزینەوە گرنگەکانیشدا، لێکۆڵەرەوان دەڵێن کاتێک کەسانێک زۆر بەقووڵی بیر لە شتێک دەکەنەوە،

ئەقڵی نائاگاییبیان چالاک دەبێت و لە بیرکرنەوە بەردەوام دەبێت، تەنانەت کاتێکیش ئەمان لە ئاستی ئاگاییدا بە شتی ترەوە سەرقاڵن. هەر بۆیە کە لەپڕ دەگەنە دۆزینەوەیەکی گرنگ، وا هەست دەکەن کە "لە ئاسمانەوە بۆیان دابەزیوە" بەڵام لە ڕاستیدا هیچ نییە، جگە لە میوانی درەنگهاتووی خودی بیرکردنەوە.

ئێستا پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا کام لەم دوو تێڕوانینە بۆ لەخۆوەزانین تێڕوانینی دروستە؟ ئایا لەخۆوەزانین سەربەخۆیە لە بیرکردنەوە، یاخود بەرهەمی بیرکردنەوەیە؟

## چالاکییە بنەڕەتییەکان لە بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا

چالاکییە بنەڕەتییەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی یەک لەدوای یەک بریتین لە لێکۆڵینەوە {لێوردبوونەوە}، لێکدانەوە {تەفسیر} و بڕیاردان {حوکومدان}. ئەم چارتەی خوارەوە پەیوەندیی هەر چالاکییەکیان بە دووانەکەی تریانەوە بە شێوەیەکی کورت پیشان دەدات:

| چالاکی | پێناسە | مەرجەکان |
|---|---|---|
| لێکۆڵینەوە | دۆزینەوەی بەڵگە، کە داتایە و بتوانی وەڵامی پرسیارە گرنگەکان لەسەر کێشەکە {بابەتەکە} بداتەوە. | بەڵگەکان دەبێت هەم پەیوەندیدار بن بە بابەتەکەوە، هەم لە بڕدا تەواو بن sufficient. |

| | | |
|---|---|---|
| لێکدانەوە | بڕیاردان لەسەر ئەوەی بەڵگەکان چی مانایەکیان هەیە. | لێکدانەوەی بەڵگەکان پێوستە مەعقولتر بێت لەو لێکدانەوانەی کە پێشتر بۆیان کراوە. |
| بڕیاردان | گەیشتنەدەرئەنجام لەسەر کێشەکە (بابەتەکە). | دەرئەنجامەکە بەناچاری دەبێت یەک بگرێتەوە لەگەڵ چێکی لۆژیکدا. |

وەک لە پێشتردا تێبینیمان کرد، بیرکەرەوە نابەرپرسەکان {نارەخنەییەکان} لەپێشدا دەرئەنجامەکانیان هەڵدەبژێرن، پاشان بەدوای بەڵگەدا دەگەڕێین، تا پاکانە ی هەڵبژاردنەکانیانی پێ بکەن. ئەوان بێئاگان لەوەی تەنها دەرئەنجامێک کە شیاوی پێگەیشتن بێت، ئەو دەرئەنجامەیە کە لە ڕێگەی تێگەیشتن لە گرفتەکە یان کێشەکە و تەنها چارەسەر یان چارەسەرە ڕێتێچووەکانەوە بەدەست هاتووە. ئایا قەبلاندن {تخمین} و خەیاڵکردن و گریمانەدانان hypotheses باش و قبوڵکراون؟ بەدڵنیاییەوە ئەوانە چالاکیی بەسوودن. ئەو چالاکییانە زەمینەیەکی لەبار فەراهەم دەکەن بۆ هەنگاوە سەرەتاییەکانی پرۆسەی بیرکردنەوە. (دیارە ئێمە چەندێکیش هەوڵ بەین تا پێیان هەڵنەسین، ئەوا هەر ناتوانین). لەگەڵ ئەوەشدا، خاڵی جەوهەری و زۆر گرنگ ئەوەیە، کە ڕێ نەدەین قەبلاندن و گریمانەکان بیرکردنەوەمان چەواشە بکەن و هەر لە سەرەتاوە دەرئەنجامەکانمانی پێ دیاری بکەن.

## بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و نووسین

نووسین دەشێت بەکار بهێنرێت بۆ یەکێک لەم دوو مەبەستە سەرەکییە: بۆ دۆزینەوەی ئایدیاکان یان بۆ گوزارشتکردن {گەیاندنی} ئایدیاکان.

گومانی تێدا نییە کە زۆربەی ئەو نووسینانەی لە قوتابخانە نووسیوتن، لە جۆری دووەمیان بووە. بەڵام ئەوەی پێشووتریان، دەشێت زۆر بەسوود بێت، نەک تەنها بۆ ڕێکخستن و پۆلێنکردنی ئەو ئایدیایانەی کە هەنووکە بەرهەمت هێناون {لات گەڵاڵە بوون} بەڵکوو وەکوو بزوێنەرێکیش، تا ئایدیای نوێش هاژە بکەن {واتە دەشێت لە کاتی نووسینەوەی ئەو ئایدیایانەی لامان گەڵاڵە بوون، بیرۆکەی نوێش لەدایک ببن، بە مانایەکی تر، نووسین هەم گوزارشتکەری ئایدیاکان و هەم بەرهەمهێنەریشیانە}. لەبەر هەندێک هۆ، نووسینەوەی تەنها ئایدیایەکیش، ڕەنگە ئایدیای تر بەرهەم بهێنێت.

هەرکاتێک دەستت کرد بە نووسین تا ئایدیاکان بدۆزیتەوە، سەرنج بخەرە سەر ئەو بابەتەی لێی ئەکۆڵیتەوە و هەموو بیرۆکە و پرسیار و گوزارە جەختلەسەرکراوەکان تۆمار بکە. گوێ مەدە ڕێکخستن و ڕاستکردنەوەیان. ئەگەر بیرۆکەکان {ئایدیاکان} خاو هاتن، پشوودرێژ بە. ئەگەریش لەپڕ و بەلێشاو هاتن، هەوڵ مەدە خاویان بکەیتەوە، هەوڵ مەدە هەریەکەیان بەدووروودرێژی بنووسیت، بەڵکوو بەسادەیی سەرەقەڵەمیان لەسەر بنووسە. (دواتر کات ئەبێت بۆ ڕوونکردنەوە و ڕێکخستنیان). بیرکردنەوەی مێشکت ئاراستە بکە، بەڵام بەهەندیش ئەو ئایدیانە وەر بگرە، کە لە کەناری ئاگاییدان. هەندێک جار ئەوانیش بیرۆکەی بەنرخ دەسەلمێنن.

ئەگەر تۆ سەرکەوتووانە نووسینی دۆزەرەوەت discovery writing بەئەنجام گەیاندن و ڕەخنەییانە بیرت لە ئایدیا بەرهەمهاتووەکانت کردەوە، ئەوا نووسین بۆ گوزارشتکردن و گەیاندن زۆر ئاسانترە، چێژبەخشتر دەبێت. دواتر تۆ زۆر ئایدیای ترت دەبێت _ بە وریاییەوە هەڵیان بسەنگێنە _ گەشەیان پێ بە و ڕێکیان بخە.

## بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و گفتوگۆکردن

لە باشترین حاڵەتدا، گفتوگۆکردن پشت دەبەستێت بە تێگەیشتن و هەوڵدان بۆ چارەسەری کێشەیەک و گەیشتنە بڕیارێک. لە خراپترین حاڵەتیدا، دەبێتە هۆی پەستی و توڕەبوون، دەرئەنجامی ئەمەش کێشە گرنگەکان بە چارەسەرنەکراوی جێ دەهێڵدرێن. بەداخەوە، زاڵترین مۆدیلی گفتوگۆکردن لە کولتووری هاوچەرخدا (ڕادیۆ، دیالۆگەکانی تەلەڤزیۆن) زۆر جار لە جۆری دووەمیانە.

زۆر لە پێشکەشکاری بەرنامەکان پێداگری لە میواناکانیان دەکەن، تا وەڵامی پرسیارە ئاڵۆزەکان بە "بەڵێ" یان "نەخێر" بدەنەوە. ئەگەر میوانەکان بەم شێوەیە وەڵامیان دایەوە، تۆمەتبار دەکرێن بە سادەگۆیی. ئەگەریش لەجیاتی ئەوە هەوڵیان دا وەڵامێکی هاوسەنگ و بەویژدانی {بابەتی} پرسیارەکان بدەنەوە، پێشکەشکارەکە هاوار دەکات "ئێوە وەڵامی پرسیارەکان نادەنەوە" ئیدی خۆی وەڵامیان دەداتەوە. ئەو میوانانەی ڕازی دەبن بە ستراتیژیی پێشکەشکارەکە، بە گەرمی و ڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، ئەوانی تریش پەراوێز دەخرێن و بە بێئاگا دەدرێنە قەڵەم. زۆر جاریش میوانەکان لە گەرمەی قسەکردندان، قسە بە یەکتری ئەبڕن، هاوار دەکەن "ڕێم بدە تەواوی بکەم." هیچ کامیان مەیلی ئەوەی نییە لەوی ترەوە شتێک فێر بێت. کە بەرنامەکەش بەرەو کۆتایی دەڕوات، پێشکەشکارەکە سوپاسی بەشداربوونیان دەکات بۆ ئەم "دیبەیتە {گفتوگۆ} گەرموگوڕە،" بەڵێنیش بە بینەران دەدات، کە چاوەڕێی بەرنامەی گەرموگوڕتر بن لە زنجیرەی داهاتوودا.

ئەمانەی خوارەوە هەندێک ڕێنماییی سادەن، بۆ ئەوەی ئەو گفتوگۆیانەی کە تۆ لە پۆلدا، لەسەر ئیش، یان لە ماڵەوە دەیانکەیت، زیاتر شارشتانیتر و ماناداراتر و بەرهەمدار تر بن، لەو گفتوگۆیانەی دەیانبینیت لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆنەوە. بە ڕەچاوکردنی ئەم ڕێنماییانە، تۆ دەبیتە نموونەیەکی چاک بۆ کەسانی دەوروبەر.

## هەرکاتێك کرا، لەپێشدا ئامادە بە:

ناتوانیت لەپێشدا خۆت بۆ هەموو گفتوگۆیەک ئامادە بکەیت. بەڵام بۆ زۆربەیان دەتوانیت. ئەگەر بە هۆی کارەکەتەوە بەشدار بیت لە کۆبوونەوەیەکی بازرگانیدا، ئەوا ئەجێندای کۆبوونەوەکە چەند ڕۆژێک پێش ئەجامدانی کۆبوونەوەکە بڵاو دەکرێتەوە. ئەگەر قوتابی بیت لە زانکۆ، بە هۆی جەدۆلەوە بەدڵنیاییەوە دەتوانی بزانیت لە ڕۆژانی داهاتوودا بابەتی قسەلەسەرکردن چی دەبی لە پۆلەکاندا. ئەو زانیارییانە بەکار بهێنە، تا پێشوەخت خۆت بۆ گفتوگۆکان ئامادە بکەیت. سەرتا بزانە تا چ ڕادەیەک زانیاریت لەسەر ئەو باباتانە هەیە. پاشان بزانە بە چ ڕێگەیەک دەتوانی مەعریفەی خۆت لەسەریان فراوان بکەیت، کاتیش بۆ ئەم خۆدەوڵەماندکردنە تەرخان بک. (بە پانزە-بیست خولەکێک گەڕانی جیدی لە ئینتەرنێتدا دەتوانرێت بڕێکی گرنگ لە زانیاری، بە نزیکەیی، لەسەر هەر بابەتێک بەدەست بهێنرێت). لە کۆتاییدا، هەوڵ بدە ئەندێشەی ئەو گۆشەنیگا جیاوازانە بکە، کە ڕەنگە بخرێنە ڕوو لە گفتوگۆکاندا و بەهای ڕێژەییی هەریەکەیان لەبەرچاو بگرە. دەرئەنجامەکانت بە کراوەیی بهێڵەرەوە، تا بتوانی بە ڕووی ئەو فاکت و {ڕاستی} لێکدانەوانەی ئەوانی تر گوزارشتی لێ دەکەن، کراوە بێت.

## چاوەڕوانیی ژیرانەت هەبێت:

تۆ هەرگیز بەنائومێدی گفتوگۆیەکت بەجێ هێشتووە، کە ئەوانی تر نەک نەهاتوونەتە سەر بیروڕاکانی تۆ، بەڵکوو گاڵتەشیان پێ کردووە؟ تۆ هەرگیز هەستت بە بریندارکی کردووە، کاتێک کەسێک لەگەڵتا ناکۆک بووە و لێی پرسیویت کە چی بەڵگەیەکت هەیە بۆ پشتگیریکردنی بۆچوونەکەت؟ ئەگەر وەڵامی هەردوو پرسیارەکە بەڵێیە، ئەوا پێدەچێ چاوەڕێی زیاد لە پێویستت لەوانی تر کردبێت. خەڵک بەدەگمەن بیروڕای خۆیان دەگۆڕن، بە شێوەیەکی خێرا و ئاسان، بەتایبەت لەو بڕوایانەی ماوەیەکی زۆرە هەڵگریانن. کاتێکیش ڕووبەڕووی ئەو ئایدیانە دەبنەوە کە جیاوازن لەوەی خۆیان، ئاساییە بیانەوێ بزانن چی بەڵگەیەک هەیە پشتڕاستیان بکاتەوە. چاوەڕێ بە گومان و پرسیار لە ئایدیاکانت بکرێن. ئارام و بەڕێز بە لە وەڵامدانەوەیاندا.

## واز لە خودپەرستی و ئەجێندای شەخسی بێنە:

بۆ ئەوەی بەرهەمدار بێت، گفتوگۆکردن پێویستی بە ژینگەیەکە، کە هەموو ڕێز لە یەک دەگرن و مەدەنین. خودپەرستی egotism دەبێتە هۆی نواندنی هەڵویستی بێڕێز بەرامبەر بە یەکدی (وەک ئەم هەڵوێستانە)، "من زۆر لە کەسانی تر گرنگترم،" "ئایدیاکانم لە هی هەموویان باشترە"، "ڕێساکان بەسەر مندا جێبەجێ نابن." ئەجێندا شەخسییەکان، وەکوو حەزنەکردن لە بەشداریکردنی ئەوانی تر، یان پێداگری و حەماسەت لەسەر گۆشەنیگایەک، دەشێ ببێتە هۆی هێرشی شەخسی و ئارەزووی گوێنەگرتن لە بۆچوونی ئەوانی دیکە.

## بەشداریکردن نەك پاوانکردن:

ئەگەر تۆ لەو کەسانەی کە حەزیان لە قسەکردنە و زۆر شتیان هەیە بۆ وتن، ئەوە ڕەنگە تۆ زیاتر لەوانی تر بەشداری بکەی لە گفتوگۆکردنەکەدا. بەپێچەوانەوە، ئەگەر تۆ کەمدوو بیت، ئەوا ڕەنگە بەدەگمەن قسەیەک بکەیت. گرفتێک لەئارادا نییە، کەسایەتیت لە هەرجۆرێکیان بێت. هەرچەندە گفتوگۆ زۆر بەرهەمدارتر دەبێت کاتێک هەموو بەشداری دەکەن. بۆ ئەوەی ئەمەش ڕوو بدات، چەنەبازەکان دەبێت وەک پێویست بەشداری بکەن، کەمدووەکانیش بە بەرپرسیاریتیی خۆیان هەڵسن و بەشداری لە گفتوگۆکەدا بکەن بە گوشەنیگاکانیان.

## واز لە خووە بێزارکەرەکانی قسەکردن بێنە:

لەم خووانە mannerism {ئەو خووە تایبەتییانەی کە هەریەکەمان خاوەنین و لە کاتی گفتوگۆکردندا نائاگایانە گوزارشتی لێ دەکەین _ و} وەکوو: تەواونەکردنی ڕستەیەک و لەپڕچوونەسەر ڕستەیەکی تر، منگەمنگکردن، وەستان لەسەر هەموو برگە و ڕستەکان و وتنی (ئمم، ئێ). ئەوە خووە بێزارکەرەکانە وا دەکات پەیامەکەت بەباشی نەگاتە وەرگرەکانت. بۆ چارەسەرکردنیان، گوێ لە خۆت بگرە کاتێک قسە دەکەیت. چاکتریش وایە گفتوگۆکانت لەگەڵ هاوڕێ و ئەندامانی خێزانکەتدا (بە ڕەزامەندییان) تۆمار بکەیت و گوێی لێ بگریتەوە. هەرکاتێکیش بەشداریت کرد لە گفتوگۆیەکدا، هەوڵ بدە بە شێوەیەکی ڕێکخراو و ڕوون قسە بکەیت و بە کەمترین وشە مەبەستەکەت بگەیەنیت.

## ڕاهێنانی گوێگرتن

کاتێک بەشداربووەکانی گفتوگۆکە گوێ لە یەکتر ناگرن، گفتوگۆکە نزیک دەبێتەوە لە خوتبەدان؛ هەرکەسە لە جێی خۆیەوە قسە دەکات بەبێ ئەوەی ئەوانی تر گوێیان لێ گرتبێت. ئەمە دەشێت تەواو نائاگاییانە ڕوو بدات، چونکە مێشک ئەوەندە ئایدیا بەرهەم دەهێنێت، کە خێراترین قسەکەریش ناتوانێت فریایان بکەوێت و دەریان ببڕێت. مێشکت بێزار دەبێت لە چاوەڕوانیکردن، وەک سەگێکی لێ دێ، کە دەیەوێت ڕزگاری بێت لە زنجیرەکەی. لە بارودۆخێکی ئاوادا، لەباتی گوێگرتن لە وشەکانی قسەکەرەکە، تۆ ڕەنگە بیر بکەیتەوە لە جلوبەرگەکەی یان مۆدیلی قژی، یان ڕەنگە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە بکەیت، تا بزانی چی ئەگوزەرێت. تەنانەت کاتێکیش هەوڵێکی زۆر دەدەیت تا گوێ بگریت، ئاسانە تەرکیز لەدەست بدەیت. یان ڕەنگە بە هۆی گوزارەیەکی قسەکەرەوە ئیدی تۆ خەیاڵ بتباتەوە بۆ ڕابردوو. ئەگەر قسەکەرەکە شتێکی وت تۆ لەگەڵی ناکۆک بوویت، ڕەنگە ئیدی لە گوێگرتن بوەستیت و بکەویتە داڵغەی وەڵامێکەوە. باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی سەرنجی خۆت لەدەست نەدەی، ئەویە کە ئاگاداری ئەم خاڵە بێزارکەرانە بیت، کە سەرنجدانت پەرت دەکەن، هەروەها ڕووبەڕوویان ببیتەوە. هەوڵ بدە تێبگەی کە قسەکەرەکە چۆن بیر دەکاتەوە، لە مانای هەموو ڕستەکانی تێبگە و بیبەستەرەوە بە ڕستەکانی پێشووترەوە. هەرکاتێک زانیت مێشکت دەیەوێت لە بابەتی گفتوگۆکە لا بدات، بیهێنەرەوە سەر بابەتەکە.

## بەرپرسیارانە حوکم لەسەر ئایدیاکان بدە:

ئایدیاکان لە ڕووی چۆنایەتییەوە ڕێک دەخرێن، لە ئایدیا قووڵەکانەوە بۆ ئایدیا بێماناکان، لە سوودبەخشەکانەوە بۆ زیانبەخشەکان، لە مەزنکردنەکانەوە بۆ بێنرخکردنەکان. بە هەرشێوەیەک بێت،

دادپەروەربوون، (لە حوکمەکانتا لەسەر ئایدیاکان) ئەوە دەخوازێ، کە حوکمەکانت بنیات نابێت لەسەر لەبەرچاوگرتنێکی وردی سەرلەبەری لاوازی و بەهێزییەکانی ئایدیاکان، نەک لەسەر ئیعجاب یان پەرچەکردارە سەرەتاییەکان. بە شێوەیەکی بنەڕەتی ئاگاداری ئەو ئایدیانە بە، کە نائاشنا یان جیاوازن لەگەڵ ئایدیاکانی خۆت، لەبەر ئەوەی حەزێکی زۆرت هەیە تا نادادپەروەرانە ئەو ئایدیایانە وەک خۆی نەبینیت.

## بەرەنگاری حەزی دەنگهەڵبڕین یان پێبڕین ببەرەوە:

گومانی تیادا نییە کە تۆ دەزانی دەنگهەڵبڕین یان پێبڕین ڕەوشتێکە کە هەم جوان نییە هەم بێڕێزییە، بەڵام ئەوەش دەزانیت کە لە زۆربەی کەیسەکاندا هێمایەکیشن بۆ *لاوازیی ڕۆشنبیری*. ئەگەر تۆ دڵنیا بیت لە دروستیی بۆچوونەکانت، ئیدی پێویست بەوە ناکات دەنگت هەڵببڕیت یان ئەوانی تر بێدەنگ بکەیت. تەنانەت ئەگەر ئەوانی تریش وەها ڕەفتارێک بنوێنن. باشترین ڕێگە بۆ پیشاندانی بڕوابەخۆبوون و باشکارەکتەری، ئەویە کە چاو لەوانی تر نەکەیت. با پێوەری خۆت هەبێت بۆ ناڕازیبوون، بەبێ ئەوەی ببیتە کەسێکی ڕووگرژ و بوغزاوی disagreeable.

## دوورکەوتنەوە لە قۆپیەکردن

هەر کە ئایدیاکان، بۆچوونەکان بوون بە وشە و چاپ کران و بڵاو بوونەوە، ئەوە دەچنە خانەی "مافی بڵاوکردنەوەوە" intellectual property {ئەو مافەیە کە بەپێی یاسا پارێزراوە بۆ ئەو کەسەی خاوەن بەرهەمێکی ڕۆشنبیرییە، بۆ ئەوەی خاوەن بەرهەمەکە سوودی ئابووری لە بەرهەمەکە ببینێت، نەک کەسێکی تر}. خاوەن بەرهەمەکە وەک چۆن مافی خاوەندارێتیی هەیە بەسەر سەیارەکەی یان خانووکەیەوە، ئاواش مافی خاوەندارێتیی هەیە بەسەر

بەرهەمەکەیەوە. تەنها جیاوازییان ئەوەیە، کە بەرهەمی رۆشنبیری بە زەبری تەقەلالای ئەقڵی و فکری دەکڕدرێت، بەڵام موڵکی ماددی بە پارە دەکڕدرێت. هەرکەسێکیش رۆژێک لە رۆژان ئەقڵی ماندوو و گەرم بووبێت بەدەست چارەسەکردنی کێشەیەکی فکرییەوە، یان لە گۆڕینی ئایدیا ئاڵۆز و فرەڕەهەندەکان بۆ ئەو وشە و گوزارە سادانەی شیاوی تێگەیشتنن، چاک دەزانێت تەقەلالای ئەقڵی و فکری چەندە زەحمەت و پڕکۆششە.

قۆپیە واتە خستنەڕووی ئایدیاکانی ئەوانی تر وەک هی خۆت. قۆپیە هەم دزینە، هەم هەڵخەڵەتاندن. لە جیهانی ئەکادیمیدا، قۆپیەکردن وەکوو لادانێکی ئەخلاقی سەیر دەکرێت و لادەرەکەش یان ئەوەتا لەو وانەیەدا دەکەوێت، یان لەو ساڵەدا یان هەر بەیەکجاری دەر دەکرێت لە زانکۆ. لە دەرەوەی جیهانی ئەکادیمیشدا، ئەگەر خاوەن بەرهەمەکە سکاڵا لەسەر دزەکە تۆمار بکات، ئەوا راپێچی دادگا دەکرێت.

قوپیەکردن دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک، لەوانە، بێدەربەستی و کەمتەرخەمی. بەڵام زۆربەی حاڵەتەکانی قۆپیەکردن دەگەڕێتەوە بۆ کێشەی خراپی لەیەکتێنگەیشتن. کاتێک مامۆستا لە لایەک بە قوتابییەکانی دەڵێت "پێویستە بنچینەی راپۆرتەکانتان، لێکۆڵینەوەکانتان لەسەر لێکۆڵینەوەکانی تر بنیات بنێن، نەک لەسەر را تاقینەکراوەکانی خۆتان،" لە لایەکی تریشەوە، پێیان دەڵێت"ئایدیای ئەوانی تر وەک هی خۆتان مەخەنە روو،" لەم بەینەدا قوتابی سەری لی دەشوێت، چونکە ئەو دوو رستەیە وەک دوو پەیامی دژ بە یەک وەر دەگرێت. خۆشبەختانە رێگەچارە هەیە بۆ روونکردنەوەی ئەم دژبەیەکییە:

**هەنگاوی یەکەم:** ئایدیای سەرچاوەکان و ئەوانی خۆت تێکەڵ مەکە. هەر سەرچاوەیەکیشت بەکار هێنا، ئاماژە بە ڕیفرینسەکەی بدە. بۆ سەرچاوە ئینتەرنێتییەکان، ئاماژە بە سایت و ناوی نووسەر و ناوی بابەتەکە و کاتی وەرگرتنەکەی بکە و تۆماریان بکە لای خۆت. بۆ کتێب، ئاماژە بە ناوی نووسەر و ناوی کتێب و شوێنی بڵاوکردنەوە و دەزگای چاپەمەنی و کاتی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە بکە. بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان، ئاماژە بدە بە ناوی نووسەر و ناوی بابەتەکە و ناوی بڵاکراوەکە و ژمارەی بڵاوکراوەکە. بۆ بەرنامە تەلەڤزیۆن و ڕادیۆییەکان، ئاماژە بدە بە ناوی بەرنامەکە، ناوی کەناڵەکە و بەرواری بڵاوکردنەوەکەی.

**هەنگاوی دووەم:** لە کاتی خوێندنەوەی سەرچاوەکاندا، لە هەرشوێنێکدا ئایدیایەک هەبوو کە بتەوێت بەکاری بهێنێت لە نووسینەکەی خۆتدا، ئەوا دیاریی بکە. ئەگەر نووسەرەکە ڕوون و ورد ئاماژەی بە ئایدیاکە دابوو، ئەوا ڕێک وەک خۆی بیانگوێزەرەوە بۆ ناو نووسینەکەت و بیانخەرە نێوان دوو کەوانەی بچووکەوە "". ئەگەر دووروودرێژیش بوون، ئەوا خۆت دووبارە بەکورتی دایان بڕێژەرەوە. هەروەها ئاماژە بە ژمارەی لاپەڕەی سەرچاوەکەش بکە.

ئەگەر ئایدیای نووسەرەکە شتێکی لا ورووژاندنی، بۆنموونە وەکوو پرسیارێک، پەیوەندیی ئەم ئایدیایە بە ئادیایەکی ترەوە، کە پێشتر لە شوێنێکی تردا خوێندوتەتەوە، یان ئەزموونی تایبەتیی خۆت، کە هاوڕا یاخود دژی ئەم بۆچوونی نووسەرە دەوەستێتەوە، ئەوا ئاماژەیان پێ بدە و بیانخەرە ئەم جۆرە کەوانەیەوە[]، بۆ ئەوەی کاتێک دووبارە دەیانخوێنیتەوە، بزانیت بۆچوونی خۆتن. ئەمەی خوارەوە نموونەیەکە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە:

ئادلەر، مۆرتایمەر ج. *ئایدیا مەزنەکان*: فەهرەستی فکری خۆرئاوا (نیو یۆرک:

ماکمیلان، ١٩٩٢) دەڵێت هەر لە یۆنانی کۆنەوە فەیلەسوفەکان لە مشتومڕی ئەوەدا بوون، کە ئایا ڕاستی چییە. هەروەها دەڵێت زۆربەی فەیلەسوفە ناودارەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە حەقیقەت بریتییە لە "هەمەئاهەنگی نێوان فکر و واقیع" ٨٦٧، هەرەوەها دەڵێت کە فرۆید ئەم تێگەیشتنەی بۆ حەقیقەت بە تێگەیشتنێکی *زانستی* داوەتە قەڵەم. فرۆید دەڵێت "ئەوەی ئێمە ناومان ناوە حەقیقەت، هەمەئاهەنگە لەگەڵ جیهانی واقیعی دەرەوەدا. ئامانجی کارە زانستییەکان دۆزینەوە ئەم حەققەتەیە، ئەگەر لە کاتییکیشدا ئەو بەها کردارەکییانەی لەم حەقیقتەوە ئەکەونەوە، دژی بەرژەوەندیشمان بوەستنەوە" ٨٦٩ [من دەڵێم گوازارە ڕاستەکان هەمەئاهەنگن لەگەڵ فاکتەکاندا، لە کاتێکدا گوزارە هەڵەکان وا نین].

هەرکاتێک بگەڕێتەوە سەر ئەم نووسینە، تەنانەت دوای ساڵێکیش، هەر بە چاوپیاخشاندنێک یەکسەر دەزانیت کامە بۆچوونی نووسەرەکەیە و کامەش هی خۆت. هەموو ڕستەکان جگە لە کۆتاڕستە، هی نووسەرەکەیە و تۆ بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەکارت هێنانون.

**هەنگاوی سێیەم:** لە کاتی نووسینی بابەتەکەتدا، تۆ هەم بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و هەم ناڕاستەوخۆ سوود لە ئایدیای نووسەرانی تر وەر دەگریت. کەواتە دەبێت بە شێوەیەکی وا ئاماژەیان پێ بدەیت، کە هیچ گومان و لێڵییەکی نەبێت لەوەی لەکوێدا و چۆن بەکارت هێناون. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بە شێوەی پەراوێز، یان هەر لەناو تێکستەکەدا ئاماژە بە سەرچاوە سوودلێوەرگیراوەکان بکرێت.

ئەمەی خوارەوە، نموونەیەکە، کە چۆن بتوانیت سوود لە بۆچونەکانی مۆرتایمەر ئادلەر ج وەر بگریت لە نووسینێکدا. هەروەها لە پارەگرافی دووەمدا

ئاماژە بەوە دراوە، کە چۆن بۆچوونەکانی خۆت گەشە پێ بدەیت. (سەرنج بدە و بزانە چۆن شێوازی پەراوێز بەکار هاتووە).

مۆرتایمەر ج ئادلەر قسە لەسەر ئەوە دەکات، کە بەدرێژاییی مێژوو، هەر لە یۆنانییە کۆنەکانەوە، فەیلەسوفەکان لە مشتومڕی چییەتیی حەقیقەتدا بوون. بەلاَم بۆ ئادلەر، خاڵی گرنگ و سەرنجراکێش ئەوەیە، کە هەرچەندە ئەوان لە مشتومڕ و ناکۆکیدا بوون، بەلاَم زۆربەی فەیلەسوفە بەناوبانگەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە حەقیقەت بریتییە لە "هەمەئاهەنگی نێوان فکرو واقیع." ئادلەر ئاماژەی بە دیدی فرۆید دەدات لەسەر ئەم پێناسەیە، کە فرۆید پێی وایە ئەم پێناسەیە زانستییە. ئەو دەڵێت فرۆید وتوویەتی، کە "ئەوەی ئێمە ناومان ناوە حەقیقەت، هەمەئاهەنگییە لەگەڵ جیهانی واقیعیی دەرەوەدا. ئامانجی کارە زانستییەکان، دۆزینەوە ئەم حەققەتەیە، ئەگەر لە کاتێکیشدا ئەو بەها کردارەکیانەی لەم حەقیقتەوە ئەکەونەوە، دژی بەرژەوەندییەکانیشمان بوەستنەوە."

ئەم دیدە بۆ حەقیقەت، کۆکە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە باوەی کە بۆ حەقیقەت هەیە، کە ئەویش برتییە لەوەی بۆچوونێک ڕاستە، ئەگەر کۆک بێت لەگەڵ فاکتەکان و ئەگەر واش نەبوو، هەڵەیە. بۆ نموونە، ئەم بۆچوونە: "دوو تاوەری سەنتەری بازرگانیی جیهانی لە ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠٢دا لە نیو یۆرک تێک شکێنرا" هەڵەیە، چونکە ساڵێک پێشتر لەم بەروارە ئەم ڕووداوە ڕووی داوە. با من زۆر دڵنیاش بم لەوەی لە ٢٠٠٢دا بووە، بەلاَم ئەمە هیچ شتێک لە حەقیقەتی ڕووداوەکە ناگۆڕێت. بە هەمان شێوە، ئەگەر کەسێکی بێتاوان بە هەڵەی دادگا تاوانبار کراو، هەموو دونیاش لەگەڵ دادگادا کۆک بوون، ئەمە هیچ لە بێتاوانیی کەسەکە کەم ناکاتەوە. ئێمە ئازادین لەوەی خەون بە هەرشتێکەوە ببین، کە دەمانەوێت، بەلاَم بە خۆزگە و ئارەزووی ئێمە هیچ لە حەقیقەتی واقیع ناگۆڕدرێت.

# ڕاهێنانەکان

١. بیر لە ڕابردووی خۆت بکەرەوە لە قوتابخانە. تا چ ڕادەیەک نزیکە لەوەی ئارسەرەوە؟

٢. هەڵوێستەیەک لەسەر توانای تەرکیزکردنی خۆت بکە. ئایا بەلاتەوە دژوارە تەئەمول لەسەر کێشە گرنگەکان بکەیت؟ ئایا دەتوانیت ڕێگری بکەیت لە وێنە و خەیاڵی نیمەچەبەئاگاکان، تا بیکردنەوەت پەرت نەکەن؟ ئایا حاڵەتی تایبەت هەیە کە ئەم توانای ڕێگرییەت کەم بکاتەوە؟ ڕوونی بکەرەوە.

٣. خۆت هەڵبسەنگێنە بەو پێوەرانەی کە لە لاپەرەکانی ١٩ و ٢٠دا بۆ بیرکەرەوەی ڕەخنەیی ڕیز کراون. لە کامیاندا زۆر بەهێزیت و لەکامیاندا زۆر لاوازیت؟ ئەگەر توانای بیکردنەوەی ڕەخنەییت لە بەرزونزمدایە، هەوڵ بدە لە هۆکارەکانی ئەم بەرزونزمەییە تێبگەیت.

٤. ئایا تۆ بە چ شێوازێک ڕووبەڕووی کێشە و بابەتەکان دەبیتەوە؟ ئایا هیچ شێوازێکی دیاریکراوت هەیە کە لە کاتی تێفکرین لە کێشەکان پەیڕەویی لێ بکەیت؟ ئایا لە کاتی بیرکردنەوەدا یەکەم شت کە بە خەیاڵتدا گوزەر دەکات، وێنەیە؟ یان وشە؟ ئەی چی دوای ئەو دێت؟ ئەی لە دواتردا چی؟ ئەگەر توانای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەت نییە، ئەم ڕاهێنانە جێبەجێ بکە تا هاوکاریت بکات: لەم کتێبەی بەردەستتدا، دەیان پەڕە هەڵبدەوەرە، پاشان هەر

لەخۆوە ڕستەیەک دەسنیشان بکە، بیخوێنەرەوە و بزانە میشکت چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات (ئەم ڕاهێنانە ڕەنگە کەمێک سەیر دەر بکەوێت، کە چۆن شیاوە بیر بکەینەوە لە بیرکردنەوە خۆی، بەڵام دوای دووبارەکردنەوەی چەندجارەی ئەم ڕاهێنانە، ئیدی لات ئاشنان دەبێت).

٥. ئەم ڕستانەی خوارەوە بەوردی بخوێنەرەوە. پاشان بە ڕای تۆ بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان چ جۆرە پرسیارێک لەسەر ئەم ڕستانە قوت دەکەنەوە، ئەمە ئەگەر هیچ پرسیارێک هەبێت؟

a. تەلەڤزیۆنەکان وێنەیەکی هەستبزوێنمان لەسەر جەنگ بۆ دەگوازنەوە، چونکە تەنها وێنەی مرۆڤی بریندار و کوژراو وێرانکاریمان بۆ پیاشان دەدەن.

b. باوانم زۆر توند و ڕەق بوون لەگەڵم، چونکە نەیانهێشت بۆ هیچ ژوانێک بچم تا تەمەنی ١٦ساڵی.

c. من دڵنیام ڕاڵف هیچ منی بەلاوە گرنگە نییە، چونکە قەت قسەم لەگەڵ ناکات، کاتێک بەلای یەکتردا تێدەپەڕین لە ڕاڕاوەکەدا.

d. پێشکەشکاری هەواڵەکان، لەداوی ڕیکلامێکی بازرگانییەوە دەڵێت: ئێمە بەردەوام هەواڵی گەرمتان پێ ڕادەگەیەنین، تا ئێوە بەردەوام ئاگاداری دواگۆڕانکارییەکان بن.

e. مامۆستایەکی قوتابخانەی بنەڕەتی ئەلەباماى حکومی، قوتابییەکانی فێر دەکات کە پێش هەر ژەمێک سوپاسگوزاری بۆ خودا دەر ببڕن. مامۆستاکە لەسەر ئەم ئامۆژگاریکردنە دەڵێت "من بە بەشێک لە ئەرکی خۆمی دەزانم ئەو بەهایانە لە دڵی منداڵەکاندا بچێنم، کە پێوستن بۆ ئەوەی ژیانێکی باش بژین."

## ڕای جیاواز

ئەم پارەگرافەی خوارەوە پوختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی بەشە ناوخۆی تێکەڵ و جیا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵە، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد کە بۆچوونێک لەوانی تر ماعقوڵترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولییەتی تیدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسرا و یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

### ئایا پێویست دەکات زانکۆکان قوتابییان ناچار بکەن لە بەشە ناوخۆییە تێکەڵەکاندا بژین؟

هەتا ٣٠ ساڵ لەمەوپێش، زۆربەی هەرە زۆری زانکۆکان ڕێگەیان نەدەدا کوڕ و کچ لە بەشە ناوخۆییەکاندا پێکەوە بژین. بەڵام ئێستا شتەکان گۆڕاون، بە جۆرێک، کە هەندێک زانکۆ قوتابییەکان ناچار دەکەن لە بەشە ناوخۆی تێکەڵ بمێننەوە. لە ساڵی ١٩٩٧دا، دوو قوتابیی کوڕی زانکۆی یاڵ، داوا لە زانکۆ دەکەن کە بەشە ناوخۆی کوڕانینان بۆ فەراهەم بکەن، چونکە بەشە ناوخۆی دوو ڕەگەز لەگەڵ ئایینەکەیاندا ناکۆکە، کە

یەهودی ئۆرسۆدۆکسییە. (دیارە بەشە ناوخۆی تێکەڵ ناکۆکیشە لەگەڵ ئاینی ئیسلام و مەسیحی ئۆرسۆدۆکسی و کاسۆلیکدا). بەڵام زانکۆ لە بەرامبەردا پێی وتوون: "ئەمە بەشێکە لە یاسا و ڕێسای زانکۆی یاڵ، ئەگەر بەدڵتان نییە، فەرموون بۆ دەرەوە." زۆر کەس کۆکن لەگەڵ یاسا و ڕێسای یاڵدا لەسەر ئەم مەسەلەیە، بەڵام هەندێکی تر ناکۆکن و بە شتێکی قبوڵنەکراوی دەدەنە قەڵەم.

# چاپتەری سێیەم

## حەقیقەت چییە؟ What is Truth?

سەدان ساڵە فەیلەسوفەکان لە مشتومڕی ئەوەدان، کە ئایا "حەقیقەت Truth" بوونی هەیە. مشتومڕەکە عادەتەن دەربارەی حەقیقەتی ڕەهایە Truth، واتە بە پیتی گەورە T نەک بچوک t ، جۆرێک لە دەستنیشانکردنی تەواوی ئەوەی کە بووە، هەیە، یان دەبێت، حەقیقەتێک خاڵی لە هەڵە، لە ناکۆکی، دواهەمین بڕیاردان لەسەر ڕاستبوون یان هەڵەبوونی ئایدیاکان یان تیۆرەکان.

ئەوانەی بڕاوایان بەم جۆرە لە *حەقیقەتی ڕەها* هەیە، لەو بڕوایەدان ئەم حەقیقەتە وا لە جیهانی ڕۆحیدا، مەعنەویدا نەک لە جیهانی ماددیدا. لەگەڵ ئەوەشدا لە دەرەوەی کات و شوێنیشە. ئەم حەقیقەتە ڕەهایە دائەنرا بەو تێگەیشتنانەی لەنێوان خواوەندەکاندا gods هەیە، یان بەو ئایدیایەی لەناو ڕۆحی خودادا God، یان بەکورتی، بریتییە لە تێکڕای *واقیع reality*. ئایا مرۆڤ هەرگیز دەتوانێت دەستی بەو حەقیقەتە ڕەهایە بگات؟ هەندێک دەڵێن نا، هەرگیز. هەندێکیش دەڵێن بەڵێ، بەڵام تەنها لە ژیانەکەی تردا. هەندێکی تریشیان دەڵێن تەنانەت حەکیمترین و باشترین مرۆڤەکانیش دەتوانن بەشێکی ببینن و باقیی مرۆڤایەتیش دەبێت لەو مرۆڤە دانسقە و ژیرانەوە فێر ببن.

ئەوانـەی ئـەم حەقیقەتـە شـکۆمەندە، سـەراپاگیرەیان ڕەت کردۆتـەوە، پێیـان وایـە تێگەیشـتنێکی بەتاڵـە. چۆن دەکرێت سـەرلەبەری واقیـع کـورت بکرێتـەوە بـەم شـێوەیە؟ لـەوەش گرنگتـر، چ بەڵگەیـەک خراوەتـە ڕوو تـا ڕاسـتیی بوونـی بسـەلمێنێت؟ زۆر لەوانـەی بـەم شـێوەیە بیریـان کردۆتـەوە، حەقیقەتـی ڕەهایـان وەک بیرکردنەوەیەکـی حەکیمانـە ڕەت کردۆتـەوە، وەک جۆرێـک لـە خۆشـاردنەوەی فەلسـەفیی ئارامبەخـش. هەندێکـی تریشـیان هەنگاوێـک زیاتـر ڕۆیشـتن و تەناتـەن نکۆڵییـان لـە حەقیقەتـی ڕێژەییـش *truth* کـردووە.

سـەردەمی ئێمـە هەمـوو ئـەو میراتـەی لـەو ئارگۆمێنتـە جیاوازجیاوازانـە بـۆ ماوەتـەوە. بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەوەی کـە جێـی سـەرنج و گرنگپێدانە، گـۆڕدراوە. حەقیقەتـی ڕەهـا چیـدی ئەوەنـدە گرنـگ نییـە. تەنانـەت ئەگـەر حەقیقەتـی ڕەهـا هەشـبێت، ئـەوە ئـەو گرنگییـە نییـە لـە چارەسـەرکردنی کێشـەکانی جیهـان و ژیانمـان، چونکـە ئـەوە لـەژوور توانـای تێگەیشـتنی مرۆڤەوەیە. تەناتەن زۆر لەوانەی دیدێکی دینیی توند و کۆنسـەرڤاتیڤیانەیان هەیـە، چیـدی پرسـیاری حەقیقەتـی ڕەهـا بـە گرنـگ نازانـن بـۆ تێگەیشـتن و پراکتیزەکردنـی ئیمانیـان.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، کێشـەی حەقیقەتـەکان truth (بـە پیتـی بچـووک) دەمێنێتـەوە، هەروەهـا ئـەو مەوقیعـەی ئێمـە دەیگریـن لـە وەڵامدانـەوەی ئـەم کێشـەیە، بەدڵنیاییـەوە گرنگیـی خـۆی هەیـە لەسـەر چۆنێتیـی ئاڕاسـتەکردنی بیرکردنـەوە و کردارنواندنـی ئێمـە. بەداخـەوە، ئاڵۆزکـردن و شـێواندنێکی زۆر هەیـە دەربـارەی چەمکەکـە. هـەر لێرەشـەوەیە ئـەم چاپتـەرە تەرخـان کـراوە بـۆ تیشکخستنەسـەر ئـەم چەمکـە.

ئەوەی ئەمڕۆ باوە، ئەوەیە کە بڕوا بە ڕێژەی بوون و شەخسی یان کەسێتیی بوونی حەقیقەت بێنیت. "هەموو کەس حەقیقەتی خۆی دروست دەکات،" "ئەوەی بۆ تۆ ڕاستە، بۆ من ڕاست نییە." مانای ئەم گوزارانە درێژ دەبێتەوە بۆ ئەوەی کە بڵێت "ئەمە ولاتێکی ئازادە، دەتوانم بڕوا بەو شتە بهێنم، کە دەمەوێت." ئەم دیعایەیە دەگاتە ئاستێک، کە بڵێیت، *هەرشتێک کەسێک بە ڕاستی بزانێت، ڕاستە، چونکە ئەو بەڕاستی دەزانێت.* هەر بۆیە سەیر نییە کە ڕووبەڕووبوونەوەی دیدی کەسێک وەک شتێکی بێتام و زەوقسسی لەقەڵەم دەدرێت. "ئەوە حەقیقەتەکەی منە، تۆ بۆ ڕەخنەی دەکەیت، بێقیمەت، تۆزێک ڕێز پیشان بدە."

دەرهاویشتەکانی ئەم دیدە، زۆر جێی قەلەقی و داخە، لەگەڵ ئەمەشدا، کەم کەس هەستیان بە مەترسییەکانی کردووە، ژمارەرەیەکی کەمتریش بایەخ بە مەعقولیەتبوون، ئەقڵانیبوونی بڕیار و تێگەیشتنەکانی خۆیان دەدەن. یەکێک لە دەرئەنجامەکانی برتییە لەوەی مادەم هەموو کەس ڕاستە، کەواتە هیچ کەس هەڵە نییە. بگرە *ناکرێت* هیچ کەس هەڵە بێت. کۆمیدیای ئەم دیدە بۆ حەقیقەت دەگاتە ئەوەی کە قوتابی بە ماموستاکەی بڵێت، بە چ حەقێک وەڵامەکەم بە هەڵە دەزانیت، ئەی من خۆم خاوەنی ڕاستیی خۆم نیم! دەرئەنجامێکی تری ئەم تێگەیشتنە ئەوەیە، کە تەوەقوعات و یادەوەریی هەموو کەسەکان بە شێوەیەکی خاڵی لە هەڵە کار دەکەن، بە شێوەیەک، کە هیچ کەموکووڕی و ناتەواوەتییەکی تێدا نییە. دەرهاویشتەیەکی تر ئەوەیە، کە هیچ کەسێک "حەقیقەت"ی ئەوی تر هەڵنابژێرێت، شوێنی ناکەوێت. فکرەی دروستکردنی حەقیقەت ڕێگرە لە بەردەم وەرگرتن یان گواستنەوەی حەقیقەت _ ئەگەر گوایە حەقیقەت تەنها کێشەیەکی زاتی بێت، ئەوا مانای وایە هەرکەسە خاوەن

حەقیقەتێکی تایبەت بە خۆیەتی. با هەریەک لەم ئایدیایانە بەوردی بخەینە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

## هەموو ئەمانە لەکوێوە دەستیان پێ کرد؟

ئەو ئایدیایەی کە دەڵێت ئێمە خۆمان حەقیقەتی خۆمان دروست دەکەین، بەبێ کاریگەری و یارمەتیی دەرەکی، ئەگەر بهاتبایە ئەم فکرەیە تەنها جەختی لەسەر تەمەنی کامڵبوونی مرۆڤ بکردبایە، ڕەنگە لەم حاڵەتەدا مەعقولیێتی تێدا بایە. بەڵام کاتێک سەرنج لە قۆناغی منداڵی دەدەین، ئیدی ئەم بۆچوونە شوێنی گومانە، چونکە هەمووومان لەو قوناغەدا لە ڕووی جەستەیی و عاتیفی و عەقڵییەوە پشتمان بەوانی تر بەستووە. هەرشتێک کە زانیومانە یان بڕوامان پێ کردووە، لەلایەن ئەوانی ترەوە فێر کراوین. ئێمە پرسیارمان کردووە _ "بۆ دایە؟" "بۆ باوە؟" ئەوان وەڵامیان داوینەتەوە. وەڵامەکانمان قبوڵ کردووە. بیرکردنەوە و بیروڕامان هەرچەندە ئاڵۆز بێت لە تەمەنی کامڵبووندا، ئەوا بنچینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەڵامانەی کە لە سەردەمی منداڵیدا وەرمان گرتووە.

ڕێژەگەراکان بەدڵنیاییەوە بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئێمە دەتوانین لە تەمەنی کامڵبووندا لە کاریگەرییەکانی قۆناغەکانی پێشوو، خۆمان ڕزگار بکەین، بەڵام ئەم بانگەشەیە سەرەکیترین پرنسیپەکانی سایکۆلۆژیا پشتگوێ دەخات. نووسەرێک بەم شێوەیە باس لە بەردوامبوونی کاریگەرییەکانی سەردەمی منداڵیی دەکات:

پێش ئەوەی جیهان ببینین، پێمان وترا چییە. ئێمە زۆربەی وێناکردنەکانمان بۆشتەکان دەکەوێتە پێش ناسین و ئەزموونکردنەکانمانەوە بۆ ئەو شتانە. ئەو وێناکردنە پێشوەختانە بە شێوەیەکی کاریگەر تەواوی

دونیابینیی ئێمەیان ئاراستە کردووە و دواتر لە ڕێی پەروەردەوە ئێمە تێدەگەین لەو بۆچوونە پێشوەختانە. ئەو تەسەورە پێشوەختانە کاریگەریان کردووە، کە بە هەندێک بابەتی دیاریکراو و زانراو ئاشنا بین و هەندێکی تریشیان وەک ناڕوون و نائاشنا ببینین، هەروەها جەختیان لەسەر جیاوازییەکانی نێوانیان کردۆتەوە، بۆیە شتێک کە کەمێک پێی ئاشناین، وا دەر دەکەوێت زۆر باش دەیناسین، شتێکیش کە کەمێک ناڕوونە و پێی نائاشناین، وەک شتێکی تەواو جیاواز لە خۆمان دەیبینین. هەرکاتێک هێمایەکی بچووک ببینینەوە کە ڕەنگە جیاوازیش بێت لە خۆیان، ئەمان {واتە تەسەورە پێشوەختەکان} دەورووژێن، چالاک دەبنەوە. بە هۆی دووبارە چالاک بوونیانەوە وێنەیەکی کۆن دەخەنە جێی وێنەیەکی تازە، هەروەها ئەوەی لە یادەوەریدا بووە، دووبارە دەیخەنەوە جیهان.

هەموو ئەو پەندە کۆنەمان بیستووە، کە دەڵێت "بینین بڕواکردنە" {واتە هەرچەندە شتێک ناوازە و سەیریش بێت، بەڵام کە بینیت، ئیدی گومانێک بۆ ڕاستنەبوونی ئەو شتە نامێنێتەوە}. بە مانایەک لە ماناکان، پێچەوانەکەشی ڕاستە: بڕوات بە هەرشت هێنا، ئیدی وەک ئەوەیە ئەو شتەت بینیبێت، کە لە ڕاستیدا ڕەنگە نەشتدیبێت. هەر بۆیە کەم تا زۆر ئەوەی ئێمە بە گۆشەنیگای تاقانەی خۆمانی دەزانین، لە ڕاستیدا مارکی ئایدیا و بڕواکانی ئەوانی تری لەسەر نەخشێندراوە.

## تێگەیشتنی ناتەواو

ئایا تێگەیشتن خاڵییە لە هەڵە؟ زۆر کەم. ئەمەش لەبەر یەک شت، تێگەشتنەکان لەژێر کاریگەریی ویست و بەرژەوەندی و چاوەڕوانییەکانمندان: "تێگەیشتنە سەرەتاییەکانمان دەیانەوێت جیهانی دەوروبەرمان بەسادەیی بخەنە ڕوو. یادەوەریش بەردەوام پرۆسەکە خێراتر دەکات" تێگەشتن لەو

کاتەدا کە سنوردار دەکرێت، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەکەوێتە هەڵەوە. قوتابییەکی زانکۆ کە دڵنیاییە لەوەی تێکست بووکەکە {ئەو کتێبەی وەک مەنهەج دەخوێندرێت} وەڵامی تەواوی پرسیارەکانی تاقیکردنەوەی تێدایە. بەڵام کاتێک وەڵامی ڕاستی پرسیارەکان وەر دەگرێتەوە و بەراوردیان دەکات بە تێکست بووکەکە، ئینجا دەبینێت وەڵامە ڕاستەکان تەواو جیاوازن و ئەم بەهەڵەدا چووە.

لە ١٩٣٠ و ١٩٤٠ەکاندا، بینەرانی فیلم موچووڕکە بە گیانیاندا دەهات کاتێک تەڕەزان هاواری دەکرد و لەم دار بۆ ئەو دار بازی دەدا بەدوای کەسە خراپەکانەوە. ئەگەر ئەوان پێیان بوترایە تەڕەزان هەرگیز ئەو هاوارانەی نەکردووە، ئەوان لە وەڵامدا دەیانوت، "نا، وا نییە، ئێمە بە گوێی خۆمان گوێمان لێ بوو تەڕەزان هاواری دەکرد." بەستەر کرابی کە یەکێکە لەو پیاوانەی بۆ یەکەم جار ڕۆڵی تەڕەزانی بینیوە، دەڵێت، ئەو هاوارانەی تەڕەزان لە ستۆدیۆکاندا کردوونی بە تێکەڵکردنی سێ دەنگ بەرهەم هاتوون: سۆپرانۆ {دەنگی مێ لە تۆنە زۆر بەرزەکاندا}، باریتۆن {دەنگی نزمی پیاو} و دەنگی بەراز.

لانی کەم بەس لە کۆتاییی هەفتەکاندا، مرۆڤەکان دەیان و دەیان هەڵە دەکەن، بەتایبەت لەو کاتانەدا کە یەکسەر لەداوی ڕووداوێک، شتێک دەڵێن. ئایا هەوادارانی وەرزش نین لە هەموو شوێنێک ناوبەناو هاوار دەکەن "پاسێکی هەڵە بوو" کەچی ساتێک داوی ئەوە، قسەکەی هەڵە دەر دەچێ؟ ئێمە دەتوانێن ئەوەندە دڵنیا بین، کە گرەو لەسەر دەرماڵەی حەفتەیەکمان بکەین، کە قاچی فڵان یاریزان لەپێشدا بەر تۆپەکە کەوتووە. بەڵام دواتر کاتێک وێنەکان لێدەدرێنەوە، بۆمان دەر دەکەوێت، تێگەیشتنە سەرەتاییەکانمان چەندە بەهەڵەدا چوون.

تەسەور یان تێگەیشتنی نادڵنیا، لەلایەن لێکۆڵەرەوەکانی بواری شەهادەتەوە، لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە _ وەکوو پارێزەرەکانی دادگا و زابتەکانی پۆلیس و سایکۆلۆجیستەکان. زۆر بەباشی ڕوون کراوەتەوە، کە دەیان هۆکار هەن وامان لێ دەکەن نەتوانین بەدیقەت بین لە بینین و بیستندا. تاریکی، کەشی تەماوی، دووری لەو شتەوە کە تەماشای دەکەین، هەموو ئەمان ڕێگرن. ڕەنگە لە ساتێکی زۆر گرنگدا دامان ببڕن لە حالەتەکە. ئەگەر هیلاک بووین، یان لەژێر فشاری هەستە ناخۆشەکانی وەکوو ترس یان تووڕەبووندا بین، ئەوا ناتوانین بە شێوەیەکی ئاسایی تێبگەین. هەروەها ئیحتیمالی تێکەڵکردنی هەستپێکردن و لێکدانەوە بە یەکتر هەیە _ تەوەقوعکردنی چۆنێتیی ڕوودانی ڕووداوێک، ڕەنگە ئاستەنگ دروست بکات لە بەردەم بینینی ڕودانی ڕووداوەکە وەک خۆی. دڵسۆزی و سۆزمان بۆ کەسەکان یان شتەکان، ئەویش دەتوانێ بینینمان، تێگەیشتنمان بشێوێنێت. ئەگەر کەسێک کە ئێمە خۆشیمان لێ نایەت بە دەنگی بەرز و حەماسەتەوە قسە بکات، ڕەنگە وای لێک بدەینەوە، کە ئەو کەسە پۆز لێئەدا و خۆی ئەنوێنێت. بەڵام ئەگەر هاوڕێیەکمان وا قسە بکات، ئەوا بە چووستوچالاک و مرۆڤێکی کراوەی ئەدەینە قەڵەم.

## یادەوەریی ناتەواو

تەنانەت ئەگەر تێگەیشتن، هەستپێکردنی یەکەمین جاریشمان بێ کەموکووڕی بێت، ئەوا یادەوەریمان دەیشێوێنێت. وردەکاریی شتەکان لەیاد دەکەین و کە هەوڵ دەدەین بیرمان بکەوێتەوە چی ڕووی داوە، پەنا دەبەینە بەر خەیاڵ بۆ وێناکردنی ئەو بەشانەی نایەنەوە یادمان. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە سەرەتادا ڕەنگە بزانین ئێمە ڕووداوەکە سەرلەنووێ دروست دەکەینەوە، بەڵام ئەم زانینە هەر زوو کاڵ دەبێتەوە، ئیدی وا تەسەور دەکەین ئەوەی بیرمان کەوتۆتەوە، بینینە ئەسڵییەکە یان

تێگەیشتنە ڕاستەقینەکە بووە. سایکۆلۆجیست William James ولیام جەیمس ئەم حاڵەتەی بەم شێوەیە ڕوون کردۆتەوە:

یەکێک لەو سەرچاوانەی زۆرترین زانیاریی ناڕاست دەخاتە بیرەوەریمانەوە، بریتییە لەو قورسایی و گرنگییە، کە بۆ ئەوانی تری دادەنێین لە ئەزموونەکانی خۆماندا. ئەم جۆرە ڕەفتارانە زۆربەی هەرە زۆری جارەکان سادەتر و سەرنجڕاکێشتر دەر دەکەون وەک لە حەقیقەت خۆی. ئەوە دەهێنینەوە یادمان، کە دەبووایە بمانتوانییایە یان بمانکردایە، نەک ئەوەی کە بەڕاستی وتوومانە یان کردوومانە؛ دیارە لە یەکەم جاردا ئاگاداری جیاوازییەکە هەین، بەڵام {دوای} ماوەیەک، خەیاڵ {شتە دروستکراوەکان} جێ بە شتە واقیعییەکان چۆڵ دەکات {جێ دەگرێتەوە}. بیر لەوە دەکەینەوە، کە بریا چی ڕووی بدایە، یان دەشیا چی ڕووی بدابایە {لێکدانەوەکانی} کردارەکان، ئیدی هەر زوو ناتوانین ئەوەی کە بەڕاستی ڕووی داوە، لەگەڵ بیرکردنەوەکانمان سەبارەت بەوەی کە دەشیا چی ڕووی بدابایە، جیا بکەینەوە. خۆزگەکانمان، هیواکانمان، هەندێک جاریش ترسەکانمان، ئەمانە هۆکارە کۆنتڕۆڵکەرەکانی یادەوەریمانن.

یادەوەریی موعەرەزە بۆ وەرگرتنی شتێک، کە تەنانەت لە دەرەوەی ئەقڵیشەوەیە. منداڵ مەودای ئاگاییان کورتە و موعەرەزن بۆ کارلێکردن، بەڵام تەنانەت قوتابیی زانکۆش (لە هەموو تەمەنەکاندا) دەتوانرێت وایان لێ بکرێت شتێکیان بیر بکەوێتەوە، کە هەرگیز ڕووی نەداوە. لە یەکێک لە تاقیکردنەوەکانیدا، سایکۆلۆجیستی بەناوبانگی یادەوەری، Elizabeth Loftus ئیلابێس لۆفتوس، داوای لە باوانی هەندێک لە قوتابییەکانی کرد باسی هەندێک شت لە کاتی منداڵیی کچ و کوڕەکانیان بکەن. دواتر لەگەڵ قوتابییەکاندا دەربارەی ئەو ڕووداوانە دوا، بەڵام یەک-*دوو ڕووداوی*

*دروستکراویشی* تێکەڵ کرد. دوای کەمێک لە باسکردنی قوتابییەکان، ڕووداوە دروستکراوەکانیان "بیر کەوتەوە،" تەناتەن دیتەیڵی زیاتریان لەسەر ڕووداوەکان ئەخستە ڕوو. لە هەندێک لە حاڵەتەکاندا، قوتابییەکان نکۆڵییان دەکرد لەوەی کە ئەو ڕووداوانە ڕاستی نەبن و دروستکراو بن، تەنانەت دوای ئەوەش کە لۆفتۆس بۆی ڕوون دەکردنەوە، کە دروستکراوی خۆین و ڕاست نین.

## زانیاریی هەڵە Defeciant information

چلۆنایەتیی بڕوایەک دەکەوێتە سەر ڕادەی چۆنایەتیی ئەو زانیارییانەی کە پاڵپشتیی بڕواکە دەکەن. لەبەر ئەوەی جیهان بۆ خۆی ئاڵۆزە و ڕیاڵیتیش، واقیعیش زیاد لە دەموچاوێکی هەیە، بۆیە ڕێی تێدەچێت ئێمە زانیارییەکانمان هەڵە بن. چەندن ئەو شوفێرانەی بە هەڵە پێچ دەکەنەوە؟ یان ئەو کەسانەی سواری پاس یان شەمەندەفەری هەڵە دەبن؟ یان ئەو شوێفێرانەی بڕێکی زیاد یان کەمتر لە پێویست هەوا دەکەنە تایەی ئۆتۆمۆبیلەکانیانەوە؟ باشە ئەگەر زانیارییەکان لەم بابەتە سادەنەدا هەڵە بن، ئاخۆ دەبێت لە کێشە و باباتە ئاڵۆزەکاندا چۆن بێت، وەکوو بوارەکانی یاسا و پزیشکی و حوکمەتداری و ئایین؟

بەدڵنیاییەوە دەکرێت کەسێک ژیانی تەرخان بکات بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی کێڵگەیەکی، بابەتێکی دیاریکراوی فکری. بەڵام تەنانەت ئەو کەسانەش ناتوانن هەموو شتێک دەربارەی بابەتەکەی خۆیان بزانن. شتەکان زۆر بەخێرای ڕوو دەدەن. ئەوان ڕوو دەدەن تۆ بیانبینی یان نا. مەحاڵە بیانوەستێنی لە کاتێکدا پشوویەک ئەدەیت و قاوەیەک ئەخۆیتەوە یان حەمامێک دەکەیت. قوتابییەکی زانکۆ کە ٣ مانگە نەگەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، ڕەنگە بتوانی وێنەی دارە ڕەشە گەورەکەی دراوسێکەیان بهێنێتە

بەرچاوی خۆی، لە کاتێکدا رەنگە ٢ مانگ لەمەوبەر دارەکە براپێتەوە. رەنگە جەنگاوەرێک زۆربەی شەتەکانی شارۆچکەکەی خۆی لە یادەوەریدا هەڵگرتبێت ـ دیمەنەکان، دەنگەکان، بۆنەکان ـ کەچی کە دەگەڕێتەوە، سەیر دەکات بەشێک لە شەقامەکان زۆر گۆڕاون، قوتابخانە ئامادەییە کۆنەکە داخراوە و تازەترین ئۆتۆمۆبیلیش لە گەراجی هاوڕێکەیایەتی.

## تەنانەت ژیرترین کەسەکانیش دەکەونە هەڵەوە

تا ئێستا قسەمان لەسەر ئەوە کردووە، کە کەسەکان، تاکەکان دەکەونە هەڵەوە دەربارەی ئەو شتانەی بیریان لێ دەکەنەوە، هەروەها ئەو زانیارییانەی کە دەستیان دەکەوێت، دەشێت هەڵە بێت و ناتەواو بێت. ئەم حاڵەتە پەیوەندیی بە تاکەکانەوە هەیە. بەڵام ئەی حوکمی گروپێک کە بە دیقەتەوە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەن لە لێکۆڵینەوەکانی باشترین بیرمەندەکان، یان لە بەرهەمی ژیرترین پیاو یان ژنی گشت سەردەمەکان؟ ئایا لەم حاڵەتەدا بەرهەمەکە باشترە؟ بە خۆشحاڵییەوە، بەڵێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا زۆر شت دەمێنێتەوە کە شیاوی قسەلەسەرکردنە.

*زۆر کات رووی داوە، ئەو شتەی وەک حەقیقیەت لەلایەن کەسە بەناوبانگەکانەوە خراوەتە ڕوو، دواتر لە ڕۆژگارێکی تردا سەلمێنراوە کە هەڵە بووە.* بێگومان تۆ هەندێک نموونەت بیستووە. لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا، کاتێک گالیلۆ وتی خۆر چەقی کۆمەڵەی خۆری خۆمانە، ئەو تۆمەتبار کرا بە لە-دین-هەڵگەڕاوە و زیندانی کرا، ناچاریش کرا نادروستیی بۆچوونەکەی خۆی ڕابگەیەنێت. ئەو "حەقیقەتە"ی کە لەلایەن زانا ناودارەکانی ئەو کاتەوە قبوڵ کرابوو، بریتی بوو لەوەی کە زەوی چەقی کۆمەڵەی خۆرە، نەک خۆر.

ئەمانەی خوارەوە هەندێکی ترن لەو نموونانەی کە ڕەنگە نەتبیستبێتن، کە تێیاندا "حەقیقەت" دەر کەوتووە، کە حەقیقت نییە:

• بۆ ماوەیەکی زۆر پزیشکە سێرجەرییەکان لە کاتی نەشتەرگەریدا دەستکێشێکی لاسیکیان بەکار دەهێنا، کە بۆدرەی پێوە دەکرا. دواتر بۆیان دەر کەوت کە دەشێت ژەهراوی بێت. پاشان گۆڕییان بۆ نیشاستە {واتە لەبری بۆدرە، بە نیشاستە دایان پۆشی} پاشان ئەمیش سەلمێنرا کە کاریگەریی ژەهراویی هەیە لەسەر نەخۆشەکە.

• شارەزاکانی بواری فیلم لەو باوەڕەدا بوون، کە هەموو فیلمەکانی چارلی چاپلینیان دیراسە کردووە. کەچی لە ١٩٨٢دا فیلمێکی نەبینراوی چاپلینیان لە ژێرزەمینێکدا، لە ئەرشیفی سینەمایەکی بەریتانیادا دۆزییەوە.

• بۆ ماوەی سەدان ساڵ مێژوونووسان لەو بڕوایەدا بوون، کە خەڵکی پۆمپی کەوتوونەتە ژێر لێشاوی بورکانی چیای ڤیسیوڤینسەوە لە ساڵی ٧٩ی پێش زایین، بەڵام دراوسێکەیان کە هێرکیولانیۆمەکان بوون، توانیویانە ڕزگاریان ببێت. بەڵام دواتر دۆزینەوەی ٨ لاشە و (پاشماوەی سەدانی تریش) لەژێر خۆڵەمێشی بورکانەکەدا، سەلماندی کە زۆر لە هێرکیولانیۆمەکانیش بوونەتە قوربانی.

• داپیرە و باپیرەت فێر کراون کە تەنها ٨ هەسارە لە کۆمەڵەی خۆری خۆماندا بوونی هەیە. لەبەر ئەوەی ١٩٣٠ پلاتۆ دۆزرایەوە، بۆیە تۆ و دایک و باوکت ئەو چانسەتان هەبووە کە بزانن نۆ دانەن نەک هەشت. بەڵام ئەگەر لێکۆڵینەوەکانی جۆسێپ. ڵ. بڕادی لە زانکۆی کالیفۆرنیا ڕاست دەر بچێت، ئەوا منداڵەکانی تۆ فێر دەکرێن کە ١٠ هەسارە لە کۆمەڵەی خۆردا هەیە.

- دوای ئەوەی کە بۆماوەی چەندان ساڵ دکتۆرەکان مۆرفینیان بەکار دەهێنا وەک خاوکەرەوەی ئازار، دواتر دۆزرایەوە کە مۆرفین دەبێتە هۆی ئالوودەبوون. هەر بۆیە لێکۆڵەرەوەکان بەدوای بەدیلیدا دەگەڕان، کە نەبێتە هۆی ئالوودەبوون. سەرئەنجام، *هیرۆهین* دۆزرایەوە.

## حەقیقەت دەدۆزرێتەوە، نەك دروست بكرێت

با هەڵوێستەیەک بکەین و بزانین هەڵسەنگاندنەکانمان تا ئێستا چییان بۆ دەر خستووین. یەکەم: ئایدیا و بڕواکانمان بەدڵنیاییەوە لەژێر کاریگەریی ئەوانی تردان، بەتایبەت لە کاتی منداڵیدا. دووەم: هەستکردنەکانمان، تێگەیشتنەکان و یادەوەریمان ناتەواون، واتە بێخەوش نین. سێیەم: زانیارییەکانمان دەشێت ورد نەبن یان تەواو نەبن. لەگەڵ ئەمانەشدا، لە چاپتەری دوودا ئاماژە بە فاکتێک درا، کە توانای بیرکردنەوە لای هەندێک زۆر کەمە، بەداخەوە، یان ئەو توانایە بە شێوەیەکی کاریگەر ناخرێتە گەڕ، هەروەها ئەو ئایدیایەی کە دەڵێت "هەموو کەس حەقیقەتی خۆی بەرهەم دەهێنێت،" لە ڕاستیدا شوێنی گاڵتەجاڕی و پێکەنینە. ڕاستە ئێمە شتێک دروست دەکەین، بەڵام ئەو شتە حەقیقەت نییە. بەڵکوو *بڕوایە*، ئەو ئایدیایانەی ئێمە وەکوو حەقیقەت قبوڵی دەکەین، زۆر بەئاسانی دەشێت هەڵە بێت. کەواتە، ئایا ژیرانەترین تێگەیشتن دەربارەی حەقیقەت چییە؟

حەقیقەتی شتێک لەمەدا خۆی دەبینێتەوە - ڕاستی ناو شتەکە هەریەکەی بە گوێرە و ڕێژەی خۆی – سوور بوون و باوەڕەکانمان ڕاستن، کاتێک بەرمەبنای ئەم وردەکارییەن و (بەرمەبنای ڕاستییەکان بەگوێرە و ڕێژەی خۆی) هەڵەن، کاتێک دژ بەمەن.

حەقیقەتی شتێک بریتییە لە ڕاستیی ناو شتەکە بە گوێرە و ڕێژەی خۆی. هەر لێرەشەوە پێداگری و باوەڕەکانمان کاتێک ڕاست دەبن، کە

بەرمەبنـای ئـەم وردەکارییـە بـن {بەرمەبنـای ڕاسـتییەکان بـە گوێـرە و ڕێژەی خۆی}. کەواتـە بڕواکان و جەختکردنەوەکانمـان ڕاست دەر دەچن، ئـەو کاتـەی یـەک دەگرنـەوە لەگـەڵ ئـەو واقیعـەدا و هەڵـەن ئـەو کاتـەی یـەک ناگرنـەوە.

ئایا کاتی یارییەکـە تـەواو بـوو، پێش ئـەوەی یاریزانـی باسکەکە ئاخـر گۆڵی خۆی تۆمـار بکات؟ چۆن یاسـای کێشـکردنی زەوی کار دەکات؟ کێ کەپی سـەیارەکەتی دزیوە؟ ئایا سنوور بۆ کات/شـوێن هەیە لـە گەردووندا؟ حەفتـەی پێشـوو کێ دەمەقرەکـەی نێوان تۆ و دراوسـێکەتی هەڵگیرساند، تۆ یان دراوسـێکەت؟ ئایا بەقـەدەر توانـای خـۆت لـە کۆرسـەکەدا هـەوڵـت داوە؟ گـەڕان بـەدوای حەقیقەتدا لـەم حاڵەتانـەدا گەڕانـە بـەدوای ئـەو وەڵامانـەدا کـە کۆکن لەگـەڵ فاکتەکانـدا، ئەمـەش وەڵامـە *ڕاستەکانن*.

حەقیقـەت لـە ڕێـی کەشـفکردن، دۆزینـەوەوە بەدەسـت دەهێنرێـت، پرۆسـەیەک، کە هاوەڵە بە فزوڵیەت و جیدیبوون. حەقیقەت پشت نابەستێت بـە پێزانینـی ئێمـە بـۆی و بەهیـچ شـێوەیەک ناگۆڕێـت بـە جاهلبوونـی ئێمـە دەربـارەی، هەروەهـا بـە بیرکردنـەوە خۆزگەئامێزەکانـی ئێمـە ئـەو نانێتـە شـتێکی تـر. ئارامـگای پاشـا تیـوت نەهاتـە بـوون کاتێـک لەلایـەن شوێنەوارناسـەکانەوە دۆزرایـەوە؛ ئـەو لـەوێ بـوو چـاوەڕێ بـوو بێـن و بیدۆزنـەوە. کۆپییەکانی لۆحەیەک نابێت بە کۆپییە ڕاستەقینەییەکە کاتێک خەڵک گەمژە دەکرێن و وەک وێنە ڕاستەقینەییەکە پێیان دەفرۆشـرێتەوە. بـەس لەبـەر ئـەوەی کـە ئێمـە حـەز لـە جگـەرە دەکەیـن، ئەمـە وا نـاکات کـە جگـەرە بێزیـان بێـت.

ئاڵۆزی و سەرلێشـێواندنێکی زۆر سـەر هەڵدەدات دەربـارەی حەقیقـەت

لـه كێشـه ئاڵۆزەكاندا، كه تێیاندا دۆزینـەوه یان گوزارشـتكردن لـه حەقیقـەت كارێكـی قورسـه. سـەرنجی ئـەم پرسـیاره بده، ئایا لـه ڕاسـتیدا شـتێك هەیـه بـه نـاوی یوفـۆوه UHFO، كـه سـەرنشـینی فەزاییـی تێـدا بێـت؟ لەگـەڵ ئەوەشـدا كـه ئـەم پرسـیاره بـه شـێوەیەكی گەرموگوڕانـه دیبەیـت و گفتوگـۆی لەسـەر كـراوه و كەسـەكان هەوڵیـان داوه مەزەندەكانیـان وەك حەقیقـەت بخەنـه ڕوو، بـەڵام هێشـتا ئەوەنـده بەڵگـەی پێویسـت لـه بەردەسـتا نییـه كه بڵێن گەیشـتووینەته حەقیقەتـی یوفـۆ. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئەمـه بـەو مانایـه نایـەت كـه هیـچ حەقیقەتێـك دەربـارەی یوفـۆ لەئـارادا نییـە، یـان ئـەو كەسـانەی كـه ئارگۆمێنتـی بوونـی ئـەوان دەكـەن، لەگـەڵ ئەوانـەدا كـه ئارگۆمێنتـی نەبوونـی ئـەوان دەخەنـه ڕوو، هـەردوو لا بـه شـێوەیەكی یەكسـان ڕاسـتن. بەڵكـوو مانـای ئەوەیـه حەقیقـەت هەرچییـەك بێـت، ئێمـه هێشـتا خاوەنـی نیـن.

بـه هەمـان شێوه، ئاڵۆزی و قورسـی سـەر هەڵدەدات لـه زۆر پرسـیاری سـایكۆلۆجی و فەلسـەفیدا _ بـۆ نموونـه، بۆچـی هەندێـك خەڵـك سـێكس لەگـەڵ ڕەگـەزی پێچەوانـه دەكـەن و هەندێكـی تریشـیان هاوڕەگەزبازن؟ ئایا هـۆكاری تـاوان، جینەتیكه یان ژینگه یان تێكەڵەیـەك لـه هەردووكیان؟ ئایا مرۆڤـەكان بـه سروشـت توندوتیژن؟ ئایا ژیانـی دوای مـەرگ بوونـی هەیـە؟ چـی دەبێتـه هـۆی سـەركەوتن؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیاره و زۆر كێشـەی تریـش كـه تـۆ دەیانبینیـت، لـه ڕاهێنانەكانـی ئـەم كتێبـەدا زۆربـەی جـار ناتـەواون یـان جێی دڵنیایـی نین. بـەڵام لەگـەڵ ئەمانەشـدا، نابێت ئـەو بڕوایـەت لا لـەق بێت، كـه حەقیقەتـەكان هـەن بـۆ ئـەوەی كەشـف بكرێن.

لـه مـاوەی كاندیدكردنـی كلاڕێنس تۆمـاس Clarence Thomas لەلایـەن مەجلیسـی شـویخ بـۆ پۆسـتی دادگای بـاڵا، تۆمەتباركردنـی لەلایـەن ئەنتیا

هیلس Antia hills بە تۆمەتی هەراسکردنی جنسیەوە، مشتومڕێکی نەتەوەی لێ کەوتەوە. ئایا تۆماس تاوانبار بوو وەک ئەنتیا دەیوت، یان بێتاوان بوو، وەک تۆماس بەردەوام پێداگری لەسەر دەکرد. دەیان سەروتار و وتار و کتێب نووسران دەربارەی کێشەکە و بۆ ماوەی سەدان سەعات لە تەلەڤیزیۆنی ماڵەکانەوە سەیری لێکدانەوە و شیکردنەوەی بەڵگەکان دەکرا. زۆر خەڵک وەک خراپکارێک دەیانبینی و زۆری تریش وەک بێتاوانێک سەیریان دەکرد، کە بۆتە قوربانیی تۆمەتبارکردنێکی ناڕاست؛ زۆری تریش نەیاندەتوانی بڕیاری خۆیان بدەن. بەلام بەپێی تێگەیشتنی من، کەسێک ئارگۆمێنتێکی نەخستە ڕوو کە *هەردوو چیرۆکەکە ڕاستە*_ واتە تۆماس لە یەک کاتدا هەم بێتاوانە و هەم تاوانبار. ئەگەر کەسێک وەها ئارگۆمێنتێکی بخستایەتە ڕوو، ئەوا لەلایەن هەردوو لاوە هێرش دەکرایە سەری، تۆمەتبار دەکرا بەوەی کە قسەی بێمانا دەکات و لە نرخی کێشەیەکی ئاوا گرنگ کەم دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە شتێکی باو بێت کە هەرکەسە بە ناوی حەقیقەتی خۆیەوە قسە بکات "حەقیقەتی خۆم" و " حەقیقەتی خۆت" لە کێشەیەکی گرنگی وەک ئەوەی تۆماسدا، بەلام هێشتا خەڵک دەیانەوێت *حەقیقەتیان* بۆ دەر بکەوێت، واتە ئەو شتەی کە فیعلی ڕووی داوە.

هەبوونی حاڵەتێکی دروستی ئەقڵ right frame of mind دەتوانی لە کارگرانی گەشتەکەت بەدوای دۆزینەوەی حەقیقەتدا کەم کاتەوە و کارێک بکات، کە ئەزمونی ئەو حاڵەتە بکەیت، کە بیرمەندە گەورەکانی مێژوو لە گەشتەکەیاندا بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت ئەزموونیان کردووە. ڕێگەیەکی باش بۆ دەستپێکردن ئەوەیە، کە ئەم ئایدیایانەت لەخەیاڵ بێت: "دەزانم کە تواناکانم سنووردارە و دەکرێت بەئاسانی بکەومە هەڵەوە. بەدڵنیاییشەوە من ناتوانم هەموو ئەو وەلامانەم دەست بکەوێت، کە

دەمەوێت. بەلام خۆ دەتوانم بە شێوەیەکی دیقەتتر و وردتر سەرقالی وردبوونەوە و سەرنجدانەکانی خۆم بم و بە شێوەکی فراوانتر هەوڵ بدەم لە شتەکان تێبگەم. ئەگەر ئەمانە بکەم، ئەوا زیاتر لە حەقیقەت نزیکتر دەبمەوە".

دیارە ئەمە زۆر جیاوازە لەوەی بڵێین، "هەرکەسە خۆی حەقیقەتی خۆی دروست دەکات" یان بڵێین" هەموو دەکەوتە سەر ئەوەی تۆ چۆن سەیری حاڵەتەکە دەکەیت." نا بەڵکوو بەدڵنیاییەوە ئەمە زۆر مەعقولتر و ئاقڵانەترە.

# ڕاهێنانەکان

١. بیر لە حاڵەتێک بکەرەوە، کە بەم دواییە کەسێک تێیدا بە شێوەیەکی نامەعقولانە ئاماژەی بۆ "حەقیقەتی خۆم" کردبێت. دوو یان سێ پەرەگراف لەسەر حاڵەتەکە بنووسە و ئەوەی کە لەم چاپتەرەدا فێری بوویت، بۆ کەسەکەی ڕوون بکەرەرە.

٢. پرسیاری بنەڕەتی لە کۆمەڵناسیدا بریتییە لە کۆمەڵگە چۆن گەشە دەکات؟ سێ کەسی زۆر بەناوبانگ سێ وەڵامی جیاوازیان داوەتەوە. ئۆگۆست کۆم (١٧٩٨-١٨٥٧) دەڵێت ئەو گەشەکردنە بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت: ئایینی، میتافیزیکی، زانستی. هێربەرت سپێنسەر (١٨٢٠-١٩٠٣) بانگەشەی ئەوە دەکات، کە ئەو گەشەکردنە لە ڕێی داروینیزمەوە ڕوو دەدات "هەڵبژادنی سروشت،" کە تێیدا تەنها ئەوانە دەمێننەوە، کە بە باشترین شێوە لەگەڵ سروشتدا خۆیان دەگونجێنن. کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) ئارگۆمێنتی ئەوە سەر ڕێگە دەخات، کە گەشەکردنەکە لە ڕێگەی بەیەکدادانی چینەکانی کۆمەڵگەوە ڕوو دەدات، کە هۆکاری ئەمەش خراپبەکارهێنان و قۆرخکردنی ئابوورییە. ئایا بڕوابوون بە تیۆری ڕێژەگەرایی ـ ئەو ئایدیایەی کە دەڵێت هەموو کەس خۆی حەقیقەتی خۆی بەرهەم دەهێنێت ـ پاڵنەر و حەماسەتی کەسێک زیاد دەکات یان کەم دەکاتەوە بۆ شیکردنەوەی ئەو سێ گۆشەنیگا جیاوازانە و هەروەها هەوڵدانەکانی بۆ تێگەیشتن لە هۆکارەکانی گەشەکردنی کۆمەڵگە؟

وەڵامەکانت شی بکەرەوە.

٣. هەریەک لەم پەرەگرافانەی خوارەوە بخوێنەرەوە، بڕیار بدە تا چ رادەیەک مەعقول و ژیرانەن و وەڵامەکانیشت شی بکەرەوە:

a. ئەو کەسەی بڕوای وایە "هەرکەسە خۆی حەقیقەتی خۆی بەرهەم دەهێنێت" نابێت قەت ئارگۆمێنێت لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکات دەربارەی هیچ شتێک. چونکە ئەگەر بیکەن، ئەوا لەگەڵ بۆچوونەکەی خۆیاندا یەک ناگرێتەوە - چونکە لای ئەوان هەرکەسە خۆی حەقیقەتی خۆی دروست دەکات.

b. پاڵنەرەکانی پشت بەدواداگەڕانی هەرشتێک، پشت بەو ئایدیایە دەبەستێت کە هێشتا شتەکە نەدۆزراوەتەوە. کەسێک کە شتێکی بەنرخ ون دەکات، بۆ نموونە ئەڵقەیەکی ئەڵماس، ئەو کەسە بە دیقەت و بە پەرۆشەوە بەدوایدا دەگەڕێت تا دەیدۆزێتەوە. بەڵام تەنها گەمژەیەک بەردەوام دەبێت لە گەڕان *دوای دۆزینەوەی*. ئەمەش جیاواز نییە لە جۆرەکانی تری گەڕان، بۆ نموونە، گەڕان بەدوای حەقیقەتدا. هەر کە زانیمان بەدەستمان هێناوە، ئیدی پێویست ناکات بەدوایدا بگەڕێین.

٤. بۆ دەیان ساڵ قوتابییانی قۆناغی سەرەتایی لە تاقیکردنەوەی زانستدا رووبەڕووی پرسیاری "هەڵبژاردنی ڕاست یان هەڵە دەبوونەوە، بۆ پرسیارەکانی وەکوو: بازنگەکانی دەوری هەسارەی زوحەل لە ماددەی رەق پێک هاتووە." ئەگەر قوتابییەکە وەڵامی "ڕاست"ی هەڵبژاردایە، ئەوا نمرەی لەدەست دەدا، چونکە "حەقیقەت" بریتی بوو لەوەی بازنگەکان لە گاز یان تۆز دروست بوون. دواتر، لە ١٩٧٣، رادارەکان دەریان خست، کە هەموو وەڵامە هەڵەکان، ڕاست بوون. بازنگەکانی زوحەل لە ڕاستیدا لە ماددەی رەق پێک هاتبوون. ئەم حاڵەتە رەنگە وا لێک بدرێتەوە، کە

حەقیقەت دەگۆڕێت. ئایا لە ڕاستیدا حەقیقەت دەگۆڕێت؟ ڕوونی بکەرەوە.

٥. دیمەنەکە بریتییە لە ژووری ئەفسەرێکی پۆلیس لە قوتابخانەیەکدا {دیارە لە سیستەمی خوێندنی ئەمەریکیدا ئەفسەری پۆلیس لە قوتابخانەکەدا هەیە} کە تێیدا لێکۆڵینەوە لەگەڵ دوو قوتابیدا دەست پێ دەکات. کە پێش چەند خولەکێک لەمەوبەر، لە کافتریاکەدا ببوو بە شەڕەبۆکزیان. ئەفسەرەکە بەردەوام ئەم پرسیارەی لێ دووبارە دەکردنەوە، چۆن شەڕەکە دەستی پێ کرد. بەڵام وەڵامەکان پێچەوانەی یەکدی بوون. لەبەر ئەوەی هەر قوتابییە لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەوی دی تۆمەتبار بکات، بەوەی کە دەستپێشخەری کردووە، بەڵام هیچ شاهیدێک نەبوو، بۆیە ئەفسەرەکە هیچ ئومێدێکی نەبوو حەقیقەتی ڕووداوەکە کەشف بکات. بەڵام ئایا حەقیقەتێک لە ڕووداوەکەدا هەیە تا بدۆزرێتەوە؟ یان دوو دانە هەیە، هەر قوتابییە حەقیقەتی خۆی؟ ئەو ڕووناکییە فیکرییانە چییە، کە ئەم چاپتەرە دەیخایە سەر ئەم پرسیارە؟

٦. دیاردەیەکی سەیر کە ڕووبەڕووی ژمارەیەکی کەمی دانیشتووانی زەوی دەبۆوە، سەرنجی سایکۆلۆجیستەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. دیاردەکە لە کاتێکدا ڕووی دەدا، کە نەرویجییەکان پێیان دەوت"شەوەزەنگ" لە ناوچەیەکدا، کە دەکەوتە سەروو بازنەی قوتبی باکوورەوە، کە بە شێوەیەک تاریک دادەهات، وێنا نەدەکرا جارێکی تر ترووسکەی تێ بکەوێتەوە. دەر کەوت کە دیاردەکە کاریگەرییەکانی لەسەر خەڵکی ئەم ناوچەیە باش نییە، بگرە ترسناکیشە. لە خراپترین حاڵەتدا، خەڵک تووشی فشارێکی زۆر دەهاتن، ڕاڕایی بەردەوام، ترس، بیرکردنەوەی بەردەوام لە مردن، تەنانەت بیرکردنەوە لە خۆکوشتنیش، لە باشترین حاڵەتیشیدا، بریتی بوو لە نەمانی توانای تەرکیز، هەستکردن بە ماندووبوونێکی زۆر،

کەمیی گەرموگوڕی بۆ کردنی هەرشتێک، گومانکردن، بەخیلی. لە هەندێک حاڵەتیشدا، دەبووە هۆی کەمی خەو. بە هۆی تاریکییە بەردەوامەکەوە، خەڵکی سەریان لێ دەشێوا لە جیاکردنەوەی شەو و ڕۆژ لە یەکتری. ئەم دیاردەیە پرسیارێکی گرنگ قوت دەکاتەوە لە بەردەم حەقیقەتدا. ئایا دەکرێت بڵێین پێش ئەوەی دەروونناسەکان هەست بە دیاردەکە بکەن و شیی بکەنەوە، دیاردەکە بوونی هەبووە؟ یان دیاردەکە ئەو کاتە هاتە بوون، کە سایکۆلۆجیستەکان دیاردەکەیان ناسی و ئاگاداری بوون؟ {مەبەست لە کاریگەرییەکانی دیاردەکەیە بۆ سەر خەڵک، نەک خودی دیاردەکە}. دیاردەکە چ پەیوەندییەکی هەیە بە تۆوە؟ پێش ئەوەی تۆ بە دیاردەکە ئاشنا بیت، بە هۆی خوێندنەوەی لێرەدا یان خوێندنەوەی لە شوێنێکی تردا، ئایا "ڕاستیی دیاردەکە لە پەیوەندیدا بە تۆوە بوونی نەبووە؟" بەڵام ئایا x بەس لەبەر ئەوەی تۆ ئاگاداری دیاردەکە نەبوویت، ئەمە لە ڕاستیی بوونی دیاردەکە کەم دەکاتەوە؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەم چاپتەرەدا، پرسیارەکان وەڵام بدەرەوە.

٧. ئەم دیالۆگانەی خوارەوە هەڵبسەنگێنە لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لەم چاپتەردا فێری بوویت. ئەگەر هەستت کرد زانیاریی تەواوت نییە لەسەر بابەتێکیان، هەندێک لێکۆڵینەوەی لەسەر بکە.

a. مارتا: بەلامەوە گرنگ نییە مەحکەمە چی دەڵێت دەربارەی لەباربردن، من قەناعەتی تەواوم هەیە کە لەباربردن تاوانی کوشتنە، چونکە ئاوڵەمەکە {قۆناخە زۆر سەرەتاییەکانی دروستبوونی منداڵ} مرۆڤە.

مارینا: ئەگەر تۆ وا بیر دەکەیتەوە، ئازادیت، بەڵام بیرکردنەوەکەت مەسەپێنە بەسەر ئەوانی تردا، ڕێگر مەبە لە بەردەمیان تا مومارەسەی

مافی خۆیان بکەن.

مارتا: وا دیارە تۆ تێناگەیت. تەنها ئاوڵەمەکەی ناو ڕەحمی من، مرۆڤ نییە، بەڵکوو ئاوڵەمەی ناو هەموو ڕەحمی ژنەکانی تریش، بە هەمان شێوە مرۆڤن.

مارینا: قسەی هیچ. تۆ ئەو مافەت نییە بڕیار لەسەر ئەو شتە بدەیت، کە لە ڕەحمی ئەوانی تردایە. ئەوە کێشەی خۆیانە. تۆ باشترە سەرقاڵی کاروباری خۆت بیت.

b. باربی: نابێت ئەو پرۆگرامانەی لەسەر خۆکوشتنن، لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆنەکانەوە پەخش بکرێت.

کێن: بۆچی؟

باربی: چونکە هانی خەڵک دەدات خۆیان بکوژن.

کێن: ئەوە قسەیەکی زۆر بێمانایە. چۆن دەشێت بەرنامەیەکی درامایی یان دۆکیومێنتاری کە کارەساتی خۆکوشتن پیشان دەدات، وا لە خەڵک بکات خۆیان بکوژن؟

باربی: من نازانم ئەوە چۆن ڕوو دەدات. بەڵام ڕەنگە هەندێک کەس خۆیان بیریان لە خۆکوشتن کردبێتەوە، بەرنامەکەش زیاتر هانیان بدات بە کارەکە هەڵسن. یان ڕەنگە بە هۆی تەرکیزخستنەسەر لایەنی درامای کردارەکە، لایەنی تراژیدیی ڕووداوەکە لەبەرچاو نەگرن. بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام، ئەوەیە ڕێژەی هەوڵدانی خۆکوشتن زۆر بووە بە زیادبوونی ئەو جۆرە بەرنامانە.

c. مابێل: من سەرنجی ئەوەم داوە، هەرکات ڕۆژنامە دەگریت بە دەستەوە، یەکسەر دەچیتە سەر گۆشەی بورجەکان. ئەری ئەوە بە ڕاست، بڕوات بەو شتە بێمانایە هەیە؟

ئاڵفۆنسی: ئەوە شتێکی بێمانا نییە. هەسارەکان کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر ژیانی ئێمە هەیە؛ شوێنی ئەوان لە ئاسماندا، لە کاتی لەدایک بوونی ئێمەدا دەتوانن چارەنووسمان دیاری بکەن.

مابێڵ: تەسەورم نەئەکرد قسەیەکی وا بێمانام لە قوتابییەکی کۆلێجی زانستەوە گوێ لێ بێت.

ئاڵفۆنسی: گرفتەکە ئەوەیە کە تۆ ناتوانی تێبگەیت، کە ئەستێرەناسی زانستە، بگرە یەکێکیشە لە کۆنترین زانستەکان.

d. جاک: چاپتەری "حەقیقەت چییە؟" چۆن بوو بەلاتەوە؟

ڕۆکی: بێمانایە.

جاک: مەبەستت چییە ؟

ڕۆکی: ئەو چاپتەرە ناکۆکە لەگەڵ چاپتەری یەکەمدا.

جاک: تێناگەم چۆن؟ ناکۆکییەکە لەکوێدایە؟

ڕۆکی: لە چاپتەری یەکەمدا نووسەر دەڵێت، ئێمە دەبێت هەوڵ بدەین بۆ بەدەستهێنانی تاکایەتی و بۆخۆمان بیر بکەینەوە. کەچی لەم چاپتەرەدا دەڵێت، تێگەیشتنەکەی ئەو لەسەر حەقیقەت ڕاستە و ئەوەی ئێمە هەڵەیە و پێویستە دوای بیرکردنەوەکەی ئەو بکەوین. ئەمەش ناکۆکییە.

٨ دیالۆگ بە شێوەی گروپ: چەند جار بووە کە تۆ دڵنیا بوویت لە ڕاستیی شتێک، بەڵام پاش ماوەیەک، بۆت دەر کەوتووە کە بە سەهودا چوویت؟ لەگەڵ دوو یان سێ لە هاوپۆلەکانت، ئەم ڕاهێنانە ئەنجام بدە. خۆت ئامادە بکە، تا بتوانیت سەرنجراکێشترین و دراماتیکیترین ڕووداو بۆ قوتابییانی پۆلەکەت باس بکەیت.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە، پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی بەشە ناوخۆییی تێکەڵ و جیا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوزی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵە، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماقوڵترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیە کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

### ئایا بەربرپرسی یانە دیدەوانییەکان دەبێت مافی دەرکردنی ئەندامەکانی هەبێت لەسەر هاوڕەگەزبازی؟

جەمیس دالی، کە یەکێک بوو لە ئەندامانی یانەی دیدەوانی scout هەڵو، لە ڕۆژنامەیەکدا هەواڵێکی لەسەر بڵاو کراوەیە، کە گوایە سەرپەرشتیاری گرووپی بەرگریکردن لە مافی هاوڕەگەزبازی دەکات لە زانکۆی ڕوتگێرس. لەسەر ئەم مەسەلەیە دالی مافی ئەندامێتی لە یانەی دیدەوانیی هەڵۆی لێ سەنرایەوە و دەر کرا. چونکە بەرپرسانی یانەکە دەیانگوت هاوڕەگەزبازی پێچەوانەی ئەو بەها بەرزانەیە، کە

ئەندامەکانی لەسەر گۆش دەکەین. دالیش لە داداگا داوای لەسەر تۆمار کردن، بە بیانوی ئەوەی ڕووبەڕووی جیاکاری "تەمیز" بۆتەوە. لە وەلامی دادگاشدا، یانەکە دەیانگوت ئێمە وەک دامەزراوەیەکی تایبەت، مافی خۆمانە ڕێسا و یاسای تایبەت بە خۆمان هەبێت لەمەڕ مەرجەکانی بوون بە ئەندام لە یانەکەماندا. دادگای باڵای نیوجێرسی لە بەرژەوەندیی دالی بڕیاری دا، بەڵام داداگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دژی دالی بڕیاری دا. خەڵکی ئەمەریکاش دابەش بوون بەسەر دوو لایەندا، هەر وەکوو دادگاکان.

# چاپتەری چوارەم

## زانین واتای چی؟

سالی{ناوە بۆ ڕەگەزی مێ} سەری لەسەر ڕاهێنانەکەی هەڵگرت و لە هاوپۆلەکەی پرسیی، "چۆن وشەی *خەجاڵەتبوون* *embarrass* دەنووسرێت؟"

نانسی وەلامی دایەوە، "دڵنیا نیم، بەڵام وا بزانم دوو r دوو s تێدایە. ئاهـ لە ڕاستیدا نازانم."

ماریا زەردەخەنەیەکی باوەڕبەخۆبووانەی کرد، "نانسی، وای بۆ دەچم تۆ لە ڕێنووسدا کۆڵ بیت. شێوە ڕاستییەکی برتییە لە e-m-b-a-r-a-s-s. واتە تەنها یەک پیتی r."

لەم کاتەدا سالی دەستی دایە فەرهەنگەکە و بەدوای وشەکەدا کەوتە گەڕان، "با چێکی بکەین و بزانین کامیان ڕاستە، ها ئەواتانی، embarrass. دوو r دوو s، کەواتە تۆ ڕاستت کرد نانسی."

با سەرنجێکی ئەو دیالۆگەی سەرەوە بدەین. ماریا وەلامەکەی *زانی*، کەچی ئەو بەهەڵەدا چووبوو. سالی وەلامەکی *نەزانی*، کەچی ئەو لەسەر هەق بوو. سەیرە! باشە دەبێت ئەم "زانین"ە چ جۆرە شتێک بێت؟ کاتێک کە تۆ دەیزانیت، ئەوا لە ڕاستیدا تۆ نایزانیت، هەندێ کاتیش نازانیت، کەچی پێچەوانەکی بریتییە لە ڕاستی.

خۆشبەختانە هۆکاری سەرلێشێوانەکە بە هۆی ئەو هەستکردنەوەیە، کە گوایە شتێک دەزانین، کە لە ڕاستیدا نایزانین. ماریا ئەم هەستەی هەبوو. ئەو دڵنیا بوو لە ڕاستیی وەڵامەکەی، هەر بۆیە هیچ دوودڵییەکی پێوە دیار نەبوو. بەڵام ئەو لەمەدا بەهەڵەدا چووبوو.

## پێداویستییەکانی زانین

شوێنی نانسی لەوەی ماریا باشتر بوو، چونکە وەڵامی ڕاستی دایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو نەیەزانی بۆ زانین، پێویستمان بە شتێکە زیاتر لەوەی کە خاوەن وەڵامی ڕاست بین. بۆ زانین، جگە لە وەڵامی ڕاست، پێویستیشمان بە *درککردن* هەیە *بەوەی کە ئێمە خاوەن ئەو وەڵامە ڕاستەین*.

کێشەکە {واتە کێشەی زانین و پێداویستییەکانی} هەموو کات ئەوەندە سانا نابێت، وەک مەسەلەی ڕێنووسکردنی وشەیەک. بەڵکوو ڕەنگە کێشەکە پێویستی بە تێگەیشتن هەبێت لە ژمارەیەکی زۆر لە وردەکاری، یان لە زۆر پرنسیپی ئاڵۆز، یان لە قۆناغە یەک بەداوی یەکەکانی پرۆسەیەک. (هەروەها ڕەنگە پێویستی بە مەهارەتی-*چۆنێتی کردنی* شتێک هەبێت).

زانین هەمیشە ئاماژە بە شتێکی تریش دەدات، ئەویش توانای گوزارشتکردنە لەوەی کە دەیزانین و هەروەها گوزارشتکردن لەوەی چۆنیش گەیشتووین بەو زانینە. بەڵام مەرج نییە *هەمیشە* ئەم گوزارشتکردنە ڕوو بدات. ڕەنگە ئێمە ئەو توانایەمان نەبێت، تا لە ڕێی وشەوە گوزارشت لە مەعریفەی خۆمان بکەین. ڕەنگە هەندێک جار باشترین شت کە بتوانین بیڵێین بریتی بێت لە "ئەزانم و بەس" یان "من دەزانم چونکە دەزانم."

بەڵام ئەم جۆرە وەڵامانە لاوازن و بەدەگمەن ئەو کەسانە قانع دەکەن، کە دەیانەوەێت لە زانینەکانمان دڵنیا بن یان بەدەستی بهێنن.

## تاقیکردنەوەی زانیارییەکانی خۆت

لە خوارەوە هەندێک برگەی "مەعریفەی باو" {زانیاریی گشتی} خراونەتە ڕوو. بزانە بە چەندیان ئاشنایت، ئەگەر توانیشت، بزانە چۆن ئەو زانیارییانەت دەست کەوتووە. پێش ئەوەی بەردەوام بیت لە خوێندنەوەی چاپتەرەکەدا، ئەم لیستەی خوارەوە بخوێنەرەوە.

١. ئافرەت بە سروشت بەخێوکەرە، بەڵام پیاو وا نییە.

٢. لە ئەمەریکای ڕۆژئاوادا هیچ یان تەنها ژمارەیەکی زۆر کەمی ئەمەریکییە ئەفەریقاییەکان نیشتەجێن.

٣. دەربڕینی توڕەبوون، وا دەکات بڕەکەی کەم بێتەوە و ئارامیشمان بکاتەوە.

٤. پیوریتییەکان {ڕێبازێکی توندڕەوی پرۆتستانیەکانن} "پاک و خاوەن ئەخلاقی بەرز و بەحەیان".

٥. پێش ئەوەی کریستۆڤەر کۆلۆمبۆس جیهانە *نوێکە* بدۆزێتەوە، ئەمەریکییە ڕەسەنەکان لەناو یەک و لەگەڵ سروشتدا بە ئاشتی و هارمۆنی دەژیان.

٦. لێکۆڵینەوەکەی ئالفرێد کینسی دەربارەی ڕەهەندی سێکسی مرۆڤ، زۆر ئەکادیمی و بابەتییە.

٧. خاوەن پرۆژەکان لە وڵاتانی ترەوە کرێکاری ناکارامە دەهێنن بۆ ئەوەی پارە کەمتر سەرف بکەن.

٨. سەرەتای بەکارهێنانی کۆیلە دەگەڕێتەوە بۆ ئەمەریکای کۆلۆنیالکراو.

جێی سەرنج نابێت ئەگەر تۆ زۆربەی ئەو خاڵانەی سەرەوە "نەزانی".

بـه هەرحـاڵ، زۆر نووسـەر لەسـەر ئـەو بابەتانـە بەرهەمیـان نووسـیوە و بـە شـێوەیەکی بەربڵاویـش قبـوڵ کـراون. بـەڵام بـا بـەوردی سـەرنجی هەریەکەیـان بدەیـن.

١. باربـرا ڕەیزمـان فزولـی بـوو دەربـارەی ئـەوە ئایدیایـە، هـەر بۆیـە بڕیـاری دا لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بـکات. دۆزینەوەکانـی ئـەو ناکـۆک بـوو لەگەڵ ئـەو تێگەیشتنە باوەی بۆ مەسـەلەکە هەبوو. بە شێوەیەکی ئاشکرا، ئـەو پیاوانـەی بەرپرسـیار بـوون لـە بەخێوکردنـی منـداڵ یـان لـە دایـک و باوکـە پیرەکانیـان، هەمـان ئـەو مامەڵـە و سـیفاتانەیان تێـدا دەر دەکـەوت، کـە بـە شـێوەیەکی دیـار لـە ژنانیشـدا دەر دەکەوێـت. ئـەو خانمـە گەیشـت بـەو دەرئەنجامـەی کـە ئـەوەی بەرپرسـیارە لـەو سیفەتانە، بریتییـە لـە ڕۆڵـی کەسـێک لـە ژیانیـدا، نـەک ڕەگـەزی ئـەو کەسـە.

٢. فاکتـەکان پێچەوانـەی ئـەوە دەڵێـن، کـە "زانـراوە." بـۆ نموونـە، ٢٥٪ی ئەوانـەی ئاژەڵداری دەکـەن لـە ویلایەتـی تەکساسـی ئەمەریکـی، بـە ڕەگـەز ئەفەریقیـن، هەروەهـا ٦٠٪ی دانیشـتووانی لـۆس ئەینجلـس لـە بنەڕەتـدا خەڵکی ئەمەریکیی بە ڕەگـەز ئەفەریقین. هـۆی ئـەوەی بۆچـی ئـەم فاکتانـە بـە شـێوەیەکی بەربـڵاو نەزانـراوە، ڕەنگـە بگەڕێتـەوە ئـەو خەمسـاردییە ڕۆشـنبیرییە، کـە دەربـارەی ئەمەریکاییـە ئەفریقییـەکان هەیـە لـە سـەرچاوە مێژووییەکانـدا.

٣. تێگەیشـتنی بـاو و قبوڵکـراو لێرەشـدا کەوتۆتـە هەڵـەوە. دوای لێکۆڵینـەوە لـەو فاکتانـەی کـە دەربـارەی تووڕەبـوون هـەن، کارۆل تاڤیـرس گەیشـتە دەرئەنجامـێک: "هـۆکارە جەوهەرییەکانـی ئارامبوونـەوەی دەروونی، ناتوانرێـت لـە ڕێـی لێکۆڵینەوەیەکـی مەیدانییـەوە دەستنیشـان بکرێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا، بەشـێکی زۆری فاکتـەکان پێچەوانـەی تێگەیشـتنە باوەکـە

دەسەلمێنن: دەربڕینی تووڕەیی، تووڕەتر دەکات، پەرچەکردارەکان توندتر دەکات و دەبێتە هۆی بنیاتنانی خووڕەوشتی توندوتیژانە. ئەگەر لە بەرامبەر تورەبوونە کاتییەکاندا بێدەنگی هەڵبژێریت، خۆت سەرقاڵ بکەیت بە شتێکی خۆشەوە {ئارامبەخشەوە} تاکوو فشاری تورەبوونەکەت خاو دەبێتەوە، ئەوا چانسی ئارامبوونەوە زۆر زیاترە لەوەی بقیژێنیت و تورەبوونەکەت دەر ببڕیت.

٤. لەگەڵ ئەوەشدا کە پیوریتییەکان سێکسیان نەکردووە هەتا نەگیشتوونەتە قۆناغی هاوسەریتی، بەلام ئەوان بەئاشکرا قسەیان لەسەر بابەتەکە کردووە، لەناو پرۆسەی هاوسەرگیریشدا سێکسیان کردووە و هەستیار نەبوون دەربارەی. کێشەکە لەوەدایە، خەڵک پیوریتییەکان لەگەڵ ڤیکتۆرییەکاندا {ئەوانەی لە سەردەمی شاژنی بەریتانیادا ڤیکتۆری ١٨٣٧- ١٩٠١دا ژیاون، کە زۆر داخراو و دەمارگیر بوون لەسەر کێشە ڕەوشتییەکان}. تێکەڵ کردووە.

٥. ئەمەیان بەتەواوەتی هەڵەیە. تەنها ژمارەیەکی کەمی ئەو هۆزانە ئاشتیخواز بوون، لێ زۆرینەیان شەڕخواز بوون و زۆر دڕەندانە منداڵ و ژنیان دەکوشت و زۆر دڵڕەق بوون لەگەڵ دیلەکاندا. هەندێک لە هۆزەکانی تریش مرۆڤیان کردووە بە قوربانیی خواکانیان و پیرەکانی خۆیان کوشتووە، تەنانەت مرۆڤیشیان خواردووە {کانیباڵیزم}. بۆ ئەوەش کە گوایە لەگەڵ سروشتا لە هارمۆنیدا بوون، زۆر هۆز، داری دارستانەکانیان بڕیوەتەوە و بە پۆل و ڕان ئاژەڵیان کوشتووە.

٦. ئیشەکانی ئالفرێد کینیس لەسەر ڕەهەندی سێکسی ئینسان وەسف کراوە بە بابەتیبوون - ئەکادیمیبوون و بۆ ماوەی نیوسەدە بەهێزی

و گرنگیی خۆی لەدەست نەداوە. لە ڕاستیدا، بووە بە بناغەکانی سایکۆسێرییی {چارەسەرکردنی کێشە دەروونییەکان} پەروەدە و تەنانەت ئایینیش. زۆر سەیرە کە لەم ماوە درێژەدا کەس بە شێوەیەکی ڕەخنەیی نەیخوێندەوە، پێش ئەوەی جودش ئەی ڕەیزمان و ئیدوارد دەبلیو ئەو کارەیان کرد. ئەوان ئاماژە بەوە دەدەن، کە ئەو لایەنگیرییە توندەی کە کینسی کارەکانی لێوە دەست پێ کردووە، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دەرئەنجامی کارەکانی داناوە. ئەو لە هەوڵی ئەوەدا بوو، کە بیسەلمێنێ هێترەسێکسوالیتی {سێکسی نێوان ڕەگەزی نێر و مێ} ناسروشتییە وە ئەوەی وای کردووە ئاسایی بێت، تەنها بریتییە لە ڕاهاتن و شەرم؛ هەر بۆیە سێکس لەنێوان پیاوێک و ژنێک سروشتیتر نییە لە سێکسی نێوان دوو پیاو یان دوو ژن یان پیاوێک و منداڵێک یان پیاوێک و ئاژەڵێکدا؛ هەر بۆیە بایۆسێکسوالیتی {سێکس لە گەڵ هاوڕەگەز و ڕەگەزی پێچەوانە} دەبێت وەک نۆرمێک لە ڕەهەندی سێکسی مرۆڤ تەما شابکرێت. کاتێک ئەبراهەم ماسلۆ بۆ کینسی ڕوون کردەوە کە ڕێبازەکەی زانستی نەبووە، کینسی سووکوبارێک ئەو ڕەخنەیەی پشتگوێ خست. کینسی تا ئەو ڕادەیە ڕۆیشتووە، کە بڵێت ئینسێست {سێکسی نێوان ئەو کەسە نزیکانەی لە ڕووی یاساییەوە ڕێیان پێ نادرێت هاوسەرگیری پێک بێنن، بۆ نموونە ئەندامانی یەک خێزان} دەتوانێت قانعپێکەر و بەسوود بێت، هەروەها ئەوەی وای کردووە منداڵان حەز بە سێکسکردن نەکەن لەگەڵ گەورەکاندا، بەتەنها دەگەڕێتەوە بۆ تەسکبینیی باوانیان و ڕێگریی یاسا. نووسەر ئەو بانگەشەیە دەکات، کە کینسی لە لێکۆڵینەوەکەیدا گروپێک لە نۆ تاوانباری دامەزراندووە، تا لە ڕێی دەست و دەمەوە هانی چەند سەد کۆرپە و منداڵێک بدەن، تا بگەنە ئۆرگازم {لووتکەی لەزەتی سێکس}.

٧. لە ڕاستیدا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کرێکارانی هاوردە گرانترن لە

کرێکارانی ناوخۆیی، ئەمەش بە هۆی کرێی هاتووچۆوە. بۆ نموونە، لە پرۆژەی دروستکردنی سکەی قیتار لە رۆژهەلاتی ئەفەریقادا کرێکارانی هیندی هەڵبژێردران لە بری کرێکارانی ناوخۆی ئەفەریقا. بە هەمان شێوە، کرێکارانی چینی هەڵبژێردران وەک لە مالیزیای داگیرکراو. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، کرێکارانی هاوردە زیاتر کەوتوون وەک لە کرێکارانی ناوخۆ، *بەلام نرخی تێچوونی هەربەشێک لە پرۆژەکان، کەمتر بوو - ئەوەیش بە هۆی ئەوەی کرێکارانی هاوردە بەرهەمیان زیاتر بووە*. لەم کەیسە و کەیسەکانی تردا، گرنگترین فاکتەری هەڵبژاردنی کرێکارانی هاوردە لەبری کرێکارانی ناوخۆ دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کرێکارانی هاوردە "ئیشکەرتر، جێمتمانەتر و کارامەتر و وردترن."

٨ ئەم ئایدیایە هەڵەیە. کۆیلایەتی مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر و دەکەوێتە پێش ئیسلام و بودیزم و مەسیحیەتیشەوە. ئەو دیاردەیە لەناو ڤینیسییەکان و یۆنانییەکان و جوولەکەکان و چاینییەکان و هەروەها مەسیحییەکان و زۆری تریشدا بەربلاو بووە. هۆزە ئەمەریکییە رەسەنەکان یەک لەدوای یەک بەکۆیلە کراون، زۆر پێش ئەوەی کۆلۆمبۆس بگاتە ئەوەی. بەڵکوو ئەوەی ئەمەریکا جیا دەکاتەوە لەوانی تر، ئەوەی لە *کۆتاییان* بە کۆیلایەتی *هێناوە*، نەوەک بلاویان کردبێتەوە. کۆیلایەتی چەند دەیەیەک بە یاسا قەدەغە کرابوو لە نیوەگۆی رۆژئاوای زەوی، پێش ئەوەی لە ئەفەریقا و ئاسیا و رۆژهەلاتی ناوەراستا قەدەغە بکرێت.

هەتا زیاتر دەربارەی ئەو هەشت برگەیەت "زانیبێت،" هەتا زیاتر لێیان دڵنیا بووبێتی، ئەوا ئەوەندە زیاتر کێشەت دەبێت لەگەڵ قبوڵکردنی روونکردنەوەکاندا {راستتر بە روخستنەوەکاندا}. رەنگە بە خۆت بڵێیت "حەتمەن ئەو روونکردنەوانە دەبێت هەڵە بن. ئەو کەسانە کێن کە

رۆگیرۆ {نووسەری کتێبەکە} ئاماژەی پێ داون؟ ئایا ئەوان کۆمەڵێک رۆشنبیری گەورەن؟ من گومان لە هەموویان دەکەم." ئەم پەرچەکرداوە چاوەڕوانکراوە، چونکە زۆربەی جار ئەو هەستەی کە هاوجووتە لەگەڵ زانینەکەدا، زۆر بەهێزە {واتە هەستکردنە بەوەی کە من ئەو شتە دەزانم}. بەڵام بیرکەرەوە رەخنەییەکان هەر زوو سنوورێک بۆ ئەم پەرچەکرداوە دادەنێن. فەیلەسوفی کۆنی یۆنانی، ئیپیکتێیۆس Epictetus هۆشیارکردنەوەیەکی هەیە لەسەر ئەم بابەتە، "خۆت رزگار بکە لە خودپەسەندی، فیز. لەبەر ئەوەی مەحاڵە بۆ هەرکەسێک کە دەست بکات بە فێربوون، لە کاتێکدا هەست بکات کە ئەو دەزانێ."

ئایا ئێستاش قایل نیت بە رێبەتاڵکردنەوەی {پێچەوانە سەلماندی} زانیارییە قبوڵکراوە باوەکان؟ کەواتە ئەم مەعریفە باوانە لەبەرچاو بگرە، کە چەند سەدەیەک وەک حەقیقەت سەیر دەکران. لەوانە، تەنێکی قورس خێراتر دەکەوێتە خوارەوە وەک لە تەنێکی سووک، یان ئەوەی کە دەڵێت، دڵ سەرچاوەی ئاگاییە نەک ئەقڵ. هۆشیاریی باوی سەردەمەکانی پێشوو بە هەمان شێوە ئایدیای فڕینی ئامێرێکیشی رەت دەکردەوە، یان ئەوەی کە مرۆڤەکان بتوانن پەیوەندی بە یەکدییەوە بکەن لەنێوان شارە جیاوازەکاندا، یان ئەوەی وێنەی ئەندامێکی ناوەوەی مرۆڤ بپشکنرێت بێ هەڵدڕین. کەواتە ئەم چەشنە "مەعریفەیە" {ئەم هۆشیارییە باوە} کە لە راستیدا کورتبینە و لە ئێستاشدا سادە و ساکار دەر دەکەون، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەندێک لە تاکەکان ئەو ئیرادەیەیان هەبووە، کە بپرسن ئایا ئەوەی من و ئەوانی تریش پێمان وایە دەیزانینم، ئایا لە راستیدا دەیزانین؟ ئەم پرسیارە یەکێکە لە گرنگترین ئامرازەکانی ناو بیرکردنەوەی رەخنەیی.

## چۆن زانین بەدەست دەهێنین

بە دوو شێوە مەعریفە بەدەست دەهێنرێت، چالاکانە actively و ناچالاکانە passively . چالاکانە لە ڕێگەی ئەزموونکردنی ڕاستەوخۆوە، لە ڕێگەی تێستکردن و سەلماندنی دروستی ئایدیاکەوە بەدەست دەهێنرێت (وەکوو لە تاقیگە زانستییەکاندا ڕوو دەدات) و یان لە ڕێگەی بیرکردنەوەی ئەقڵییەوە reasoning بەدەست دەهێنرێت. کاتێکیش ڕێگەی بیرکردنەوەی ئەقڵی بەکار دەهێنرێت، کێشەکە شی دەکرێتەوە و هەموو فاکتەکان و ئەگەر و تەفسیرەکان لەبەرچاو دەگیرێت و پاشان بەرمەبنای ئەمانە دەرئەنجامێکی لۆجیکی بەدەست دەهێنرێت.

ڕێگەی ناچالاکانەی بەدەستهێنانی زانیاری ڕوو دەدات، کاتێک کەسێکی تر زانیارییەکەمان پێ دەدات. بەشی زۆری فێربوونەکانمان لە پۆلەکانی خوێندندا دەچێتە خانەی ڕێگەی ناچالاکانەوە، بە هەمان شێوە، لە کاتی سەیرکردنی تەلەفزیۆن و خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا، شێوازی فێربوون بریتییە لە شێوازی ناچالاک. بە شێوەیەک داڕێژراون، تا بمانکاتە وەرگرێکی ناچالاک. هەر بۆیەشە ڕۆژانە ئێمە پشتیان پێ دەبەستین لە کاتی پەیوەندیکردنمان بە هاوڕێ و هاوپیشەکانمانەوە.

بەداخەوە، فێربوونی ناچالاکانە زۆر دەرئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. ئەم جۆرە فێربوونە کارێک دەکات، بە شێوەیەکی نارەخنەیی ئەوەی ئاراستەمان دەکرێت، وەر بگرین تەنانەت لەو کاتانەشدا کە ئەوەی دەیبیستین، هیچ نەبێت جگە لە بوختان و دیعایە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان یاریی پڕوپاگەندەت کردووە؟ یارییەکە بەوە دەست پێ دەکات، کە کەسێک پەیامێک دەنووسێت و پیشانی هیچ کەسێکی نادات.

پاشان وشەبەوشە پەیامەکە بە گوێی کەسێکی تردا دەچپێنێت. لە دواییدا ئەو کەسەش پەیامەکە بە گوێی کەسێکی تردا دەچپێنێت، بەم شێوەیە تا هەر هەموو بەشداربووانی یارییەکە پەیامەکە دەبیستن. دواهەمین کەس ئەو پەیامەی کە بیستوویەتی، وشەبەوشە وەک ئەوەی بیستوویەتی، دەینووسێتەوە. دواتر هەردوو نووسراوەکە بەراورد دەکرێت بە یەکتری. بە شێوەیەکی گشتی، بە هۆی گواستنەوەی پەیامەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، گۆڕان بەسەر پەیامە ئەسڵییەکەدا هاتووە، هەندێک جاریش گۆڕانەکە زۆر و بەرچاوە.

ئەوەی کە ڕوو دەدات لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕێک لەم یارییە دەچێت. هیچ دوو وشەیەک بە تەواوەتی هەمان مانا ناگەیەنن. هەر بۆیە کاتێک کەسەکان چیرۆکەکان لە ڕێی وشەکانی خۆیانەوە دەگێڕنەوە نەک لە ڕێی دووبارەکردنەوەی وردی ئەوەی بیستوویانە، گۆڕان بەسەر چیرۆکەکاندا دێت. هەروەها ئەمەش ئەوە دەر دەخات کە زۆربەی کەسەکان گوێگرێکی ورد نین. زۆر کەسیش چێژ دەبینن لەوەی ئیزافەی داهێنەرانەی خۆیان بکەن، گەشەی پێ بدەن، نەخشی بکەن بە شێوازی تایبەتیی خۆیان. ئەم ویستی ئیزافەکردنە لە هەردوو حاڵەتی ئاگایی و نەستیشدا ڕوو دەدات. بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکەدا کاریگەرییەکە، هەر یەکە _ ئەوانەی گوێبیستیان دەبن وا هەست دەکەن کە دەزانن.

ئەم پرۆسەیە تەنها ڕوو نادات لە مامەڵەی ڕۆژانەی مرۆڤەکاندا، بەڵکوو لەناو ڕۆشنبیران و نووسەرانیشدا ڕوو دەدات: "دەربڕینی ڕایەک لەلایەن نووسەرێکەوە، لەوانەیە وەک فاکتێک لەلایەن نووسەرێکی ترەوە دەر ببڕێتەوە، کە لەوانەشە ئەمیش ببێتە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ کەسێکی تر، ئیدی ڕەنگە ئەم پرۆسەیە هەروەها بەردەوام بێت، تا وەکوو

کەسێک دێت و پرسیار لە دروستیی ئەو فاکتە دەکات، کە نووسەری یەکەم ڕاکەی خۆی پێ پشتڕاست کردۆتەوە یان لە ڕێگەی گومانکردن لەو تەفسیرانەی کە نووسەرەکە لەسەر ئەو فاکتانە دەری بڕیون."

## بۆچی زانین کارێکی دژوارە

یەکێک لەو هۆکارانەی وا دەکات زانین کارێکی دژوار بێت، ئەوەیە پرسیارە کۆنە وەڵامنەدراوەکان بەردەوامن لە تەحەداکردنی وەڵامەکان، پرسیارگەلێکی وەکوو هۆکانی شێرپەنجە چین؟ باشترین شێوازی پەروەردەکردنی منداڵان چییە؟ چۆن دەتوانین ڕێ لە تاوان بگرین بەبێ سنووردارکردنی ئازادییە تاکەکەسییەکان؟

هۆکارێکی تر کە وای کردووە زانین کارێکی دژوار بێت، ئەوەیە ڕۆژانە ئێمە ڕووبەڕووی کێشەی وا دەبینەوە، کە هیچ نموونەیەکی نییە لە ڕابردوودا. کاتێک گەشە بە نەشتەرگەریی دەماغ، ناسراو بە لۆبەتۆمی، lobotomy، درا {نەشتەرگەرییەکە کە تێیدا ئەو بەشەی پێشەوەی مێشک، کە بەرپرسیارە لە توورەیی دەبڕدرێت و دەر دەهێنرێت} بۆ خاوکردنەوەی هەڵچوونە بەهێزەکان، پرسیار دەرهەق بە ئەخلاقی بوونی ئەم "چارەسەرکردنە" قوت دەکرایەوە، چونکە دەبووە هۆی لەناوبردنی ڕەهەندێکی هەستیاری مرۆڤ. کاتێک توانرا دڵی گواستراوە و دڵی دەستکرد بەکار بهێنرێت لە نەشتەرگەریی دڵدا، کێشەی ئەوە سەری هەڵدا، کە کام لە نەخۆشەکان دەبێت چانسی چارەسەریان پێ بدرێت. هەروەها کێشەی ئەوەی کە چۆن قوربانییە خۆبەخشەکان قبوڵ بکرێن. هەروەها لەدوای ئەوەی کە زیانەکانی جگەرە دۆزرایەوە کە هۆکاری چەندان نەخۆشیی ترسناکە، ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە بووینەوە، کە تا چەند ژیرانەیە ڕێ بە ڕیکلامی بازرگانیی جگەرە بدەین، کە بینەرانی

تەلەڤزیۆن هەڵدەخەڵەتێنێت و هانیان دەدات زیان بە خۆیان بگەیەنن. لەم دواییەشدا کە دەر کەوت جگەرەکێشان نەک تەنها بۆ جگەرەکێش، بەڵکوو زیان بە کەسانی چواردەوریشی دەگەیەنێت، ئیدی دیبەتێک هاتە مەیدان دەربارەی مافی جگەرەکێش و کەسانی چواردەوری لە شوێنە گشتییەکاندا.

لەگەڵ ئەمانەشدا، کێشەیەکی تر ئەوەیە کە کاتێک نەوەیەک پێش نەوەیەکی تر دەکەوێت، مەعریفە زۆر جار یان فەرامۆش دەکرێت، یان بە شێوەیەکی گەمژانە ڕەت دەکرێتەوە. بۆ نموونە، یۆنانییە کۆنەکان زانیبوویان کە نەهەنگ سیی هەیە لە جیاتی گوێچکەماسی {ئەو ئەندامەی کە ماسییەکان بۆ هەناسەدان بەکاری دەهێنن} هەر بۆیە وەکوو گیانەوەرە مەمکدارەکان {شیردەرەکان} پۆلێنیان کردوون. لەگەڵ ئەوەشدا، لە دواتردا ڕۆمانییەکان نەهەنگەکانیان بە ماسی ناوزەند کرد و ئەم ئایدیا هەڵەیە تا سەدەی حەڤدە لە مێشکی ڕۆژئاواییەکاندا چەسپا. پیاوێک لە سەدەی حەڤدە بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە نەهەنگ لە گیانەوەرە مەمکدارەکانە، دواتریش کەسێکی دی ئەمەی سەلماند و وەک فاکتێک قبوڵ کرا. بەم شێوەیەش ڕۆژئاوا بۆ جاری دووەم حەقیقەتەکەی دۆزییەوە.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، ئایدیای "گوناح" و "هەڵە" وای لێ هاتووە، کە وەکوو ئایدیایەکی بێسوود و زیانبەخش وێنا بکرێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوکەرانی پیوریتانی {ئەم ڕێبازە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدە و حەڤدە لە بەریتانیا، کە بڕوایان وا بوو هەوڵدانی زۆر و خۆکۆنترۆڵکردن چاک و پێوستە، لە بەرامبەردا چێژ، هەڵە و ناپێویستە}. "ئەخلاقی نوێ" هانی خەڵک دەدات تا ئەم ئایدیا کۆنە بەسەرچووانە بخەنە لاوە، چونکە ڕێگرن لە بەردەم بەختەوەربوون و تێربووندا. پاشان کارڵ مێنینگەر کە یەکێکە لە ڕێبەرانی پزیشکانی دەروونناسی ئەمەریکی، کتێبێکی نووسی

بە ناوی whatever became of sin. کە تێیدا ئارگۆمێنتی ئەوە سەرڕێ دەخات، کە ئایدیا "گوناح" و "هەڵە" هەم چاکن و هەم پێویستن بۆ کۆمەڵگە شارستانییەکان. بە شێوەیەکی تر، ئەو دەڵێت ڕەتکردنەوەی ئێمە بۆ ئەم چەمکانە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەم زۆر زوو، هەم زۆر گەمژانەش بوو.

هەندێک جار وێنەی مەعریفە دەکرێت وەکوو شتێکی مردوو کە لەسەر ڕەفە تۆزاوییەکان لە کتێبخانە تاریکەکاندا هەڵگیراون. بەداخەوە، کەشە خامۆشەکەی کتێبخانە دەڵێی کڵێسایەکی بچووک یان گۆڕستانێکە. بەڵام ڕووکەش هەڵخەڵەتێنەرە. ئایدیاکانی سەر ئەو ڕەفانە لە زیندوو زیندووترن، تەنانەت زۆر جار خوێناویانە لەگەڵ یەک دەجەنگن. با سەیرێکی ئەم حاڵەتانەی لای خوارەوە بکەین.

ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت کۆلۆمبۆس یەکەم کەس بوو لە ئەوروپا و ئەفەریقا و ئاسیاوە، کە لەسەر کەنارەکانی باکوور و باشووری ئەمەریکا لەنگەری گرت، بە شێوەیەکی بەربڵاو قبوڵ کراوە. بۆچوونی پێچەوانەی ئەم ئایدیایە بەردەوامە لە ڕەخنەگرتنی بۆچوونە باوەکە. (بەڵگەکان دژی کۆلۆمبۆس لە زیادبووندایە: دۆزینەوەی بەرهەمێکی گڵکاریی یابانی لە ئیکوادۆر نیشانە دەدات بە هاتنی دەریاوانە زۆر کۆنەکان لە سیدۆنەوە لە ساڵی ٥٤١ پ. ز. هەروەها هاتنی یۆنانی و جوولەکە کۆنەکان لە ساڵی ٢٠٠ پ. ز، هەروەها ڤاکینگەکان لە ٨٧٤ پ. ز) (دواهەمین بەڵگەش ئاماژە بەوە دەدات، کە ڕەنگە کۆرییەکان ئەمەریکایان لە ٢٥٠٠ پ. ز. دۆزیبێتەوە).

ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت مێژووی کۆیلایەتی و نەبوونی و هەژاری بۆتە هۆی ئەوەی ئەمەریکییە بە ڕەگەز ئەفەریقییەکان کەمتر ڕێز لە خۆیان بگرن self-esteem {ڕێزگرتن لە خۆ، بڕوابوون بە بەها و توانای

خۆ} وەک لە سپییستەکان بەباشی ڕەگی داکوتیبوو، تا دواجار ئەم ئایدیایە ڕەت کرایەوە لەلایەن دوو لێکۆڵەری کۆمەڵناسیی بەریتانی، جیرۆڵد هیسس Jerold Hiss و سوزن ئەونس susan owens. لێکۆڵینەوەکەیان دەری خست، سێلفە ستیمی کلاسی ناوەندی ئەمەریکییە بە ڕەگەز ئەفەریقییەکان، هاوشێوەی کلاسی ناوەندی سپییستەکانە - هەروەها سێلفە ستیمی کلاسی خوارەوەی ئەمەریکییە بە ڕەگەز ئەفەریقییەکان، زیاترە لە هی کلاسی خوارەوەی سپییستەکان.

زۆرن ئەوانەی کە بڕوا بە و ئایدیایە دەکەن، کە دەڵێت لە کاتێکدا بچووکترین منداڵی ماڵ، ماڵ بەجێ دەهێڵێت، دایک و باوکی تەمەن مامناوەند، بەتایبەتیش دایکەکان، زۆر بەتوندی خەمبار دەبن و هەست دەکەن ئیدی ژیان کۆتایی هاتووە. بەڵام بە لایەنی کەمەوە لێکۆڵینەوەیەک هێرشی کردۆتە سەر ئەم ئادیایە. لێکۆڵینەوەکە پیشانی دەدات کە زۆر لە باوان، بگرە زۆربەی هەرە زۆریان بە هیچ شێوەیەک خەمبار نابن؛ بگرە ئەوان بە چاوی ئومێدەوە چاو لە ژیانێکی سادەتر و کەمزەحمەتتر دەبڕن.

بە هەمان شێوە، هەتا ئەم دواییەش زۆربەی زاناکانیش لەو بڕوایەدا بوون کە پیری دەرئەنجامی خراپبوونی فیزیکی مێشکە، هەروەها پیری هەم پرۆسەیەکی بەردەوامە و هەم حەتمیە. بەڵام لێکۆڵینەوەیەک لە خەستەخانەی ئەلباما ڤێرترنس دەری خستووە، کە لە زۆربەی کەیسەکاندا نیشانەکانی پیری وەکوو _ پەشۆکاوی، سەرلێشێواوی، خۆدزینەوە لە واقیع، دەتوانرێت بوەستێنرێت، بگرە تەنانەت چارەسەریش بکرێت "لە ڕێی پرۆگرامێکی سادەوە، کە ئامانجی ئەوەیە کەسە بەتەمەنەکە لە پەیوەندیدا بهێڵێتەوە لەگەڵ ژینگەی چواردەوردا."

دەیان نووسین و کتێب دەربارەی "دووبارە بەدەستهێنانەوەی هێز و توانا second wind"ی وەرزشەوانان نووسراوە. بەڵام نێلس هومفێری و ڕۆبەرت ڕیولینگ لە زانکۆی یوتاھ utah بەڵگەیان لەسەر هەڵبوونی ئەم ئایدیایە خستۆتە ڕوو، ئەوان دەڵێن شتێک نییە بە ناوی "دووبارەبەدەستهێنانەوەی هێز و توانا،" بەڵکوو ئەو هەستەی کە وەرزشەوانەکان ئەزموونی دەکەن، تەنها بریتییە لە هەستێکی سایکۆلۆژیی پەتی.

## حیکایەتێکی هۆشیارکەرەوە

تەنانەت پسپۆڕەکانیش کە تازەترین ئامرازە زانستییەکان بەکار دەهێنن لە لێکۆڵینەوەکانیاندا، ڕەنگە نەتوانن دڵنیایی {حەقیقەت} بەدەست بهێنن. بۆ نموونە، با سەیری ئەو ئاستەنگییانە بکەین، کە لەلایەن خێڵی تاسادەییەوە Tasaday خراوەتە بەردەم مرۆڤناسەکان. لە کۆتاییی ١٩٦٠ەکاندا، ئەم خێڵە لە دوورگەی میندانۆدا لە فلیپین کەوتنە بەرچاو وەک ئەوەی لە سەردەمی بەرددا بژین Stone age _ لە ئەشکەوتی قووڵایی جەنگەڵەکاندا نیشتەجێ بوون، بێئاگا لە کشتوکاڵکردن و لەسەر ڕاوکردن و کۆکردنەوە دەژیان. هەر زوو دیکتاتۆر مارکۆس، بڕیاری دا ئەم خێڵە بەتەواوەتی بپارێزرێن. بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە وای کرد ژمارەیەک لە مرۆڤناس و شارەزایان سەردانی ئەم خێڵە بکەن و توێژینەوە لەسەر کەلوپەل و زمان و بوونیادی کۆمەڵایەتییان بە ئەنجام بگەیەنن. بێجگە لە ژمارەیەکی کەمی توێژەرە گومانگەراکان، ئەوانی تر هەموو حوکمیان بەسەر خێڵەکەدا دا، وەک خێڵێکی ڕەسەنی چاخی بەردین. بڵاوکەرەوە بەناوبانگەکانی لە چەشنی *جیۆگرافیی قەومی* national geographic لەسەر خێڵی تاسادەییان نووسیوە، ئیعجابی خۆیان لەسەریان وەک خێڵێکی بێگوناح و نەرمونیان

نەشاردۆتەوە، خێڵێک، کە زمانەکەیان خاڵییە لە وشەگەلی وەکوو "چەک"، "جەنگ" و "دوژمنداری."

لەدوای ١٩٨٦ەوە، واتە دوای ڕووخانی ڕژیمەکەی مارکۆس، ڕۆژنامەنووسێکی سویدی سەردانی خێڵی تاسەدای کرد، بەلام بینیی کە ئەوان لە خانوودا دەژین. دانیشتووانیش ڕۆژنامەنووسەکەیان دڵنیا کردەوە، کە پیشاندانی ئەوان وەک خێڵێکی سەر بە چاخە بەردینەکان، چیرۆکێکە خۆڵ لە چاوان دەکات و دانەرەکەشی ئێلیزالدۆیە Elizaldo. گوایە ئەو{ئێلیزالدۆ}یە داوای لە هۆزەکە کردووە، لەکاتی سەردانی ڕۆژنامەنووس و لێکۆڵەرەوەکان بچنە ئەشکەوتەکان و ژیانێکی چاخیبەردینئاسا بژین. ئێلیزالدۆ بەردەوام ئەم تۆمەتەی ڕەت دەکردەوە و لەلایەن کۆمەڵێک زاناشەوە پشتگیریی لێ دەکرا. دۆگلاس یان Douglas Yen، کە یەکێک بوو لە توێژەرە مرۆڤناسەکان، کە سەردانی خێڵەکەیان کردبوو، لە سەرەتادا هەوڵی دابوو پەیوەندی لەنێوان ئەم خێڵە و ئەوانەی کە کشتوکاڵ دەکەن، بدۆزێتەوە، بەلام ئێستا ئەو لەو بڕوایەدایە، کە حکومدانی تاسەدای وەک خێڵێکی سەر بە چاخی بەردین، لە جێی خۆیایەتی. ( دۆگلاس ئاماژە بە حاڵەتێک ئەدات، کە تێیدا منداڵە بچووکەکان سەریان سووڕ ماوە لە کاتی بینینی برنجدا) کارۆل مۆنۆمی Carol Monomy، زمانناس و توێژەر، کۆکە لەسەر ناساندنی تاسەدای وەک خێڵێکی چاخی بەردین. ئەو دەڵێت بۆ ئەوەی منداڵان و گەورەکانی ئەم خێڵە بتوانن هەموو میتافۆرێکی کشتوکاڵی {هەر وشەیەک کە بەرهەمی چاخی کشتوکاڵییە} لە قسەکردنیان بکەنە دەرێ، ئەوا دەبوو بەڕاستی هەموو لە ئەکتەرە هەرە بەهرەمەندەکان بوونایە. سێن مکدۆناهی Sean McDonagh قەشە، کە گومانگەرایەک بوو {واتە ناکۆک بوو لەسەر ناساندنی ئەو خێڵە وەک خێڵێکی چاخی بەردین}، ئێستا لەو بڕوایەدایە نەک هەر تەنها تاسەدای،

بگرە خێڵەکانی دەوروپشتیشی خێڵی چاخی بەردینین.

یەکێک لە بابەتەکان کە بەردەوام جێی مشتومڕە، بریتییە لە ئەگەری ڕەسەنبوونی ئەو ئامراز و کەلووپەلانەی تاسەداییەکان بەکاریان دەهێنا. زیۆس سەلازەر Zeus Salazar کە مرۆڤناسێکی فلیپینییە، لەو بڕوایەدایە کە ئەو بەردە تیژانەی شلوشێواوانە بە دەستێکەوە جێگریان کردوون، هەوڵێکی سەرنەکەوتووە بۆ لاساییکردنەوەی ئامرازەکانی چاخی بەردین. بەڵام ئان گلۆڤەر Ian Gloverی مرۆڤناس دەڵێت، ئەو شلوشاوییە لە کەلوپەلەکانی چاخی بەردینیشدا بەدی دەکرێت. لێدوانەکانی تاسەداییەکان خۆشیان ئاڵۆزی مەتەڵەکەیان سادە نەکردۆتەوە. جارێک بە NBC و تەلەڤزیۆنی فیلیپین دەڵێن، کە یەکەم چیرۆکی بڵاکەرەوە ڕاستە {واتە تاسەدای خێڵێکە سەر بە چاخی بەردین}، لێ هەر خۆیان بە ABC ڕادەگەیەنن ئەو چیرۆکە درۆیە و هەڵبەستراوە.

ئایا چەندێک لە لێکۆڵەرەوەکان دەتوانن حەقیقەتی چیرۆکەکە *بزانن* بە هەموو ئاڵۆزییەکانیەوە؟ لە ڕاستیدا زۆر نین. هەر لەبەر ئەمەشە لەم کەیسە و لە هاوکەیسە ئاڵۆزەکانی تریشدا کەسانی بەرپرسیار *لافی زانین* لێنادەن. لەبری ئەوە ئەوان {لێکۆڵەرەوە بەرپرسەکان} قسە لەسەر ئەوە دەکەن کە کام لە بۆچوونەکان زیاتر *قەناعەتپێکەرە* لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەکاندا. تۆماس هێدلاند Thomas Headlandی مرۆڤناس، دوای لێکۆڵینەوەیەکی ماندووکەر، بەم شێوە بەرپرسیارانەیە لەسەر کێشەکە دەنووسێت: لەوانەیە هیچ درۆ و پیوەنانێکی مەبەستدار لەئارادا نەبووبێت، بەڵام زیادەڕۆیی و ڕاپۆرتی هەڵەی میدیاکان، هەروەها ویستی هەندێک لە مرۆڤناسەکان بۆ ڕاستدەرچوونی تیۆروانینەکانیان حاڵەتەکەی دروست کردبێت. ئەو لەو بڕوایەدایە، کە ڕێی تێدەچی تاسەداییەکان ڕۆژێک لە

ڕۆژان هاوسێی چەند هۆزێکی کشتوکاڵی بووبێتن، بەڵام داواتر پێش چەند سەد ساڵێک لەمەوپێش، هەڵهاتوون (ڕەنگە بۆ خۆرزگارکردن بووبێت لەوەی ببنە کۆیلە و بازرگانییان پێوە بکرێت) و ئیدی بۆ ماوەی چەند نەوەیەک هەر لە دارستانەکاندا خۆیان حەشار دابێت، بە شێوەیەک، کە نەک هەر گەڕاونەتەوە بۆ چاخی بەردین، بەڵکوو هەموو زانییەرەکانی قۆناغە پێشکەوتووترەکەی پێشووتریان لەدەست دابێت.

## ئایا ئیمان جۆرێکە لە مەعریفە؟

هەندێک لە خوێنەران، و بەتایبەتی ئیماندارە کۆنسەرڤاتیڤەکان، دەیانەوێت بزانن چی لەسەر ئەو مەعریفەیە وتراوە و دەوترێت، کە بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕەخنەی توندی ئاراستەی ئایین کردووە و دەکات. قەڵەقیی ئەوان شیاوی تێگەیشتنە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕۆشنبیرانەی لەم سەدەیە و لە سەدەکانی پێشتریشدا ئایینیان ڕەخنە کردووە و وەک خورافاتێکی پەتی خستوویانەتە ڕوو. بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو ناوزڕاندنانە ناخەینە بەر باس. پەیوەندیی نێوان ئیمان و مەعریفە هەم ئاڵۆزە و هەم ورد و ناڕوون. چەمکی *ئیمانی ئایینی* {بڕوای دینی} ئاماژەیە بە بڕواکردن بە شتێک، کە شیاوی سەلماندن نییە. ئەمە بەو مانایە نایەت، هەرشتێک کە چووە قاڵبی بڕواهێنانەوە، ڕاست نییە، بەڵکوو ئەمە بەو مانایە دێت، کە *حەقیقەتی ئەو بڕوایە ناتوانرێت بە شێوەیەکی خاڵی لە گومان بسەلمێنرێت*. جوولەکەکان (زۆری تریش) لەو بڕوایەدان موسا ١٠ یاساکەی{واتە بایبل}ی لە خوداوە وەرگرتووە، موسڵمانەکان لەو بڕوایەدان کە محەمەد نێردراوی خودایە، هەروەها مەسیحییەکان عیسا بە کوڕی خودا دەزانن. زۆر بەسادەیی زانست بەسەر ئەم بڕوایانەدا جێبەجێ ناکرێت. بەڵام فەلسەفە دەتوانێت ئارگۆمێنتی دووئاڕاستەی دەربارەی ئەم بڕوایانە بخاتە ڕوو، واتە هەم پشتگیریی لێ دەکات و هەم ڕەخنەشی لێ دەگرێت، بەڵام فەلسەفەش

ناتوانێت ئەو بڕوایەنە، چ بە ئەرێنی و چ بە نەرێنی، بسەلمێنێت.

مۆرتیمەر ئادلێر Mortimar Adler کە فەیلەسوفێکی ناسراوە، تێگەیشتنێکی بەسوود دەربارەی سروشتی ئیمان دەخاتە بەردەست:

ئەوەی زۆر جار بە "گەشەکردنی ئیمان" ناسراوە، پێویستە بۆ گواستنەوە لە دۆڵی [ نێوان فەلسەفە و ئاییندا]. بەڵام گەشەکردنی {بەرزبوونەوەی} ئیمان the leap of faith زۆر جار بە شێوەیەکی هەڵە لێک دەدرێتەوە، وەک ئەوەی بریتی بێت لە گواستنەوە لە نەبوونی بەڵگەی تەواو بۆ سەلماندنی بوونی خودا، بۆ حاڵەتێک، کە دڵنیاییەکی زیاتر لە سەلماندنی بوونی خودادا هەیە. لە کاتێکدا ئەمە حاڵەتەکە نییە. گەشەکردنی ئیمان وا لەناو پرۆسەی گواستنەوە لە دەرئەنجامێکی خوداناسیی فەلسەفیی ڕووتەوە بۆ بڕوایەکی ئایینی بە خودا، کە خۆی پیشان دەدات وەک بوونێکی خۆشویستروا و دادپەروەر و میهرەبان، کە دروستکەری گەردوونە، ئەم خودایە دەبێت خۆش بویسترێت و بپەرسترێت و داوای ڕەحمەت و بەزەییی لێ بکرێت.

خاڵێکی تر کە جێی گرنگیی کۆنسێرڤەتیڤە ئیماندارەکانە، ئەوەیە کە ئایا بە قبوڵکردن و وەرگرتنی ئەو ڕەهەندە فەلسەفییەی لەم چاپتەرەدا خرایە ڕوو، ئەوانە زەرەر بە ئیمانەکەیان ناگەیەنن. بەدڵنیاییەوە هەریەکە لە ئێمە دەبێت خۆی بۆخۆی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. بە هەرحاڵ، پێش بڕیاردان باشتر وایە سەیرێکی ئەو ئارگۆمێنتە بکەین، کە لەلایەن مارک نۆل Mark Nollی ڕۆشنبیری ئیڤنجیلیک {کاسۆلیک مەزهەب}ی ناسراوەوە خراوەتە ڕوو. ئەو لە بەدواداچوونێکی فەلسەفیی ڕەخنەگرانەدا دەڵێت، ئیڤانجیلیکییەکان نەک هەر خۆیان بەدوور گرتووە لەو گفتوگۆیانەی

بۆ هەمووان ماناداره، بەڵکوو هەر داشبراون لەو "خووه ئەقڵییانەی بۆ دوو سەدەیە ئیڤانجیلیکییەکانی پێ دەناسرێتەوه لە ئەمەریکا." ئەمەش بۆ مارک سەلمێنراوه، کە چەند هەڵەیەکی مەترسیداره.

## رێگرییەکانی بەردەم مەعریفە

پێش ئەوەی قسە لەسەر باشترین رێگە بۆ بەدەستهێنانی مەعریفە بکەین، با دوو خوو habits لەبەرچاو بگرین، کە لەمپەرن لە بەردەم مەعریفەدا، ئەوانیش: خەملاندن assuming و گریمانەکردن guessing {خەملاندن واتە حوکمدان بێ هەبوونی هیچ بەڵگە یان هۆیەکی ئەقڵی. گریمانەکردن، یان گریمانەدانان واتە حوکمدان بێ هەبوونی بەڵگە یان هۆی ئەقڵیی تەواو - کافی }. خەملاندن واتە وەرگرتنی، قبوڵکردنی شتێک کوێرانە _ واتە یەکسەر قبوڵکردنی راستیبوونی شتێک، کە هێشتا دروستبوونەکەی، راستبوونەکەی نەسەلمێنراوه، بگرە دەشێت بە هۆی ئەقڵەوه رەتیش بکرێتەوه. لەبەر ئەوەی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا خەملاندن چالاکییەکی ناخودئاگایە، نەستییە unconscious، هەر بۆیە زۆر کات بێئاگاین لەو کاریگەرییانەی لەسەرمان دایدەنێن*. بەهێزترین کاریگەریی نەرێنی کە خەملاندنی بێئاگا لەسەرمان دای دەنێت، بریتییە لە خەفەکردنی ئەو فزوڵیتییەی ئاراستەمان دەکات رووەو بەدەستهێنانی مەعریفە.

زۆر کەس رۆژێک لە رۆژان بیر لە ژیانی رۆژانەی ماسییەکان ناکەنەوه. لەگەڵ ئەوەشدا، رەنگە جاروبار سەردانی ئەو دوکانانە بکەن، کە ماسیی ناو ماڵان دەفرۆشن و چاو ببڕنە ماسیی هێلی کەمەرەییەکان، کە لە

* ئەگەری هێنانەدەرەوەی خەملاندن لە نائاگییەوه بۆ ئاگایی، ئەگەرێکی زیندووه. ئاماژەکردنی زۆر لە زاناکان بە چەمکی خەملاندن، ئاماژەدانە بە چەمکەکە لە ئاستی ئاگاییدا.

حەوزەکانـدا مەلـە دەکـەن. بـەڵام هیـچ ئارەزووییەکیـان نییـە بـۆ تێگەیشـتن لـە ژیـان و پەیوەندیـی کۆمەڵایەتیی ماسـییەکان، چونکـە لـەو بڕوایـەدا نیـن ماسـییەکان ڕۆڵ و پەیوەندیـی کۆمەڵایەتییـان هەبێـت. بـەڵام سـی. لاڤێـت سـمس C. Lavett Smith کۆمەڵناسـی دەریایـی، دەڵێـت، "ماسـی هەیـە بـە ڕۆڵـی دەلاک هەڵدەسـتێت، هەشـیانە بـە ئەرکـی پۆلیـس، هەشـیانە بـە ڕۆڵـی جووتیـار هەڵدەسـتێت. هەیانـە بـەردەوام دەجووڵێـن و هەشـیانە زۆر بەکەمـی دەجووڵێنـەوە. هەندێکیـان شـەو کار دەکـەن و هەشـیانە بـە ڕۆژ."

*گریمانەکـردن* واتـە بڕیاردانـی بەرمەبنـای هەسـتێک، کـە دڵنیـا نیـن لـە دروسـتییەکەی یـان وەرگرتنـی وەڵامێـک بـێ دڵنیابـوون لـە ڕاسـتیی بوونـی وەڵامەکـە. ئـەم چالاکییـەش {گریمانەکردن} ڕۆژانـە پێـی هەڵدەسـتین. بـۆ ئـەو قوتابییانـەی کـە خۆیـان ئامـادە ناکـەن بـۆ تاقیکردنـەوەکان، گریمانەکـردن تەنهـا هیـوای ڕزگاربوونیانـە. بـا لەسـەر گریمانەکردن نموونەیەکـی خۆشـتر بێنینـەوە _ خواردنـەوەی بیـرە. ماوەیـەک لەمەوپێش پرۆفیسـۆرێکی زانسـتی ڕەفتـاری behavioral science لـە زانکـۆی کالیفۆرنیـا تاقیکردنوەیەکـی لەنـاو قوتابییەکانـی خۆیـدا ئەنجـام دا لەسـەر تامکردنـی بیـرە جیـاوازەکان. ئامانجەکە ئـەوە بـوو، کـە ئایـا ئـەوان دەتوانـن بیـرەی خـۆش لـە ناخۆشـەکان جیـا بکەنـەوە یـان خۆشـترین بیـرە لەنـاو بیرەکانـدا دەسـتنیشـان بکـەن. زۆر لـە قوتابییـەکان گریمانـەی ئەوەیـان دەکـرد، کـە دەتوانـن بـە کارەکـە هەڵسـن و هـەر لـە ڕێـی گریمانەکردنیشـەوە بـوو، کـە هەڵبژاردنەکانـی خۆیـان ئەنجـام دا. بـەڵام دوای ئـەوەی نووسـراوی سـەر بیرەکان لێکرانـەوە، تەنانـەت یـەک قوتابییـش نەیتوانـی جـۆری ئـەو بیرەیـەی کـە دەیخواتـەوە، دەسـتنیشـان بـکات.

لەبـەر ئـەوەی خەمڵانـدن قەلەقـی و ئـارەزووی کەشـفکردن لەبـار دەبـات و گریمانەکردنیـش گرنگیـی بوونـی بەڵگـە لەبەرچـاو ناگرێـت، کەواتـە هیچیـان

سەر ناکێشن بۆ مەعریفە. باشترین ڕێگە ئەوەیە، حەزەر بکەیت لە کاتی جەختکرنەوە لەسەر زانینی شتێک. ئاگاداری پلەی جەختکردنەوەکەت بە _ هەرکاتێک دڵنیا نەبوویت لە جەختکردنەوەکەت، ئەوا ئاماژە بە ئەگەرەکانی تر بکەیت. بۆ نموونە لەبری ئەوەی بڵێیت "من ئەو شتە دەزانم" بڵێ، "بە بۆچوونی من" یان "وەک ئەوەی کە من تێگەیشتووم." زۆرزۆر گرنگە تۆ هەم لەگەڵ خۆت و هەم لەگەڵ ئەوانی تریشدا ڕاستگۆ بیت و خاکییانە دان بنێیت بەو شتانەی کە نایانزانیت. داننان بەوەدا کە تۆ شتێک نازانیت، هەم زەوقسەلیمیی تۆ هەم توانای خۆناسین و هەم ڕاستگۆبوونی ڕۆشنبیریی تۆ دەر دەخات. دیارە ئەمانەش خاڵی بەهێزین، نەک لاوازی. داننان بە جاهیلبوونی خۆماندا، گرنگترین هەنگاوە ڕووەو مەعریفە {من دەزانم کە نازانم _ سوکرات}.

بەڵام ئایا ئەمە بەو مانایە دێت، کە تۆ دڵنیابوون لەدەست بدەیت و بۆ هەرشتێک کە دەیڵێیت ڕەنگە و پێئەچییەک قوت بکەیتەوە لە بەردەمیدا؟ ئایا بۆ ئەوەی ببیتە بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەگر، مەرجە ئیدی تۆ باوەڕ و دڵنیاییی خۆت لەدەست بدەیت؟ وەڵامی هەردوو پرسیارەکە بریتییە لە "نا"یەکی قەڵەو! بەڵکوو ئەمە بەو مانایە دێت، کە تۆ ئەوەندە گوزارشتە بەهێز و دڵنیاکانت بەلاوە گرنگە، کە دوایان دەخەیت تا ئەو کاتەی بەڵگەی تەواو لە بەردەستا دەبێت دەربارەیان. بە هەمان شێوە، دەبێت باوەڕەکانی خۆشت هێند بەلاوە گرنگ بێت، تەنها ئەو کاتە قبوڵیان بکەیت، کە دەبیتە خاوەن مەعریفەیەکی قووڵ لەسەریان، هەروەها هەرکاتێکیش پرنسیپی ڕاستگۆییی ڕۆشنبیری intellectual honesty داوای کرد، پێویستە ئەو باوەڕانە بگۆڕیت.

# ڕاهێنانەکان

١. بیر لـەم گـوزارەی فەیلەسـوفی یۆنانیـی کـۆن، Epictetus بکـەرەوە =: "وێنـەکان بۆ مێشـک بـە چـوار شـێوە دەر دەکـەون. یـان ئەوەتـا وێنـەکان هـەن و هـەر واش دەر دەکـەون، یـان ئەوەتـا نیـن و دەریـش ناکـەون؛ یـان ئەوەتـا هـەن و وەک خۆیـان دەر ناکـەون، یـان خۆیـان نیـن، بـەلآم لەگـەڵ ئەوەشـدا دەر دەکـەون." ئـەوە ئیشـی پیاوی ئاقڵە ئـەم حاڵەتانـە وەک خۆیـان بناسـێتەوە." ئایا ئـەم بۆچوونـە پشـتگیریی ئـەوە دەکات، کـە فێـری بوویـت لـەم چاپتـەرەدا یاخـود ڕەتـی دەکاتـەوە؟ ڕوونـی بکـەرەوە.

٢. ئـەم سـەرنجانەی ڕۆژنامەنـووس و نووسـەری کتێبـی لایەنگـری bias بێرنـارد گۆڵدبێـرگ Bernard Goldberg بخوێنـەرەوە: "یەکێـک لـەو نهێنییـە پیسـانەی کـە ڕۆژنامەنووسـان بـەردەوام لـە وەرگرەکانیـان دەشـارنەوە، بریتییـە لـە ئـەو ڕۆژنامەنووسـەی کـە ڕاپۆرتێـک ئامـادە دەکات، دەتوانێـت پسـپۆڕێک بدۆزێتـەوە، کـە ڕێـک ئـەوە بڵێـت کـە ئـەم دەیەوێـت _ *هەرشـتێک کـە ڕۆژنامەنووسـەکە بیخوازێـت!* ئـەو دەسـت دەکات بـە پەیوەندیکـردن تـا پسـپۆڕێک بدۆزێتـەوە، کـە قسـەی دڵـی ئـەو بـکات، ئیـدی خـۆی و گرووپـی وێنەگـر دەگەنـە لای و چاوپێکەوتنەکـەی لەگەڵـدا ئەنجـام دەدەن. ڕۆژنامەنووس، پسپۆڕێکی ناوێت بڵێیت 'بە بۆچوونـی مـن باجوەرگرتن بـە شـێوەیەکی یەکسـان {واتـە هەمووومـان هەمـان بڕی باجیـان لـێ وەر بگیرێـت}

باشـه، لەبـەر ئـەم هۆیانـە..' بەڵکوو ئـەو پسـپۆڕێکی دەوێت قسـەی دڵـی ئـەو بـکات، واتـە نابابەتییانـە لێدوان بـدات. ئـا بـەم شـێوەیەیە ڕۆژنامەنووسـان بۆچوونەکانـی خۆیـان تێکـەڵ بـە ڕاپۆرتەکانیـان دەکـەن و وەک کارێکـی بابەتـی بێلایـەن بـڵاوی دەکەنـەوە" ٢٤. ئایا ئـەم بۆچوونـە چ کاریگەرییەکـی بـۆ سـەر بابەتـی ئـەم چاپتـەرە هەیـە؟ وەڵامەکـەت ڕوون بکـەرەوە.

٣. لـە هەریـەک لـەم حاڵەتانـەی خـوارەدا، کەسـێک لـەو بڕوایەدایـە کـە شتێک دەزانێت. لەبـەر ڕۆشـناییی ئـەوەی کـە فێری بوویت لـەم چاپتـەرەدا، بیـر بکـەرەوە کـە ئایا ئـەو کەسـە بەڕاسـتی ئـەو شـتە دەزانێت.

ا. تێـد Ted ڕۆژنامــە دەخوێنێتــەوە، هەواڵێکـی بەرچـاو دەکەوێـت، کـە تێیدا هاوڕێیەکی نزیکی بە تۆمەتی بڕینی چەند کۆگایـەک دەسـتگیر کراوە. تێـد ئەحەپەسـێ و بـە دایکـی ئەڵـێ، "ئەمــە مەحاڵـە، حەتمـەن پۆلیسـەکان بەهەڵـەدا چـوون، مـن و بـۆب هاوڕێـی گیانیبەگیانیـی یەکترین، مـن زۆر بـاش دەزانـم ئـەو بێتاوانـە."

ب. *ڕاڵف* Ralph: هـاری Harry موعەتـەرە تازەکـەم بـەکار بهێنـە. بەتەواوەتـی ڕێ لـە عارەقکردنـەوە دەگرێـت.

*هـاری:* نـا، سـوپاس. مـن بەباشـی نازانـم موعەتـەر بـەکار بهێنـم. مـن وای بـۆ دەچـم هەرشتێک ڕێ لـە جەسـتە بگرێت، بـە کارە سروشـتییەکانی خـۆی هەڵبسـتێت، دەرئەنجامـی خراپـی دەبێت. بەلامـەوە سـەیر نابێت ئەگـەر موعەتـەر ببێتـە هـۆی شـێرپەنجە.

*ڕاڵف:* گەمژە مەبـە. مـن دڵنیام نابێتـە هـۆی شـێرپەنجە. بەرهەمێکی لـەم چەشـنە پێش ئـەوەی مافی فرۆشـتن وەر بگرێت، زۆر بـەوردی دەپشـکنرێن. ئەگـەر ببووایەتـە هـۆی شـێرپەنجە، قەدەغـە دەکرا.

س. جەین Jane: لەم دواییەدا هەندێک بەڵگەم بەرچاو کەوت، کە بەکارهێنانی ئەسپرین ڕێ لە جەڵدەی دڵ دەگرێت.
جێنی Jeney: قسەی هیچ. دەزانم وا نییە. خاڵم زۆر حەپی ئەسپرینی بەکار دەهێنا، کەچی پارساڵ بە هۆی جەڵدەی دڵەوە مرد.

٤. "داوی ئەوەی دەر کەوت بێتاوانە، ئەو پیاوەی بە تۆمەتی دەستدرێژیی سێکسی تاوانبار کرابوو، ئازاد کرا." "بۆچوونە باوەکە دەر کەوت کە هەڵەیە،" "دانای یاریدەدەری پێشوو دەربارەی بەدرۆتۆمتبارکردنی یاسادانەرەکان" _ ڕۆژانە ئەو چیرۆکانە لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە، چیرۆکگەلێک کە "زانراو بوون" کەچی پاش هەفتەیەک، مانگێک، یان ساڵێک، دەر دەکەوێت کە نەزانراو بوون. بە لایەنی کەمەوە، سێ نموونەی لەم چەشنە لە ڕۆژنامەکانی ئەم دواییەدا بدۆزەرەوە.

٥. "مرۆڤ نابێتە گەمژە بە هۆی ئەو شتانەوە، کە نایزانێت، بەڵکوو بە هۆی ئەو شتانەوەیە، کە دەیانزانێت،" جۆش بیلینگس، کۆمیدینووسی ئەمەریکی سەدەی نۆزدە. هەوڵ بدە چەندێک ئەتوانی ئەو ئەزموونانەی خۆت بەیاد بێنەرەوە کە پشتگیری لەم بۆچوونە دەکەن.

٦. لە کۆتاییی ١٩٨٢دا بە هۆی کێشەیەکی دادگاوە لە باشووری داکۆتا Dakota، کێشە کەوتە نێوان حکومەتی ئەمەریکا و بزووتنەوەی هندییەکانەوە. حکومەت هەوڵی دا کۆتایی بە داگیرکاری ٢٠ مانگی گروپێک لە ئەمەریکییە ڕەسەنەکان بێنێ بەسەر زەوییەکی گشتییەوە، لە ناوچەی بلاک هیلی Blak Hill دارستانی نیشتیمانی. گروپەکە دەیانوت شوێنەکە ناوچەیەکی پیرۆزە بۆ ئەوان، هەم شوێنی لەدایکبوونینانە و مەزاری کەسوکاریان لەوێیە، هەم چەقی گەردوونە بۆ ئەوان - هەر بۆیە پێویستە

بەیەکجاری ببێتە شوێنی دامەزراندنی جڤاتێکی ئایینی بۆ ئەمەریکییە ڕەسەنەکان. بەلام حکومەت سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو گروپە هیچ مافێکی یاساییان نییە بەسەر ناوچەکەدا. بە بۆچوونی تۆ، کام فاکتەرانە پێویستە لە بەرچاو بگیرێت لە وەها کەیسێکدا و چ بڕیارێک بە باشترین شێوە لە خزمەتی دادپەروەریدا دەبێت؟ لە کاتی وەلامدانەوەدا، ئاگادار بە جیاوازی بکە لەنێوان ئەوەی کە دەیزانی، ئەوەی کە دەیخەملێنی و ئەوەی کە گریمانەی دەکەیت. پاش ئەوەی ئەم پرسیارانەت وەلام دایەوە، نوێترین وێنەی ئەم چیرۆکە لە ئینتەرنێتدا بخوێنەرەوە. سەردانی ئەم ماڵپەڕە بکە :www. sacredland. org\hills. html. ئەگەر هیچت دەست نەکەوت، بەدوای ئەم گرییەدا بگەڕێ "بزووتنەوەی هیندییە ئەمەریکییەکان بلاک هیلس دارستانی نیشتیمانی American Indian Movement Black Hills National Fores".

٧. لەم سالانەی دواییدا مشتومڕێکی زۆر کرا لەسەر ئەوەی کە ئایا دەبێت بیانووی شێتبوون وەک پاکانەیەکی یاسایی قبول بکرێت. زۆر کەس لەو بڕوایەدان کە دەبێت کۆتایی بە قبولکردنی ئەم بیانووە بهێنرێت - بەلام زۆر کەسیش وەک بەشێکی بنچینەیی دەبینن بۆ سیستەمێکی دادگەری چاک. تۆ بۆچوونت چۆنە؟ لە وەلامدانەوەدا ئاگادار بە ئەوەی کە دەیزانیت تێکەلی مەکە لەوەی کە دەیخەملێنیت یان ئەوەی کە گریمانەی دەکەیت. ئەگەر زانیارییەکانت کەم بوو، باشترە لێکۆلینەوەیەکی لەسەر بکەیت.

٨. دیالۆگ بە شێوەی گروپ: بڕیار لەسەر دروست و وردبوونی هەریەک لەم ڕستانەی خوارەوەدا. بۆچوونەکانت لەگەل دوو یان سێ لە هاپۆلەکەت بگۆڕەوە. دلنیا بە لەوەی کە زانین تێکەلی خەملاندن و گریمانەکردن ناکەیت.

a. زۆربەی تاوانبارەكان لە خێزانە كەمدەرامەتەكانەوە دێن.

b. تاوان ئەوەندەی دەرهەق بە ڕەشپێستەكان دەكرێت، ئەوەندە دەرهەق بە سپیپێستەكان ناكرێت.

c. بەپێی دەستووری ئەمەریكا، هەموو هاوولاتییەك مافی خاوەندارێتیی چەكی هەیە.

d. توندوتیژیی ڕاگەیاندن، بەرپرسیارە لەو توندوتیژییەی لەسەر ئەرزی واقیع پیادە دەكرێت.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و كۆكراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی یانیسیب و ڕۆڵی حكومەت لەم مەسەلەیەدا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێك بكە بە كتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو كەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر كێشەكە، چۆن باسی لێوە دەكەن. بەلام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەكەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەك لە خوێندنەوەكان دیاری بكە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی كە بۆچوونێك بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بكەرەوە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت كرد بۆچوونێك لەوانی تر ماقولترە، بەلام ئەوانی تریش هەریەكەیان بڕێك لە مەقولییەتی تێدایە، كە لە *زۆربەری حالەتەكانیشدا هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای كۆكردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەكانی نووسینەكانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بكەرەوە، كە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر كێشەكە. پاشان بۆچوونەكانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەكەت، بەو شێوەیە كە مامۆستا بۆت دیاری دەكات.

**ئایا پێوسته حکومەت یانیسیبی فەرمی هەبێت؟**

بە نزیکەی هەموو سەدەی بیست، قومار لە زۆربەی وڵاتەکاندا بە یاسا قەدەغە کرابوو. بەڵام لە سی ساڵی ڕابردوودا گۆڕانی زۆر لە تێگەیشتنی یاسا و خەڵکیدا هاتووە دەرهەق بەم مەسەلەیە. ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتەکاندا یانسیبی حکومی هەیە و لە ٢١ دەوڵەتیشدا گازینۆی قومارکردن بە شێوەیەکی فەرمی هەن. ساڵانە داهاتی قومار زیاترە لە ٥٠ ملیۆن دۆلار. زۆر کەس لەو بڕوایەدان، کە بەشداریکردن لە یانیسیبدا ڕێگەیەکی بێزیانی کاتبەسەربردن و داهاتکۆکردنەوەیە، هەر بۆیە نەنگییەک لەوەدا نییە، کە حکومەتە بەشداریی تێدا بکات. لە بەرامبەریشدا کەسانێکی زۆر دەڵێن، یانیسیب و قومارکردن دەرئەنجامی کۆمەڵایەتیی نەخوازراوی لێ دەکەوێتەوە و پێویستە حکومەت بە هیچ شێوەیەک بەشداریی تێدا نەکات {واتە حکومەت خۆی یانیسیبی تایبەت بە خۆی نەبێت}.

# چاپتەری پێنجەم

## تا چ ڕادەیەك ڕاکانت دروستن؟

## How Good are Your Opinions?

هەقیقەت لای من زۆر بەنرخە... پێم باشترە تەنیا بم بەڵام ڕاست بم، وەک لەوەی لەناو میگەلدا بم بەلام هەڵە بم، بە هۆی دەستگرتن بە بۆچوونەکانمەوە بوومەتە جێی سووکایەتی و گاڵتەپێکردن و پێکەنینی هەندێک لە هاوڕێکانم. وەک کەسێکی نامۆ و سەیر تێم دەڕوانن، بەڵام حەقیقەت هەر بە حەقیقەتی دەمێنێتەوە، ئەگەر هەموو دونیاش ڕەتی بکاتەوە و دژم بوەستنەوە، من هەر دەستبەرداری نابم.

چ وشەگەلێکی گەرموگوڕن. ئاسانە بهێنیتە بەرچاوت، کە چۆن نووسەرەکە ئازایانە ڕووبەڕووی لەشکرێک خەڵکی ناڕازی بۆتەوە، کە دەیانەوێت دۆگما تەسکبینەکەی خۆیان بەسەریدا بسەپێنن. دەتوانیت گوێت لە کۆمەڵی خەڵک بێت، کە هاوار دەکەن "چ پیاوێکی ئازا و خۆڕاگرە." قارەمانێکی بەهێز، کە هەرگیز پاشگەز نابێتەوە!

با بزانین نووسەرەکە کێیە، ئەی ئەو ڕایە چییە کە ئاوا خوێنگەرمانە بەرگریی لێ دەکات؟ نووسەرەکەمان چارلس سلڤێستەردی فۆرتە.

پەرەگرافەکەش لە نامیلکەیەکەوە وەر گیراوە، کە ١٩٣١دا نووسیویەتی. ئەو ڕایەشی کە ئاوا گەرموگوڕانە بەرگریی لێ دەکات، بریتییە لە زەویی تەختە! ـ چاوەڕێت دەکرد ئا ئەمە ڕاکەی بێت؟

بە شێوەکی گشتی، خەڵکی ڕاکانی خۆیان بەلاوە گرنگە، بەڵام ئەمڕۆکە خەڵکێکی زۆر بە جۆشوخرۆش و گەرموگوڕییەکی زۆرەوە ڕاکانی خۆیان دەر دەبڕن. ئەمڕۆکە دەربڕینی لە چەشنی " من ئەو مافەم هەیە کە خاوەن ڕای خۆم بم،" "هەموو کەس دەتوانێت خاوەن ڕای خۆی بێت" بە شێوەکەی بەربڵاو بەر گوێ دەکەون. ئەگەر گومان و پرسیار ئاڕاستەی بۆچوونی کەسێکی تر بکەیت، ئەوا زۆر نزیکە ئاوا وەڵامت بداتەوە، "ئەزانی چی؟ ئەمە *ڕای* منە." دیارە پەیامەکە ئەوەیە، کە "بێدەنگ بە و گفتوگۆکە کۆتاییی پێ هات."

ئایا ئەمە بۆچوونێکی دروستە؟ ئایا ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاکانی ئەوانی تر کارێکی نابەجێیە؟ وەڵامی پرسیارەکان پابەندن بەو بابەتانەی کە ڕاکانی لەسەر دەدرێن. ئەگەر بابەتەکە *بابەتی حەز زەوقێک* بوو the matter of taste، ئەوە بابەتێکی شەخسییە، پەیوەندیی بە کەسەکە خۆیەوە هەیە و گفتوگۆ هەڵناگرێت. بۆ نموونە، گریمان جاک لای سوزان کوڕێکی قۆزە، بەڵام لای سالی وا نییە، ئەم ناکۆکییە نابێتە زەمینەیەک بۆ گفتوگۆیەکی مانادار. یان بۆ نموونە، کاتێک ڕالف بەدیار کامارۆیەکی پرتەقاڵییەوە کە ویلکەپەکانی زەردە و کوشنەکانی پەمەیییە، دۆش دائەمێنی، بەڵام کارلا سەیارەکەی بەلاوە جوان نییە. بە هەمان شێوە، هەندێک کەس حەز دەکەن کەچەپ لەگەڵ هۆت دۆگدا {جۆرێکە لە خواردن} بخۆن، بەڵام هەندێکی تر ڕەنگە حەز بکەن ساسی پیوە بخۆن، یان ڕەنگە ڕێک لەم ساتەدا کەسێک مایۆنێز یان هەرشتێکی لەم

بابەتانە بکات بە هۆت دۆگەکەیەوە، ئینجا بیخوات. بەلام بە ئێمە چی؟ خۆ ئەمانە شتێک نین شیاوی گفتوگۆلەسەرکردن بن.

لەگەڵ ئەوانەشدا، سەرنج بدە کە چۆن دەشێت چەمکی *ڕا* بە شێوەیەکی تەواو جیاواز بەکار بهێنرێت. لە ڕۆژنامەیەکدا بلاو کراوەتەوە، کە گوایە دادگای بالا لە یەکلاییکردنەوەی کێشەیەکی ئالۆزدا، ڕای خۆی تێکەڵ بە بڕیارەکانی کردووە. ئاشکرایە حاکمەکان ڕا شەخسییەکانی خۆیان، واتە ئەو شتانەی کە حەزی پێ دەکەن و ئەو شتانەی ڕقیان لێیەتی، تێکەڵ بە بڕیارە یاساییەکان ناکەن. ئەوان دوای گەڕان و وردبوونەوە و تێبینیکردنێکی زۆر و بەدیقەت، ئینجا *بڕیارە ورد و بیرلێکراوەکەی* خۆیان دەدەن.

لە سیاقی بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا، چەمکی *ڕا* ئاماژەیە بە گوزارشتکردن لە بڕیاردانێک، حوکمدانێک، نەوەک گوزارشتکردن لە حەز یان زەوقێک*. بەداخەوە، لە هەندێک حاڵەتدا ڕوون نییە کە ئایا ئەو کەسە گوزارشت لە ڕاکەی دەکات وەک حەزێک، زەوقێک یان وەک حوکمدانێک. لە کاتێکدا کە دەتەوێت هۆڵی سینەما جێ بهێڵیت، ڕەنگە هاوڕێکەت پێت بڵێت، " ئەمە فیلمێکی زۆر خۆشە." هاوڕێکەت ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت، کە بڵێت "من حەز بەم فیلمە دەکەم،" یان ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت، کە "ئەم فیلمە لە ئاستێکی زۆر بەرزی هونەری سینەماسازیدایە."

---

* ع حکومدان و ع ڕا، هەردووکیان دەشێت لە ئەقڵدا هەبن، بەبێ ئەوەی دەریش ببڕدرێن. بەلام ئاواش ئێمە دەتوانین حوکمدانەکانی خۆمان هەڵسەنگێنین، تەنانەت پێش ئەوەی دەریشمان بڕیبێت، بەلام ناتوانین حوکمدانەکانی ئەوانی تر هەڵسەنگێنین، پێش ئەوەی گوزارشتیان لێ کرابێت. هەر بۆیە پێناسەکەی ئێمە تەنها ئەو ڕایانە دەگرێتەوە، کە بریتییە لە حوکمدانێکی دەربڕاو.

ئەگەر مەبەستەکەی تەنها ئەوە بێت کە من حەزم لێیەتی و تۆش حەزی پێ ناکەی، ئەوا لەم کاتەدا بێمانایە گفتوگۆ لەسەر ئەم دوو حەزە زاتییە جیاوازە بکرێت. بەڵام ئەگەر مەبەستەکەی گوزارشتکردن بێت لە حوکمدانێکی جوانناسییانە بەسەر فلیمەکەدا، ئەوا زۆر مەعقولە کە تۆ ئاماژە بە هەندێک ستانداردی بەرزی هونەری سینەما بدەیت، کە فیلمەکە نەیتوانیەوە پێیان بگات.

ئایا رەوایە هەرکەسە خاوەن رای خۆی بێت؟ لە وڵاتە ئازادەکاندا، رەوایە و بگرە رەوایەتییەکەشی زەمان کراوە. بۆ نموونە، لە بەریتانیای مەزندا، تا ئێستاش کۆمەڵەی زەویی تەخت هەیە. وەک ناوەکەی دەری دەخات، ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لەو بڕوایەدان، کە زەوی تەختە، نەوەکوو گۆیی. لەم وڵاتەشدا {مەبەست ئەمەریکایە} هەریەکە لە ئێمە دەتوانێت سەیرترین و نامۆترین هەڵوێست بەرامبەر هەر کێشەیەک وەر بگرین، کە دڵمان دەیخوازێت. کاتێک کە کارمەندی دەزگای پەیوەندییەکە پێت دەڵێت "نرخی پەیوەندی بۆ هەرسێ خولەکێک بریتییە لە ٩٥ سەنت،" رەنگە تۆ وەڵام بدەیەتەوە "نا، وا نییە، دەکاتە ٢٨ سەنت." کاتێک کە رۆنگۆڕەکە دەڵێت، "رۆنەکەت لە خوار کوارتەوەیە" {واتە کەمترە لە چارەکە گالۆنێک}، رەنگە وەڵام بدەیتەوە، "نا، وا نییە، لەوە زیاتری تێدایە."

فەراهەمبوونی ئازادی بۆ هەبوونی هەر جۆرە رایەک کە دڵت دەیخوازێت و گوزارشتکردن لێیان، لە راستیدا گەرەنتیی ئەوە ناکات کە هەمیشە ئەو رایانە سەر دەکێشن بۆ دەرئەنجامێکی دڵخواز. رەنگە کارمەندی سەر تەلەفونەکە دای بخاتەوە بەسەرتا یان رۆنگۆڕەکە بەرەقی وەڵامت بداتەوە.

ئەگەری ئەوەی کە کردەوەنواندن بەرمەبنای ڕاکانمان سەر بکێشێت بۆ دەرئەنجامیکی دڵخوازراو، تەنانەت لاوازتریشە لە ئەگەری دەستکەوتنی دەرئەنجامێکی باش لە گوزارشتکردن لە ڕاکانمانەوە. با نموونەی ئەو دایک و باوکە کالیفۆرنییە وەر بگرین، کە کوڕە یازدە ساڵانەکەیان نەخۆشی شەکرەی هەبوو، بردیان بۆ لای دوعاخوێنێک. دایک و باوک لەو بڕوایەدا بوون، کە پیاوچاکەکە شیفای بەخشیوە بە کوڕەکەیان، هەر بۆیە چیدی حەپی ئینسولینەکەیان نەدا بە کوڕە نەخۆشەکە. بەڵام هەر دوای سێ ڕۆژ، کوڕە دەمرێت. ئاواش دایە و باوە تووشی شۆک نەبوون، بەڵکوو پشتئەستوور بە ڕاکەی خۆیان، لەو بڕوایەدا بوون کە خودا کوڕەکەیان بۆ زیندوو دەکاتەوە. پۆلیس ژنەکە و پیاوەکەشی بە تۆمەتی کوشتنی نائەنقەست دەستگیر کرد. هەڵوێستی یاسا لەم جۆرە کێشانەدا، هەم ڕوونە و هەم مەقولیشە: ئازادیی ئێمە بۆ کردارنواندن، بەرمەبنای ڕاکانمان تا ئەو شوێنە ڕێپێدراوە، کە نەبنە مایەی ئازار بۆ ئەوانی دیکە.

## دەشێت ڕاکانمان هەڵە بن

ڕەنگە ئەوە بێت بە خەیاڵماندا، کە ئەگەر ئێمە ئازاد بین لە هەڵبژاردنی ڕاکانمان، کەواتە بەناچاری ڕاکانمان ڕاست دەر دەچن. بەڵام لە ڕاستیدا، ئەمە ڕاست نییە. کۆمەڵگە ئازادەکان لەسەر تێبینییەکی قووڵ، ژیرانە دامەزراون، ئەویش ئەوەیە کە مافی ئازادیی بیر کردنەوە و ئازادیی هەڵبژاردن، دوو مافن کە نابێت خەڵکیان لێ بێبەش بکرێن. بەڵام ئەم فاکتە {هەبوونی ئازادی بۆ بیرکردنەوە و هەڵبژاردن لە کۆمەڵگە ئازادەکاندا} بە هیچ شێوەیەک ئەوە نابەخشێت، کە بیرکردنەوەکان و هەڵبژاردنەکان {هەموو وەک یەک} ڕاست و دروستن. بنەڕەتیترین پرنسیپی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی دەڵێت، چۆنێتیی ئایدیاکان بەدەگمەن نەبێت، وەک یەک نین.

چارەسەرەکانی کێشەکان جۆراوجۆرن لەوانەوە، کە کردارین بۆ ئەوانەی کە ناکردارین، بیروڕاکان جیاوازن لەوانەوە، کە بناغەیەکی پتەویان هەیە بۆ ئەوانەی کە بناغەکەیان پووچەڵە، ئارگۆمێنتەکان جۆراوجۆرن لە ئارگۆمێنتە لۆجیکییەکانەوە بۆ نالۆجیکییەکان، بە هەمان شێوە، ڕاکانیش جۆراوجۆرن لەوانەوە، کە پشتئەستورن بە مەعریفە بۆ ئەوانەی کە خاڵین لە باگراوەندێکی مەعریفی. ئەوە ئیشی بیرکردنەوەی ڕەخنەییە، کە هەڵبستێت بە جیاکردنەوەی ئەوانەی کە شیاون، چاکن لەوانەی کە نەشیاون، خراپن، لە باشترین حاڵەتیشدا بیرکردنەوەی ڕەخنەیی هەڵدەستێت بە دەستنیشانکردنی ئەوەی کە باشترینە the best.

لە چواردەورماندا دەتوانین ئەو بەڵگانە ببینین، کە چۆن ڕاکان دەشێت بکەونە هەڵەوە. کەسێک کە تەنها هەینی و هەینی دەخواتەوە، ڕای وایە کە مادام ڕۆژەکانی تر ناخواتەوە، کەواتە ئەو ئالوودە نەبووە بە ماددە کحولیەکان. شوفێرێک کە بەردەوامە لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیلە هەشتپستۆنییەکەی، لە کاتێکدا گێچی بەنزینەکەی لەسەر سفرە، ڕەنگە بە خۆی بڵێت، گێچەکە هەڵە دەکات و تا پەنجا میلی تر پێی دەڕۆم. ئەو قوتابییەی کە لە تەمەنی شازدە ساڵاندا واز لە خوێندن دەهێنێت، پێی وایە ئەگەر لە تەمەنێکی زووەوە دەست بکات بە ئیشکردن، ئەوا دەتوانێت گەرەنتیی بەردەوامبوونی ئیشەکەی بکات لە داهاتوودا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە هەریەکە لەوان بەجیدی و قوڵیشەوە ڕاکانی خۆیان بە ڕاست بزانن، بەڵام لە ڕاستیدا هەڵەن.

لێکۆڵینەوەکان پیشانمان دەدەن، کە تەنانەت ئەوانەش کە هەوڵ دەدەن بە شێوەیەکی بابەتی حوکم بدەن ئەگەری ئەوە هەیە کە بکەونە هەڵەوە. هەندێک جار بە هۆی لەبەرچاونەگرتنی شتی زۆر بچووکەوە، کە ئەمان

ئاگاداری نین، دەکەونە هەڵەوە. بۆ نموونە، کۆمەڵێک کەس بەشدارییان کرد لە تاقیکردنەوەیەکدا دەربارەی کاریگەریی خواردنەوەی قاوە. بەشداربووان سێ جۆر قاوەیان تام کرد، کە لە سێ قووتووی قاوەیی و زەرد و سووردا بوون، بەبێ ئەوەی جۆری قاوەکە لە قووتووە ڕەنگ جیاوەزەکاندا نووسرابێت. ئەوانەی کە قاوەی قووتووە قاوەییەکەیان خواردووە، وتیان کە قاوەیەکی بەهێزە و بە هۆیەوە بەدرێژاییی شەو بێدار بوون. ئەوانەی قاوەی قووتووە زەردەکەیان بەکار هێنا، وتیان قاوەیەکی لاواز و ترنگ بووە. ئەوانەشی هی قووتووە سوورەکەیان بەکار هێنا، ڕایان وا بوو کە قاوەکە وەک پێویست بەهێز و بەتام بووە. بەڵام لە ڕاستیدا هەموو قاوەکان هەر یەک جۆر بوون و تەنها کرابوونە سێ قووتووی ڕەنگجیاوازەوە. *بەشداربووەکان نەستییانە، نائاگایانە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی ڕەنگە جیاوازەکانەوە.*

## ڕاکان لەسەر کێشە ئەخلاقییەکان Opinions on Moral Issues

ئەو بیرەی کە دەڵێت هەموو کەس مافی هەیە خاوەن ڕای خۆی بێت، لە کێشە ئەخلاقییەکاندا پێداگرییەکی بەهێزتر دەکات لەسەر ئەو مافە. حوکومدان لەسەر ئەوەی چ هەڵەیە و چ ڕاست، لەم دیدەوە تەواو وەک کێشەیەکی خودی و شەخسی لێک دروادوەتەوە. لەم دیدەوە ئەگەر تۆ ڕەفتارێکی دیاریکراو بە نائەخلاقی بدەیتە قەڵەم، بەڵام من بە ئەخلاقی و بگرە وەک ڕەفتارێکی خانەدانانەش بیدەمە قەڵەم، ئەوا هەردوو هەر ڕاستین. چونکە گۆشەنیگاکەی تۆ "بۆ خۆت ڕاستە" و ئەوەی "منیش بۆ خۆم."

لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە ئەو وێناکردنە زۆر مەعقول و کراوە دەر بکەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا دیدێکی زۆر کرچوکاڵ و سادەلەوحانەیە.

ڕۆژانە ئەو حاڵەتانە دێنە پێشەوە، کە وا پێویست دەکات لەلایەن کەسە ژیرەکانەوە هێرشیان بکرێتە سەر. ڕۆژێک لە ڕۆژان گوێت لە کەسێک بووە بڵێت، ماڵبڕین، خیانەتی هاوسەری، تەعدالیکردن، لە ڕووی ئەخلاقییەوە ڕێپێدراوە بۆ ئەوانەی بە ڕاستی دەزانن؟ کاتێک کەسێک تاوانی دەستدرێژی کردنە سەر منداڵانی بەسەردا ساغ دەبێتەوە، ئایا هاووڵاتییان لە بەردەم دادگادا کۆ دەبنەوە و تا لە ڕێی لافیتەکانیانەوە بڵێن، "با ئێمەش منداڵبازی بە هەڵە بزانین، بەڵام خۆ ئەو مافی خۆیەتی بە ڕاستی بزانێت؟" ئەگەر مامۆستاکەت بۆی دەر کەوت کە غەشت کردووە لە تاقیکردنەوەدا، ئایا پاکانەکەی تۆ قبوڵ دەکات بەوەی ئەنجام، هۆکار دەشارێتەوە؟ ئەگەر دەر کەوت هاوپۆلەکەت زیاد لە ڕادەی یاسایی خواردۆتەوە لە کاتی سەیارەلێخوڕیندا، ئایا ئەفسەری هاتووچۆ لێی خۆش دەبێت، تا هەر وا بەئاسانی بڕوات؟

بە نزیکەیی، هەموو ڕێکخراوێکی پرۆفیشناڵ و هەموو دەزگایەک، خاوەن کۆدی ئیتیکی خۆیانن، کە دەستنیشانی دەکەن چ هەڵسوکەوتێک ڕێگەپێدراوە و چیش نا. لە هەموو وڵاتێکدا، یاسا هەیە کە یاساشکێنەکان سزا دەدات. تەنانەت یاسا هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان. دیارە ئەم هەموو کۆدە ئیتیکی و سیستەمە یاساییانە هەر وا لە هەواوە وەر نەگیراون. بەڵکوو ئەمانە بەرهەمی حوکمە ئەخلاقییەکان، هەمان ئەو چالاکییە ئەقڵییەی تاکەکان ڕۆژانە پێی هەڵدەستن بۆ جیاکردنەوەی ڕاست لە هەڵە. ئەوانیش بە هەمان شێوە ئەکەونە ژێر باری سنوورداری و ناتەواوییەوە. هەر بۆیە ڕاکان لەسەر کێشە ئەخلاقییەکان، وەکوو ڕاکانی تر دەشێت هەڵە بن یان ڕاست بن.

ئایا هیچ پێوەدانگێک هەیە کە ئێمە چاوی لێ ببڕین، بەو هیوایەی

حوکمە ئەخلاقییەکانمان دروست بن؟ بەدڵنیاییەوە بەڵێ. لە گرنگترین ئەو پێودانگیانە، بریتین لە پابەندبوون obligation، باڵا Ideals، دەرهاویشتە.

- **پابەندبوون:** پابەندبوون واتە سنووردارکردنی ڕەفتارەکان، بە شێوەیەک، کە ناچارت دەکات شتێک بکەیت یان نەیکەیت. ئاشکراترین جۆری پابەندبوون بریتییە لە ڕێککەوتنە فۆرمەڵەکان وەکوو پەیماننامە، پابەندبوون چەند شتێکی تریش دەگرێتەوە، وەکوو پابەندبوونی پرۆفیشناڵی و پیشەیی و پابەندبوونی هاوڕێیەتی و هاوولاتی هەبوون.

- **باڵابوون:** بە شێوەیەکی گشتی، چەمکی باڵا ئاماژەیە بۆ مومتازبوون، ئەو ئامانجانەی کە هارمۆنیایەکی زیاتر لەنێوان خۆمان و ئەوانی تردا دروست دەکات. لە ئاکاردا، ڕەفتارە باڵاکان کۆمەڵێ چەمک دەگرێتەوە، کە کۆمەکمان دەکەن تا ڕێزگرتنمان لەوی دیکە بەردەوام بێت. هەندێک لەو چەمکانەی کە زۆر گرنگە ئاماژەیان پێ بدەین، ئەمانەن: ڕاستگۆیی، دەستپاکی، دادپەروەری و یەکسانی. ئەگەر دووان یان زیاتر لەم چەمکانە لە حاڵەتێکدا ڕووبەڕووی یەک بوونەوە، ئەوا دەبێت گرنگترینیان بخرێتە پێش ئەوی تریانەوە.

- **دەرهاویشتەکان:** دەرهاویشتەکان ئەنجامە باش یان خراپەکانی کردارێک دەگرێتەوە، کە کار دەکاتە سەر هەم بکەرەکە و هەم ئەوانی تریش. لێوردبوونەوە لە هەر دەرهاویشتەیەک، دەبێت کۆمەڵێک دووری، ڕەهەند لە بەرچاو بگرێت: شەخسی و کۆمەڵایەتی، فیزیکی و هەستی، سەرەتایی و کۆتایی، بە مەبەست و بێمەبەستەکان، دیار و شاراوەکان، ئەگەرەکان و دڵنیاییەکان. ئەو کردارانەی کە دەرئەنجامێکی

سوودبەخشیان هەیە، دەبێت جیا بکرێنەوە لەوانە کە دەرئەنجامێکی زیانبەخشیان هەیە. لە هەرکاتێکیشدا، زیاد لە دەرهاویشتەیەک هەبوو (هەندێک باش و هەندێک خراپ)، ئەوا کردەوەی پەسەندکراو ئەوەیە، کە باشەکانی زیاترە لە خراپەکانی.

## تەنانەت پسپۆڕەکانیش هەندێك جار بەهەڵەدا دەچن

مێژوو ژمارەیەکی زۆری ئەو بۆنانەی بۆ تۆمار کردووین، کە تێیاندا ڕای پسپۆڕەکان بەهەڵەدا چوون. لە سەردەمە کۆنەکاندا ڕای ستانداردی پزیشکی، سەرئێشەی گەڕانۆتەوە بۆ هەبوونی شەیتان لە کەللەی سەردا. هەر بە گوێرەی ئەم ڕایە، چارەسەر بریتی بووە لە کردنەوەی کاسەی سەر بۆ ئەوەی شەیتانەکە بێتە دەرەوە و مێشکی مانگا و پشقلی بزنیان دەرخواردی نەخۆشەکە دەدا. (هەندێک هۆزی ئەمەریکییە ڕەسەنەکان، گونی سەگی ئاوییان پێ باشتر بوو).

کاتێک بۆ یەکەم جار دەرمانی کوتان دژی ئاوڵە لە ١٧٠٠کاندا گەیشتە شوێنە داگیراوەکان، زۆربەی پسپۆڕەکان وەک شتێکی بێمانا سەیریان ئەکرد و بڕوایان پێی نەبوو. لە ناویشیاندا بینجامین فرانکلین Benjamin Franklin و هەندێک لەو پیاوانە هەبوون، کە دواتر بەشی پزیشکییان لە زانکۆی هارڤرد دامەزراند. زەبدیل بۆیلیستۆن Zabdiel Boylston کە پیاوێکی تا ڕادەیەک نەناسراوبوو و خاوەن هیچ بڕوانامەیەکی پزیشکی نەبوو، بەڵام ڕاکەی پێچەوانەی پسپۆڕەکان بوو. بەڵام ئایا ڕای کێ ڕاست دەر چوو؟ لە ڕاستیدا پسپۆڕەکان بەهەڵەدا چوون و زەبدیلیش لەسەر هەق بوو.

لە ١٩٨٠دا، براوەی خەڵاتی نۆبڵ، بەکتریا ناس، د. ڕۆبێرت کۆچ .Dr

Robert Koch بانگەشـەی ئەوەی کرد، کە گوایە شیفای نەخۆشـی سیلی دۆزیوەتـەوە. بـەڵام دوای ئـەوەی شـیفاکە بـە دەرزی لـە چەنـد نەخۆشـێک درا، دەر کـەوت کـە نـەک هـەر چارەیـان نـاکات، بگـرە حاڵیشـیان خراپتـر دەکات و تەنانـەت دەبێتـە هـۆی مردنـی نەخۆشـەکانیش.

لـە ١٩٠٤دا، ج سـتانلی هـۆل G. Stanley Hallی دەروونشـیکار، ڕای پرۆفیشـناڵی خـۆی لەسـەر ژنـان دەر بـڕی. بەگوێرەی ئـەو ڕایەیـە کاتێک ژنـان سـەرقاڵی چالاکییەکی ئەقڵی چڕوپڕ دەبـن بەتایبـەت لەگـەڵ پیاوانـدا، ئـەوا ئەزموونـی کۆمەڵـی حاڵـەت دەکـەن، وەکـوو کەمبوونـەوەی شـیری مەمکیـان و کەمبوونـەوەی ئارەزووی بـوون بـە دایـک و ناچالاکبوونیـان لـە ڕووی منداڵبوونـەوە. هـەر بۆیـە ئەگـەر منداڵیشـیان ببێـت، ئـەوا نەخـۆش و ناسـاغ دەبێت. بـەڵام لـە ئێسـتادا، ئـەم ڕایـە جێـی پێکەنیـن و گاڵتەپێکردنـە.

لـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ١٩١٩ تـا ١٩٢٢ مۆزەخانـەی گشـتی لـە نیـۆرک چەنـد دەفریکـی ئاڵتوونییـان کـڕی، کـە شـارەزایان دڵنیـا بـوون لـەوەی مێژوویەکـی ٣٥٠٠ سـاڵییان هەیـە و لـە گـۆڕی میسـرییە کۆنەکانـدا دۆزراونەتـەوە. بـەڵام لـە سـاڵی ١٩٨٢دا، دەر کـەوت کـە دەفرەکان سـاختەن و مێژووەکەیـان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەدەی بیسـتەم.

لـە سـاڵی ١٩٢٨دا، دەرمانێـک بـە نـاوی سۆرۆترەسـت Thorotrast دۆزرایـەوە، پزیشـکەکان لـەو بڕوایـەدا بـوون، کـە بـە هـۆی ئـەم دەرمانـەوە دەتوانرێـت تیشـکی X ڕوونتـر بـۆ نەخۆشـەکان بگیرێـت. بـەڵام دوای ١٩ سـاڵ، پزیشـکەکان بۆیـان دەر کـەوت کـە تەنانـەت بەکارهێنانـی بڕێکـی کەمیش لـەو دەرمانـە، دەبێتە هـۆی تووشـبوونی نەخۆشـەکە بـە شـێرپەنجە.

لە ساڵی ١٩٥٩دا، جۆرێکی نوێی ئازارشکێن خرایە بازاڕەکانەوە بە ناوی زەلیدەماید thalidomide. زۆر پزیشک لەم دەرمانەیان دەدا بە ژنە دووگیانەکان. بەڵام دواتر ژمارەیەکی زۆر منداڵی شێواو و ناتەواو لەدایک بوون، بۆیە پسپۆڕە تەندروستییەکان کەوتنە گەڕان بەدوای هۆکارەکەیدا، بۆیان دەر کەوت کە زەلیدیماید هۆکاری حاڵەتەکەیە.

لە ساڵی ١٩٧٦دا، بە هۆی بەکارهێنانی تازەترین تەکنەلۆژیای ئاسمانیی ئەو کاتەوە، زاناکان رایان گەیاند کە تێگەیشتنیان سەبارەت بە ڕووی ڤینۆس، هەڵە بووە. ڕووکەشی ڤینۆس ساف نەبوو وەک ئەوەی کە لەو بڕوایەدا بوون بۆ ماوەیەکی زۆر، بەڵکوو ڕووەکەی یەکپارچە چاڵچاڵە.

لە ساڵی ١٩٨٠کان و ١٩٩٠کاندا، یەکێک لە گەرمترین بابەتەکانی ناو بڵاوکراوەکان و سیمینارەکان بریتی بوو لە هاوپەیوەستی co_ dependency. هەرکەسێک پەیوەندیی هەبووایە بە کەسێکی ئارەقخۆری مودمین یان تلیاککێشانەوە، وەکوو بەشدار لە کێشەکەدا سەیری دەکرا، ئەمەش بە پلەی یەکەم، لەبەر ئەوەی کە نائاگایانە هانی تووشبووەکە دەدات تا لەسەر خووەکەی بەردەوام بێت، یان ئەو ماددەکانی بۆ "فەراهەم دەکات." ئیدی هەر ڕەفتارێک کە وا دەر بکەوتایە لە دەرەوەی کۆنترۆڵەوەیە، ناوی هاوپەیوەستییان لێ دەنا. هاوپەیوەستەکان هان دەدران تا بخوێننەوە و بەشداری سیمینارەکان بکەن و بەشداری بکەن لە ئامۆژگاریکردنی ئەندامە خاوەن کێشەکانی خێزانەکەیان. بەڵام دواتر، ئیدس گۆمبێرگ کە لێکۆڵەرەوەیەکی فزولی بوو، دەستی کرد بە لێوردبوونەوە لەو لێکۆڵینەوە زانستییانەی کە ئەم تەوژمە فکرییەی {هاوپەیوەستی} لەسەر دامەزرابوو. بەڵام ئەو هیچ، هەر هیچ، شتێکی نەدۆزییەوە. ئەو دەڵێت، "ڕاپرسی نەکراوە، لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی

نەکراوە، هیچ هەڵسەنگاندنیک بوونی نییە؛ تەنها کۆمەڵێک حوکمی وەسفی و گشتییە."

لە ماوەی بە نزیکەی هەموو سەدەی بیست لەسەر ئاستی جیهانی، ڕایەکی زانستی قبولکراو هەبوو دەربارەی هۆکاری تووشبوونی نەخۆشیی برینی گەدە. بەپێی ئەو ڕایە، هۆکاری ئەو نەخۆشییە بریتییە لە قەلەقی، کە وا دەکات گەدە زیاد لە پێویست ترشی هەرسکەر بڕژێنێت. لێ دواتر باری مارشل Barry Marshel دەری خست، کە هۆکاری برینی گەدە بەکتریایە و دەشتوانرێت لە ڕێی دژەبەکتریاوە چارەسەر بکرێت.

دەتوانی برۆنتۆسێۆرۆس {دەینەسورێکی زۆر گەورەی ملدرێژی گیاخۆرە} بهێنیتە بەرچاوت، کە لە پارکی جیور*اسیکدا* گەڵای سەری سەرەوەی درەختەکان دەخوات؟ ئەو دیمەنەی ئەم پرسیارە پێشنیاری دەکات، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆچوونە زانستییە باوەی کە دەڵێت، دەینەسۆرە گیاخۆرەکان لەسەر گەڵای ئەو درەختانە ژیاون، کە بەرزاییان زیاتر لە سی پێ بووە. بەڵام پسپۆڕ لە ناوچەی ئیلینۆیس Illnios مایکل پاریش Michael Parish، توانیی لە ڕێی کەمپیوتەرەوە ئێسکەکانی برۆنتۆسێۆرۆس پێکەوە بنێت و بۆی دەر بکەوێت کە ئەم دەینەسۆڕانە هەرگیز نەیانتوانیوە سەریان لە ئاستی لەشیان زیاتر بەرز بکەنەوە، چونکە ئەگەر زیاتر بەرزیان بکردایەتەوە، ئەوا بڕبڕەی پشتیان دەشکا. تەنانەت نەشیان دەتوانی لەسەر پاشوویان {دوو پێی دواوە} بوەستن، چونکە بۆ ئەوە، پێویستیان بەوە دەبوو فشاری خوێنیان بێئەندازە بەرز ببایەتەوە.

ساڵانێکی زۆر بوو پزیشکەکان پێیان دەوتین خواردنی فایبەر Fiber ڕادەی کۆلسترۆڵ دادەبەزێنێت و ڕێگرە لە بەردەم تووشبوونی ڕیخۆڵە

بە شێرپەنجە. لە دواییدا توێژینەوەیەکی پزیشکی دەری خست، فایبەر رادەی کۆلسترۆڵ دانابەزێنێت. پاشانیش لێکۆڵینەوەکان دەریان خست، فایبەر ناشتوانێت پارێزگاری ڕیخۆڵە بکات لە تووشبوون بە شێرپەنجە.

تا ئەمڕۆش، دەیان پسپۆڕ و شارەزا لەو بڕوایەدان ژینگەی کۆمەڵایەتی، خراپ سەر دەکێشێت بۆ تاوانکاری، هەر بۆیە چارەسەر بریتییە لە ساغکردنەوەی دەیان ملیۆن دۆلار لە ناوچە هەژارنشینەکەندا لە بەرنامە کۆمەڵایەتییە جۆربەجۆرەکاندا. لێ هەندێکی دی لە شارەزایان لەو بڕوایەدان، نەخۆشییە دەروونییەکان هۆی تاوانەکانن، هەر بۆیە چارەسەر بە دانیشتن دەبێت لەگەڵ دەروونزانەکاندا، بەڵام لێکۆڵەری دیار و کاریگەر، سانتۆن سامینۆ Santon Samenow هەردوو بۆچوونەکە ڕەت دەکاتەوە. ئەو دەڵێت، "ژینگەی خراپ، دایک و باوکی کەمتەرخەم، تەلەڤزیۆن، قوتابخانە، دەرمانە بێهۆشکەرەکان، بێکاری، هیچکام لەمانە هۆکاری تاوان نین، تەنها تاوانباران خۆیان هۆکاری تاوانن." تاوانباران یاساکان دەشکێنن، نەک لەبەر ئەوەی لە دۆخێکدان ناچار بن بە شکاندنی، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە خۆیان *ئازادانە* بڕیار دەدەن بیانشکێنن، چونکە خۆیان بە شتێکی تایبەت دەزانن، بە شێوەیەک، وەک ئەوەی ئەوان لە سەرووی یاساوە بن. لە دیدی سانتۆندا، گرنگترین هۆکاری چاکسازیی کۆمەڵایەتی ئەوەیە، کە تاوانباران قانع بکەیت بەوەی بەرپرسیارێتیی کردەوانی خۆیان دەکەوێتە ئەستۆی خودی خۆیان. بەڵام ئایا سانتۆن لەسەر حەقە؟ لێگەڕێ داهاتوو وەڵام بداتەوە.

مەحاڵە ئەمڕۆ بزانرێت کە سبەی ڕای کام شارەزایە ڕەت دەکرێتەوە. بەڵام ئەوەی جێی دڵنیاییە، ئەوەیە کە هەندێک هەر تووش دەبن، بە شێوەیەک، ڕەنگە ئەوانە بن کە ئەمڕۆ وەک خاوەن حەقیقەت تەماشا دەکرێن.

## جۆرەکانی هەڵە

ڕاکان بە هۆی ئەم چوار جۆرە باوەی هەڵەوە لە بەردەم ئەگەری بەهەڵەداچوونن*. بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، وا لە خوارەوە جۆری هەڵەکان و نموونەکانیان دەخەینە ڕوو:

١. هەڵەکردن، یان مەیلی ئەنجامدانی کاری هەڵە لەنێوان هەمووماندا بوونی هەیە و بەشێکە لە شووناسی مرۆڤبوونمان (بۆ نموونە سەیرکردنی کێشەکان تەنها لە یەک گۆشەوە، یان پەلەکردن لە حوکمداندا یان سادەکردنەوەی واقیعە ئاڵۆزەکان).

٢. هەڵەکردن، یان مەیلی هەڵەکردن، زیاد لە هۆیەکی هەیە، بۆ نموونە، ڕەنگە بە هۆی ئەو شتانەوە بێت، کە وەک خوویەک بیریان لێ دەکرێتەوە یان ڕەنگە هۆکەی ڕەفتار، یان بڕوا یان تیۆرییەک بێت ( بۆ نموونە، خووی ڕقلێبوونەوە لە ئەندامەکانی دینێک یان نەژادێکی تر).

٣. هەندێکی تر لە هەڵەکان ڕوو دەدەن بە هۆی پەیوەندیکردن و ڕێگرییەکانی بەردەم زماندا (بۆ نموونە، لە کاتی گوزارشتکردن لە ئایدیایەک یان دەربڕینی هەستێکدا بە شێوەیەکی ناکامڵ و نیوەناچڵ، دەبێتە هۆی هەڵەتێگەیشتن لە نێوان قسەکەر و گوێگردا).

٤. جۆرێکی تر لە هەڵە، ئەو جۆرەیە کە وەک مۆدیلێکی قبوڵکراو لە سەردەمێکی دیاریکراودا بوونی هەیە (بۆ نموونە، مەیلی قبوڵکردنی

---

* ئەم پۆلێنەی لێرەدا باس کراوە، لە کتێبە بەناوبانگەکەی فرانسس بیکۆنەوە وەر گیراوە، "بتەکان،" نوڤیۆم و وۆرگانیۆم، کتێبی یەکەم (١٦٢٠)

دەسەلات لە سەردەمی باووباپیرانماندا بەبێ هیچ پرسیارێک، بەلام مەیلی ئێمە بۆ قبوڵنەکردنی هیچ دەسەلاتێک جگە لە خۆمان).

بەلام بەدڵنیاییەوە هەندێک لە مرۆڤەکان زیاتر لەوانی تر دەکەونە هەڵەوە. فەیلەسوفی ئینگلیزی، جۆن لۆک، ئەم جۆرە کەسانە دابەش دەکات بۆ سێ گروپ:

گروپێکیان زۆر بەکەمی نەبێ، بیر ناکەنەوە، بە هەمان شێوەی کەسەکانی دەوروبەریان بیر دەکەنەوە و ڕەفتار ئەنوێنن وەکوو باوانیان، دراوسێکانیان، یان وەک قەشەکانیان، یان هەرکەسێکی تر، کە جێی ئیعتیبار و ڕێزی ئەوانە.

گروپێکی تریان ئەوانەن کە زیاتر لەژێر کاریگەریی هەستەکانیانن وەک لە ئەقڵیان. ئەم کەسانە تەنها گوێ لە ئەقڵێک دەگرن، کە پشتگیریی حوکمە پێشوەختەکانیان بکات.

گروپی سێیەم ئەوانەن کە بە شێوەیەکی گەرموگوڕانە وەدووی ئەقڵ دەکەون، بەلام گرفتیان ئەوەیە، کە بە شێوەیەکی بەرتەسکانە سەیری کێشەکان دەکەن، هەر بۆیە هەموو ڕەهەندەکانی کێشەکە نابینن. ئەوان تەنها لەگەڵ گروپێک خەڵکدا قسە دەکەن، تەنها جۆرێک کتێب دەخوێننەوە، تەنها بە ڕووی یەک گۆشەنیگاشدا دەکرێنەوە.

دەتوانین یەگ گروپی تر زیاد بکەین بۆ دابەشکردنەکی لۆک، ئەوەش ئەوانەن کە هەرکاتێک ڕایەکیان وەر گرت، ئیدی هەرگیز زەحمەتی ئەوە ناکێشن چاوێکی پێدا بخشێننەوە. ئەم گروپە زیاد لە هەر گروپێکی

تر، لە بەردەم ئەگەری بەهەڵەداچووندان، جگە لەوەش، ئەوان هەموو ئەو چانسانەش لەدەست دەدەن بۆ پێداچوونەوەی ڕا هەڵەکان لە کاتی دەرکەوتنی بەڵگەی نوێکاندا.

## ڕای بەئاگا لە بەرامبەر ڕای بێئاگادا
## Formed versus informed opinion

ئەگەر شارەزایان هەر وەک ئێمە لە بەردەم ئەگەری بەهەڵەداچووندا بن، ئەی بۆچی ڕاکانی ئەوان لە هی کەسە ناشارەزاکان بەنرختترە؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەو نموونانەی پێشتر باسمان کردن، ڕەنگە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە گوێگرتن لە ڕای پسپۆڕەکان، کاتبەفیڕۆدانە. با سەیری هەندێک نموونە بکەین لە خوارەوە، تا بزانین ئەم دەرئەنجامە ئاقڵانەیە یا خود نا.

ئایا کێشانی حەشیشە چ کاریگەرییەک لەسەر ئەو کەسە دادەنێ، کە دەیکێشێت؟ بۆ وەڵامی پرسیارەکەمان، دەتوانین ڕای کەسێک یان گروپێک وەر بگرین، کە ئەم ماددەیە دەکێشن. بەڵام بەدڵنیاییەوە وەڵامێکی وردتر و جێمتمانەترمان دەست دەکەوێت، ئەگەر ڕای کەسێکی *شارەزا* یان چەند کەسێک وەر بگرین، کە لێکۆڵینەوەی زانستییان لەسەر کاریگەرییەکانی حەشیشە بەئەنجام گەیاندووە. (بۆ نموونە، گروپێک لە پزیشکە سەربازییەکان بۆیان دەر کەوتووە کێشانی بڕێکی زۆری حەشیشە، زیان بە سییەکان دەگەیەنێت. هەروەها ئەگەر حەشیشەکێشەکە نەخۆشیی شیزۆفینینای هەبوو، ئەوا نەخۆشییەکەی بە هۆی حەشیشەکەوە بۆ ماوەیەکی زۆر زیاتر درێژە دەکێشێت.)

کوەیزە quasar {کوەیزە بە چەقی ئەو کۆمەڵەهەسارەیە دادەنرێت،

کە زۆرزۆر دوورە لە خۆمانەوە} زەبەلاح رەنگە کەوتبێتە کۆتاییی گەردوونەوە، بە شێوەیەک، کە ١٠ بلیۆن ساڵی رووناکی لە ئێمە دوورە. (دەتوانین دورییەکەمان بە میل دەست بکەوێت لە رێگەی لێکدانی خێرای رووناکی لە هەر چرکەیەکدا کە ١٨٦٠٠٠ میللە، لە ژمارەی چرکەکانی یەک رۆژ کە ٨٦٤٠٠ چرکەیە؛ پاشان لێدانی وەلامەکەیان لە ژمارەی رۆژەکانی رۆژ لە ساڵێکدا، کە ٣٦٥ رۆژە؛ لە کۆتاییشدا لێدانی وەلامەکە لە ٠٠٠، ٠٠٠، ١٠٠٠٠). ئەستێرەناسان بۆیان دەر کەوتووە کە ئەو رووناکییەی ئەوان ئێستا دەیبینین، بۆ ماوەی ئەو هەموو ساڵە لە گەردووندا بەرێوە بووە تا گەیشتوتە لای ئەوان. کوەیزەکە رەنگە پێش ملیۆن ملیۆن ساڵ لەمەوبەر *لەناو* چووبێت. ئایا وایە؟ رەنگە چەندان ملیۆن ساڵ پێش ئەوەی ئێمە بتوانین بیبینین، رووداوەکە بووبێت. ئەگەر بمانەوێت زیاتر دەربارەی کوەیزە یان کوەیزەکان بزانین، دەتوانین کەسێک لەسەر جادە بگرین و پرسیاری لێ بکەین. بەلام ئاشکرایە ئاقلانەترە کە پرسیارەکانمان ئاراستەی ئەستێرەناسێک بێت.

ئایا حوتەکان دەتوانن پەیوەندی بە یەکترییەوە بکەن؟ ئەگەر دەتوانن، تا چ دوورییەک دەتوانن پەیامەکانیان بگوێزنەوە؟ رەنگە میکانیکێک یان بەقاڵێک یان پزیشکێکی ددان یان کارمەندی بانک هەموو خاوەن را بن لەسەر پرسیارەکەمان. بەلام هەرچۆنێک بێت، ئەگەر زۆر بەتواناش بن لە بوارەکانی خۆیاندا، ئەوا راکانیان هەر سادەگۆ و ناراست دەبێت لەسەر بابەتەکەی ئێمە. رای ئەو کەسانە نرخی دەبێت، کە توێژینەوەیان لەسەر حوتەکان بەئەنجام گەیاندووە. ( شارەزایان پێمان دەڵێن، حوتی هەمپباک دەتوانێت چەندین دەنگ دەر بکات، حوتەکان جۆرە دەنگێک دەر دەکەن، کە وەکوو تەقتەق وایە، هەروەها دەنگێک، کە وەکوو جیرەجیری دەرگا وایە، جگە لەمانە، دەنگێک دەر دەکەن، کە بە هۆیەوە قسە لەگەڵ یەکتردا

دەکەن. حوتەکان بۆ چەندەها خولەک بەردەوام دەبن لەسەر دەرکردنی ئەم دەنگانە، بە هێزی ۱۰۰ تا ۱۱۰ دیسیبێل، هەروەها تا دووریی ۲۵۰۰۰ میل بڵاو دەبنەوە.)

نموونەی هاوشێوەی ئەوانەی سەرەوە دەتوانرێت لە سەرجەم کایە مەعریفییە جیاوازەکاندا بهێنرێتەوە: لە ئاسەوار ناسییەوە بۆ ئیتیک، لە هونەرەوە بۆ تاواںناسی. هەموو نموونەکانیش جەخت لەسەر یەک فاکت دەکەنەوە: بە لەبەرچاوگرتن و لێوردبوونەوە لە ڕای کەسە شارەزاکان، پێش ئەوەی بڕیاری خۆمان بدەین، کۆمەڵی سوودمان دەست دەکەوێت، وەکوو فراوانکردنی ئاسۆی بینینمان، بینینی ئەو وردەکارییانەی خۆمان بەتەنها نەماندەتوانی بیان بینین، لەبەرچاوگرتنی ئەو فاکتانەی کە بێ ئەوان فەرامۆشمان دەکردن، هەروەها کەمکردنەوەی ئەگەری بەهەڵەداچوونمان. (بەڵام ئەگەر پێمان وا بێت لە ڕێی ئەوانەوە دەتوانین هەموو شت بزانین، گەمژەییە). هیچکەس ناتوانێت هەموو شت دەربارەی هەموو شت بزانێت؛ زۆر بەسادەیی لەبەر ئەوەی کاتی تەواو لە بەردەستا نییە بۆ فێربوون. لەبەرچاوگرتنی ڕای ئەوانەی خۆیان تەرخان کردووە بۆ قوڵبوونەوە لە کایەیەکی مەعریفیدا، واتای ئەوە ناگەیەنێت، کە دەبنە کەسێکی پاسڤ، یان نابەرپرسیار، بەڵکوو مانای چالاکی و زەوقسەلیمیمان دەگەیەنێت.

بۆ ئەوەی ڕایەیەک وەک ڕایەکی بەئاگا بێتە ئەژمار، لە ڕاستیدا دەبێت لەسەر بناغەیەکی جەوهەری دامەزرابێت لەجیاتی ئاشنایەتیی ئێمە بە ڕاکە، یان درێژیی ئەو ماوەیەی کە ئێمە ڕاکەمان قبوڵ کردووە، یان ئەوەی کە گوایە ئێمە دەتوانین هەرشتێک بە ڕاست بزانین کە دەمانەوێت. بەڵکوو دەبێت لەسەر لەبەرچاوگرتنێکی جیدی بەڵگەکان دامەزرابێت. تەنانەت لە کاتی بۆنە نافەرمییەکاندا ڕا وتراو یان نووسراوەکان دەبێت

بە بەڵگە تەواو پشتڕاست کرابێتنەوە. هەردوو نووسەری ئەمەریکی، ڕەی مارشاڵ و مارک تیوکەر، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە هۆکاری ئەوەی کاری وانەوتنەوە وەک پێویست ڕێزی لێ نەنراوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی هەموو مامۆستاکان ژن بوون. بۆ پشتڕاستکردنەوەی حوکمەکەی خۆیان، نووسەران ئاماژەیان بە زۆر شت داوە، لەوانە: ئاوڕێک لە ڕەهەندی مێژووی بابەتەکە دەدەنەوە، ئاماژە بە وتەی بەڕێوبەرانی پەروەدەیی و فەیلەسوفان دەدەن، هەروەها ئاماژە بە ڕێژەی دامەزراندنی مامۆستاکان دەکەن(لە ١٨٧٠دا ٥٩٪ ئافرەت بوون و لە ١٩٢٠دا ٨٦٪)، هەروەها سەرنج دەخەنە سەر گۆڕانە دیارەکانی پرۆگرامی خوێندن، جگە لە هەموو ئەمانەش، ئاماژە بە کەمیی موچەی مامۆستا ئافرەتەکان دەدەن لە بەرامبەر موچەی زۆرتری هاوپیشە پیاوەکاندا.

وەک ئەم نموونەیە پیشانی دا، لە زۆربەی ئەو حاڵەتانەدا کە بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە ڕاکان پیشان دەدرێن، خودی ڕاکە خۆی لە ڕستەیەکدا یان دوو ڕستەدا دەخرێتە ڕوو، ئەمە لە کاتێکدا وردەکاریی پشتڕاستکردنەوەی ڕاکە پەرەگراف، لاپەڕە تەنانەت هەموو چاپتەرەکەشی بۆ تەرخان دەکرێت. ئەمەت لەخەیاڵ بێت لە کاتی نووسینە شیکارییەکانی خۆتدا.

## دارشتنی ڕای دروست

یەکێک لەو تایبەتمەندییانەی کە وا لە مرۆڤەکان دەکات زۆر ئاڵۆزتر و سەرنجڕاکێشتر بن لە ئاژەڵ و درختەکان، بریتییە لە توانای ڕادارشتن. ئەم توانایەش سیفەتێکی سروشتیی مرۆڤەکانە. تەنانەت ئەگەر هەوڵیش بدەین ئەو توانایە لە خۆماندا بکوژین، ئەوا ناتوانین، بگرە هەر پێویستیش ناکات هەوڵێکی واش بدەین. بەلام لەگەڵ

ئەمانەشدا، ئەم توانایەی مرۆڤ دوو دیوە. دیویکی ئەوەیە کە بەرزمان دەکاتەوە ڕووەو مەعریفە، دیوەکەی تریشی شۆڕمان دەکاتەوە ڕووەو سادەلۆجی، بگرە گەمژەییش. لە خوارەوە هەندێ ئامۆژگاری دەخەینە ڕوو بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی چۆنێتیی ڕاکانمان:

١. **تێگەیشتن لە چۆنێتیی دروستبوونی ڕاکان:** وەکوو هەموو مۆڤەکانی تر، تۆش بەردەوام لە پرۆسەی هەستکردندایت، واتە پرۆسەی وەرگرتنی داتا لە ڕێی هەستەکانتەوە. هەروەها وەک هەریەکێکی تر تۆش ویستێکی سروشتیت تێدایە بۆ دۆزینەوەی مانا لەناو هەستکردن و سەرنجدانەکانت. ئەم ویستە سروشتییە هەم لە بەردەم ئەگەری بەهێزکرن و هەم لە بەردەم ئەگەری لاوازکردنیشدایە، بەڵام هەرگیز ناتوانرێت بەتەواوەتی لەناو ببرێت. بە مانەیەکی تر، تۆ ناتوانیت ڕێگری بکەیت لە دروستبوونی ڕاکانت، چونکە هەرشتێک کە دەیبیستی یان دەیبینی، دەبنە هۆی دروستبوونی ڕا و ئەم پرۆسەی ڕادروستبوونە دەشێت لەژێر کۆنترۆڵی ئەقڵی خۆتدا بێت، واتە ئاگاییانە بێت، هەندێ کاتیش نائاگاییانە. لەو کاتەنەدا کە کۆنترۆڵی خۆت لەدەست دەدەیت، سیستەمی ئەقڵیت لە دۆخێکی نارەخنەییدا کار دەکات. لە خوارەوە بەراوردێک دەکەین لەنێوان دۆخی نارەخنەیی و دۆخی بەئاگا، واتە ڕەخنەیی لە پەیوەندیدا بە پرۆسەی دروستبوونی ڕاوە:

| دۆخی نارەخنەیی | دۆخی رەخنەیی |
| --- | --- |
| هەستکردن | هەستکردن |
| ڕاکە قبوڵ دەکات، تەنها سەرنج دەخاتە سەر ئەو زانیارییەی کە پشتگیریی ڕاکە دەکات. | پێشوەخت لە ڕاکە دەکۆڵێتەوە، ڕا ئەڵتەرناتیڤەکانیش لەبەرچاو دەگرێت. |
| دەبێتە شوێنکەوتووی ڕاکە. | بەدوای ئاقڵانەترین ڕای ناو ڕاکاندا دەگەڕێت. |

**٢. بەرەنگاری ئەو مەیلە ببەرەوە، کە دەیەوێت وەک فاکتێک ڕاکانی خۆت قبوڵ بکەیت:**

ئەم مەیلە دەشێت زۆر بەهێز بێت. وەک چۆن دایک و باوک وابەستەی منداڵەکانی خۆیان دەبن، ئاواش سروشتییە تۆش وابەستەی ڕاکانی خۆت بیت. هەتا زیاتر ڕایەک لە خەیاڵتا بێت و هەتا زیاتر گوزارشتی لێ بکەیت بۆ ئەوانی دی، زیاتر و زیاتر وابەستەتر دەبیت پێوەی. هەر بۆیە وای لێ دێت، ئیدی پرسیار لەسەر ڕەوایەتی ئەو ڕایە هەر بە خەیاڵیشتا نایەت. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا، خۆت لەوە دڵنیایت کە هەندێک لە ڕاکانت بە شێوەیەکی نارەخنەیی دارێژراون و پێویستە پێیاندا بچیتەوە. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە، کە ناتوانیت دڵنیا بیت کە ئەو ڕایانە کامانەن. هەر بۆیە ڕێگەچارە ئەوەیە، کە هەموو ڕاکانت بخەیە ژێر پرسیارەوە، تەنانەت ئەوانەشی کە خۆشت دەوێن، لە هەر چرکەساتێکدا کە بەڵگەیەک دەر کەوت و پێی وتیت ڕاکەت لەسەر خوو، ئارەزوو، کەڵکەڵە whim، مەیلی تاکەکەسی، یان بە هۆی کاریگەریی ئایدیایەکی باوەوە دارێژراوە نەوەک واقیع و ڕاستی، ئەوا پێویستە پێیاندا بچیتەوە.

**٣. چاودێریی بیرکردنەوکانی خۆت بکە، تا ڕێ بگرێت لە بیرکردنەوە**

**نارەخنەییەکان لەوەی ببنە قسەکەری یەکەم:**

لە کاتی دروستبوونی هەستی سەرسامبوون بەرامبەر بە کەسێک، شوێنێک، یان حاڵەتێک، ئەم ئامۆژگارییەی فەیلەسوفی یۆنانی Epictetus لەبەرچاو بگرە، "مەکەوە داوی ئەو شتەی کە پێی سەرسام دەبیت، بەڵکوو پێی بڵێ کەمێک بۆستە ئەی سەرسامبوون. لێم گەڕێ تێت بگەم کە تۆ چیت و گوزارشت لە چی دەکەیت. لێم گەڕێ تاقیت بکەمەوە." لە ڕێی ئەم شێوازەوە، دەتوانی لە مەعقولییەتی سەرسامبوونەکانت تێبگەیت پێش ئەوەی بگۆڕێن و ببنە ڕایەکی بەهێز.

باشە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەم سێ ئامۆژگارییە، چ سوودێکت پێ دەگات؟ سوودێکی بەرچاو کە دەستت دەکەوێت، بریتییە لەوەی کە ئەوە تۆیت کە ڕاکان کۆنترۆڵ دەکەیت، نەک بە پێچەوانەوەش، واتە ئەوان تۆ کۆنترۆڵ بکەن.

# ڕاهێنانەکان

١. وای دانـێ بەرپرسـی کتێبخانـەی کۆلێجێکـت. لیسـتێکت لەلایـەن مامۆسـتای بەشـەکانەوە بۆ دێت، لەو لیسـتەدا کە لـە خـوارەوەدا ئاماژەی پـێ دراوە، نـاوی کۆمەڵـی گۆڤـاری تێدایـە لەگـەڵ کۆمێنتێکـی زۆر کـورت لەسـەر هەریەکەیـان کـە لـە *گۆڤارێک* بـۆ *کتێبخانەکانـ*ەوە وەر گیـراوە، دانەرەکانی ئـەو گۆڤارەش بریتیـن لـە بیل کەیتز و لیندا سترێنبێرگ کەیتز:

a. *نەتـەوە the nation*. "ئـەم گۆڤـارە باشـترین گۆڤـاری لیبراڵە\باڵـی چەپـە، سـتاندارديکە بۆ هەمـوو ئـەو گۆڤـارە لیبراڵانـەی تـر، کە دەر دەچـن، لایەنگریکردنـی ئـەم گۆڤـارە، هیـچ دوودڵییەکـی نـاوێ."

b. ڕووداوە ئینسـانییەکان *human events*. "سـەرنووسـەر هیـچ بانگەشـەی بێلایەنـی گۆڤارەکـەی نـاکات... سـەروتار هەمیشـە تۆنێکـی کەنسـێڤەتیڤانەی پێـوە دیـارە، بەتایبـەت ئەگـەر باسـی کۆنگرێـس بـکات."

c. *free inqauiry*: گۆڤارێکـی مرۆڤدۆسـتانەی عەلمانییـە. "بابەتەکانـی ئـەم بڵاوکراوەیـە ڕەنگدانـەوەی CODESH و [ئەنجومەنێـک بـۆ مرۆڤگەراییەکـی دیموکراتـی و عەلمانـی the council of democratic and secular humanism] و دژی ئـەوەن ئایین بـە دامەزراوە بکرێت و لەگەڵ ئـەوەدان بـە شـێوەیەکی عەلمانـی ئینسـانی تەفسـیر بکرێـت."

d. پەیدیکا paidika: *گۆڤارێکە دەربارەی منداڵبازی.* "پەیدیکا دەخوازێ گۆڤارێک بێت تا بە شێوەیەکی ئەکادیمی لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەهەندی سێکسی مرۆڤ بکات، هەروەها لە مێژوو و چییەتی منداڵبازی و منداڵباز بکۆڵێتەوە."

ڕوونی بکەرەوە کام لە گۆڤارەکان دەستنیشان دەکەیت بۆ کتێبخانەکە، کامیشیان ڕەت دەکەیتەوە، دەربارەی کامەنەش داوای زانیاریی زیاتر دەکەیت تا بڕیاری لەسەر بدەیت. ئەگەر پێویستت بە زانیاریی زیاتر هەبوو، ڕوونی بکەرەوە کە ئەو زانیارییە چییە و چۆنیش بەدەستی دەهێنیت. (تێبینی: دەبێت کۆپییەکت لە گۆڤاری *گۆڤارێک بۆ کتێبخانەکان* لە کتێبخانەکی زانکۆکەتدا دەستبکەوێت.)

٢. کام یەک لەم کەسانەی خوارەوە ئەگەری ئەوەی هەیە بتوانێت زۆرترین خەڵک قایل بکات، تا مۆدیلێکی نوێی کاڵەی وەرزشی بکڕن؟ هۆی هەڵبژاردنەکەت ڕوون بکەرەوە.

ا. ڕاهێنەرێکی بەئەزموون.

ب. براوەی خەڵاتی ئۆلمپی بۆ ڕاکردن.

ت. پێداتریستێک {کەسێکی شارەزا لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پێ}.

ج. وەزیری تەندروستیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

٣. کام لەوانەی لەسەرەوە ناویان هاتووە، بە بۆچوونی تۆ خاوەن زۆرترین زانیارییە لەسەر کاڵەی وەرزیشی؟

٤. ئەو هۆکارانە کامانەن کە بە هۆیانەوە زیاد لە کەسێکی

پێشنیارکراوی ڕاهێنانی ژمارە ٢ هەڵدەبژێریت؟ کام لەو کەسانە باشترین سەرچاوەی زانیارین؟ هەر وەڵامێک کە هەڵی دەبژێریت، هۆکارەکەی ڕوون بکەرەوە.

٥. کاتێک نووسەر چەمکی *ڕا* بەکار دەهێنێت، بە پلەی یەکەم مەبەستی سەرەکیی ئەو کام لەمانەی خوارەوەیە؟ هۆی وەڵامەکەت ڕوون بکەرەوە.

a. گوزارەیەکی پەسەندخوازی a statement of preference

b. حوکمدانێکی ورد و بەدیقەت

c. گۆشەنیگایەک یان بڕوایەک بۆ ماوەیەکی کەم

d. هەڵوێستێکی، تەسکبینانە و توندڕەوانە

e. هەڵوێستێک کە بەرگریی لێ ناکرێت

f. هەموو ئەوانەی سەرەوە

g. هیچکام لەوانەی سەرەوە

٦. لە دیدی نووسەردا، کام لەمانەی خوارەوە بە باشترین ڕێگە دێت بۆ دارشتنی ڕایەکی پتەو؟ هۆکانی وەڵامەت بخە ڕوو.

a. لە خەمی هۆی ئەقڵانیدا بیت تا ڕاکەتی پێ پشتئەستوور بکەیت.

b. جیاکردنەوەی و ڕایەکی بەئاگا لە ڕایەکی بێئاگا؟

C. ڕەتکردنەوەی ڕای ئەوانی دی.

d. ڕاکەتکراوە بێت لە بەردەم بەڵگە نوێکاندا تا دووبارە چێک بکرێتەوە.

٧. قوتابییەکی ناوەندی دراوسێیەکی ژنی تەمەن ٣٥ساڵی بانگێشت کردووە بۆ ئاهەنگی تەواوکردنی قۆناغی ناوەندی. ژنەکە خاوەن ٤ منداڵە و مێردەکەشی ڕەزامەندیی پیشان داوە لەسەر چوونی بۆ ئاهەنگەکە.

بەلام بەڕێوەبەری قوتابخانەکە دەڵێت، ئەگەر ئەو ژنە بێت، ئەوا کوڕەکە نابێت بەشداری بکات لە چالاکیی سەماکردنی ئاهەنگەکە. ڕای تۆ چییە لەسەر بڕیاری بەڕێوەبەرەکە؟

٨ـ ئەم دیالۆگانەی خوارەوە بەوردی بخوێنەرەوە. پاشان بزانە هیچ ئایدیایەکی تێدایە کە ناکۆک بێت بە چاپتەرەکە. هەر بیرێکی هەڵەی تێدا بوو، دەستنیشانی بکە، پاشان لە ڕێی وشەکانی خۆتەوە باسی هەریەکەیان بکە.

فرێد: ئەو گفتوگۆیەی ئەمڕۆ لە پۆلدا ڕووی دا، بەڕاستی قەڵسی کردم.
ئارت: بەڕاست؟ دەربارەی چی بوو؟
فرێد: سێکس لە تەمەنی مێردمنداڵیدا. پرسیاری گفتوگۆکە ئەوە بوو، ئایا سێکسکردنی مێردمنداڵان هەرکاتێک کە دڵیان خواستی و لەگەڵ هەرکەسێک کە ویستیان، زیانیان پێ دەگەیەنێت یان نا، هەندێک دەیانوت، بەڵێ زیانبەخشە و هەندێکی دی دەیانوت، ئەکەوێتەوە سەر بارودۆخەکە.
ئارت: تۆ وتت چی؟
فرێد: من وتم بە هیچ شێوەیەک زیان بە کەس ناگەیەنێت. دایک و باوکمان تەنیا دەیانەوێت لە ڕێی چیرۆکەکانیانەوە بمانترسێنن. پاشان مامۆستا لێی پرسیم کە ئایا چ بەڵگەیەکم هەیە بۆ پشتڕاستکردنەوەی ڕاکەم؟
ئارت: ئێ تۆ وتت چی؟
فرێد: پێم وت پێویستم بە هیچ بەڵگەیەک نییە بۆ پشتڕاستکردنەوەی ڕاکەم، چونکە ئەوە *ڕای* تایبەتیی خۆمە. هەروەها وتم سێکس شتێکی شەخسییە و ئەو مافەم هەیە کە بە هەرشێوەیەک کە دەمەوێت، بیری

لێ بکەمەوە. ڕای منیش وەکوو ڕای هەموو ئەوانی تر، ڕایەکی دروستە.

٩. بیر لە نموونەیەک بکەرەوە، کە تۆ یان کەسێک کە تۆ دەیناسیت، ڕایەکی دەربارەی شتێک هەبووبێت، بەڵام دواتر دەر کەوتبێت کە ڕاکە هەڵە بووە. ڕاکە بخە ڕوو و ڕوونیشی بکەرەوە، کە لە چ ڕوویەکەوە هەڵە بووە.

١٠. ئەم پرسیارانەی خوارەوە هەریەکەیان دەربارەی بابەتێکی گەرموگوڕن _ بابەتەگەلێکن لەناو خەڵکیدا گفتوگۆی توندیان لەسەر دەکرێن. ڕای خۆتیان لەسەر بڵێ و پشتگیریی ڕاکەی خۆشت بکە، ئەو هۆشیارییەش لەم چاپتەرەوە بەدەستت گەیشتووە، بەکاریان بهێنە.

a. لە حاڵەتەکانی تەلاقدا، دەبێت دادگا بەرمەبنای چ شتێکی ئەو دایک یان باوکە هەڵبژێرێت، کە دەبێت منداڵەکان بەخێو بکەن؟
b. تاچ تەمەنێک دەبێت منداڵەکان لێیان بدرێت {مەبەست لە زللە کێشانە بە قونیاندا} (یان ئایا هەر لە بنەڕەتدا پێویست دەکات لێیان بدرێت؟)
c. ئایا بچووکترین تەمەنی ڕێپێدراو بۆ خواردنەوەی مادده کحولییەکان لە هەموو وڵاتەکاندا پێویست دەکات تەمەنی شازدە ساڵی بێت؟
d. ئایا لە چ دۆخێکدا پێویست دەکات ئەمەریکا لە یەکەم گورزی سەربازیی خۆیدا بۆمبی ئەتۆم بەکار بهێنێت؟ ئایا هەر لە بنەڕەتدا دەبێت بۆمبی ئەتۆم بەکار بهێنرێت؟
e. ئایا ڕۆحیانەتی خراپەکار بوونی هەیە؟ ئەگەر هەیە، ئایا دەتوانێ کار لە کردەوەی مرۆڤەکان بکات؟

f. ئایا هیچ دۆخێک هەیە کە ئامانج، خاڵی کۆتاییی پاساوی ئامراز، هۆکار بداتەوە؟

g. ئایا بەشداریکردنی هەموو وانەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، چانسی سەرکەوتنی ئەکادیمییانەی قوتابی زیاد دەکات؟

h. ئایا لە کام حاڵەتەیاندا زیاتر ڕێز لە مامۆستاکان گیراوە، پەنجا ساڵ لەمەوبەر یان لە ئێستادا؟

i. ئایا خواردنەوەی مادده ئەلکحولییەکان تەنها لە پشووی هەفتەدا کەسێک دەکاتە ئالوودە لەسەر مادده کحولییەکان؟

j. ئایا بە هۆی میدیاوە هەڵسوکەوتە لادەرە کۆمەڵایەتییەکان زیادیان کردووە، یان ئایا میدیا کارێکی باش دەکات ئەگەر تەنها پیشانیان بدات؟

١١. ئەم دیالۆگەی خوارەوە بەوردی بخوێنەرەوە. پاشان ئەو ڕایە دەستنیشان بکە، کە زیاتر مەعقولانەترە لەسەر بابەتی دیالۆگەکە. دڵنیا بە لەوەی کە بڕیارەکەت بەرمەبنای بەڵگەکانە نەک لایەنگری پێشوەخت بۆ ڕایەک.

**تێبینیەک لەسەر باکگراوەندی بابەتی دیالۆگەکە:** ڕۆچستەر Rochester ی مافناس، بەرەنگاری بڕیارێکی دادگا بووە. بەپێی ئەو بڕیارە، ژنان لە "شەوانی تایبەت بە ئافرەتان" لە بارەکاندا دەبێت نیوەی پارەی خواردنەوەکانیان بۆ حساب بکرێت. ڕۆچستەری مافناس ئەم بڕیارەی دادگای بە بڕیارێکی جیاکاری ڕەگەزی دایە قەڵەم دژ بە پیاوان.

هێنریتە: ئەو مافناسە پێدەچی بە گاڵتەوە ئەو شتەی دژ بە فیمینزم وتبێت. ناکرێت بەجیدی ئەو قسەیەی کردبێت.

بێرت: بۆ ناکرێت بەجیدی بووبێت؟ خۆ ئاشکرایە ئەوە بڕیارێکە

بەرمەبنـای جیاکاریـی ڕەگـەزی.

هێنریتـە: سـەیر بکـە، هـەردوو دەزانین شـەوانی تایبـەت بـە ژنـان وەک تەکنیکێک دانـراوە بـۆ کێشـکردنی موشـتەریی زیاتـر. ژنـان لـەو شـەوانەدا بەکۆمـەڵ دەچنـە بـارەکان، چونکـە هەرزانتـر لەسـەریان دەکەوێـت وەک لەشـەوانی تـر، پیاوانیـش بەکۆمـەڵ خۆیـان دەکـەن بـە بارەکانـدا، چونکـە ژنـان لەوێـن. هیـچ جیاوازییـەک لەنێوان ئەمـە و تەکنیکەکانـی تـری وەکـوو سـەعاتی کۆکتێلـدا نییـە، کـە تێیـدا دوو خواردنـەوە بـە نرخـی دانەیـەک دەفرۆشـرێت.

بێـرت: بمبـوورە هێنریتـە، بـەڵام ئەمـە تـەواو جیـاوازە لـە سـەعاتی کۆکتێل، کـە هەرکەسێک چ نێـر یان مـێ، دەتوانـێ دووان بخواتەوە بە نرخی دانەیـەک. لـە شـەوانی تایبـەت بـە ئافرەتانـدا، نرخـەکان بەپێـی ڕەگـەزەکان دیـاری کـراون، کـە ئەمـەش جیاکارییەکـی ڕەگەزیـی ڕووتوقوتـە.

هێنریتـە: باشـە بۆ لـەم کاتـەدا بوویتـە دوژمنێکی سەرسـەختی جیاکاریی ڕەگـەزی. باشـە چۆنـە بەلاتـەوە ئاسـاییە کـە پیـاوان ئـەو مافەیـان پـێ نـەدراوە، کـە وەک ژنـان بـە نیوەڕووتـی بەشـداریی زۆرانبازیـی نـاو قـوڕ و لیتـە بکـەن؟ {زۆرانبازیـی نـاو قـوڕ و لیتـە یارییەکە، تایبـەت بـە ژنـان. ئـەم یارییـە بـەزۆری لەنـاو بـار و شـوێنی کاتبەسـەربردندا ئەنجـام دەدرێـت، کـە تێیـدا ژنـان بـە نیوەڕووتـی بـۆ خۆشـی، یەکتـری لـە قـوڕ هەڵدەکێشـن}. باشـە بۆچـی دژی ئـەو فاکتـەش ناوەسـتیتەوە، کـە ژنـان کەمتـر موچـە وەر دەگـرن لـە پیـاوان بـۆ بەئەنجامدانـی هەمـان کار؟ تـۆ ڕاسـتگۆ نیـت و تـوڕەشـم دەکـەیت، بێـرت.

بێـرت: سـووکایەتی بـە یەکێـک بکەیـت، مانـای ئـەوە ناگەیەنێـت لـەو کەسـە هۆشـیارتریت. پاشـان مـن تێناگـەم بـۆ دەبێـت وا سـۆزدارانە هەڵچی بـە هـۆی ڕەخنـەی مافناسـیکەوە. وەختـە بڵێـم ئـەو هەڵچوونـەت مانـای ئـەوە دەگەیەنێـت، کـە ژنـان زیاتـر لـە پیـاوان عاتفیتـرن.

## ڕای جیاواز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە، پوختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی زیادکردنی گیانی بەرپرسیارێتیی جڤاتی. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەلام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە وە ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماقوڵترە، بەلام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولییەتی تێدایە، *کە لە زۆربەری حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

*ڕێگەیەکی نوێ بۆ زیادکردنی گیانی بەرپرسیارێتیی جڤاتی*: لە ماوەی ئەم چەند دەیەیی ڕابردوودا، زۆر لە زانکۆکان داواکارییەکی نوێیان زیاد کردووە بۆ سەر لیستی داواکارییەکان لە قوتابی، ئەویش پێشکەشکردنی خزمەتی جڤاتییە. ئەم زانکۆیانە لەو بڕوایەدان زیادکردنی ئەم داواکارییە، ویژدانی قوتابییان لە ئاست کێشە جڤاتییەکانی وەکوو کێشەی پیسبوونی ژینگە، کێشەی هەژاری، ئازار و نارەحەتییەکانی بەساڵاچووان و کەمئەندامان زیندوو ڕادەگرێت. بەو هیوایەی هەنگاوبەهەنگاو گیانی

بەرپرسیاریتی لە ئاست کۆمەڵگەدا لەناو گەنجەکاندا بە ئەندازەیەک گەشە بکات، کە ببێت بە خوویەک و ڕۆژانە خۆیان پێی هەڵبستن. لە بەرامبەردا ئەوانی بەرەنگاری ئەم داوا نوێیەی زانکۆ دەکەن، دەڵێن، خودی داواکە دژیەکییە، چونکە ئەم جۆرە خزمەتانە دەبێت تاکەکان خۆیان خۆویستانە و بێ ناچارکردن پێی هەڵبستن، هەر بۆیە ئەگەر ناچار کران، ئەوا لەبری گەشەدانی ڕۆحییەتی بەرپرسیاریتی، ڕۆحییەتی ڕەق گەشە دەکات.

# چاپتەری شەشەم

## بەڵگە چییە؟ What is Evidence?

لە ڕێی گوزارشتکردن لە ڕایەکەوە، ئێمە بەوانی تر دەڵێین کە بیر لە چی دەکەینەوە، بەڵام کاتێک بەڵگە دەخەینە ڕوو، ئەوا *پیشانیان* دەدەین کە بیرکردنەوەکەی ئێمە مەعقولیەتی تێدایە. بۆ ئێمە زۆر خۆشترە شتەکانمان پیشان بدەن، نەک تەنها هەر پێمان بڵێن _ لە قۆناغی سەرەتاییەوە هەموو ئەمە دەزانین. باشە، کە وایە، بۆچی ئەو هەموو نووسین و قسانە هەن کە هیچ نین جگە لە تۆپەڵکردنی کۆمەڵێک ڕا، کە یان بێبەڵگەن یان کەمترین بەڵگەیان هەیە بۆ پشتڕاستکردنەوەیان؟ یەکێک لە هۆکان، وەک لە چاپتەری پێنجدا بینیمان، ئەوەیە کە ئەقڵی مرۆڤ خۆی بۆ خۆی کارگەیەکی بێوێنەی بەرهەمهێنانی ڕایە، هەر بۆیەشە زۆرینەی خەڵکی لەسەر شتە جۆربەجۆرەکان بێشومار ڕایان هەیە. هۆکارێکی تر ئەوەیە، کە خەڵکی بیریان دەچێتەوە، کە بە چ ڕێگەیەک دەبنە هەڵگری ڕایەک، بەڵام خودی ڕاکە لەیاد ناکەن، ڕێک وەک چۆن قوتابییان نمرەی کۆتاییی کۆرسەکانین لەیاد ناکەن، بەڵام ئەنجامی هەموو ئەو تاقیکردنەوە و ڕاهێنانانە لەیاد دەکەن، کە بە هەموویان نمرەی کۆتاییی کۆرسەکە پێک دەهێنن.

سێیەم هۆ، کە لە زۆر ڕووەوە گرنگترین هۆشە، ئەوەیە کە یان هەر بەڵگە نییە، یان ئەوەندە نییە کە بتوانێت لە یادەوەریدا بمێنێتەوە، بە

مانەیەکی تر، راکە خاڵییە لە هەرشتێکی جەوهەری و مانادار. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٩٩دا زۆر کەس هەڵگری ئەو رایە بوون، کە درۆکردنەکەی کلینتۆن لە کاتی سوێندخواردنی لە دادگادا "هەڵەیەک نییە شیاوی گرنگیپێدان بێت، بە شێوەیەک، کە وا بکات لە پۆستەکەی لا ببرێت." کاتێکیش دەتپرسی کە بۆ وا بیر دەکەنەوە، زۆر کەس ئەم جەختکردنەوەیەیان دووبارە دەکردەوە: "پێویست ناکات لە پۆستەکەی دوور بخرێتەوە،" "ئەوە شتێکە پەیوەندیی هەیە بە خۆی و هیلارییەوە." یان بە رایەکی نزیک لەوەی خوارەوە وەلامیان دەدایەوە: "ئەمە موئامەرەیەکی باڵی راستڕەوەکانە" راوێژکار کنیس ستار، سەرقاڵی تۆمەت و بوختانهەڵبەستنە بۆ سەرۆک." لەگەڵ ئەوەشدا کە مەحاڵە بتوانین *دڵنیا* بین لەوەی بۆچی بەو شێوەیە بیریان دەکردەوە، بەڵام فاکتەکە ئەوەیە، کە هەموو هەمان رایان دەر دەبڕی و نیوەی راوێژکارەکانی کۆشکی سپیش خاوەن هەمان را بوون، ژمارەیەکی بێشوماری تریش لەوانەی بەرگریکار بوون لە کلینتۆن، هەمان رایان قبوڵ دەکرد. تەنانەت بێ ئەوەی هەڵیشی بسەنگێنن*

زۆربەی زۆرمان ئەگەر داوامان لێ بکرێت راکانمان پشتراست بکەینەوە، ئەوا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا جگە لە هەندێ بەڵگەی لاواز کە قانعکەر نین، رەنگە شتێکی تر شک نەبەین. ئەشێ ئێمە خۆمان هەڵبخەڵەتێنین بەوەی یەک کۆمەڵ بەڵگەمان هەیە بەڵام لە راستیدا لە کاتی بەرگریکردن لە راکانمان، رەنگە جگە لە بەڵگە کرچوکاڵەکان، شتێکی تر شک نەبەین.

---

* ئەوەی زۆر کەس بروایان بەم رایە هەبوو بێ بەڵگە، مانای ئەوە نییە کە نەئەتوانرا هیچ بەڵگەیەک بەکار بهێنرێت بۆ پشتراستکردنەوەی ئەو رایە. چونکە هەندێک لە بەرگریکارەکانی کلینتۆن، بە شێوەیەکی بەهێزتر توانییان پشتراستی راکەی خۆیان بکەنەوە.

هەمان ئەو خودهەڵخەڵەتاندنەی کە کەسانی تر تێی دەکەون، ئەگەرێکی زیندووشە لە بەردەم بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکاندا، بەلام جیاوازییەکە ئەوەیە، ئەوان فێر بوون ملی بۆ کەچ نەکەن و بەرەنگاری ببنەوە. چونکە بەهای ئەم ملکەچنەکردنە دەزانن. لەوەش گرنتر، ئەوان {بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان} گەشەیان بە خوویەک داوە، کە خۆی چێککردنی بڕ و نۆعییەتی بەڵگەکانە، پێش ئەوەی ڕایەک پشتئەستوور بەوان دابڕێژن. هەروەها پێش دەربڕینی ڕاکەشیان، دووبارە بە بەڵگەکانیاندا دەچنەوە. ئەو بڕوابەخۆبوونەی کە ئەوان هەیانە دەربارەی ڕاکانیان، قەرەبووکردنەوەیەکی زۆر باشە بۆ ئەو کات و ماندوێتییەی بە بەڵگەکانەوە سەرفیان کردووە.

## جۆرەکانی بەڵگە

بۆ هەڵسەنگاندنی ڕاکانی خۆت و ئەوانی تریش، پێویست دەکات تێبگەیت لە جۆرە جیاوازەکانی بەڵگە. لە ڕێی ئەم تێگەیشتنەشەوە، دەتوانیت هەم بەهاو هەم کەموکوڕیەکانی بەڵگەکان ببینیت، هەروەها دەشتوانیت هەریەکەیان ڕووبەڕووی پرسیارە دروستەکان بکەیتەوە. لە گرنگترین جۆرەکانی بەڵگەش، بریتین لە **ئەزمونی شەخسی، ڕاپۆرتە بلاونەکراوەکان، ڕاپۆرتە بلاوکراوەکان، شایەتحاڵ، شایەتیدانی کەسە بەناوبانگەکان، ڕای شارەزایان، تاقیکردنەوە، ستاتیستیک، ڕاپرسی، تێبینیکردنی فەرمی، پێداچوونەوەی توێژینەوەکان.**

تێبینییەکی گرنگ کە دەبێت ئاماژەی پێ بدەین، ئەوەیە کە ئەم پۆلێنکردنەی سەرەوە لەسەر ڕادەی جێمتمانەبوونی بەڵگەکان لە زۆرەوە بۆ کەم یان بەپێچەوانەوە نییە، بەڵکوو تەنها لەسەر بنەمای ڕادەی ئاشنایەتیمانە لە گەڵیاندا. چونکە زۆرینەی خەڵکی ئاشنان بە ئەزموونی

شەخسی، بەلام پێداچوونەوەی توێژینەوەکان کەمترین کەس.

## ئەزموونی شەخسی

ئەزموونی شەخسی تەنها جۆری بەلگەیە، کە پێویست ناکات کتێبخانە و ئینتەرنێتی بۆ بگەڕێین تا دەستمان بکەوێت. چونکە ئەو لە مێشکماندایە، کەواتە بۆ هەرشوێنێک بچین، لێمان دانابڕێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە زیاتر لە هەر جۆرێکی تری بەلگە کاریگەری زیاترە لە سەرمان. ئەو کەسانەی لە پەیوەندیدا بووین لەگەڵیاندا، ئەو بارودۆخانەی ئەزموونمان کردوون، ئەو شتانەی بەسەرماندا هاتوون، هەموو ئەمانە بۆ ئێمە ڕاستەقینە و مانادارتر دەر دەکەون وەک لەوانەی کە تەنها دەیانبیستین یان دەیانخوێنینەوە. ئێمە دڵنیاین لە ئەزموونە شەخسییەکانمان. لێ بەداخەوە، ئەم دڵنیابوونە وا دەکات ئێمە گرنگی و گەردوونیایەتییەکی زیاتر بدەینە پاڵ هەندێک ڕووداو، کە زیاتر بن لە ڕادەی پێویست. ئەگەر جارێک لە جاران تەکسییەک بگرین لە نیو یۆرک و دوو قسەی لەگەڵدا بکەین، ئیدی وا هەست دەکەین ئاشنای شۆفێری تەکسییەکانی هەموو نیۆرک بووین. ئەگەر هاوڕێیەکی کۆریمان هەبێت، ئیدی وا هەست دەکەین بە شێوەیەکی گشتی، هەموو کۆرییەکان دەناسین. یان تەنانەت بە شێوەیەکی گشتی، هەموو ئاسیا دەناسین. کێشەکە ئەوەیە کە ڕەنگە تەنها بە پاڵپشتیی بەلگەیەک یان زیاتر، گشتاندنێک ڕوو بدات. لێ بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو گشتاندنە، تەنانەت ڕەنگە دەیان بەلگەش هێشتا قانعکەر نەبن.

*بۆ هەلسەنگاندنی ئەزموونە شەخسییەکانمان، ئێمە خاوەنی دوو شتین، پرسیارەکانی خۆمان و ئەوانی دیش:* ئایا ڕووداوەکە ئاساییە یان دەگمەن و ناوازەیە؟ ئایا لە ڕووی بڕ و چلۆنایەتییەوە کافین بۆ

پشتڕاستکردنەوەی دەرئەنجامەکە؟ گرنگە لەبیرت بێت کە بەهێزی و دراماتیکیی ڕووداوێک ناتوانێت سنوورداربوونی خۆی بشارێتەوە.

## ڕاپۆرتە بڵاونەکراوەکان

ڕاپۆرتی بڵاونەکراوە هەموو ئەو چیرۆکانە دەگرێتەوە، کە ئێمە لەوانی ترەوە گوێبیستی دەبین، کە زۆر جار هیچ نین جگە لە پڕوپاگەندە و خەیبکردن و ورتەورت. گەورەترین گرفتی ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە ئەوەیە، کە ناتوانین لێیان دڵنیا بین. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نازانین ئاخۆ ئەو چیرۆکانەی دەیانبیستن، دەستی دووەمە، سێیەمە، چوارەمە، یان دەستی پێنجەمە. چیرۆکەکان بە هۆی گواستنەوەیانەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، بەدڵنیاییەوە گۆڕانیان بەسەردا دێت. ئەو کەسانەی چیرۆکەکان دەگێڕنەوە، مەرج نییە کەسانی ناڕاستگۆ بن، یان ئارەزوومەندانە چیرۆکەکان بگۆڕن، بەڵکوو زۆر کات ناخودئاگایانە هەندێک وشەی بۆ زیاد دەکەن یان لێی کەمدەکەنەوە یان وردەکارییەکانی یاخود ڕیزبەندیی ڕووداوەکان دەگۆڕن.

*بۆ هەڵسەنگاندی ڕاپۆرتە بڵاونەکراوەکان، دەبێت بپرسیت ئایا* سەرچاوەی یەکەمی چیرۆکەکە کێیە، چییە؟ چۆن دەتوانم دڵنیا بم لە ڕاست و دروستیی ئەو ڤێرژنەی من بیستوومە؟

## ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکان

ئەم جۆرە لە بەڵگە، هەم لە نووسراوە بڵاکراوەکان و هەم لە بەرنامە جۆربەجۆرەکاندا دەبینرێت، ئەم ڕووبەرە بەرفراوەنەش، لە کتێبە ئەکادیمییەکانەوە بۆ بڵاوکراوە پرۆفیشناڵەکان و ئینسایکلۆپیدیا و گۆڤار و ڕۆژنامە و هەواڵەکان و لێداوانە ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆنییەکان دەگرێتەوە.

لە بەرهەمە ئەکادیمییەکاندا هەمیشە سەرچاوە بەکارهاتووەکان بەوردی لە لیستی سەرچاوەکاندا ئاماژەیان پێ کراوە. بەلام لە سەرچاوە نائەکادیمییەکاندا، سەرچاوەی زانیارییە بەکارهاتووەکان بە شێوەیەکی نارەسمی و پچڕپچڕ و بگرە هەندێک جار هەر ئاماژەشیان پێ نادرێت. لەم حاڵەتانەدا پەنا دەبەینە بەر ڕادەی جێمتمانەبوونی نووسەر و بڵاوکەرەوەکە. لە بڵاوکراوەکانی ئێستادا و بەتایبەتی نائەکادیمییەکان، زۆر جار فاکت و ڕا پێکەوە تێکەڵ دەکرێن، هەر بۆیە دەبێت بە شێوەیەکی ورد و بەدیقەت بخوێنرێنەوە تا بۆمان دەر بکەوێت کام گوزارە خودی بەڵگەکەیە و کام گوزارەش خۆی پێویستی بە بەڵگەیە تا پشتڕاست بکرێتەوە.

*بۆ هەڵسەنگاندنی ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکان دەپرسین*، ئایا ڕاپۆرتەکە ئاماژە بە سەرچاوەی هەموو ئەو برگە زانیارییە بەسوودانە دەدات، کە بەکاری هێناون (ئەگەر ئا، ئەوا دەتوانیت چێکیان بکەیت). ئایا نووسەرەکە خاوەن ناوبانگێکی باشە؟ ئایا چاپخانەکە یان لایەنی بڵاوکەرەوەکە خاوەن ناوبانگ و متمانەیەکی باشن؟ لە ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکەدا، کام گوزارە بریتییە لە بەڵگە و کام گوزارەش پێوستی بە بەڵگەیە تا پشتڕاست بکرێتەوە؟ (دەتوانرێت ئەم پرسیارە بە شێوەیەکی تر بکرێت؛ کام برگەی ڕاپۆرتەکە بۆ کەسێکی بیرکەوەرە جێی گومانە و پرسیارە؟ ئایا نووسەرەکە بە شێوەیەکی قانعپێکەر وەلامی ئەو پرسیار و گومانانە دەداتەوە؟)

## شایەتحاڵ

شایەتحاڵ {شهود ألعیان- eyewitness} بە شێوەیەکی گشتی وەک بەهێزترین و جێمتمانەترین بەڵگە دێتە ئەژماردن، هەرچەندە ڕەنگە لات سەیر بێت، بەلام لەبەر هۆیەک لە هۆکان، ئەگەری کەوتنەهەڵەی

ئـەم جـۆرە بەڵگەیـە ئەگەرێکـی زینـدووە، یەکێـک لـە هـۆکان، بارودۆخـی دەرەکییـە کـە ڕەنگـە یارمەتیدەر نەبێت، بۆنموونـە، دەشـێت ڕووداوەکـە لـە شـەوێکی تەماویـدا ڕوو بـدات و شـایەتی ڕووداوەکـەش دوور لـە شـوێنی ڕووداوەکـەوە بێت. شایەتی حاڵ ڕەنگە ماندوو بێت، یان لەژێر کاریگەریی مـاددە هۆشـبەرەکاندا بێت؛ جگـە لەمانـە، توانـای دیقەتدانـی لـە ڕووداوەکـە ڕەنگـە بـە هـۆی حوکمێکـی پێشـوەختە یـان چاوەڕوانییەکـی دیاریکـراوەوە بشـێوێنرێت. دواجاریـش، ڕەنگـە یادەوەریـی شـایەتحاڵەکە بـە هـۆی ئـەو ڕووداوانـەی کـە دوای ڕووداوەکـە ڕوو دەدەن، بشـێوێنرێت. ڕادەی ئـەم شێواندنەش زیاد دەکات بـە زیادبوونـی کاتـی ڕوودانـی ڕووداوەکـە و کاتـی شـایەتیدانی شـایەتحاڵەکە.

*بۆ هەڵسـەنگاندنی شـایەتیدانی شـایەتحاڵەکە، دەپرسـین* ئـەو باردۆخ و هۆیانـە چیـن، بـە حاڵەتـی ئەقڵیشـەوە، کـە ڕەنگـە شـایەتیدانەکەی شـێواندبێت؟ (ئەگـەر گومانـی شـێواندنێک هەبـوو، هـەوڵ بـدە بـەوردی دەستنیشـانی بکەیـت). هەروەهـا گرنگیشـە بزانیـن گێڕانـەوەی جیاوازی ڕووداوەکـە لەوەی شـایەتحاڵەکە بـڵاو کراوەتـەوە.

## شایەتیدانی کەسە بەناوبانگەکان

لـە ئێسـتادا بـە شـێوەیەکی بەربڵاو دەبینرێت، کـە چـۆن کەسـە بەناوبانگەکان سـەرقاڵی بە-نایاب-پیشـاندانی کاڵا و بەرهەمـە خزمەتگوزارییەکانـن لـە ڕێـی ڕیـکلام و "بەرنامـە بازرگانییەکانـەوە." جگـە لـە ڕیکلامیـش، ئـەم جـۆرە کەسـانە لە بەرنامـە ڕادیۆیی و تەلەڤزیۆنییەکانـەوە داوایـان لـێ دەکرێت ڕای شەخسـیی خۆیـان لەسـەر کێشـە هەنووکەیـی و گەرمـەکان دەر ببـڕن. تـا ڕادەیـەک، هەمـوو ڕۆژێـک دەتوانیت گۆرانیبێژێک، ئەکتەرێک، وەرزشـەوانێک ببینیـت، کـە چـۆن سـەرقاڵی قسـەکردنن لەسـەر دیـن، بەرقەراربوونـی

عەدالەت، پەروەردەکردن، ئابوری، پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، کامپەینی چاکسازیی ئابوری، دەروونناسی و زۆر بابەتی تریش. بۆ نموونە، جارێکیان پیشکەشکارەکە لە ئەکتەرێکی پرسی، "تا چ رادەیەک هۆکاری چانس کاریگەریی هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤەکان لە گەردووندا؟"

رەنگە سەرسامیی تۆ بە کەسە بەناوبانگەکان وەک کەسانی تەریفی بتخاتە ئەو بڕوایەوە، کە هەرچییەکیان باس کرد، شارەزا و لێزانن تێیدا. ئەم بڕوایەش لە زۆربەی حاڵەتەکاندا هەڵەیە. چونکە رەنگە هەر زۆر بێئاگا بن. یان رەنگە بۆ خۆرزگارکردن لەوەی وەک گێل و نەزانێک دەر بکەون، هەرچییەک بێت بە خەیاڵیاندا لە وەڵامی پرسیاری پێشکەشکارەکەدا دەیڵێن. هەندێکیان ئەوەندە خۆیان لا گەورە و مەزنە، دەکەونە ئەو وەهمەوە کە هەرچییەک ئەوان دەیڵێن، قووڵ و ماناداره - تەنها لەبەر ئەوەی کە ئەوان وتوویانە! لە کاتی پیاهەڵدانەدا بەسەر کەلوپەل و خرمەتگوزارییەکاندا، ئەم کەسە بەناوبانگانە ئەوەندە بێئاگان لەو بابەتەی کە قسەی لەسەر دەکەن، هیچ ناکەن جگە لە خوێندنەوەی ئەو وشانەی کە بۆیان نووسراوەتەوە، بەمەش بڕێک پارە پەیدا دەکەن.

*بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم جۆرە بەڵگەیە، دەپرسین*، لە حاڵەتی ریکلام و "بەرنامە بازرگانییەکاندا" ئایا کەسە بەناوبەنگەکە بە پارە گیراوە؟ (زۆر کات لە کۆتاییی ریکلامەکەدا بە فۆنتێکی بچووک ئاماژە بەمە دەدرێت). لە حاڵەتی بەرنامە دیدارەکاندا، ئایا ئەو کەسە هیچ پشتڕاستکردنەوەیەک دەخاتە روو بۆ راکانی _ بۆ نموونە ئاماژەدان بە لێکۆڵینەوەیەک، کە لەلایەن کەسانی گونجاوەوە بە ئەنجام گەیەنرابێت؟ هەروەها ئایا پێشکەشکارەکەش داوای پشتگیر و پشتڕاسکردنەوەیەکی لەم چەشنە دەکات؟ ئەگەر قسەکانی میوانی بەرنامەکە هیچ نەبێت جگە لە کۆمەڵێک

جەختکردنەوەی بێبەڵگە، ئەوا با زۆر ئەو کەسەشت بەدڵ بێت، بێ دوودڵی ڕاکانی ڕەت بکەرەوە.

## ڕای شارەزایان

ڕەنگە تۆش هاوڕا بیت، کە ڕای شارەزایان expert بە شێوەیەکی گشتی وەکوو جێمتمانەترین جۆری بەڵگە دێتە ئەژماردن بە بەراورد لەگەڵ ئەو جۆرانەی بەڵگە کە تا ئێستا باس کران. یەکێک لە خاڵە ئەرێنییەکانی ئەم جۆرە بەڵگەیە ئەوەیە، کە پرسیار قوت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی وەکوو حاڵەتی سروشتی قبوڵ کراوە، دیارە بەڵگەی ئەزموونی شەخسی یەکێکە لەو حاڵەتانە. بەڵام تەنانەت لەگەڵ ئەمانەشدا، هەموو کات ڕای شارەزایان جێی متمانە نییە. سەرەکیترین هۆکار بۆ ئەم بێمتمانەییە ئەوەیە، کە خودی مەعریفە تا ڕادەیەک لە هەموو بوارەکاندا بە شێوەکی خێرا لە بەرفراوانبووندایە. سەدەیەک لەمەوبەر دەکرا شارەزایی لە زیاتر لە کایەیەکی مەعریفیدا بەدەست بهێنیت. لێ لە ئێستادا لێکۆڵەرەکان بە شێوەکەی گشتی شارەزای یەک *ڕەهەندی دیاریکراوی کایەکی مەعریفین*، لەگەڵ ئەوەشدا، ڕەنگە سەخت بێت بتوانن ئاگاداری هەموو ئەو گەشەکردنە خێرایانە بن، کە لەو ڕەهەندەدا ڕوو دەدات. بەڵام بەداخەوە، هەندێک کەس ناتوانن بەرەنگاری مەیلی خۆبەپسپۆڕزان لە هەموو بوارەکان ببنەوە. بۆ نموونە، ئەستێرەناسێکی بەناوبانگ ڕاهاتبوو لەسەر بڵاوکردنەوەی ڕاکانی لە گۆڤارە ناودارەکاندا لەسەر بابەتگەلیکی وەکوو ئێتیک، مرۆڤناسی، سیۆلۆجی.

بۆ *هەڵسەنگاندی ڕای شارەزایان دەپرسین*، جگە لە شارەزایی لە بوارەکەدا بە شێوەکەی گشتی، ئایا ئەو کەسە پسپۆڕیی *دیاریکراوی* هەیە لەسەر ئەو بابەتەی کە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت؟ دڵنیابوون لەمە

بۆ کەسانێک کە شارەزان لە بوارەکەدا نییە، زەحمەتە، بەڵام نیشانەیەکی باش بۆ دڵنیابوون ئەوەیە، کە ئەو کەسە تەنها ڕای خۆی ناڵێت و بەس، بەڵکوو بە لێکۆڵینەوە هەنووکەییەکان پشتڕاستی دەکاتەوە. پرسیارێکی تر، ئایا ئەو کەسە لە بەرامبەر سەرنجەکانی پارەی وەر گرتووە یان نا؟ مەرج نییە بە وەرگرتنی پارە، ئیدی ڕای پیسپۆڕەکە بکەوێت، بەڵام وەرگرتنی پارە پرسیار لەسەر بابەتیبوونی ڕای شارەزاکە دروست دەکات. لە کۆتاییدا، بپرسە داخۆ شارەزایانی تر هاوڕان یان دژەڕای گۆشەنیگای کەسەکەن.

## تاقیکردنەوە

دوو جۆری بەرفراوانی تاقیکردنەوەمان هەیە، تاقیکردنەوەی *تاقیگەییەکان* کە تێیاندا لێکۆڵەرەوەکان حاڵەتەکان دەگۆڕن، بەمەش هۆکار و دەرئەنجامەکان وردتر و بەدیقەتتر دەستنیشان دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا، یەکێک لە خاڵە نێگەتڤەکانی تاقیکردنەوە تاقیگەییەکان، بریتییە لە دەستکردیتی {ناسروشتیتی}artificiality . تاقیکردنەوەی *کێڵگەییەکانیش* the field experiment لەو ڕووەوە باشترن، کە لە ژینگە سروشتییەکاندا {واتە لە شوێنی بابەتی تاقیکردنەوەکە} بە ئەنجام دەگەیەنرێن، بەڵام ئامادەگیی لێکۆڵەرەوەکە ڕەنگە کاریگەری دابنێت لەسەر بابەتەکە و ڕەوتی دەرئەنجامەکانیش بگۆڕێت.

بۆ *هەڵسەنگاندنی بەڵگەی تاقیکردنەوەکان، دەپرسین* بۆ تاقیکردنەوە تاقیگەییەکان، ئایا هیچ لێکۆڵەرەوەیەکی تر بەم تاقیکردنەوەیە هەڵساوە؟ بۆ تاقیکردنەوە کێڵگەییەکان، ئایا هیچ لێکۆڵەرەوەیەکی تر بە شێوەیەکی سەربەخۆ گەیشتووە بە هەمان دەرئەنجام؟ ئەگەر دەرئەنجامی تاقیکردنەوە دووەمییەکان هاوجووت نەبوو لەگەڵ یەکەمییەکان، ئەوا زۆر

باش دەکەیت ئەگەر قبوڵکردنی دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکان دوا بخەیت بۆ کاتێکی تر.

## ستاتیستیك

بە مانا بەرفراوانەکەی، تێرمی *ستاتیستیک* هەموو ئەو زانیارییانە دەگرێتەوە، کە دەتوانرێن بژمێردرێن، بۆ نموونە، پێوانی گۆڕانی پلەی گەرمی لە ماوەیەکی دیاریکراودا، تا بزانین بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی ڕوو دەدات یان نا. تێرمی *ستاتیستیک* دەتوانرێت بە شێوەکەی بەرتەسکتر بەکار بهێنرێت، بۆ نموونە، بە مانای زانیاریی ژمێردراوی گروپێک، کە یان لە ڕێی پەیوەندیکردن بە گروپەکەوە، یان لە ڕێی تاک بە تاکی ناو گروپەکەوە بەدەست دەخرێت. ئەنجامدانی ڕاپرسی لە ئەمریکادا دەچێتە بابی ستاتیستیکەوە بەم تێگەشتنە دیاریکراوە. هەروەها ئەم تێرمە هەموو ئەمانەی خواریشەوە دەگرێتەوە: ڕێژەی دەنگە بەدەستهاتووەکانی سیناتۆرە ئەمەریکییەکان، ڕێژەی قوربانییانی ئۆتۆمۆبیل بە هۆی مەستییەوە، بەرزونزمکردنی کۆچکردن بەدرێژاییی سەدەی ڕابردوو، ڕێژەی ئەو دایکانەی کە هاسەرگیرییان نەکردووە و لەماڵێکی تاکباواندا گەورە بوون و بەراوردکردنی ڕێژەی نێوان پەروەردەکردن و بڕی داهاتی چەند گروپێکی ئیتیک جیاوازدا.

*لە کاتی هەڵسەنگاندنی زانیاریی ستاتیستیکی، ئەم پرسیازانە دەکەین،* سەرچاوەی زانیارییەکە چییە؟ ئایا سەرچاوەکەی متمانەپێکراوە؟ زانیارییەکان تا چ ڕادەیەک کۆنن؟ ئایا هیچ هۆکاریکی گرنگ گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە دوای کۆکردنەوەی زانیارییەکان؟

## ڕاپرسی

یەکێک لە باوترین ئامرازەکانی لێکۆڵینەوە کە توێژەرەکان بەکاری دەهێنن، بریتییە لە ڕاپرسی، بەتایبەتی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا. بەوەدا کە بە هۆی ڕاپرسییەوە زانیارییە ژمێردراوەکان کۆ دەکرێنەوە، هەر بۆیە زۆر جار لەژێر تایتلی "ستاتیستیکدا" ئاماژەی پێ دەکرێت. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا، لەبەر هۆیەک کە لە یەکیان جیا دەکاتەوە، جیا لە یەکتری ئاماژەیان پێ دەکەین: لە ڕاپرسیدا زانیاری لە کۆی گروپەوە (کە ناسراوە بە *دانیشتووان*) وەر ناگیرێت، بەڵکوو لە *سامپڵەکانی* ناو گروپەکەوە وەر دەگیرێت، کە چەند تاکێکی ناو گروپەکەن و نوێنەرایەتی هەموو گروپە دەکەن. ڕاپرسی لەم ڕێگەیانەوە بەئەنجام دەگەیەنرێت: پەیوەندیی تەلەفونی، ئیمەیڵ، یان لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆوە. شێوازی سامپڵوەرگرتنەکەش یان هەڕەمەکییە، یان *ڕێکخراو* (بۆ نموونە، لە دەلیلی تەلەفونەوە هەموو دەیەمین یان سەدەمین کەسێک وەر دەگرین) یان *بەشبەشکردن stratified* (بە شێوەکەی ڕێکخراو پێکهێنەرە جیاوازەکانی ناو دانیشتووانی لێکۆڵینەوەکە وەر دەگرین؛ بۆ نموونە ٥١٪ مێ و ٤٩٪ نێر).

*لە کاتی هەڵسەنگاندنی ڕاپرسیدا، ئەم پرسیارانە دەکەین*، ئایا سامپڵەکان بە شێوەیەکی ورد و دەقیق نوێنەرایەتیی دانیشتووانەکەیان کردووە؟ بۆ نموونە، ئایا هەموو ئەندامەکانی ناو گروپەکە چانسی یەکسانییان هەبووە بۆ بەشداریکردن؟ ئایا پرسیارەکان ڕوون و ڕەوان بوون؟ ئایا بە شێوەیەکی بابەتی داڕێژراون، یان نابابەتی؟ لە حاڵەتی پەیوەندیبەستن بە سامپڵەکانەوە لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە، ئایا ژمارەیەکی بەرچاویان بێوەلام بوون؟ ئەگەر وا بوو، باشە بێوەلامەکان جیاوازییان چییە

لەگەڵ وەڵامدەرەوەکاندا؟ هەروەها، ئایا تا ئیستا هیچ ڕاپرسییەکانی تر دەرئەنجامەکانی ئەم پشتڕاست دەکەنەوە؟

## تێبینیکردنی فەرمی Formal Observation

تیبینیکردنی فەرمی دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر. تیبینیکردنی *دابڕاو*، لێرەدا تێبینیکەر تیکەڵ بەو تاکانە نابێت، کە تویژینەوەیان لەسەر دەکات. بۆ نموونە، سایکۆلۆجیستێکی منداڵان سەردانی گۆڕەپانی قوتابخانەیەک دەکات و هەر لە دوورەوە چاودێریی ڕەفتاری منداڵەکان دەکات. بەلام لە تێبینیکردنی *تێکەڵ بوو*، توێژەر تێکەڵ بەو چالاکییەنە دەبێت کە کەسانی توێژینەوەلەسەرکراو پێی هەڵدەستن. بۆ نموونە، مرۆڤناسێک بۆ ماوەی چەند مانگێک لەگەڵ خێڵێکی کۆچەردا ژیان دەکات و نانیان لەگەڵ دەخوات و بەشداریی چالاکییە دەستەجەمعییە جۆربەجۆرەکانیان دەکات.

*لە کاتی هەڵسەنگاندنی تێبینیکردنی فەرمیدا، ئەم پرسیارانە دەخەینە ڕوو:*
ئایا ڕێی تێ دەچێت بە هۆی ئامادەبوونی لێکۆڵەرەوەکە گۆڕان {لە شێوازی سروشتی} لە ڕەفتاری ئەو کەسانەدا ڕوو بدات، کە تێبینی دەکرێن؟ ئایا کاتی تێبینیکردنە بەسە بۆ بەدەستخستنی ئەو دەرئەنجامانەی کە بەدەست گەیشتوون؟ ئایا زیادەڕۆیی لە گشتاندنی دەرئەنجامەکاندا نەکراوە؟ (بۆ نموونە، ئەو دەرئەنجامانەی کە بە هۆی تێبینیکردنی تەنها یەک خێڵی کۆچەرەوە بەدەست هاتوون، ڕەنگە بگشتێنرێن بۆ هەموو خێڵە کۆچەرییەکانی تر، لێ لێرەدا ئەو فاکتە پشتگوێ خراوە، کە ڕەنگە خێڵەکانی تر چەندان جیاوازیی گرنگیان هەبێت.)

## پێداچوونەوەی توێژینەوەکان

تەنها کاتێک شتێکمان هەیە بە ناوی پێداچوونەوەی توێژینەوەکان، کە ژمارەیەک لێتوێژینەوە لەسەر بابەتێکی دیاریکراو بەئەنجام گەیەنرابن، کە تێیدا ئەو کەسەی بەم کارە هەڵدەستێت، بە هەموو ئەو لێکۆڵینەوە ئەکادیمییانەدا دەچێتەوە، کە بەئەنجام گەیەنراون، پاشان دەرئەنجامەکانی هەموو لێکۆڵینەوەکان بە یەکدی بەراورد دەکات و پوختەیەکیان لەسەر دەنووسێت. زۆربەی کات دەیان یان تەنانەت سەدان لێکۆڵینەوەش بە یەکدی بەراورد دەکرێن. لە ڕێی ئەم چالاکییەشەوە، خاڵە هاوبەش و جیاکۆکەکانی لێکۆڵینەوەکانمان بۆ دەر دەکەوێت، جگە لەوەش، پڕچەکمان دەکات بەرامبەر ئەو مەعریفە هەنووکەییەی لەسەر ئەو بابەتە بەرهەم هاتووە تا ئێستا.

بۆ *هەڵسەنگاندنی پێداچوونەوە بە توێژینەوەکاندا* دەپرسین ئایا ئەو دەرئەنجامەی پێداچوونەوەکە پێی گەیشتووە، گونجاوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو توێژینەوانەی کە وەر گیراون؟ ئایا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی پەیوەندیدار هەیە کە توێژەکە پەراوێزی خستبێت؟ ( وەک کەسێک کە شارەزای بوارەکە نیت، ئەم پرسیارە وەکوو مەحاڵێک دێتە پێش چاوت. بەڵام دەتوانی لە پسپۆڕێکی بوارەکە بپرسیت، کە هەم خاوەن لێکۆڵینەوەیە و هەم شارەزای پێداچوونەوەیە بە توێژینەوەکاندا.)

پرسیارێکی تر کە بەسەر هەموو جۆرەکانی تری بەڵگەدا دەچەسپێت، ئەمەیە: ئایا ئەم بەڵگەیە *پەیوەندیدارە* بە بابەتەکەوە؟ ئەگەر پەیوەندیدار نەبوو، ئەوا شیاوی هیچ گرنگیپێدانێک نییە، با لە ڕووەکانی تریشەوە بەڵگەیەکی بەهێز بێت. با سەرنجی ئەم نموونە واقیعییە بدەین، کە چۆن

سەرلێشێواندنێک ڕووی داوە بە هۆی بەکارهێنانی بەڵگەی ناپەیوەندیدار بە بابەتەکەوە. وانەبێژەکانی کۆلێجەکان داوای کەمکردنەوەی ژمارەی قوتابییەکانیان کرد، لە وانەکانی نووسین و قسەکردن و بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا، بەڵام کاربەدەستانی کۆلێجەکان ئەم داوایەیان ڕەفز کردەوە. کاربەدەستان، بۆ پشتگیریکردن لە ڕاکەیان، ئاماژەیان بەو لێکۆڵینەوانە دەدا، کە دەڵێن ژمارەی قوتابییان لە پۆلێکدا هیچ پەیوەندیی نییە بە چۆنێتیی وانەوتنەوەوە - بە مانەیەکی تر، مامۆستاکان دەتوانن زۆر بەباشی وانە بڵێنەوە ئەگەر ٥٠ یان ١٥ قوتابی لە پۆلێکدا بن. ئەمە لە کاتێکدا لێکۆڵینەوە بەکارهاتووەکان تەنها باسی ئەو وانانە دەکەن، کە مامۆستا زانیاری نەقڵ دەکات بۆ قوتابییان، نەک ئەو وانانەی کە تێیدا سەرقاڵی گەشەپێدانی مەهارەتی قوتابییەکانە. هەر بۆیە بەڵگەی کاربەدەستانی کۆلێجەکان هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە {چونکە لە وانەکانی وەکوو نووسین و قسەکردن و بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا، مەهارەت و توانای قوتابییان گەشە دەکەن و تەنها بریتی نین لە گواستنەوەی زانیاری لە مامۆستاوە بۆ قوتابییان }.

## هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان

ئێمە هەموو ئارەزوو دەکەین خۆمان وەک کەسانێک ببینین، کە بەتەواوەتی بابەتین و بە شێوەیەکی یەکسان هەموو گۆشەکانی کێشەکان لەبەرچاو دەگرین. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم حاڵەتە دەگمەنە. تەنانەت ئەگەر ئێمە بە هۆی دەرئەنجامی هەڵسەنگاندنەکانیشمانەوە نەبووبێتینە لایەنگری بەهێزی لایەک، ئەوا هەمیشە "لێژبوونەوەیەک"{مەیلێکمان} بۆ ئەم یان ئەو لایەنی کێشەکە هەیە، ئەمەش بە چەند هۆیەک، وەکوو فەلسەفەمان بە شێوەیەکی گشتی بۆ ژیان، دیدە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانمان، ڕاکانمان لەسەر کێشە پەیوەندیدارەکان، یان سەرنجمان لەسەر ئەو کەسانەی پەیوەندیدارن بە

کێشەکەوە. ئەم لێژبوونەوەیە کە بە لایەنگرتنیش ناسراوە، ڕەنگە ئەوەندە کەم بێت، کە کاریگەرییەکی کەم یان هەر هیچ کاریگەرییەکیشی لەسەر بڕیارەکانمان نەبێت. بەڵام بە دیوەکەی تریشدا، ڕەنگە ئەوەندە زۆر بێت، کە ببێتە ڕێگرییەکی گەورە لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا. لە ڕاستیدا هەتا زیاتر بیشکێنینەوە بە لایەکدا، ئەوا مەودای بیرکردنەوەمان کورتتر و کورتتر دەبێتەوە.

چۆن دەتوانیت بزانیت کە ئایا لایەنگری دەکەیت لە هەڵسەنگاندنی بەڵگەکاندا یان نا؟ هەموو ئەمانەی خوارەوە هێمان تا پێت بڵێن کە تۆ لایەنگری دەکەیت:

* لە کاتی هەڵسەنگاندنی بەڵگەکاندا حەز دەکەیت لایەک بسەلمێنیت کە ڕاستە.
* کە دەست دەکەیت بە لێکۆڵینەوە، هەر سەرەتا وای دەدنێیت کە دیدە ئاشناکان بە خۆت، لەوسەرەوە بە دروستی بێنە دەرەوە.
* بەدوای ئەو بەڵگانەدا دەگەڕێیت، کە پشتگیری ئەو لایە دەکەن، کە تۆ پێت دروستە و بەڵگەی لایەکی تر پشتگوێ دەخەیت.
* لەو سەرچاوانەوە دەست پێ دەکەیت، کە لە دیدی خۆتەوە نزیکن نەک ئەوانەی کە لە ڕووی جۆرایەتی و متمانەوە لەپێشترن.
* وردودرشتیی ئەو بەڵگانە ئەپشکنیت، کە دژی ڕاکانی خۆتن، لێ بە چاوێکی نارەخنەییەوە سەیری ئەو بەڵگانە دەکەیت، کە ڕاکانی تۆ پشتڕاست دەکەنەوە.
* پێش ئەوە ئەو بەڵگانە بەتەواوەتی هەڵسەنگێنی، کە دژی ڕاکانی خۆتن، یەکسەر دەست دەکەیت بە ڕەتکردنەدوەیان.

هەرچەندە ڕەنگە تۆ نەتوانی بەسەر لایەنگیریەکانی خۆتا زاڵ بیت، بەڵام

لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانی دەستنیشانیان بکەیت و *کۆنترۆڵیان* بکەیت و ئەمەش هەموو مەسەلەکەیە. مەبەست لە هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان بریتییە لە گەیشتن بە ڕاستی، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئەو ڕاستییە تاڵە یان شیرین و تەنها ڕێگەش بۆ ئەوەی بە ڕاستی بگەیت، بریتییە لە هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان بە شێوەیەکی *یەکسان*. ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنەش هەندێک جار دەتگەیەنێتە دەرئەنجامێک، کە ئەو دیدەی کە دەیشکێنیتەوە بەلایدا (یان ئەوەی کە بڕوات پێیەتی)، هەڵە دەر دەچن. بەڵام قەت دوودڵ مەبە لە کردنی ئەمە. گۆڕان لە ڕاکانتا شتێک نییە جێی شەرم بێت، بەڵام پێداگری و مانەوە لەسەر دیدە هەڵەکان بۆ بەرگریکردن لەوەی کە هەیت، نەک هەر گەمژانەیە، بەڵکوو لە ڕووی ڕۆشنبیریشەوە دەچێتە بابی درۆکردنەوە.

## بەڵگەی "تەواو" لە چی پێك دێت؟

لە ڕاستیدا بەدەگمەن نەبێت، ئاسان نییە بڕیاردان لەسەر ئەوەی چ کاتێک بەڵگەی خۆت یان بەڵگەی ئەو کەسەی کە ڕاکەی هەڵدەسنگێنیت، تەواوە بەسە sufficiant. لە پرۆسەی بڕیاردانەکەدا، دەبێت هەم بڕ و هەم نۆعیەتی بەڵگەکە لەبەرچاو بگریت. دیارە ڕێسایەکی سووکوئاسان لە گۆڕێ نییە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە بۆ هەندێ حاڵەتی دیاریکراو دەستمان دەگرن:

*١. بەڵگەیەک بەسە کاتێک بە هۆیەوە دەتوانین دڵنیا بین لەو بڕیارەی کە دەیدەین.* خۆزگەخواستن، گریمانەکردن، یان واپیشاندان، هیچکام لەمانە ناتوانن دڵنیایی بە ڕاستی حوکمێک ببەخشن. دڵنیایی کاتێک هەیە، کە هۆیەکی باش نییە بۆ گومان، بنەمایەک نییە بۆ ناڕازیبوون. بۆ نموونە لە حاڵەتی بڕیاردان لەسەر تاوانباریی کەسێک لە دادگادا:

"کەسێک تاوانبارە، چونکە هۆیەکی مەعقول نییە بۆ بێتاوانیی ئەو کەسە."
بەدەستهێنانی دڵنیایی بە شێوەکی گشتی زۆر قورسە، بەتایبەتی لە کێشە ئاڵۆزەکاندا، هەر بۆیە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ناچاریت قبوڵی حوکمێکی متەوازعانەتر بکەیت.

٢. *کاتێک توانرا بسەلمێنرێت کە دڵنیایی ناتوانرێت بەدەست بهێنرێت، بەڵگەیەک بەس دەبێت،* چونکە *ئەگەری ڕاستیی ئەو دیدەی بەڵگەکە بەرگریی لێدەکات، لە ئەگەری هەموو دیدەکانی تر بەهێزترە.* لێرەدا ئەو دیدەی کە قسەی لەسەر دەکرێت، پیشان دەدرێت کە بە شێوەیەکی دیار مەعقولترە لە هەموو ئەو دیدانەی کە منافەسەی دەکەن. لە دادگا مەدەنییەکاندا، ئەم حاڵەتە بە "باشترینی ناو بەڵگەکان" ناو دەبرێت. *پیشاندانی* مەعقولیەت، دیارە زۆر جیاوازە لە *جەختکردنەوەی* پەتی، هەر بۆیە هەموو دیدە بەشداربووەکان دەبێت لەبەرچاو بگیرێن و هەڵبسەنگێنرێن پێش ئەوەی بڕیار لەسەر مەعقولترینی ناویان بدرێت.

٣. *جگە لە دوو حاڵەتەکەی سەرەوە، لە هەموو کەیسەکانی تردا،* پێویستە *بەڵگەکان وەک بەڵگەی ناتەواو بێنە ئەژماردن.* بە مانایەکی تر، ئەگەر هیچکام لە بەڵگەکان نەیانتوانی مەعقولیەتی ڕایەک بەسەر ڕاکانی تردا بسەلمێنن، ئەوا تەنها بڕیاری دروست کە بدرێت، بریتی دەبێت لە حکومنەدان هەتا ئەو کاتەی بەڵگەی یەکلاییکەرەوە لە بەردەستا دەبن. ئەم پەلەنەکرن و دانبەخۆداگرتنە، دیارە زەحمەتە، بەڵام خودی ئەم پەلەنەکردنە، سیفەتێکی جەوهەریی بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکانە.

# ڕاهێنانەکان

١. چەند ساڵێک لەمەوپێش، پسپۆڕێکی بواری بیرکردنەوە ئەم تێبینییەی خستە ڕوو: "ڕەنگە سەرەکیترین سیفەتی کەسێکی ڕاهێنراو لەسەر بیرکردنەوە، کە بەپێچەوانەوە کەسێکی ڕانەهێنراو نییەتی، ئەوەیە کە لەسەر بنەمای بەڵگەی ناتەواو بڕیار نادەن" بیر لەو بۆنانە بکەرەوە، کە تیایاندا ڕاکانت لەسەر کەمترین، یان تەنانەت بێ هیچ بەڵگەیەک، دەر بڕیوە. ڕاکانت دەستنیشان بکە و بیر لەو بەڵگانە بکەرەوە، کە پێویست دەبن بۆ پشتڕاستکردنەوەیان.

٢. چەند ساڵێک لەمەوپێش، ئەکتەرێکی بەناوبانگی تەلەفزیۆن، میوانی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆن بوو، باسی زۆر شتی کرد، لەناویاندا ماچکردنی دوو لێزبیان لە بەردەم کامێرادا. لەوێدا ئەکتەرە کچەکە ئەم ڕایەی دەر پەڕاند: "ئێستا ئەو کاتەیە کە ترس لە هاوڕەگەزبازی و تاوان دژ بە هاوڕەگەزبازەکان لەوپەڕیدایە بە ئەندازەیەک، کە تا ئێستا بێوێنەیە." ئەگەر پێشکەشکاری بەرنامەکە بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەگر بووایە، داخۆ چ پرسیارێکی ئاراستەی ئەکتەرەکە دەکرد، لەسەر ئەو ڕایە؟ چ جۆرە بەڵگەیەک سوودی دەبوو بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی مەعقولیەتی ڕای ئەکتەرەکە؟

٣. لە بەشی پێنجەمدا، ڕاهێنانی ژمارە ١٠، داوات لێ کرابوو لە بەردەم هەر پرسیارێکدا کە لە خوارەوەشدا دووبارە ئاماژەیان بۆ کراوەتەوە،

ڕای خۆت بڵێیت. ئێستا بە ڕاکانت و ئەو بەڵگانەشتا بچۆرەوە، کە وەک پشتڕاستکەرەوەی ڕاکانت بەکارت هێناون. جۆری بەڵگەکانیش دەستنیشان بکە: *ئەزموونی شەخسی، ڕاپۆرتە بڵاونەکراوەکان، ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکان، شایەتحاڵ، شایەتیدانی کەسە بەناوبانگەکان، ڕای شارەزایان، تاقیکردنەوە، ستاتیستیک، ڕاپرسی، تێبینیکردنی فەرمی، پێداچوونەوەی توێژینەوەکان.* ئایا بەڵگەکانت بەس بوون بۆ پشتڕاسکردنەوەی ڕاکانت؟ ئەگەر وا نەبوون، ئەو بەڵگانە کامانەن کە دەتوانن ئەو ڕۆڵە ببینن.

a. لە حاڵەتەکانی تەلاقدا، دەبێت دادگا بەرمەبنای چ شتێکی ئەو دایک یان باوکە هەڵبژێرێت، کە دەبێت منداڵەکان بەخێو بکەن؟

b. تا چ تەمەنێک دەبێت منداڵەکان لێیان بدرێت {مەبەست لە زللەکێشانە بە قونیاندا spank} (یان ئایا هەر لە بنەڕەتدا پێویست دەکات لێیان بدرێت؟)

c. ئایا بچووکترین تەمەنی ڕێپێدراو بۆ خواردنەوەی مادده کحولییەکان لە هەموو وڵاتەکاندا پێویست دەکات تەمەنی شازدە ساڵی بێت؟

d. ئایا لە چ دۆخێکدا پێویست دەکات ئەمەریکا لە یەکەم گورزی سەربازیی خۆیدا بۆمبی ئەتۆم بەکار بهێنیت؟ ئایا هەر لە بنەڕەتدا دەبێت بۆمبی ئەتۆم بەکار بهێنرێت؟

e. ئایا ڕۆحیانەتی خراپەکار بوونی هەیە؟ ئەگەر هەیە، ئایا دەتوانی کار لە کردەوەکانی مرۆڤەکان بکات؟

f. ئایا هیچ دۆخێک هەیە کە بە ئامانج، خاڵی کۆتاییی پاساوی ئامراز، هۆکار بداتەوە؟

g. ئایا بەشداریکردنی هەموو وانەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، چانسی سەرکەوتنی ئەکادیمییانەی قوتابی زیاد دەکات؟

h. ئایا لە کام حاڵەتەیاندا زیاتر ڕێز لە مامۆستاکان گیراوە، پەنجا

ساڵ لەمەوبەر یان لە ئێستادا؟

i. ئایا خواردنەوەی مادده کحولییەکان، تەنها لە پشووی هەفتەدا کەسێک دەکاتە مودمین لەسەر مادده کحولییەکان؟

j. ئایا بە هۆی میدیاوە هەڵسوکەوتە لادەرە کۆمەڵایەتییەکان زیادیان کردووە؟ یان ئایا میدیا کاریگەری باش دەکات ئەگەر تەنها پیشانیان بدات؟

٤. لە پرسیاری هەشتی ڕاهێنانەکانی چاپتەری یەکدا، لەسەر هەریەک لەم گوزارانەی خوارەوە تۆ ڕای خۆت داوە. سەیریکیان بکەرەوە و پاشان بە ڕێنماییەکانی پرسیاری سەرەوەدا بچۆرەوە.

a. کارمەندەکانی بواری خزمەتگوزاریی تەندروستی دەبێت تێستی HIV\AIDSیان بۆ بکرێت.

b . پێشبڕکێی جوانی و بەهرەداری بۆ منداڵان دەبێت قەدەغە بکرێت.

c. گروپە دەمارگیرەکانی وەکوو کو کلوکس کلان ku klux klan دەبێت ڕێیان پێ بدرێت لە شوێنە گشتییەکاندا کۆبوونەوەی خۆیان ببەستن، یان بە شێوەیەکی ڕەسمی ڕێیان پێ بدرێت لە شەقامەکانی شاردا نمایشی خۆیان بکەن.

d. کۆرسی بەهێزکرنی توانای نووسین دەبێت بۆ هەموو قوتابییەکان بێت، نەک تەنها بۆ فرێشمانەکان، واتە ئەو قوتابییانەی یەکەم ساڵیانە.

e. وەرزشکاران دەبێت تێستی مادده وزەبەخشەکانیان بۆ بکرێت.

f. کریەیشنیزم {ئەو تیۆرەی کە دەڵێت خودا دروستکەری بوونە} دەبێت لە قۆناغی ئامادەییدا لە وانەی زیندەوەرزانیدا بخوێنرێت.

g. فرەژنی دەبێت بە یاسایی بکرێت.

h. ساڵی یاساییی دەنگدان دەبێت کەم بکرێتەوە بۆ شازدە ساڵی.

i. سیستەمی زیندانیکردن دەبێت زیاتر جەخت بکاتەوە لەسەر

زیندانیکردنی ئەو تاوانبارانەی نەخۆشیی ئەقڵییان هەیە، وەک لە ناردنی ئەو تاوانبارانە بۆ سەنتەرەکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی.

j. دکتۆرەکان و دەرمانسازەکان دەبێت داوای ڕەزامەندیی دایک و باوک لەو گەنجانە بکەن، کە لەخوار تەمەنی یاسایی سێکسکردنەوەن و داوای کڕینی ئامڕازەکانی ڕێگری لە سکپڕی دەکەن.

k. شکۆی پیاوێک بەقورسی بریندار دەبێت، ئەگەر هاوسەرەکەی زیاتر لە ئەو پارە پەیدا بکات.

l. ژنان پێیان خۆشە پشت بە پیاوان ببەستن.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە، پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی دەستنیشانکردنی ئەوەی کە کێ ببێتە نموونەی باڵا بۆ منداڵان. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

*کێـن ئەوانـەی کـە دەبێـت ببـن بـە نموونـەی بـالا بـۆ منـدالان:* چەنـد سـاڵێک لەمەوپێش، یاریزانـی بەناوبانگـی تۆپـی سـەبەتە، چارلـس بارکلـی، لـە بۆنەیەکـی وەرزشـیدا ڕای گەیانـد، کـە ئـەم نایەوێـت ببێتـە نموونـەی بـالا بـۆ هیـچ منداڵێک و پێشـی وایـە کـە هیـچ وەرزشـەوانێکیش نابێـت ئـەو مافـە بـە خـۆی بـدات. بـەڵام ئـەوەی کـە هەیـە لەسـەر ئـەرزی واقیـع، ئەوەیـە کـە مێردمندالانێکـی زۆر دەیانەوێـت ببنـە شـوێنکەوتووی ئەوانـەی کـە بـە نموونـەی بـاڵای خۆیانـی دەزانـن، لـە وەرزشـەوانە بەناوبانـگ و ئەستێرەی سـینەماییەوە بیگـرە تـا گۆرانیبێژەکانـی سـتایلی ڕۆک و شـتی تریـش. لـە ڕاسـتیدا هەمـوو کات ئـەم نموونـە باڵایانـە کەسـانێک نیـن شـیاوی ئـەوە بـن کـە کەسـێک چاویـان تـێ ببڕێـت. لەمـەڕ ئـەم مەسـەلەیەوە، دوو پرسـیاری گرنـگ بەکراوەیـی ماونەتـەوە: ئایـا کێـن ئـەو کەسـانەی کـە دەتوانـن ببنـە باشـترین نموونـەی بـاڵا بـۆ گەنجـان؟ ئایـا چـۆن دەتوانرێـت گەنجـان قایـل بکرێـن بـە قبوڵکردنـی ئـەو کەسـانە بـە نموونـەی بـاڵای خۆیـان؟

# چاپتەری حەوتەم

## ئارگۆمێنت چییە؟ What is Argument

وشـەی ئارگۆمێـنت چەنـد مانایەکـی یـان تێگەیشـتنێکی هەیـە، لەبـەر ئـەوە، یەکەم شت کە پێی هەڵدەستین ئەوەیە، کە ئەو تێگەیشتنانە دەخەینە ڕوو، تێبینیـی ئـەوە دەکەیـن کـە چـۆن هەریەکەیـان لـەوی تـر جیـاوازە. یەکێـک لـە مانـا باوەکانـی ئـەوە کـە ''ئارگۆمێنتکـردن واتـە دەمەبۆڵـە" وەک چـۆن لـەم ڕسـتەیەدا گوزارشـتی لـێ کـراوە "ئـەوان ئارگۆمێنتێکـی گەرموگوڕیـان هەبوو، قیژەقیژێکی ڕاستەقینە." لەبەر ئەوەی دەمەبۆڵەکردن لە هەست و سـۆزەکان پێـک دێـت نـەک لـە بیرکردنـەوەکان و دەبنـە هـۆی ئاڵۆزکردنـی گرێی خۆبەهەقزانینی کەسەکان و لەبەر ئەوە، زۆربەی کات سەر دەکێشێت بـۆ قرەقرێکـی بێئەقڵانـە. ئـەم پێناسـەیەی ئارگۆمێنتکـردن پەیوەندییەکـی زۆر لاوازی بـە بیرکردنـەوەی ڕەخنەییـەوە هەیـە. لەبـەر ئـەوە، بـۆ ئێمـە {بیرکـەرەوە ڕەخنـەگرەکان} ئارگۆمێنتکـردن بریتـی نییـە لـە دەمەبۆڵـە.

مانایەکـی تـری یـان تێگەیشـتنێکی تـری ئارگۆمێنتکـردن بریتییـە لـە "ئاڵوگۆڕکردنـی بیـروڕاکان لەنێـوان دوو کـەس یـان زیاتـردا" وەک ئـەوەی لـە دیبەیتـە {وشـەی دیبەیت ناکرێت بە گفتوگـۆکردن وەر بگێڕدرێت، چونکە دیبەیـت هەمـوو جـۆرە گفتۆگۆیـەک ناگرێتـەوە، بەڵکـوو تەنهـا ئـەو جـۆرە دەگرێتـەوە، کـە چاودێرێـک هەیـە، کاتـی قسـەکردنی بەشـداربووەکان ڕێـک

دەخات و نایەڵێت گفتوگۆکە لە چوارچێوەی بابەتەکە دەر بچێت، هەر بۆیە باشترە وشەی دیبەیت وەک خۆی بنووسرێتەوە} ڕەسمییەکاندا دەبینرێت. بەپێی ئەم تێگەشتنە بۆ چەمکەکە، ئارگۆمێنتکردن لە فۆرمە ئایدیاڵەکەیدا بریتییە لە هەوڵێکی دەستەجەمعی، کە تێیدا کەسە خاوەن دیدگا جیاوازەکان پێکەوە هەوڵ دەدەن تا بگەنە تێگەیشتنێکی قووڵتر و وردتر بۆ کێشەکە {بابەتی گفتوگۆکە}. لەم جۆرە دیبەیتە ئایدیاڵەدا، بەشداربووان مەیلی سەرکێشیی خۆبەحەقزانینی خۆیان کۆنترۆڵ دەکەن، هەر بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا کە حەز دەکەن لەسەر حەق بن، بەڵام ئەگەر توانرا بسەلمێنرێت کە هەڵەن، ئەوا بە سینگفراوانییەوە قبوڵی دەکەن. لە دیبەیتێکی ئاواشدا، هەموو کەس بە تێگەیشتنێکی فراوانترەوە لەمەڕ کێشەکەوە لە گفتوگۆکەوە دێتە دەرەوە. کەواتە هیچکەس دۆڕاو نییە. بەڵام بەداخەوە، گرێی خۆبەڕاستزانین بەئاسانی کۆنترۆڵ ناکرێت و زۆربەمان ڕاهێنراوین لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێت دۆڕاو و براوە هەبێت بۆ هەموو ئارگۆمێنتەکان، هەر وەکوو چۆن لە پێشبڕکێ وەرزشەوانییەکاندا هەیە. لەبەر ئەوە، ئێمە زۆربەی کات لەبری جیدیبوون بۆ زیادکردنی مەعریفە و ژیریتی، بیر لە "خاڵە ڕووخێنەرەکان" دەکەینەوە تا دژی هاودیالۆگەکەمان بەکاری بهێنین. هەر بۆیە لە باشترین حاڵەتیشدا ئارگۆمێنتکردن ناتوانێت بگاتە فۆرمە ئایدیاڵەکەی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە *ئارگۆمێنتکردن* وەکوو "ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاکان لە نێوان دوو کەس یان زیاتردا" پەیوەندیی هەیە بە بیرکردنەوەی ڕەخنەییەوە، بەڵام تێگەیشتنێکی دیکە هەیە بۆ چەمکەکە کە زیاتر پەیوەندیدارە بەو موغامەرەیەوە کە *دەمانکاتە* بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەیی. ئەویش مانا یان تێگەیشتنی سێیەمی *ئارگۆمێنتکردنە*، کە بریتییە لە "سەررێگەخستنی بیرکردنەوەی ئەقڵیReasoning بۆ پشتڕاستکردنەوەی

حوکمەکان." کاتێک کە ئێمە دەڵێین، "ئارگۆمێنتەکەی جۆن بۆ سزای لەسێدارەدان زۆر لەوەی سالّی قایلکەرانەتر بوو." لەم کاتەدا ئێمە سەرنج دەخەینە سەر چۆنێتی ئەو بەشدارییەی کە خودی جۆن بۆ کۆی گفتوگۆکە کردوویەتی. لەبەر ئەوەی خەمی سەرەکیی ئێمە لەم بەشەدا بگرە لە هەموو کتێبەکەشدا بریتییە لە هەڵسەنگاندنی ئارگۆمێنتی تاکەکەسەکان، هەڵسەنگاندنی هی خودی خۆت بە هەمان شێوەی هی ئەوانی تریش، هەر بۆیە لەم چاپتەرەدا سەرنج دەخەینە سەر تێگەیشتنی سێیەمی ئارگۆمێنتکردن.

بۆ کارئاسانی دەتوانرێت بیر لە ئارگۆمێنت بکرێتەوە وەکوو کێشەیەکی زارەکی بەبێ بەکارهێنانی ڕەمزە بیرکارییەکان. هاوکێشە ژمارەییەکان لەم فۆرمەدا دەر دەبڕین ١+١=٢، یان ٢-١=١، بەڵام هاوکێشە زارەکییەکان هەمان ئایدیا دەر دەبڕن بەبێ بەکارهێنانی ڕەمزەکانی وەک لێدەرکردن، کۆکردنەوە یان یەکسان. بۆ نموونە :

بەپێی یاسا، مامۆستا بۆی نییە ڕابەری چالاکییە ئاینییەکان لە قوتابخانە حکومییەکاندا بکات. وینۆنە Wynona چالاکییە ئاینییەکان لە پۆلەکەی خۆیدا کە لە قوتابخانەیەکی حکومیدایە، بەڕێوە دەبات. کەواتە، وینۆنە یاسای پێشێل کردووە.

وەک هاوکێشە ژمارەییەکان، ئارگۆمێنتەکان دەکرێت هەم سادە بن هەم ئاڵۆز. هەر وەک چۆن دەرئەنجامی هاوکێشەیەکی ژمارەیی دەشێت بریتی بێت لە کۆکردنەوەی کۆمەڵێک ژمارە (٢٤١+١٨٦+٢٣٢+١١١+٨٧١) ئاواش دەشێت دەرئەنجامی ئارگۆمێنتێک بەرمەبنای کۆمەڵێک بنچینە premises {جەختکردنەوە، پێشمەرج} بێت. وەک چۆن هەبوونی ژمارەیەکی هەڵە لە لیستی ژمارەکاندا وا دەکات دەرئەنجامی کۆکردنەوەی ژمارەکان هەڵە بێت،

بە هەمان شێوە جەختکردنەوە لە بنچینە، پێشمەرجێکی هەڵە، دەبێتە هۆی بەئەنجامگەیاندنێکی هەڵە. لە ئارگۆمێنتەکەی سەرەوەدا، لەسەر مەسەلەی ڕێبەری ئاییتی لە پۆلدا، ئەگەر بکەوینە ئەو هەڵەیەوە کە یاسا ڕێ ئەدات بە مامۆستاکان تا چالاکییە دینییەکان لە پۆلەکاندا جێبەجێ بکەن، ئەوە دەگەینە دەرئەنجامێکی هەڵە، کە بریتییە لەوەی وینۆنە یاسای پێشێل نەکردووە، کە ئەمەش هەڵەیە.

هاوکێشە ژمارەییەکان و ئارگۆمێنتەکان بەتەواوەتی لەیەک ناچن. یەکێک لە جیاوازییەکان ئەوەیە کە ئارگۆمێنتەکان بە شێوەیەکی گشتی ئاڵۆزترن و سەختترن بۆ تاقیکردنەوە. بۆ نموونە لەم نموونانەی خوارەوەدا: ئایا ڤیتامین C ڕێگری دەکات لە تووشبوون بە هەڵامەت یان تەنها لە سەختیی نەخۆشییەکە کەم دەکاتەوە؟ ئایا توندوتیژی لە تەلەڤیزیۆندا سەر دەکێشێت بۆ توندوتیژی لە واقیعدا؟ ئایا جۆن ف. کەنەدی تەنها لەلایەن یەک تیرۆرستەوە کوژرا؟ ئایا جۆن بێنت ڕامیس لەلایەن دایک و باوکیەوە کوژرا؟ لەم حاڵەتانە و لە زۆری تریشدا، بەڵگەکان هێشتا بەتەواوەتی ساغ نەبوونەتەوە، هەر بۆیە کێشەکان بەتەواوەتی یەکلایی نەکراونەتەوە و جێی ناکۆکی و مشتومڕن.

## بەشەکانی ئارگۆمێنت

ئەو کێڵگە مەعریفییەی کە زۆر پەیوەندیدارە بە لێکۆڵینەوەی ئارگۆمێنتەوە، بریتییە لە لۆژیک. وەکوو هەر کێڵگەیەکی تر، کە دەرگیرە لەگەڵ کێشە ئاڵۆزەکاندا، ئەمیش خاوەن چەمکگەلێکی تایبەت بە خۆیەتی. لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە زیاتر پراکتیکییە وەک لەوەی تیۆری بێت، هەر بۆیە تەنها لەو تێرمانە ئەدوێن، کە بەشەکانی ئارگۆمێنتمان بۆ دەخەنە ڕوو. ئەوانیش *بنچینەکان* }پێشمەرجەکان {premises و *دەرئەنجامەکانن*. لە ئارگۆمێنتی

وینۆنە کە لە سەرەوە ئاماژەی پێ درا، بنچینەکان بریتین لە "بەپێی یاسا، مامۆستا بۆی نییە ڕێبەری سروتە ئاینییەکان بکات لە پۆلی قوتابخانە حوکومییەکاندا" وە هەروەها "وینۆنە ڕێبەری ئەنجامدانی چالاکییە ئاینییەکان دەکات لە پۆلی قوتابخانەیەکی حکومیدا" دەرئەنجامەکەش بریتییە لە "لەبەر ئەوە، وینۆنە یاسای پێشێل کردووە." وشەی *لەبەر ئەوە* و هاوماناکانی وەکوو *کەواتە، لە دەرئەنجامدا* هەمیشە بەکار دەهێنرێن بۆ ئاماژەدان بە دەرئەنجامەکان. لە هەر شوێنێکیشدا بەکار نەهێنران، دەتوانی دەرئەنجامەکە بناسیتەوە بە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە، کام لە جەختکردنەوەکان پشتڕاست دەکرێتەوە بە جەختکردنەوەیەکی تر؟

ئەمانەی خوارەوە ئەو پرنسیپە سەرەکییانەن کە لۆجیککارەکان logicians بەکاری دەهێنن بۆ هەڵسەنگاندنی ئارگۆمێنتەکان:

١_ پێشمەرجەکان یان ئەوەتا *ڕاستن* یان *هەڵە* {دروستن یان نادروستن}.

٢_ ئەو پاساوە یان هۆیە ئەقڵییانەی کە پێشمەرجەکان دەبەستنەوە بە دەرئەنجامەکان، یان ئەوەتا *یاسایین* valid یان *نایاسایین* invalid. (بۆ ئەوەی ئەو دەرئەنجامەی خراوەتە ڕوو، یاسایی بێت، ئەوا دەبێت لە ڕووی لۆجیکییەوە تەنها ئەو دەرئەنجامە بتوانرێت هەڵبهێنجرێت لە پێشمەرجەکەوە).

٣_ پێشمەرجە دروستەکان لەگەڵ هۆ یاساییەکان یەکسانە بە ئارگۆمێنتێکی *دروست* sound {لە ڕووی ئەقڵییەوە قبول کراوە}.

٤_ پێشمەرجێکی نادروست یان هۆیەکی نایاسایی وا دەکەن ئارگۆمێنتەکە *نادروست* unsound بێت {لە ڕووی ئەقڵییەوە قبوڵنەکراو بێت}.

هەڵەکان لە بیرکردنەوەدا زۆرن، هەر وەک چۆن لە بیرکاریشدا هەر وان. ئەوە تەنها بیرکردنەوەی ئەوانی دیکە نییە کە هەڵەیان تێدایە، بەڵکوو بیرکردنەوەی خۆشمان بێبەری نین لە هەڵە. هەر وەک چۆن دەشێت هەڵە لە دەرئەنجامی کۆکردنەوەی ژمارەکاندا بکەین لەگەڵ ئەوەشدا کە بەئاگاییەوە کۆمان کردوونەتەوە، بە هەمان شێوە دەشێت لە دەرئەنجامەکەمان هەڵە بن لەگەڵ ئەوەشدا کە زانیارییەکانمان وردن. بەلام گومانی تێدا نییە کە ئەگەری هەڵەبوونی دهرئەنجامەکانمان *زیاترە* کاتێک بە زانیارییەکی ناورد یان ناتەواو، یان هۆیەکی ناڕاست دەست دەکەین بە بیرکردنەوە.

مامەڵەیەکی نادروست لەگەڵ ئایدیا و پرۆسەی هۆهێنانەوە {پرۆسەی پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکان بە هۆی ئەقڵی} دەبێتە هۆی دروستکردنی هەڵە و کەموکووڕی لە ئارگۆمێنتدا. بۆ نموونە، ئەگەر تۆ بەرکەوتنە یەکەمییەکانت یان سەرنجە یەکەمییەکانت first impression لەسەر شتێک وەک لە هەڵەبەدەرێک دانا، ئەوا بە شێوەیەکی نارەخنەیی قبوڵیان دەکەیت، وە نە بەدوای ئەو بەڵگانەدا دەگەڕێیت کە پشتگیرییان لێ دەکەن نە ئەوانەش کە ڕەخنەیان دەکەن، دەرئەنجامیش ئەوەیە کە کوێرانە بەرگرییان لێ دەکەیت و شوێنیان دەکەویت. وەها ڕێگەیەک بێ حەسرەت دەکات چ بۆ خۆهەڵخەتاندن چ بۆ قۆرخکردنت لەلایەن ئەوانی ترەوە. بەپێچەوانەوە، ئەگەر تۆ بەرکەوتنە یەکەمییەکانت یان سەرنجە یەکەمییەکانت بەوریایی و ئاگاییەوە وەر گرت و وەکوو ئەگەرە سەرنجڕاکێشەکان نەک ئەگەرە دڵنیا و بێکەموکووڕییەکان مامەڵەت لەگەڵ کردن، هەروەها بەراوردت کردن بە ئایدیاکانی تر، بەر لەوەی بڕیاری کۆتاییان لەسەر بدەیت، ئەوە ئەگەری خۆگەمژەکردن و هەڵخەڵەتاندنت لەلایەن ئەوانی ترەوە دەبێتە ئەگەرێکی لاواز.

## چۆنێتیی هەڵسەنگاندی ئارگۆمێنتەکان

شێواز یان ڕێگەی سەرەتاییی هەڵسەنگاندنی ئارگومێنتەکان، دەتوانرێت بە شێوەیەکی ئاسان بخرێتە ڕوو: *بڕیار بدە ئایا بنچینەکان 'پێشمەرجەکان' ڕاستن یان هەڵەن و ئایا ئەو هۆیانەی کە پێشمەرجەکان دەبەستنەوە بە دەرئەنجامەکانەوە، یاسایین یان نا.* ئەگەر هەردوو پێوەرەکە یەکیان گرت {واتە ئەگەر ڕاست و یاسایی بوون}، ئەوا ئارگۆمێنتەکە دروستە. ئەگەر ئارگۆمێنتەکە بە شێوەیەکی ڕوون و بێ کەموکووڕی خرایە ڕوو، تۆش پرسیاری دروستت لەسەری کرد، ئەوا ئەم ڕێگەیە بۆ هەڵسەنگاندنی ئارگۆمێنتەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی ئاسانە بۆ پەیڕەوکردن. دیارە بەدڵنیاییەوە پێویستت بە هەندێک لێکۆڵینەوە دەبێت بۆ دیاریکردنی ڕاستی یان ناڕاستیی یەکێک یان هەردوو پێشمەرجەکان (ژمارەی ئەو پێشمەرجانەی کە دەرئەنجامێکی لێوە بەدەست دەهێنرێت، پەیوەندیی بە جۆری ئارگۆمێنتەکەوە هەیە). ئەمانەی خوارەوە نموونەی هەندێک ئارگۆمێنتن کە بە شێوەیەکی ڕوون و تەواو خراونەتە ڕوو و لە ڕێی پرسیاری دروستەوە هەڵسەنگێنراون:

| ئارگۆمێنتەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| ئایا هەموو مرۆڤەکان فانین؟ | ئایا هەموو مرۆڤەکان فانین؟ |
| سوکرات مرۆڤە. | ئایا سوکرات مرۆڤە؟ |
| کەواتە سوکرات فانییە. | ئایا ئەم دەرئەنجامە لۆجیکییانە داکەوتووە لە پێشمەرجەکانەوە؟ ئایا هیچ دەرئەنجامێکی تر قابیلی بەدەستهێنان نییە لە پێشمەرجەکانەوە؟ |

*لێدوان:* ڕاستیی پێشمەرجەکان ڕوونە و ئەو دەرئەنجامەی خراوەتە ڕوو، تەنها دەرئەنجامە، کە لۆجیکییانە بەدەست بهێنرێت. کەواتە، ئارگۆمێنتەکە ئارگۆمێنتێکی دروستە.

| ئارگۆمێنتەکان | پرسیارەکان |
| --- | --- |
| هەر چالاکییەک مەشقی جەستەیی لەخۆ بگرێت، ئەوا دروستە وەک وەرزش بناسرێنرێت یان پۆلێن بکرێت. | ئایا هیچ چالاکییەکی جەستەیی نییە کە بە وەرزش ناو نابرێن و لەگەڵ ئەوەشدا مەشقی جەستەیین؟ |
| یاریی لەشجوانی پێوستی بە ئەرکی جەستەیی هەیە. | ئایا یاریی لەشجوانی ئەرکی جەستەیی لەخۆ دەگرێت؟ |
| لەبەر ئەوە، دروستە یاریی لەشجوانی وەک وەرزش پۆلێن بکرێت. | ئایا بەدەستهێنانی ئەم دەرئەنجامە لە پێشمەرجەکانەوە لۆجیکمەندانەیە؟ ئایا هیچ دەرئەنجامێکی تر نییە، کە لۆجیکمەندانە لەم پێشمەرجانەوە بەدەست بهێنرێت؟ |

لێدوان: لەگەڵ ئەوەشدا، پێشمەرجی دووەم دروستە (ڕاستە) و دەرئەنجامەکە بە شێوەیەکی لۆجیکی لە پێشمەرجەکانەوە هاتۆتە دەری، بەڵام ئارگۆمێنتەکە نادروستە، چونکە پێشمەرجی یەکەم هەڵەیە. زۆر چالاکیی جەستەیی هەن کە ئەرکی جەستەیی لەخۆ دەگرن، لەگەڵ

ئەوەشدا، بە هیچ شێوەیەک بە وەرزش دانانرێن. بۆ نموونە، گواستنەوەی پیانۆیەک. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئاگاداری ئەوە بە، دەرخستنی نادروستی ئەم ئارگۆمێنتە ئەوە ناسەلمێنێت کە یاری لەشجوانی وەرزش نییە. چونکە بە هۆی هەندێک ئارگۆمێنتی ترەوە، دەتوانرێت بسەلمێنرێت کە لەشجوانی وەرزشە.

| ئارگۆمێنتەکان | پرسیارەکان |
| --- | --- |
| خەڵکی تاوانبار هەمیشە لە تێستی درۆکەشفکردندا دەکەون. | ئایا ئەمە ڕاستە؟ |
| برۆنۆ لە تێستی کەشفکردنی درۆدا کەوت. | ئایا ئەو لە تاقیکردنەوەکەدا کەوت؟ |
| کەواتە برۆنۆ تاوانبارە. | ئایا ئەم دەرئەنجامە لۆجیکییانە لە پێشمەرجەکانەوە داکەوتووە؟ هیچ دەرئەنجامێکی تر نییە کە مەعقول بێت؟ |

*لیدوان:* پێشمەرجی یەکەم و دووەمیش ڕاستن، ( بەرپرسیارانی تێستەکە دەیانتوانی درۆ بکەن لە دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکەی برۆنۆدا، بەڵام با وای دابنێین ڕاستیان وتووە) لەگەڵ ئەوەشدا پێشمەرجەکان بەڵگەی تەواو نادەن بە دەستەوە تا بگەینە دەرئەنجامی پێشکەشکراو. ئێمە دەبێت ئەوە بزانین، کا ئایا ڕێی تێدەچێت کەسێکی *بێتاوان* بکەوێت لە تێستی کەشفکردنی درۆدا. ئەگەر وا بوو، ئەوا ڕێی تێدەچێت کە برۆنۆ بێتاوان بێت.

| ئارگۆمێنتەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| ئەو کەسانە سەرکەوتن بەدەست دەهێنن کە هەوڵ زۆر دەدەن. | ئایا هەمیشە ئەوە ڕاستە؟ |
| جان کەسێکی سەرکەوتووە. | ئایا ئەو سەرکەوتووە؟ ئایا بەدەستهێنانی ئەم دەرئەنجامە لە پێشمەرجەکانەوە لۆجیکمەندانەیە؟ |
| کەواتە جان کەسێکە زۆر هەوڵ دەدات. | ئایا هیچ دەرئەنجامێکی تر نییە کە مەعقولانە بێت؟ |

*لێدوان:* پێشمەرجی یەکەم بەتەواوی ڕاست نییە، هەندێک کەس لەگەڵ ئەوەشدا کە هەوڵ زۆر دەدەن، بەلام سەرکەوتوو نابن، چونکە بەهرەی پێویست یان ئەزموونی پێشوەختیان نییە تا ڕووبەڕووی ڕێگرەکان ببنەوە. زیاتر لەوەش، هەندێک کەس لەگەڵ ئەوەشدا کە هەوڵ زۆر نادەن، سەرکەوتووش دەبن بە هۆی ئەوەی کە پارە یان دەسەلاتیان هەیە. تەنانەت ئەگەر دووەمیش وەک پێشمەرجێکی ڕاست قبوڵبکەین، ئارگۆمێنتەکە هەر پێویستە بە نادروست لەقەڵەم بدرێت، چونکە پێشمەرجی یەکەم هەڵەیە.

ئایا هەرگیز گوێبیستی ئارگۆمێنتێک بوویت کە سەرنجت ڕابکێشێت، بەلام دواتر گوێت لە ئارگۆمێنتێکی پێچەوانەی ئەوەی یەکەم بێت کە زیاتر لەوەی یەکەم سەرنجڕاکێش بێت؟ ئەم حاڵەتە جاروبار ڕوو دەدات. بۆ نموونە، لە ململانێی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ساڵی ۲۰۰۰، پرسیارێک سەری هەڵدابوو کە ئایا کاندید جۆرج دەبلیو بۆش لە چەند ساڵی پێشوودا کۆکایینی بەکار هێناوە یان نا. هەندێک پسپۆڕان ڕایان وا بوو کە ئەگەر ئەو کۆکایینی بەکار هێنابێت، کەواتە کەسێکی دووڕووە، چونکە ئەو وەکوو بەرپرسی باج ئیمزای لەسەر ئەو یاسایە کردووە کە

سزای هەرکەسێک بدرێت کە کۆکایین بەکار دەهێنێت. ئەم ئارگۆمێنتەش پەسەندکراو بوو. پاشان هەندێکی تر لە پسپۆڕان ئارگۆمێنتی ئەوەیان دەکرد، کەسێک کە کۆکایینی بەکار هێناوە، لە پێگەیەکی باشتردایە بۆ زانینی ئەوەی کە کۆکایین چەندە مەترسیدارە بۆ تاک و کۆمەڵگەش بەراورد بە کەسێک کە کۆکایینی بەکار نەهێناوە. ئەوان پاساویان ئەوە بوو، کەسێک کە ئالوودە بووە لەسەر کحول، وردتر و ڕاستتر دەتوانێت قسە لەسەر خراپیەکارهێنانی کحول بکات وەک لەو کەسەی کە هەرگیز کحولی بەکار نەهێناوە {واتە مادامێک ئەزموونی هەیە، کەواتە باشتریش هەست بە مەترسییەکانی کحول دەکات}. تاوانبارێکی گەڕاوە {تاوانبارێکی سزادراو} زیاتر ئاشنایە لەگەڵ پاڵنەرە شەیتانییەکانی تاوان وەک لە هاونیشتیمانییەکی گوێڕایەڵ بۆ یاسا و ئیتر بەو شێوەیە {واتە لە هەر حاڵەتێکدا ئەزموون هەبوو، ئەوا مەعریفەش هەیە}.

ئەوەت لەیاد بێت، هەڵسەنگاندنی هەر ئارگۆمێنێک زۆر وردتر و کاریگەرترە ئەگەر ئاگاداری هەردوو دیوی ئارگۆمێنتەکە بیت {هەم ئەوانەی پشتگیری ئارگۆمێنتەکە دەکەن، ئەوانەشی کە ڕەخنەی دەکەن} یان لانی کەم ئەو ڕەخنانە لە بەرچاو بگرە کە هەر لایەنێکیان دەیگرن لە لاکەی تر.

## ئارگۆمێنتە ئاڵۆزەکان

بەداخەوە هەموو ئارگۆمێنتەکان بەڕوونی یان بەتەواوەتی ناخرێنە ڕوو. ئەمانەی خوارەوە هەندێک لە سەرەکیترین حاڵەتە نارەحەتەکانی ئەو ئارگۆمێنتانەن لەگەڵ ڕێبەرێک بۆ چۆنێتیی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

*کاتێک ئارگۆمێنتەکە درێژترە لە پەرەگرافێک:* ئارگۆمێنتەکە

کورت بکەرەوە پێش ئەوەی هەڵی بسەنگێنیت بە هۆی پرسیار و وەڵامەکانتەوە. ئەم کورتکردنەوەیە مەترسیی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە رەنگە هەندێک بەشی ئارگۆمێنتەکە لە بەرچاو نەگریت. بە هەرحاڵ، ئەگەر بەوریاییەوە کورتی بکەیتەوە، ئەتوانی بەسەر ئەم گرفتەدا زاڵ بیت.

*لە کاتێکدا دڵنیا نیت کام بەشی ئارگۆمێنتەکە بنچینە یان پێشمەرجە و کام بەشی دەرئەنجامە:* لە خۆت بپرسە، ئەو ئایدیایە کامەیە کە قسەکەر هەوڵ ئەدات تا پێی قایل بم (ئەو ئایدیایە بریتییە لە دەرئەنجام) دواتر لە خۆت بپرسە، ئەو هۆیانە کامانەن کە پشتگیری ئایدیاکە دەکەن (ئەو هۆیانە بریتین لە پێشمەرجەکان).

*کاتێک ئارگۆمێنتەکە زیاتر لە دوو پێشمەرجی تێدایە:* هەریەکەیان بەجیا هەڵبسەنگێنە {کە بریتییە لە پرسیارکردن و چێککردنیان}. پێویست بە ترس و شڵەژان ناکات، ئەگەر پێشمەرجەکان زۆر بوون، دانەبەدانەیان بەجیا چێک بکە {لە رێی پرسیارەکانتەوە یەک لەدوای یەک هەڵیان بسەنگێنە} پاش جیاکردنەوە و پشتگوێخستنی پێشمەرجە ناپەیوەندیدارەکان، دواتر بزانە دەرئەنجامەکە بە شێوەیەکی لۆجیکی داکەوتووە لەو پێشمەرجانەی کە ماونەتەوە. ئەگەر زیاد لە دەرئەنجامێک هەبوو، بزانە کە ئایا کامیان لە هەموویان مەعقولترە.

*کاتێک کە هەم ئەوانەی بەرگری لە بیرۆکەیەک دەکەن و هەم ئەوانەشی کە دژی دەوەستنەوە، ناتوانن ئارگۆمێنتێکی قایلکەرانە بخەنە روو(هەرچەندە رەنگە لە بنەرەتدا دانەیەکیان لەوی تریان باشتر بێت)* لەم حاڵەتەدا بە دوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا بگەرێ. هەندێک

جار ئـەم ئەڵتەرناتیڤی سـێیەمە تێکەڵەیەکە لـە هـەردوو ئەڵتەرناتیڤەکـەی پێشوو. نموونەیەکی باش بۆ ئـەم حاڵەتـە ئـەو دیبەیتە بەردەوامەیە کە دەربـارەی هەڵواسـینی دە ڕێنماییەکەیـە لـە پۆلـی قوتابخانـە بنەڕەتییـە گشـتییەکاندا {مەبەسـت لـەو دە ڕێسـای هەڵسـوکەوتکردنەیە کـە لـە بەشـی یەکەمـی بایبڵـدا نووسـراوە}. ئەمانـەی خـوارەوە هەندێـک لـەو دژەئارگۆمێنتانـەن {واتـە ئارگۆمێنـت بـۆ هەڵنەواسـینی دە ڕێنماییەکـە} کـە لـە گفتوگـۆ نایاسـاییەکاندا دەخرێنـە ڕوو*.

| ئارگۆمێنتە پۆزەتیڤەکان | ئارگۆمێنتە نێگەتیڤەکان |
|---|---|
| قوتابخانە گشتییەکان (وەکوو قوتابخانەکانی تر) پێویستە جەخت لەسەر بەها ئەخلاقییەکان بکاتەوە. | نابێت کولتوور یان ئایینی هیچ گروپێکی دیاریکراو، مامەڵەیەکی تایبەتی(پەسەندکراوی)لەگەڵدا بکرێت لە قوتابخانە گشتییەکاندا. |
| پیشاندانی دە ڕێنماییەکە هانی بەها ئەخلاقییەکان دەدات. | ئەو ڕێنماییانە لە قوتابخانە گشتییەکاندا فەزڵدانە بە مەسیحی و جوولەکەکان بەسەر ئایینەکانی تردا. |
| کەواتە قوتابخانە گشتییەکان دەبێت ئەو دە ڕێنماییە هەڵبواسێت. | کەواتە دە ڕێنماییەکە نابێت هەڵبواسرێت لە قوتابخانە گشتییەکاندا. |

*لێدوان:* ئەڵتەرناتیڤێـک {ئارگۆمێنتێـک} کـە لـە هەریـەک لەوانـی تـرەوە وەر گیـراوە بـەڵام دەچێتـە پشـت ئەوانیشـەوە {لـەوان قووڵتـر دەڕوات}، ئەوەیـە کـە ئارگۆمێنتـی ئـەوە بکەیـت کـە هەمـوو جـۆرە جیاوازەکانـی دە

* جگـە لەمـە، بەدڵنیاییـەوە ئارگۆمێنتی یاسـایی لەمـەڕ ئـەم بابەتـەوە سـاز دەکرێـت، کـە ئایا ببێتـە ماددەیەکی دەسـتووری یان نـا.

ڕێنماییەکە پیشان بدرێت (چونکە بایبل زیاد لە چاپێکی هەیە)، بە هەمان شێوەش ڕێنماییەکانی دینەکانی تریش لەگەڵ لیستێک لە ڕێنماییە ئەخلاقییەکانی عەلمانییەکان وەر بگیرێت. هۆکەشی دەتوانین بڵێین ئەوەیە کە دیدگە جیاوازەکان پێکەوە کۆ دەکاتەوە دوور لە هەر سووکایەتی یان پشتگوێخستنێک، هەروەها جەختیش لەسەر بەها ئەخلاقییە گرنگەکان دەکرێتەوە کە ئەمەش سوودبەخشە.

*کاتێک کە ئارگومێنتەکە پێشمەرجی شاراوەی تێدایە:* پێش درێژەدان بە هەڵسەنگاندنەکەت، ئەو پێشمەرجانە دیاری بکە. دیارە ئەو ئایدیایانەی کە پێشمەرجە شاراوەکان دەیخەنە ڕوو، نائاشکران و لە کاتی دەربڕینی ئارگومێنتەکەدا ناناسرێنەوە. ئەگەر هات و پێشمەرجە شاراوەکان ڕاست بوون، ئەوا مەترسیدار نین. بەڵام ئەگەر ناڕاست بوون، ئەوا سەرلەبەری ئارگومێنتەکە تێک دەدەن. ئەمانەی خوارەوە هەندێک نموونەی ئەو جۆرە ئارگومێنتانەن. یەکەم جار لە شێوەی گفتوگۆیەکی نارەسمیدا خراونەتە ڕوو. پاشان دابەش کراون بۆ بەشە پێکهێنەرەکانیان کە جەختکردنەوە شاراوەکانیش دەگرێتەوە. پاشان ئەو پرسیارانەی کە بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان دەشێ بیخەنە ڕوو، لەتەنیشت هەریەکەیانەوە خراوەتە ڕوو.

١_ *ئارگومێنت:* ئەوان قەت نەدەبوو هاوسەرگیرییان ئەنجام بدایە _ {چونکە} لە قۆناغی دەستگیرانداریدا جەستەیان لای یەکدی پەسەند نەبوو {بە جەستە یەکدییان کەمەندکێش نەکردبوو}.

| بەشە پێکهێنەرەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| بە جوانی جەستە، یەکدییان کەمەندکێش نەکردبوو. | ئایا بە جوانی جەستە، یەکدییان کەمەندکێش نەکردبوو؟ |

| | |
|---|---|
| پێشمەرجی شاراوە: جوانیی جەستەیی یان سەرنجڕاکێشانی جەستەیی، باشترین بگرە تەنها بنچینەی گرنگە بۆ هاوسەرگیری. | ئایا جوانیی جەستەیی یان سەرنجڕاکێشانی جەستەیی، باشترین بگرە تەنها بنچینەی گرنگە بۆ هاوسەرگیری؟ |
| دەرئەنجام: ئەوان نەدەبوو هەرگیز هاوسەرگیری ئەنجام بدەن. | ئایا پێشمەرجەکان تەنها سەر دەکێشن بۆ ئەم دەرئەنجامە؟ |

٢_ دیارە کە بۆچی مۆرتن ئەوەندە خراپە لە قوتابخانە_ {چونکە} ئەو هیچ بڕوای بە تواناکانی خۆی نییە.

| بەشەکانی ئارگومێنتەکە | پرسیارەکان |
|---|---|
| پێشمەرجی ئاشکرا: مۆرتن هیچ بڕوای بە تواناکانی خۆی نییە. | ئایا مۆرتن هیچ بڕوای بە تواناکانی خۆی نییە؟ |
| پێشمەرجی شاراوە: بڕوابوون بە تواناکانی خۆ، زۆر گرنگن بۆ سەرکەوتن. | ئایا بڕوابوون بە تواناکانی خۆ، زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتن؟ |
| دەرئەنجام: کەواتە ئاشکرایە کە بۆچی مۆرتن وا خراپە لە قوتابخانەدا. | ئایا پێشمەرجەکان تەنها سەر دەکێشن بۆ ئەم دەرئەنجامە؟ |

٣_ *ئارگومێنت*: ئەو کتێبە دەبێت قەدەغە بکرێت، چونکە هانی منداڵان دەدات بۆ توندوتیژی.

| پرسیارەکان | بەشەکانی ئارگومێنتەکە |
| --- | --- |
| ئایا کتێبەکە هانی منداڵان دەدات بۆ توندوتیژی؟ | پێشمەجی ئاشکرا: کتێبەکە هانی منداڵان دەدات بۆ توندوتیژی. |
| ئایا هاندان بۆ توندوتیژی هەمیشە زیانبەخشە؟ (تێبینیی ئەوە بکە، ئەگەر زاراوە سنووردارکەرەکان بەکار نەهات، بۆ نموونە، *هەندێک کات* ئەوا ئاماژە بۆ زاراوە گشتییەکان کراوە {بەنائاشکرا} بۆ نموونە، وەکوو *هەمیشە*). | یەکەم پێشمەرجی شاراوە: هاندان بۆ توندوتیژی، زیانبەخشە. |
| ئایا گونجاوترین ڕێگە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کتێبە، بریتییە لە قەدەغەکردنی؟ | دووەم پێشمەرجی شاراوە: گونجاوترین ڕێگە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کتێبە، قەدەغکردنیەتی. |
| ئایا پێشمەرجەکان تەنها سەر دەکێشن بۆ ئەم دەرئەنجامە؟ | دەرئەنجام: کتێبەکە دەبێت قەدەغە بکرێت. |

٤_ *ئارگومێنت*: خواردنەوەی ئاوی پاک لە ڕووی تەندروستییەوە باشە، ئاوی سازگاری شاخەکان پاکە، کەواتە خواردنەوەی ئاوی سازگاری شاخەکان بۆ جەستەی من باشترە وەک لە ئاوی موقەتەر.

| پرسیارەکان | بەشەکانی ئارگومێنتەکە |
| --- | --- |
| ئایا خواردنەوەی ئاوی پاک بۆ تەندروستی باشە؟ | پێشمەرجی ئاشکرا: خواردنەوەی ئاوی پاک بۆ تەندروستی باشە. |

| | |
|---|---|
| پێشمەرجی ئاشکرا: ئاوی سازگاری شاخەکان پاکە. | ئایا ئاوی سازگاری شاخەکان پاکە؟ |
| پێشمەرجی شاراوە: ئاوی موقەتەر پاک نییە. | ئایا ئاوی موقەتەر پاک نییە؟ |
| دەرئەنجام: من تەندروستیی خۆم باش ڕادەگرم بە خواردنەوەی ئاوی سازگاری شاخەکان، نەوەک بە ئاوی موقەتەر. | ئایا پێشمەرجەکان تەنها سەر دەکێشن بۆ ئەم دەرئەنجامە؟ |

ڕەنگە وا بزانرێت کە هەتا پارچەنووسینەکە درێژتر بێت، کەمتر پێشمەرجی شاراوەی تێدا دەبێت، بەلام لە ڕاستیدا وا نییە. مەحاڵ نییە کە کتێبێکی درێژ تەرخان بکرێت بۆ ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی پێشمەرجێک یان زیاتر، بەبێ ئەوەی بەئاشکرا ئاماژە بە خودی پێشمەرجەکان بدرێت. لە ڕاستیدا هەتا پارچەنووسینەکە درێژتر بێت، قورسترە ناسینەوەی ئەم پێشمەرجانە. درێژی ئەو نووسینەی کە هەڵی دەسەنگێنیت (یان کە دەینووسیت)، هەرچەندێک بێت، ئاگاداری ئەم پێشمەرجانە بە.

## ڕاهێنانەکان

١. بیر لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی بکەرەوە، کە میوانەکان ڕای جیاواز و ناکۆکیان لەسەر بابەتی گفتوگۆکە بووبێت. ئایا میوانانی بەرنامەکە ئارگۆمێنتیان ئاڵوگۆرکردووە یان ئەوەی کە وتراوە، تەنها دەمەبۆڵەیەک بووە؟ وەڵامەکانت ڕوون بکەرەوە.

٢. لەسەر هەریەک لەم پرسیارانەی خوارەوە لە فەزای گشتیدا دیبەیتی چڕوپڕ و جیدی لەم ساڵانەی دواییدا ئەنجام دراوە. یەکێک لەوانە هەڵبژێرە و لە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا بە دوای سەرچاوەیەکدا بگەڕێ، کە پشتگیریی لە لایەکی ئارگۆمێنتەکەی کردووە، جیاواز لەو سەرچاوە خەبەرییانەی کە تەنها فاکتیان خستۆتە ڕوو بێ هیچ لایەنگرییەک. پاشان ئارگۆمێنتەکە هەڵبسەنگێنە، بۆ ئەمەش، ئەوەی کە فێری بوویت، لەم چاپتەرەدا بەکاری بهێنە. (بۆ چۆنێتیی لێکۆڵینەوەکردن، سەیری چاپتەری حەڤدە بکە.)

a. ئایا لادەرە گەنجەکان دەبێت وەک لادەرە پێگەیشتووەکان لە یاسادا مامەڵەبکرێن؟

b. ئایا پێویست دەکات حکومەت/حکومەتی فیدراڵ یارمەتیی دارایی بدات بە دایک و باوکان تا سەرپشک بن لە ناردنی منداڵەکانیان بۆ

قوتابخانـەی تایبـەت یـان حکومـی بەپێـی ویسـتی خۆیـان؟

c. ئایـا نەخـۆش دەبێـت مافـی ئـەوەی هەبێـت، کـە داوای قەرەبـووی مـاددی لـەو لایەنـە بکاتـەوە، کـە بەرپرسـی تەندروسـتیی ئەمـن؟

d. ئایا پێش ئـەوەی دەسـەڵاتی یاسادانانی دەوڵـەت و حکومـەتی فیدراڵ بڕیـار لەسـەر زیادکردنـی بـاج بـدەن، پێویسـت دەکات ڕیفرانـدۆم ئەنجـام بدرێـت؟

e. ئایـا دەبێـت بەکارهێنانـی ماریوانـا {جـۆرە ڕۆکێکـی هۆشـبەرە} بـۆ مەبەسـتی پزیشـکی بەیاسـایی بکرێـت؟

f. ئایـا دەبێـت پۆلیـس مافـی دەستبەسـەرداگرتنی ئـەو ئۆتۆمۆبیلانـەی هەبێت، کـە گومـان دەکرێـت خاوەنەکانیـان ئالـوودە بـن لەسـەر مـاددە کحولییـەکان؟

g. ئایا وانـە - خوێندن لـە ماڵدا بـە ئەندازەی وانـە - خوێندن لـە پۆلـی قوتابخانەکاندا سوودبەخشـە؟

٣. پێـش چەنـد سـاڵێک لەمەوبـەر لـە کاتـی هەڵمەتـی بەدواداگەڕانـی بکوژێکـی ترسـناکدا بـە نـاوی "ڕەیلڕۆد کیلـەر،" FBI چاوپێکەتنـی لەگـەڵ ئـەو خەڵکانـەدا دەکرد، کە لـە شـوێنی ڕوودانـی تاوانەکاندا ئامـادە بوون، بـە هیـوای ئـەوەی کـە ڕەنگـە تاوانبارەکەیـان ببینێـت. لەئەنجامـدا FBI وێنـەی "پیاوێکـی ئیسـپانی" کێشـا، کـە گوایـە ئـەو پیاوکوژەکەیـە. لـە کۆنگرەیەکـی ڕۆژنامەوانیـدا ڕۆژنامەنووسـێک پرسـیارێکی ئاڕاسـتەی بەرپرسـی لێکۆڵینەوەکە دەکات، کە ئایا بـە هـۆی ئـەوەی کە گومانلێکراوەکە کەسێکی ئیسـپانییە، ئەمـە هیـچ تایبەتمەندییـەک دەدات بـە کێشـەکە؟ ئەگـەر تـۆ لـە جێـی بەرپرسـەکە بوویتایـە، چـۆن وەڵامـت دەدایـەوە؟ وەڵامەکـەت لـە شـێوەی ئارگۆمێنتـا بخـە ڕوو.

٤. بە بەکارهێنانی ئەوەی کە فێری بوویت لەم چاپتەرەوە، ئەم ئارگۆمێنتانەی خوارەوە هەڵبسەنگێنە.

a. بوجەی وەزارەتی بەرگریی ئەمەریکا دەبێت زۆر کەم بکرێتەوە، بگرە هەر نەشمێنێت، چونکە یەکێتیی سۆڤیەت چیدی بوونی نییە تا هەڕەشە بێت بۆ سەر ئاسایشی ئەمەریکا.

b. ئەو سیستەمە خۆشگوزەرانییەی کە ئێستا هەیە، هۆکارە بۆ ئەوەی خەڵکی ڕێزگرتن لە خود و بڕوابوون بە خود لەدەست بدەن self-respect and self confidence و پشت ببەستن بە حکومەت. بۆیە دەبێت سەرلەبەری سیستەمەکە بگۆڕدرێت بە سیستەمێک، کە جەخت بکاتەوە لەسەر بەرپرسیاریتی و جیدیبوون لە ئیشکردندا.

c. چالاکیی وەرزشی لە گۆڕەپانی قوتابخانەکاندا وا لەو قوتابییانە دەکات، کە توانای وەرزشییان نییە، هەست بە شەرم و سووکایەتیپێکردن بکەن. هەر بۆیە دەبێت ڕێ بگیرێت لەو چالاکییە، هەروەها پەروەردەی جەستەیی نەخوێنرێت لە پۆلدا.

d. *تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: کاربەدەستانی کۆلێژێک سەرقاڵی دیبەیتکردنن لەسەر ڕێسای کۆلێژەکەیان پاش ئەوەی لەسەر هەبوونی پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان پرۆفیسۆر و قوتابییەکان چەندان گلەیی و گازندەیان بەدەست دەگات. ئەوانیش لە وەڵامدا ئەم ئارگۆمێنتە سەرڕێکە دەخەن:*

هیچ هەڵەیەک لە هەبوونی پەیوەندیی نێوان دوو کەسی کامڵی پێگەیشتوودا نییە، هەر بۆیە پەیوەندیی نێوان پرۆفیسۆرەکان و قوتابییەکان ڕێپێدراوە، چونکە هەردوولا لە سەروو تەمەنی هەژدە ساڵییەوەن.

e. کۆپیکردنی بەرنامە کۆمپیوتەرییەکان بەپێی یاسا قەدەغەیە. من بەرنامەیەکم کڕیوە، بەڵام هاوڕێکەم لەگەڵ ئەوەدا کە زۆریش پێویستی پێیەتی، بەڵام ناتوانێت بیکڕێت. ئەگەر من کۆپییەکی خۆمی بدەمێ، هەم

یارمەتیدانی ئەوە، هەم کەسیش زیانی پێ ناگات. (ئەگەر هاورێکەم داوای کۆپییەکی لە کۆمپانییەکەش بکردبایە، بەدڵنیاییەوە ڕەفزیان دەکرد، چونکە ئەو پارەی نییە تا بیکڕێت). هەر بۆیە بڕیارێکی دادپەروەرانەیە، ئەگەر من کۆپییەکی ئەوەی خۆمی بدەمێ.

f. لە خاڵێکی بەیاننامەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆی ئەمەریکادا هاتووە، کە "هەموو مرۆڤەکان یەکسانن." کەچی هێشتا زۆر لە هاووڵاتییە ئەمەریکییەکان قوربانیی هەژاری و جیاکاری و نەبوونی چانسی خوێندن و هەلی کارن. بەڵام لە هەمان کاتدا، دەوڵەمەند و نوخبە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاستێکدا دەژین، کە بۆ زۆرینەی هاووڵاتییەکان مەحاڵە. کەواتە یەکسانی هیچ نییە جگە لە ئەفسانە.

g. *تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: ئایینی سانتێریا Santeria، کە ئایینێکی کۆنە، تا ئێستاش ژمارەیەکە لە شوێنکەوتووی هەیە لە ئەمەریکا. یەکێک لە باوەڕەکانی ئەم ئایینە بریتییە لە قوربانیکردنی ئاژەڵان بۆ ڕازیکردنی خوا ئۆلیودیومەر Olodumare. هەر بۆیە پیاوە ئایینییەکان وەک بەشێک لە نەریتی دینیی خۆیان هەڵدەستن بە هەڵدڕینی گەرووی مریشک و کۆتر و کیسەڵ و بزن؛ پاشان خوێنەکەی دەکەنە مەنجەڵی قورەوە و گۆشتەکەشی ئامادە دەکەن بۆ خواردن. زۆر کەس گلەیی لە بەرپرسەکان دەکەن، کە بۆچی بەرامبەر ئەم کێشەیە بێهەڵوێستن، بەڵام ئەوانەی کە پشتگیریان لێ دەکەن، بەم شێوەیە وەڵام دەدەنەوە:*

دەستووری ئەمەریکا ڕێگەی بە ئازادیی ئایینی داوە. بۆیە هەر ئایینێک با زۆرینەی خەڵکیش دژی بن، بەڵام بە پێی دەستوور، بوونی زەمان کراوە. هەرچەندە نەریتی کوشتنی ئاژەڵان بۆ زۆر هاووڵاتیی ئەمەریکی شتێکی قێزەونە، بەڵام یاسا دەبێت بەرگریکار بێت لە مافە دەستوورییەکانی شوێنکەوتوانی ئەم ئایینە.

*h. تێبینییەک لەسەر باککراوەندی کێشەکە: لەم ساڵانی دواییدا سواڵکردنی توندوتیژانە لە زۆربەی شارەکاندا لە زۆربووندایە. زۆر لە سواڵکەرەکان دەچنە سەر رێی پیادەڕەوەکان و هەڕەشەیان لێ دەکەن. لە ژمارەیەک لە شارەکاندا ئەم جۆرە سواڵکردنە قەدەغە کراوە بەپێی یاسا. لەگەڵ ئەوەشدا، لە دادگاکاندا ئەم جۆرە ئارگومێنتانەش بیستراون:* سواڵکردن جۆرێکە لە را دەربڕین. رادەربڕین بەپێی دەستوور رێپێدراوە. کەواتە سواڵکردن مافێکە و نابێت پێشێل بکرێت.

## رای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پوختە و کۆکراوەی رای جیاوازە لەسەر چۆنێتیی کۆتاییهێنان بە توندوتیژی لە قوتابخانەکاندا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی رای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی راستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، روونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان برێک لە مەعقولییەتی تێدایە کە *لە زۆربەری حاڵەتەکانیشدا هەر وا دەبێت،* ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، روونیشی بکەرەوە کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە روو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

*کۆتاییپێهێنان بە توندوتیژی لە قوتابخانەکاندا:* ئەو توندوتیژییانەی لە قوتابخانەکاندا ڕوو دەدات و لە ڕێی میدیاوە بڵاو دەبێتەوە، بۆتە هۆی هێنانەکایەی زنجیرەیەکی دوردرێژ و گەرموگوڕ لە دیبەت لەسەر هۆکار و چارەسەرکردنی کێشەکە. هەندێک، لاوازیی پەروەردەی خێزان بە هۆکار دەزانن و هەندێکی تر کاربەدەستانی قوتابخانە. چونکە لادەرەکان وەک پێویست سزا نادەن تا ببنە نموونە بۆ ئەوانی تر، هەندێکی تریش میدیا بە بەرپرس دەزانن چونکە میدیا هەڵدەستێت بە کولتووریکردنی توندوتیژی. وەک هۆکارەکان، چارەسەرەکانیش دابەش دەکرێن بۆ کۆمەڵێک ئاست. هەر لە سنوردارکردنی ئەوەی کە کێ مافی خاوەندارێتیی چەکی هەبێت، هەتا دانانی ئامێری چەک-کەشفکەر لە دەروازەی قوتابخانەکان و زیادکردنی کۆرسەکان لەسەر هونەری چارەسەرکردنی ململانێکان و حوکمە ئەخلاقییەکان، تا دەگاتە ئەنجامدانی قسە ئایینییەکان لە پۆلدا.

## بەشی دووەم

## تەڵە شاراوەکان The pitfalls

لە حەوت چاپتەری یەکەمدا ئەو سیاقە و کۆنتێکستە خرایە ڕوو، کە بیرکردنەوە تێیدا ڕوو دەدات. ئێستا تۆ دەزانیت کە تاکگەرایەتی individuality {یان بوون بە تاک} شتێک نییە خۆبەخۆ ڕوو بدات، بەڵکوو دەبێت جار دوای جار بەدەست بهێنرێتەوە، بیرکردنەوەی ڕەخنەیی وەک چۆن بەسەر ئایدیای ئەوانی تردا جێبەجێ دەکرێت، ئاواش بەسەر ئایدیاکانی خۆشتدا جێبەجێ دەبێت؛ حەقیقەت دەدۆزرێتەوە، وەک لەوەی دروست بکرێت. بەدەستهێنانی مەعریفەی قوڵ گەلێک زەحمەتە و گرانە. ڕاکان تا ئەو کاتە باشن، کە بە بەڵگەی باش پشتڕاست کرابێتنەوە، ئارگۆمێنتکردن بریتی نییە "لە تۆمارکردنی خاڵ" یان قیژاندن بەسەر ئەوانی تردا، بەڵکوو بریتییە لە بەدەستخستن و بیرکردنەوەیەکی لۆجیکییانە دەربارەی زانیارییە ورد و بەدیقەتەکان.

لەم بەشەدا ئەو هەڵە جۆربەجۆرانە بەسەر دەکەینەوە، کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم بیرکردنەوەدا. هەروەها ئەو ڕێگەیانەش بەسەر دەکەینەوە، کە چۆن بتوانیت بە باشترین شێوە لە نووسین و قسەکانی ئەوانی تردا بیاندۆزیتەوە، لەوێشەوە تۆ دوور بکەویتەوە لە دووبارەکردنەوەیان. سەرەکیترین هەڵە بریتییە لە هەستی خۆبەهەقزانین "هی من باشترە،"

ئەم هەستە قووڵە لە سروشتی مرۆڤبوونماندایە و ڕێگەخۆشکەرە بۆ دەیان هەڵەی تر. هەڵەکانی تریش بەگوێرەی کاتی ڕوودانیان پۆلێن کراون: *هەڵە لە دیدەکاندا* errors of perspective هەموو ئەو هەڵانە دەگرێتەوە، کە لە دیدماندایە دەربارەی واقیع realityکە کەم تا زۆر بە شێوەیەکی بەردەوام لەگەڵماندان. *هەڵەکانی پرۆسیجەر*، ئەمانە کاتێک ڕوو دەدەن، کە سەرقاڵی بینەوبەردەی هەندێک کێشەی دیاریکراوین، *هەڵەکانی گوزارشتکردن*، لە کاتی گوزارشتکردن لە بیرکردنەوەکانمان ڕوو دەدەن و *هەڵەکانی کاردانەوە*، ئەمانە کاتێک ڕوو دەدەن، کە کەسێک ڕەخنەمان دەکات یان بەرەنگاری ڕا و ئارگۆمێنتەکانمان دەبێتەوە. چاپتەری کۆتایی ئەم بەشەش تەرخان کراوە بۆ پیشاندانی ئەوەی کە چۆن دەشێت ئەم هەڵانە هەموو پێکەوە ڕوو بدەن.

# چاپتەری هەشتەم

## سەرەکیترین لەمپەر لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا:

## "هی من باشترە" Mine is better

سەرمان پڕ کراوە لە قەناعەتەکانمان، چۆنی و بۆچی ئەمە شتێکە کە کەمترین هۆشیاریمان دەربارەی هەیە. بەڵام دەبێت فێر بین پرسیار لەمەڕ ئەقڵانیبوونی بیروبۆچوونەکانمان قوت بکەینەوە... هەر ئەوەندەی قەناعەتمان دەربارەی شتێک بۆ دروست بوو، ئیدی با ئەو شتە نەخوازراو و قبوڵنەکراویش بێت، ئەوا بە تاسە و گەرموگوڕییەکی سەیرەوە سەرسەختانە بەرگریی لێ دەکەین. پرسیاری ئەوەی کە تا چەند ئایدیاکانمان مەعقولن، لە ڕاستیدا بە کێشەی خۆمانی نازانین. ئێمە نامانەوێت لەو شتەوە فێر بین، کە لێی دەترسین.

ئەو چەند دێڕەی سەرەوە کاتێک نووسراوە، کە پاش لێکۆڵینەوە، نووسەرەکە بۆی دەر کەوتووە کە زۆرینەی خەڵکی مەیلی قبوڵکردن و کڕکەوتن دەکەن لەسەر بڕواکانینان، نەوەک پێداچوونەوە و گەشەپێدانیان. بەڵام ئەم مەیلە بەهێزە جێی سەرسوورمانە، چونکە خەڵکی بەئاشکرا دەڵێن کە پێویستیان بە گەورەبوون و گەشەکردنە و ملیۆنان دۆلار لە کڕینی ئەو کتێب و نامیلکە و سیمینارانەدا خەرج دەکرێن، کە دەربارەی

پشتبەخۆبەستنن self-help؛ بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خەڵکی بە شێوەیەک کردار دەنوێنن، وەک ئەوەی کە ئەقڵیان پێویستی بە هیچ گەشەکردنێک نەبێت.

هۆی ئەم مەیلە بریتییە لە دیدی "هی من باشترە،" کە هەمووانیش خاوەنین، بەڵام بە پلەی جیاواز. زۆر سروشتییە کە شتەکانی {هەرشتێک کە خاوەنداری دەکەین} خۆمان بە باشتر بزانین لە هی ئەوانی تر*. چونکە شتەکانمان وەک درێژکراوەی خودی خۆمان دەبینین. کاتێک قوتابییانی یەکی بنەڕەتی بە یەکتری دەڵێن، "باوکی من لە باوکی تۆ گەورەترە،" یان "پێڵاوەکانی من تازەترن" یان "دەباشیرەکانی من باشترن،" ئەوا ئەوان تەنها باسی باوکیان یان پێڵاو و تەباشیرەکانینان ناکەن، بەڵکوو ئەوان شتێک لەسەر خودی خۆیان دەڵێن: "هێی، سەیری من بکە. ئەها من شتێکی جیاوازم".

دوای چەند ساڵێک، هەر هەمان ئەو منداڵانە دەڵێن: "ئۆتومۆبیلەکەی من لەوەی تۆ خێراترە" یان "تیپی دۆگۆڵییەکەی ئێمە ئەمساڵ یەکەم دەبێت" یان "نمرەکانم بەرزترن لە هی تۆ" (یەکێک لەو شتانەی کە قوتابی شانازیی پێوە دەکات ئەمەیە، چونکە ئەگەر نمرەشی نزم بێت، ئەوا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا قوتابییەک هەر هەیە کە نمرەکەی لەم نزمتربێت).

تەنانەت لە دواییشدا، دوای ئەوەی کە زانییان کە ئەگەر بە هەموو شتێکی خۆت *بڵێیت* باشترە، ئەوا خۆبەزلزانینە، کەچی هەر لەسەر

---

* حاڵەتێک کە ناکەوێتە ژێر ئەم قاعیدەیەوە، برتییە لە *ئیرەییبردن* بەوانی تر. بەڵام ئەمە حاڵەتێکی تایبەتە و دژی قاعیدەکە ناوەستێتەوە.

بیرکردنەوەکەی خۆیان بەردەوام دەبن: "خانووەکەم گرانترە، یانەکەم زۆر تایبەتە، هاوسەرەکەم زۆر سەرنجڕاکێشترە، منداڵەکانم زۆر ئاقڵترن، سەرکەوتنەکانم زۆر زیاترن، ئایدیاکانم، بڕواکانم و بەهاکانم هەموو تیژبینتر و قووڵتر و ماناداراترن لەوانەی خەڵکی."

هەموو ئەوانەی تا ئێستا ئاماژەمان پێ داون، سروشتین لەگەڵ ئەوەشدا کە نە خانەدانانەن، نە لە ڕووی ئەخلاقیشەوە بەرزن. بگرە لە زۆر حاڵەتیشدا تەنانەت هەر واقیعیش نین. بەڵام سروشتین. ئەم مەیلە ڕەنگە بەقەدەر خودی مێژووی مرۆڤایەتی کۆن بێت. مێژوو بێشومار نموونەی بۆ تۆمار کردووین. بۆ نموونە، هۆکاری زۆربەی جەنگەکان دەتوانرێت بگەڕێنرێنەوە بۆ جۆرێک لە بیرکردنەوەی "هی من باشترە." ساتیرنووسەکان Satirists لەسەر ئەم بابەتەیان نووسیوە. بۆ نموونە، ئەمبرۆس بێرس، کتێبەکەیدا Devils Dictionary، ئاماژەی بە تێرمی *کافر infidel* داوە. لە ڕووی تەکنیکییەوە وشەکە واتە "کەسێک کە بەپێی هەندێک ئایین بە بێباوەڕ دادەنرێت." بەڵام پێناسەکەی بێرس دیدە شاراوەکەی ئەو کەسانە دەخاتە ڕوو، کە تێرمەکە بەکار دەهێنن. ئەو بەم شێوەیە تێرمەکە پێناسە دەکات: "لە نیو یۆرک کەسێک دەگرێتەوە کە بڕوای بە مەسیحیەت نەبێ؛ بەڵام کۆنستانتینۆپڵ کەسێکە دەگرێتەوە، کە بڕوای بە مەسیحیەت بێت."

لە دەرئەنجامەکانی ڕاپرسییەکدا کە لەناو یەک ملیۆن قوتابیی قۆناغی شەشی ئامادەییدا بەئەنجام گەیەنراوە، بەڕوونی کاریگەرییەکانی بیرکردنەوەی "هی من باشتەرە" خراونەتە ڕوو. ڕاپرسییەکە لەسەر ئەوە بوو، کە ئایا قوتابییەکان خۆیان بە شتێک دەزانن کە " لە سەرووی تێکڕاوە" بێت {واتە خۆیان بە باشتر لە زۆرینە بدەنە قەڵەم}. لە ٧٠٪ی بەشداربووان لە توانای ڕابەریکردندا خۆیان لە سەرووی تێکڕاوە داوەتە

قەڵەم و ٢٪ لەو بڕوایەدا بوون، کە لە خوار تێکڕاوەن. هەروەها، لە ١٠٠٪ لە توانای خۆگونجاندندا لەگەڵ خەڵکیدا خۆیان لە سەرووی تێکڕاوە داناوە، ٦٠٪ خۆیان بە باشترین دە کەس داوەتە قەڵەم و *لە ٢٥٪ خۆیان لە لووتکەدا، واتە ژمارە یەکدا داوەتە قەڵەم*. (ڕەنگە ئەم دیدە هەڵئاوساوە{خۆبەزلزانینە}، بە شێوەیەک لە شێوەکان هۆکار بێت بۆ تێگەیشتن لەو قوتابییانەی کە لەکاتی وەرگرتنی نمرەی کەمدا یەکسەر مامۆستاکەیان تۆمەتبار دەکەن).

زۆر کەس لە زۆربەی کاتەکاندا، پاساوی مەیلی "هی من باشترە" دەهێننەوە، بەوەی کە کەسانی تریش هەر هەمان هەستیان هەیە بۆ کەلوپەل و شتومەکەکانیان، کەواتە ئەمە سیفەتێکی دانەبڕاوە لە سروشتی مرۆڤبوونمان. بە مانایەکی تر، زۆربەی خەڵکی درکیان بەوە کردووە، کە ئێمە هەموو بە شێوەکی تایبەت خۆمان دەبینین، جیاواز لەو کەسەی کە لە ڕاستیدا هەین و کاتێک لەگەڵ هەرشتێکیشدا پەیوەست دەبین، ئیتر دەیکەینە بەشێک لە خۆمان. ئەوانەی کە دەزانن وەها تێگەیشتنێک هەیە و بڕواشیان بە خۆیانە، تا ڕادەیەکی زۆر باش دەتوانن ئەم مەیلە کۆنترۆڵ بکەن. گرفتەکە ئەوەیە، کە زۆر کەس نازانن کە هەرکەسە و ڕوانینێکی تایبەتیی لەسەر خۆی هەیە. بۆ ئەوان مەیلی "هی من باشترە" شتێک نییە کە هەموو کەس بۆ شتەکانی خۆیان هەیانبێت. بەڵکوو وای دەبینن کە ئەمە بریتی بێت لە حەقیقەتێکی تایبەت و بەرزتر دەربارەی بارودۆخە تایبەتەکەی خۆیان دەروونناسەکان ئەم جۆرە مرۆڤانە دەخنە ژێر پۆلی مرۆڤە خۆپەرست egocentric و گرووپپەرستەکانەوە ethnocentric.

## کەسانی خۆپەرست Egocentric people

خۆپەرستی *Egocentric* واتە خۆکردنەسەنتەر یان سەرنجخستنەسەرخود و کەسی خۆپەرست تەنها بایەخ بە بەرژەوەندی و پێداویستی و گۆشەنیگاکانی خودی خۆی دەدات. شێوازی قسەکردنی کەسانی خۆ پەرست بریتییە لە زمانی من ego-speak، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لەلایەن Edmond Addeo و Robert Burger بەکار هێنرا لە کتێبەکەیاندا کە هەمان ناوی هەیە. ئەوان ئاوا تەفسیری زمانی من دەکەن، "بریتییە لە هونەری خۆزلکردن لە ڕێی قسەکردن تەنها دەربارەی ئەو شتانەی کە دەمانەوێت قسەیان لەسەر بکەین. هیچ گرنگییەکیش نەدەیەن بەو بابەتانەی کە کەسانی تر دەیانەوێت قسەی لەسەر بکەن٤." پرسیارێک کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ بابەتەکەمان، بریتییە لەوەی کە چ شتێک پێش خودسەنتەری دەکەوێت و هێزی پێ دەدات. وەڵامی ئەم پرسیارە بریتییە لە خووی ئەقڵی کەسانی خۆپەرست. بە سوودوەرگرتن لە Edmond Addeo و Robert Burger دەتوانین ناو لەم خووە بنێین *بیرکردنەوە لە خود ego-think*.

بە هۆی خوی بیرکردنەوە لە خودەوە، کەسانی خۆپەرست، بەری گۆشەنیگایان زۆر تەسکە و ناتوانن کێشەکان لە چەند ڕەهەندێکەوە ببینن. جیهان لای ئەوان پێناسە دەکرێت لە ڕێی بیروباوەڕ و بەهاکانی ئەوانەوە: هەرشتێک کە ئەوان قەڵس بکات، کەواتە دەبێت هەموو کەس قەڵس بکات؛ هەرشتێک دەرئەنجامێکی بۆ ئەوان نەبوو، ئەوا دەبێتە شتێکی بێنرخ. ئەم هەڵوێستە وا دەکات کەسانی خۆپەرست نە بتوانن ورد ببنەوە، نە گوێ بگرن، نە تێشبگەن. چ پێویست دەکات کەسێک خۆی ماندوو بکات بەوەی کە مامۆستا و نووسەری کتێبەکانی خوێندن دەیڵێن

و دەینووسن، لە کاتێکدا شتی بەهاداریان نییە بۆ وتن؟ لە کاتێکدا کەسێک هەموو ئەو شتانە بزانێت کە شیاوی زانین بێت، ئیدی چ پاڵنەرێکی هەیە بۆ فێربوون؟ چ پێویست دەکات کەسێک سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی کێشە ئاڵۆزە تاقەتپڕوکێنەکان بێت، یان لێدوانی شارەزایان، یان هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان لە کاتێکدا ڕاکانی بڕیاری کۆتایی بدەن و بێخەوش و ڕاست و دروست بن؟ لە ڕاستیدا زۆر قورسە بۆ کەسێکی خۆپەرست کە ببێتە لێهاتوویەکی بواری بیرکردنەوەی ڕەخنەیی.

خۆپەرستێتی چارەسەرکردنی کێشەکان زۆر قورستر دەکات. بۆ نموونە، دەبێت چی بکرێت دەربارەی ماددەیەکی وانەوتنەوە کە دەربارەی بابەتێکی هەستیاری وەک ڕەگەزپەرستییە، ماددەکەش ڕۆمانێکی نووسەر Mark Twain بە ناوی *موغامەرەکانی هەکلبێری فنلەندی*. بەلام با سەرەتا سەیری ئەم فاکتانە بکەین لەسەر کتێبەکە: (a) وەک بەرهەمێکی کلاسیک سەیر دەکرێت. (b) کتێبەکە پۆستەتڤە. بەو مانایەی بە شێوەکی خراپ باس لە ئەغریقییە ئەمریکییەکان ناکات. (وەک چۆن بە شێوەکی خراپ باسی هیچ گروپێکی نەژادی تریش ناکات) (c) کاراکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکە وشەی نەخوازراوی وەک "قولەڕەش" nigger بەکار دەهێنن، ئەم وشەیەش *بەئاشکرا* خوێندکارە ئەغریقییە ئەمەریکییەکان بێزار دەکات. بگرە ئازارشیان دەدات. فاکتی (d) سەرەکیترین فاکتە، چونکە ئەوەی کە وای کردووە وتنەوەی ڕۆمانەکە ببێتە کێشە، ئەم فاکتەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، کێشەکە ناتوانرێت بە شێوەکی باش چارەسەر بکرێت هەتاوەکوو *هەموو* فاکتەکان لەبەرچاو نەگیرێن.

بەلام کەسانی خۆپەرست، تەنها هەندێک لە فاکتەکان دەبینین. بۆ نموونە، ئەوان تەنها فاکتی a و b دەبینن و دەڵێن "جا ئەمە کەی

کێشـەیە. ئێمـە تەنهـا مامەڵـە لەگـەڵ وشـەکاندا دەکەیـن لێرەدا. ئەفەریقییـە ئەمەرکییـەکان زیادەڕۆیی دەکەن." (ئـەم وەڵامـە کۆمێنتێکم بیر دەخاتـەوە، کە جارێکیان کەسێک لەسـەر ڕاهێنەرێک هەیبوو: ئەو توانایەکی گـەورەی هەیـە لـە چاوپۆشـیکردنی *ئازارەکانـی ئەوانـی تـر*). بـە دیـوی ئەودیویشـدا، ئەفەریقییـە ئەمەریکییـەکان تەنهـا فاکتـی c و d دەبینـن و هــەر لێرەشـەوە دەگەنـە ئـەو دەرئەنجامـەی: مـادام "وشـەی قولـەڕەش" بریندارییـان دەکات، کەواتـە تەنهـا چارەسـەری قبوڵکـراو ئەوەیـە، کتێبەکـە قەدەغـە بکرێـت بـۆ هەمـوو قوتابییـان.

## گرووپپەرستەکان Ethnocentric People

*گرووپپەرستی* واتـە *لەڕادەبـەدەر* گرنگیدان یان پەیوەستبوون بە گرووپێکەوە. وشـەی "لەڕادەبـەدر" گرنگە بۆ تێگەیشتن لـە بابەتەکەمـان. ئێمـە دەتوانین هەسـت بـە هاووشوناسـیی خۆمـان بکەیـن لەگـەڵ هاونەژاد-ڕەگـەزەکان، یـان هاوئایینـەکان، یـان هاوکولتوورەکانـدا، بەبـێ ئـەوەی ببینـە کەسـێکی گرووپپەرسـت. هەروەهـا ئێمـە دەتوانیـن هاوەڵـی ئـەو کەسانەمان پـێ خۆشـتر بێت، کە هاوکولتـوور و هاودیدمانـن بەبێ ئـەوەی بگاتـە ئـەو ئاسـتەی کـە چیدی لەگەڵ ئەوانی تردا نەتوانین هەڵبکەین. هەستکردن بە ئاسوودەگییەکی زیاتـر لەگـەڵ ئـەو شـتانە، کەسـانەدا، کـە پێیـان ئاشـناین وەک لەوانـەی کـە پێیـان ئاشـنا نیـن، سروشـتییە، هـەر بۆیـە خۆخەڵەتاندنـە ئەگـەر پێمـان وا بێت پێچەوانەکـەی ڕاسـتە. کەواتـە، ئـەوەی کـە کۆرییـە ئەمەریکییـەکان تـا ڕادەیەکی زۆر حـەز دەکـەن لـە پەیوەندیدا بـن لەگـەڵ یەکدیدا، یـان ئـەوەی کـە نادیـی ئەمەریکییـە پۆڵۆندییـەکان ڕێ لـە بانگهێشـتکردنی ئیتاڵییـەکان، فنلەندییەکان، یـان ئەفەریقییـە ئەمەریکییـەکان ناگـرن، ناکرێـت هەمـوو ئەوانـە وەک ئاماژەیەکـی گرووپپەرسـتی بێنـە ئەژمـاردن.

ئەوەی کە گروپپەرستەکان جیا دەکاتەوە لەگەڵ ئەوانەی کە بە شێوەیەکی ئاسایی هەست بە هاوشووناسبوون دەکەن لەگەڵ گروپەکەی خۆیاندا، بریتیین لە (a) لەو بڕوایەدان کە گروپەکەیان هەر تەنها جیاواز نییە و بەس، بەڵکوو بە شێوەیەکی ڕادیکالانە و بەتەواوەتی سەردەستە بەسەر ئەوانی ترەوە (b) و گومان لە پاڵنەر و نیازەکانی هەموو گروپەکانی تر دەکەن. ئەم بڕوایانە ڕێگرن لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەدا. گروپپەرستەکان ئامادەن ڕووبەڕووی گۆشەنیگاکانی گروپەکانی تر ببنەوە، بەڵام هیچ ئارەزوویەکیان نییە بۆ پرسیارکردن لە دیدەکانی گروپەکەی خۆیان. دەرئەنجام، بە شێوەیەکی زۆر سادە وەڵامی کێشە ئاڵۆزەکان ئەدەنەوە. لە مامەڵکردن لەگەڵ کێشەکاندا، هەڵوێستێکی باباتی ناگرنە بەر، چونکە لای ئەوان یەک ڕێگە هەیە بۆ هەموو شەتەکان، *ئەو ڕێگەیەی کە لەگەڵ گروپەکەیاندا کۆکە*. هەروەها نموونەی خراپ لەسەر گروپەکانی تر هەڵدەبەستن و بڵاوی دەکەنەوە، دەروونناس Gordn Allport پێش چەندەها ساڵ لەمەوبەر، ئەم حاڵەتەی ڕوون کردۆتەوە:

ژیان زۆر سادە دەکەیەنەوە ئەو کاتەی بەشێکی زۆری مرۆڤایەتی دەخەیەنە پۆلێکی نەخوازراوەوە. بۆ نموونە، ئەگەر من هەموو بیانییەکان بخەمە ژێر یەک پۆلێنەوە، کەواتە ئیتر پێویست ناکات سەری خۆمیان پێوە بئێشێنم _ تەنها ئەوە نەبێت، بیانخەمە دەرەوەی ئاگایی خۆم. ئەگەر بمتوانیایە هەموو قولەڕەشەکانم وەک گروپێکی ژێردەست و نەخوازراو پۆلین بکردایە، ئەوا بەئاسانی خۆم لە دە هاوڕێم دوور دەخستەوە. ئەگەر بتوانم کاسۆلیک مەزهەبەکان بخەمە گروپێکی ترەوە و ڕەتم بکردنایەتەوە، ئەوا ژیانم ئاسانتر و خۆشتر دەبوو. پاشان خۆشم لە جوولەکەکان ڕزگار دەکرد و ئیتر ئاوا بەردەوام دەبوم.

کینە و بوخزی گروپپەرستەکان ئەرکێکی تریشی هەیە، ئەویش

بریتییە لە لۆمەکردنی گروپەکانی تر وەک بوون بە هۆکاری گرفتە واقیعی و ناواقیعیەکانی کۆمەڵگە. بۆنموونە هەر کێشەیەک لەمانە : تاوانەکانی سەر شەقامەکان، مامەڵەکردن بە ماددە هۆشبەرەکانەوە، گەندەڵی لە حکومەتدا، تیرۆرکردنی سیاسی، خۆپیشاندانی کرێکاران، پرۆنۆگرافی، بەرزبوونەوەی نرخی خواردن، بۆ هەموو ئەمانە بەردەوام تاوانبارێکی حازربەدەست هەیە تا پەنجەی بەرپرسیارێتیی بۆ ڕاکێشن: جوولەکەکان بەرپرسیارن یان ئیتاڵییەکان، یان ئەفەریقییە ئەمەریکییەکان، یان ئیسپانییەکان. گروپەرستەکان زۆر بەخێرایی دەستنیشانی هۆکاری کێشەکان دەکەن _ ئەمە بەقەدەر گەیاندنی دوو خاڵ بە هێڵێک بۆ ئەوان ئاسانە. ئەوان بەشێکی زۆر خەڵکیان لە بەردەستایە، تا تاوانباریان بکەن بە بوون بە هۆکاری تووڕەبوون و ترسەکانیان و کەموکووڕی و بێزارییەکانیان.

## کۆنترۆڵکردنی بیرکردنەوەی "هی من باشترە"

ئاشکرایە بیرکردنەوەی پەڕگیری "هی من باشترە" چی بەسەر حوکمدانەکانی خۆپەرست و گروپپەرستەکاندا دەهێنێت. بە شێوەیەک، خواروخێچیان دەکات، کە زۆر جار بواری ڕاستکردنەوەی تێدا نامێنێت. کاریگەریی بیرکردنەوەی "هی من باشترە" لەسەر هەریەکە لە ئێمە کەمترە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە هیچ کاریگەرییەکی نییە.

ئەو ئەفزەڵیەتەی کە دەیدەین بە بیرکردنەوەکانی خۆمان، وا دەکات نەتوانین کەموکوورییەکانی ناوی ببینین، هەروەها ڕێگرێکیشە لەوەی بە سوودوەرکرتن لە تێگەیشتنەکانی ئەوانی تر تێگەیشتنەکانی خۆمان بەرفروان بکەین. بۆ نموونە، شانازیکردنمان بە ئایینەکەی خۆمانەوە، ڕەنگە وا بکات هەر زوو زەربێک بەسەر بڕوا و کردەوەکانی ئەوانی تردا

ببێنین و هەڵەکانی ناو مێژووی ئاینەکەی خۆمان نەبینین. ئەفزەڵیەتدان بەو پارتە سیاسییەی کە پشتگیریی لێ دەکەین، ڕەنگە وا بکات دەنگ بدەین بەو کاندید و بەرنامانەی کە باشترین نین. دڵسۆزیمان بۆ ڕاکانی خۆمان دەتوانێت دامان ببڕێت لە دیدەکانی تر، لە بەرامبەر حەقیقەتە نوێکاندا کوێرمان بکات و بمانکاتە کۆیلەی دەرئەنجامەکانی ڕابردوو.

جگە لەمانەش، ئامادەگیمان بۆ قبوڵکردنی ئەوانەی کە بیرکردنەوە سادەکانمان قبوڵ دەکەن، بە شێوەیەکی نارەخنەیی، دەمانخاتە بەردەم ئەو ئەگەرەی کە ئەوان بۆ مەبەستی شەخسیی خۆیان بەکارمان بهێنن. مێژوونووسەکان بەوردی پێمان دەڵێن کە چۆن هیتلەر سەرکەوتووانە توانیی ئەڵمانیا کۆنترۆڵ بکات و بەشێکی باشیش لە جیهان وێران و تەخت بکات.

بیرکردنەوەی "هی من باشترە" گەورەترین گرفتی بەردەم بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکانە، چونکە وا دەکات شتەکان بێ تاقیکردنەوە بمێننەوە و دیدەکان بشێوێنرێن و بڕیاردان و حوکمەکان گەندەڵ بن. هەتا بەلای خودێتی subjectivity مەیلان بین، ئەو زیاتر لە بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە دوور دەکەوینەوە. هەرچەندە ڕەنگە بابەتیبوون بە شێوەیەکی تەواو مەحاڵ بێت، بەلام بە کۆنترۆڵکردنی مەیلی "هی من باشترە" دەتوانین تا ڕادەیەکی باش بابەتیبوون بەدەست بهێنین.

ئایا تا ئێستا لەم چاپتەرەدا ئاماژە بەوە دراوە کە بیرکردنەوەی "هی من باشترە" هەرگیز ناتوانێت بابەتی بێت یان هەڵسەنگاندێکی وردی هەبێت بۆ حاڵەتێک؟ بە شێوەیەکی ئاشکرا نا، بەلام ئەگەر پێت وا بێت ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەتوانێت بابەتییانە هەڵسەنگاندن ئەنجام بدات، ئەوا

تۆش کەوتوویتە ناو دۆگمای ڕێژەگەراییەوە (ڕێژەگەرایی لە چاپتەری نۆدا قسەی لەسەر دەکرێت). لە زۆبەی زۆری حاڵەتەکاندا کە دوو ئایدیا (بڕوا، تیۆر، دەرئەنجام) یان زیاتر، لە مملانێدان دەرئەنجام دانەیەکیان مەعقولترە و زیاتر پشتی بە بەڵگەکان بەستووە وەک لەوانی تر. ئەگەریش تۆ ڕاستگۆ و جیدی بیت لە هەوڵدانت بۆ بوون بە بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەگر، ئەوا زۆربەی حاڵەتەکان، ئایدیاکانت باشترین ئایدیا دەر دەچن. بەڵام ئەمەش لەدوای هەڵسەنگاندنی هەموو ئایدیاکانی تر بڕیاری لەسەر دەدرێت. بەڵام کێشەکە لەگەڵ بیرکردنەوەی "هی من باشترە" ئەوەیە، کە گرنگیی هەڵسەنگاندن فەرامۆش دەکات و وامان لێ دەکات بێ هیچ گومانێک بیرکردنەوەکانمان بە باشترین بدەینە قەڵەم.

یەکێک لە ڕێگەکانی زاڵبوون بەسەر بیرکردنەوەی "هی من باشترە"دا ئەوەیە، کە لەیادمان بێت ئێمەش وەک ئەوانی تر زەرەرمەند ئەبین لێی، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە قسە لەسەر شتێکە، کە بەلامانەوە گرنگە، وەک G. K Chesteronدەڵێت:

هەموو لەو بابەتانەدا ورد و زانستین کە جێی ئیهتیمامی شەخسیمان نین. بەڵام هەموو زیادەڕۆیی دەبینین - بۆ نموونە، لە وتارێکی نیشتمانپەروەرانە لە پارەگوای. هەموو ئارام و بەدیقتین لە بابەتێکی وەک لێکۆڵینەوە لە مارماسی. بەڵام ئەو ساتەی بڕوامان بە شتێک کرد، هەر ئەو ساتە زیادەڕۆییی تێدا دەکەین و ئەو ساتەی جیدی بووین، هەر ئەو کاتە وشەکانمان توڕەبوونیان پێوە دیارە.

ڕێگەیەکی تر بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم بیرکردنەوەیەدا، ئەوەیە کە دەستبەجێ هۆشیار ببینەوە لە هێماکان. ئەو ئاماژە و هێمایانەی کە دەتوانین هەم لە هەستەکانمان و هەم لە بیرکردنەوەکانماندا بیانبینین:

* لە هەستەکاندا: شعورێکی زۆر خۆش، یان زۆر ویستراو، حەزکردن بە قبوڵکردنی گوزارەیەک یان ئارگۆمێنتێک دەستبەجێ. یان هەستێکی زۆر نەخوازرا و خراپ، حەزکردن بە هێرشکردن و بەدناویکردنی گوزارەیەک یان ئارگۆمێنتێک بەبێ دواخستن.

* لە بیرکردنەوەدا: ئایدیای وەکوو "پێم خۆشە کە شارەزایان پشتگیریی ئەم لایەنە دەکەن _ من خۆم تەواو بیرم لێ کردۆتەوە" و "پێویست بە کاتبەفیرۆدان ناکات لە هەڵسەنگاندنی بەڵگەکاندا _ بۆیە هەر دەبێت ئەمە دەرئەنجامەکە بێت". یان ئایدیای لەم چەشنە" ئەم گۆشەنیگایە زۆر خراپە، چونکە پێچەوانەی ئەوەیە کە من بەردەوام پێم ڕاست بووە _ بۆیە هیچ ئەرزشێکی بۆ دانانێم."

هەرکاتێک بۆت دەر کەوت کە کاردانەوەکەت بریتییە لە یەکێک لەو ڕێگەیانەی سەرەوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە تۆ بوویتە قوربانیی بیرکردنەوەی "هی من باشترە." ڕێگەرەچارە بریتییە لەوەی بەرەنگاری خۆت ببیتەوە و خۆت ناچار بکەیت کێشەکان بە ئەقڵێکی کراوەترەوە وەربگریت. دیارە ئەمەش کارێکی هەر وا ئاسان نییە، - هەر خۆت دەیان بەهانە ئەهێنیتەوە بۆ چاوپۆشین لەو جۆرە بیرکردنەوەیە _ بەڵام گەشەکردنی مەهارەتەکانت وەک بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەگر دەکەوێتە سەر ئەوەی تا چ ڕادەیەک سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت لەو ڕووبەڕووبوونەوەیەدا. جۆرەکانی تری هەڵە لە بیرکردنەوەدا لە چوار چاپتەری داهاتوودا باس دەکرێن، کە هەموویان بە هۆی بیرکردنەوەی "هی من باشترە"وە ئاڵۆزتر دەبن.

# ڕاهێنانەکان

١. هەندێک کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە لە کولتووری هاوچەرخی ئەمەریکیدا خودپەرستی و گروپپەرستی لە زیادبووندایە نەک لە کەمبوونەوەدا. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، کەواتە بیرکردنەوەی ڕەخنەییش لە سەرەولێژبوونەوەدایە. لەسەر ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ڕاگەیاندن بکە و تێیدا بەدوای ئەو بەڵگانەدا بگەڕێ، کە هەم پشتگیریی ئەم بانگەشەیە دەکەن و هەم ڕەتیشی دەکەنەوە دواجار ڕاپۆرتێک لەسەر دۆزینەوەکانت ئامادە بکە. (دڵنیا بە لەوەی کە نە بەڵگەی بچووکت فەرامۆش کردووە، نە گەورە _ بۆ نموونە، ڕایەک کە لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنیدا وتراوە، یان شتێکی سەرنجڕاکیش کە لە ڕیکلامێکدا بەکار هاتووە، تا دەگاتە لێدوانی ڕەسمیی حکومی، کە گۆڕان لە سیاسەتی حکومەتدا دروست دەکات).

٢. بۆنەیەک بێنەرەوە بەرچاوی خۆت، کە تێیدا کەسێک نیشانەیەک یان زیاتری گروپپەرستانە لە هەڵوسوکەوتەکەیدا دەر کەتووە. باسی بۆنەکە بکە، نیشانەکان چی بوون و چۆن کاریگەرییەکی داناوە لە سەر بڕیارەکانی ئەو کەسە.

٣. پوختەیەک لەسەر ئەم چاپتەرە بۆ ئەو کەسەی کە لە پرسیارەکەی

سەرەوەدا ئاماژەی پێ دەدەیت، بنووسە. چەندێک دەتوانی، قایلکەرانە بینووسە. تێیدا، گرنگی بدە بەو حاڵەتانەی کە مەیلی"هی من باشترە" لە بیرکردنەوەکانیدا زاڵ بووە، بۆی ڕوون بکەرەوە کە ئەم مەیلە چ کاریگەرییەکی لەسەر حوکمەکانی جێ هێشتووە.

٤. بیر لە دوو لێکدانەوەی خۆت بکەرەوە، کە دەچنە ژێر خانەی بیرکردنەوەی "هی من باشترە"وە. باسی لێکدانەوەکان بکە و بە چیشدا بۆت دەر کەوت کە دەچنە ژێر خانەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەوە. ئەگەر توانیت ئەو هۆیانە دەستنیشان بکە، کە پاڵی پێوە نایت بەو جۆرە بیر بکەیتەوە.

٥. ئەو ئارگۆمێنتانە هەڵبسەنگێنە، کە لە خوارەوە دێن، وەک چۆن لە ڕاهێنانی چوارەمی چاپتەری حەوتدا بەئەنجامت گەیاند. سەرەتا بەشە پێکهێنەرەکانی ئارگۆمێنتەکان دەستنیشان بکە (بە پێشمەرجە شاراوەکانیشەوە) دواتر پرسیاری گونجاویان ئاراستە بکە، وەک لەوانەی کە لەو چاپتەرەدا خراونەتە ڕوو. پاشان وردی و ڕاستی هەر پێشمەرجێک بپشکنە، چ ئاشکرا و چ شاراوەش و ئایا ئەو دەرئەنجامانەی لێیانەوە وەر گیراون، مەعقولترین دەرئەنجامەی مومکینن. تێبینیی ئەوە بکە بۆ هەڵسەنگاندنی پێشمەرجەکان هەندێک جار پێویستت بە بەڵگەی تەواو هەیە تا بڕیاری لەسەر بدەیت. (ئاگاداریی مەیلی "هی من باشترە" بە، مەهێڵە کار لە لێکدانەوەکانت بکات). ئەگەر پێشمەرجێکت بینی کە ناڕاستە یان کە دەرئەنجامێک کە مەعقول نییە، بە کۆی ئارگۆمێنتەکەدا بچۆرەوە.

a. *تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: لە وڵاتدا زۆر لە قوتابخانەکان دووچاری کێشەی کەمکردنەوەی بودجە بوون. بۆیە ناچار بوون هەندێک لە چالاکییەکانیان کەم بکەنەوە، کەواتە دەبێت بڕیار بدەن*

*کام چالاکی لەپێش ئەوانی ترەوەیە. هەندێکیان بەم شێوەیەی خوارەوە بیر دەکەنەوە.*

ئارگۆمێنتەکە: چالاکیی پێشبڕکێی وەرزشیی کەسایەتی بوونیاد دەنێت و وەرزشەوانە گەنجەکان ئامادە دەکات بۆ تەنگوچەڵەمەکانی ژیان. هەروەها، هەر لە ڕێی ئەم پێشبڕکێیانەوە، قوتابییەکان هەم کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن، هەم ئینتیماو پشتگیرییان بۆ قوتابخانەکانیان دووپات دەکەنەوە. هەر بۆیە دەبێت زۆرترین بڕی بودجەی قوتابخانەکان بۆ ئەم پێشبڕکێیانە تەرخان بکرێت.

*B. تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: بە هۆی بەرزبوونەوەی ڕادەی سکپڕبوونی هەرزەکاران، Baltimore Mayland بۆ یەکەم جار پێشنیاری نۆرپلانت دەکات، کە بریتییە لە نەشتەرگەرییەک، کە بە هۆیەوە ڕێ لە سکپڕبوونی هەرزەکاران دەگیرێت. ئەوانەی بڕوایان بەم پێشنیارەیە، بەم شێوەیە بەرگری لە ئارگۆمێنتەکەیان دەکەن:*

سەرەڕای هۆشیارکردنەوەی هەرزەکاران سەبارەت بە بەکارهێنانی کۆندۆم، بەلام ڕێژەی سکپڕبوون لەم توێژەدا لە زیادبووندایە. نۆرپلانت بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە ڕێ لە سکپڕبوون دەگرێت. هەر بۆیە سیستەمی پەروەردەی قوتابخانەکان دەبێت ڕێ بە ئەنجامدانی ئەم نەشتەرگرییە بدەن.

٦. لە هەریەک لەم کێشانەی خوارەوەدا، شوێنی خۆت دەستنیشان بکە و بەرگریشی لێ بکە. دڵنیا بە لەوەی کە مەیلی "هی من باشترە"ت کۆنترۆڵ کردووە و وەڵامەکانت لەسەر بنەمایەکی ڕەخنەیی دابڕێژە.

a. Carl F. Henry کە سیۆلۆجستێکی بەناوبانگی ئیڤانجیلیکییە {گروپێکی ناو ڕێبازی پرۆتستانی مەسیحییە}، ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەو بڕوا باوەی دەڵێت ستانداردێکی ئەخلاقی نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە

زۆرینە قبوڵی دەکەن، ئەم بڕوایە مەترسییە بۆ سەر وڵات {ئەمەریکا}. مانەوەی کۆمەڵگەیەکی دیموکرات، ئەو پێی وایە وابەستەی هەبوونی ستانداردێکی ئەخلاقیە بۆ نموونە، وەکو پێودانگەکانی ئینجیل بۆ ئەخلاق و دادپەروەری.

b. بە هۆی فێڵکردن لە بانک، ڕابەرێکی ئایینی جوولەکە سێ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا. ئەم کەسە داوای لە دادگا کرد کە ڕژێمێکی خۆراکی تایبەتی پێ بدرێت، کە خواردنێک بریتی بێت لە مریشکی کۆشەر {کۆشەر واتە خۆراکی حەڵاڵ لە ئایینی جوولەکەدا}. بەڵام ماوەیەک تەندروستی بەرەو خراپبوون دەڕوات. ئەم پیاوە ئایینییە گرتووخانە بەوە تۆمەتبارە دەکات، کە ئەو شێوازە و خواردنەی بۆ ئامادە ناکەن، کە ئەو داوای دەکات بۆیە نەخۆش کەوتووە. ڕژێمە خۆراکییەکەی کە لە گرتووخانە بۆی ئامادە کردبوو، بریتی بوو لە کاهو، پرتەقاڵ، گێزەر، برنجی وشک.

c. هەردوو جۆری میوزیک وگۆرانی "heavy metal" و "gangsta rap" چەندان ڕەخنەی کۆمەڵایەتییان لێ گیراوە. ئەوانەی ڕەخنە لەم جۆرە میوزیکانە دەگرن، دەڵێن، هانی، (بگرە دەبنە هۆی) ڕەفتاری دژەکۆمەڵایەتی، هەر بۆیە بەرپرسیاریشن تا ڕادەیەک لە زیادبوونی توندوتیژی.

d. هەندێک کەس لە وبڕوایەدان، کە سزای ئۆتۆمۆبێل لێخوڕین لە کاتی بەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرەکاندا دەبێت توندتر بکرێت. یەکێک لە سزا پێشنیارکراوەکان بریتییە لە زیندانیکردن لە کاتی دووبارەکردنەوەی سەرپێچییەکەدا.

٧. ئەم دیالۆگانەی خوارەوە بەوردی بخوێنەرەوە و بەوردی بەدوای بەڵگەی هەبوونی بیرکردنەوەی "هی من باشترە"دا بگەڕێ، پاشان

بڕیار بدە ئارگۆمێنتی کامیان مەعقولترە و بۆچی. ( دڵنیا بە لەوەی کە بیرکردنەوەی" هی من باشترە"ی خۆت کۆنترۆڵ کردووە).

*a.. تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: لە گەشتێکدا بەرەو ئیسپانیا لە مانگی ١١دا، پاپا Jhon Paul II ڕای گەیاند کە ئەو گەڕان و پشکنینەی کە لە ١٤٨٠ لە کەنیسە کاسۆلیکییەکانی ئیسپانیا و {لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کەنیسە کاسۆلیکییەکان دەگەڕان و ئەوەی ئەوان بە بێباوەڕیان بزانیبایە، دەیانکوشت} دەستی پێ کرد و تا زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ بەردەوام بوو، کە بە هۆیەوە زۆر کەس لە بەندیخانە توند کران، ئازاردران و سووتێنران، هەڵە بوو.*

*ڕاڵف*: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کەنیسەی کاسۆلیکی بەڕەسمی ئیدانەی ئەو تاوانکارییە بکات.

بێرنیک: پاپا نەدەبوو بە شێوەیەکی ئاشکرا ئیدانەی بکردبایە.

*ڕاڵف*: بۆچی؟ پێت وایە دوای ٥٠٠ ساڵ، هێشتا زووە؟ دەبوو ئەو چاوەڕێی بکردبایە تا ١٠٠٠ ساڵ تێدەپەڕی؟

بێرنیک: گاڵتەجاڕ مەبە. مەبەستم ئەوەیە ئیدانەکردنی کەنیسە ئاوا بە شێوەکی ئاشکرا، بەدڵنیاییەوە باوەڕی زۆر لە کاسۆلیکەکان لاواز دەکات. ئەگەر تۆ کەسێک یان شتێکت لەم کەیسەدا خۆش بوێت، بۆ نموونە کەنیسە _ ئەوا نابێت شتێک بکەیت، کە مایەی شەرم و خەجاڵەتی بێت بۆ ئەو. بەدڵنیاییەوە ئەوەی کەنیسە کردوویەتی، هەڵە بووە، بەڵام هیچ سوودێکی نییە، تۆ دەبێت ئێستا خەڵک ئاگادار بکەیتەوە لە هەڵەکان.

*b.. تێبینییەک لەسەر باکگراوەندی کێشەکە: مامۆستایەکی کچی وانەی بایلۆجی لە قوتابخانەی long Island لە نیو یۆرک سکی پڕ بوو، بەم هۆیەوە ژمارەیەک لە باوانی قوتابییانی قوتابخانەکە، سکالانامەیان دا بە بۆردی قوتابخانەکە تا دەری بکەن. باوانەکان دەیانوت، سکپڕبوونەکەی هێمایە بۆ ئەوەی کە ئەو شتێکی بێڕەوشتانەی بەئەنجام گەیاندووە، بۆیە*

*ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر وانەوتنەوە، ئەوا دەبێتە نموونەیەکی ترسناک بۆ قوتابییان، کە ڕەنگە چاوی لێ بکەن. بەڵام بۆردی قوتابخانەکە ئامادە نەبوون مامۆستاکە لەسەر کار لا بدەن.*

*ئارسەر:* دەستخۆشی بۆ بۆردی قوتابخانەکە. بەڕاستی هەڵوێستەکەیان ئازایانە بوو. ئەو ئایینداره دووڕووانە دەتوانن هەلای گەورە دروست بکەن.

گۆنیڤەر: بۆچی پێیان دەڵێیت دووڕوو؟ ئەوان ئەو مافەیان هەیە گوزارشت لە بۆچوونەکانیان بکەن.

ئارسەر: مەبەست ئەوەیە، بڕوات بەو قسە پووچە هەیە، کە سکپڕبوونی مامۆستاکە واتای بێڕەوشتی و بوونی بە نموونەیەکی خراپ دەگەیەنێت؟

گۆنیڤەر: بەڵێ، وای دەبینم. بەڵام لەو بڕوایەدا نیم هەموو کەسێک دەبێت لەسەر کار لا ببرێت لە حاڵەتی سکپڕبووندا. بەڵام مامۆستایان دەبێت حسابێکی تایبەتیان بۆ بکرێت. چونکە ئەوان شتی زیاتریان لێ چاوەڕێ دەکرێت. هەڵسوکەوت و مامەڵەیان دەبێت سەر بەو ستانداردە بەرزانە بێت، کە لە کەسانی تر چاوەڕێ ناکرێت چونکە ئەوان بەرپرسی پەروەردەکردنی نەوەی نوێن، نەوەی نوێش، نەوەیەکە ئاسان کاریان لێ دەکرێت.

٨ـ گفتوگۆ بە شێوەی گروپ: لەسەر ئەم بۆچوونەی خوارەوە هەڵوێستە بکە. ئەوەی لەم چاپتەرەوە فێری بوویت، هاوکارە بۆ لێکدانەوەی ئەو بۆچوونە؟ ئەگەر هاوکارە، چۆن؟ لەگەڵ یەک-دوو لە هاوپۆلەکەت لەسەر ئەم بۆچوونە گفتوگۆ بکەن:

تەنانەت ئەگەر سەرلەبەری جیهانیش پێت بڵێن تۆ هەڵەیت، هیچ گرنگ نییە، بەو مەرجەی تۆ خودی خۆت بە ڕاست بزانیت. چونکە وەڵامی یەکلاییکەرەوە هەر لای خۆتە.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پوختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر سنووردارکردنی سەیرکردنی تەلەڤزیۆن لە لایەن منداڵانەوە. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تابزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەری حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

*سنورردارکردنی تەماشاکردنی تەلەڤزیون لەلایەن منداڵانەوە:* بە هۆی ئەو ڕاپۆرت و دۆکۆمێنتانەوە کە لەسەر کاریگەرییە زیانبەخشەکانی میدیا لەسەر منداڵان، لەوانە دابەزینی ئاستی خوێن و زیادبوونی ڕێژەی توندوتیژی بڵاو دەکرێنەوە، سەنتەرێکی ئەکادیمی منداڵناسی پێشنیاری کرد، کە منداڵان نابێت بە هیچ شێوەیەک ڕێیان پێ بدرێت، کە سەتەلایت و کەمپیوتەری تایبەت بە خۆیان هەبێت لە ژوورەکانیان، هەروەها منداڵانی خوار تەمەن دوو ساڵ نابێت بە هیچ شێوەیەک

تەماشـای تەلەڤزیـۆن بکـەن. زۆر کـەس دەستخۆشـییان لـەم پێشـنیارەی سـەنتەرەکە کرد، بـەڵام کەسـانێک بـە داوایەکی دەزانن، کـە زیادەڕۆیی و ناواقیعیـی پێـوە دیـارە.

# چاپتەری نۆیەم

## هەڵە لە بۆچوونەکاندا Error of Prespective

وای دانێ چاویلکەیەکت لە چاودایە شووشەکانی بۆ چاوی تۆ نابن و تۆش ئاگاداری ئەم کێشەیە نیت. تۆ بە هەموو قەناعەتی خۆتەوە بڕوات وایە شتەکان و کەسەکان بەو شێوەیەن کە تۆ دەیانبینیت، ئەمە لە کاتێکدا لە واقیعدا تەواو جیاوازن. کاتێک تۆ باسی شتەکان دەکەیت بۆ ئەوانی تر، ئەوانیش ناکۆک دەبن لەگەڵت، پێت سەیرە کە بۆچی ئەوانیش وەک تۆ ناتوانن جیهان ئاوا بەڕوونی ببینن. ئیدی دەرئەنجام یان ئەوەتا چیدی ئەو باسانەیان لەگەڵ ناکەیتەوە، یان ئەوەتا زیاتر پێ دادەگریت لەسەر بۆچوونەکانت، بەو هیوایەی بەم ڕێگەیە بێنە سەر بۆچوونەکەی تۆ.

ئێستا وای دابنێ بە هەر هۆیەکی باشەوە بێت، بۆت دەر دەکەوێت کە هەڵە لە بۆچوونەکانی ئەواندا نییە بەڵکوو ئەوە شووشەی چاویلەکەکەی تۆیە کە بۆ چاوت نابێت و وێنەکانت لێ دەشێوێنن. ئیدی بەپەلە خۆت ئەگەیەنیتە نزیکترین چاویلکەساز و دانەیەکی نوێ کە گونجاوە بۆ چاوەکانت، دەکڕیت، تا وێنەکان بە شێوەیەکی ورد ببینیت و هەست بە دڵنیایی و بڕوابەخۆبوون بکەیت.

هەڵە لە بۆچوونەکاندا، ڕێک وەک لەچاوکردنی چاویلکەی نەگونجاوە، تەنها لەوەدا نەبێت، کە چاویلەکە لەسەر لووتمان جێگیر دەبێت بەلام بۆچوونەکان لەناو مێشکماندان. ئەگەر توشی یەکێک یان زیاتر لەم هەلانە بوویتی {هەڵەکانی بیرکردنەوە} ئەوا دەشزانی کە چۆن، کەم تا زۆر، بە شێوەیەکی بەردەوام کاریگەریی نەرێنی بەجێ دەهێڵن. ئەوان ئەو مامەڵە و خووانە ئاراستە دەکەن، کە تۆ لە ڕێیانەوە کێشەکان هەڵدەسەنگێنیت، هەروەها بە هۆی لایەندارکردنی بیرکردنەوەکانت، چاوەڕوانی ناڕاستت لا دروست دەکەن. بەلام ڕەنگە تۆ هەتا شێوازی بیرکردنەوەکانت نەپشکنی، بۆت دەر نەکەوێت کە وەها کێشەیەکت هەیە. ئەم چاپتەرە دانراوە بۆ ئەوەی ئەمە بکەیت و ڕێگرەکان و هەڵەکانی ناو بۆچوونەکانت کە ڕێگری بەردەم بیرکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانەن، ڕەگکێش بکەیت. تۆ لە شەش جۆری دیاریکراوی هەڵە دەکۆڵیتەوە، کە بریتین لە: گریمانە بێبنەماکان، تێڕوانینی تەنها یەکێک لەو دووانە، پەیڕەلێکردنێکی گەمژانە، ڕەهاگەرایی، ڕێژەگەرایی، لەگەڵ یان دژی گۆڕان.

## گریمانە بێبنەماکان

گریمانەکان لێرەدا ئەو ئایدیایانە دەگرێتەوە، کە خۆبەخۆ وەک ڕاستی قبوڵ کراون و بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی بەئاگایانە نین. گریمانەکردن یان گریمانەدانان زۆر سروشتییە و مەرجیش نییە هەموو گریمانەکان خراپ بن، بەڵکوو هەندێک جار سوودبەخشن. کاتێک بەیانیان لە خەو هەڵدەستیت و بەڕێ دەکەویت بۆ زانکۆ، {بێئاگا} چەندان گریمانە دادەنێیت؛ کاتژمێرەکەت بەباشی ئیش دەکات، ئۆتۆمۆبیلەکەت بێ کێشە کار دەکات، پرۆفیسۆر لە کاتی خۆیدا دەگاتە هۆڵی وانەوتنەوە. جاروباریش هەندێک شت ڕوو دەدەن، کە چاوەڕڕێی ڕوودانیان ناکەیت _ کاتژمێرێکی وەستاو، ئۆتۆمۆبیلێک کە باترییەکەی مردووە _ بەلام ئەمانە گریمانەکانت پووچ

ناکەنەوە، بەو مانایەی کە نەدەبوو وەها گریمانەیەک بکەیت (لە ڕاستیدا ئەگەر بێت و قەلەقی ئەوە بێت کە هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆژانە دەیانکەیت بەوردی لەبەرچاویان بگریت، ئەوا ناتوانیت زۆر شت بکەیت و دەستەپاچە دەبیت).

بەڵام ئایا چ کاتێک گریمانەکان *بنەڕەتیمان*؟ هەرکاتێک *گریمانەیەک* خۆی بۆ خۆی وەک ڕاستی قبوڵ کرا، لە کاتێکدا نە بە ئەزموونی شەخسی و نە بە هیچ بەڵگەیەکی تر پشتڕاست نەکرابێتەوە، ئەوا دەبێتە گریمانەیەکی بنەڕەتی. گریمانەی جگەرەکێشەکان بنەڕەتییە ئەو کاتەی دەڵێن، جگەرەکێشان زەرەری جەستەیی لێ ناکەوێتەوە، بەس لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی باسی دەکەین، تا ئێستا تووشی نەخۆشییەکی ترسناک نەبووە. بە هەمان شێوە، ئەوانەی لەبەر تیشکی ڕاستەوخۆی خۆر مەلە دەکەن و دەڵێن تیشکی خۆر زەرەرێکی نییە بۆ پێستیان، یان ئەوانەی هەرچی لە ئینتەرنێتدا دەیبینن باوەڕی پێ دەکەن.

لە مەسەلەی لەباربردنی منداڵدا، ئەوانەی کە لە "لەگەڵ-هەڵبژاردندان" {واتە دایک ئازادە لەوەی بڕیاری لەباربردن یان بەخێوکردنی منداڵەی بدات}، گریمانەی ئەوە دەکەن کە مافی لەباربردن لە دەستووری ئەمەریکادا جێگیر کراوە یان ئەوانەی کە دەڵێن بڕیاری دادگای باڵای Ros v. wade لەسەر ئەم ماددە دەستوورییە لە ڕووی لۆجیکییەوە ئەوەندە بەهێزە، کە ناکرێت ڕەخنەی لێ بگیرێت، هەروەها ئەوانەی تەنها بۆچوونی مەسیحییە کۆنسەرڤاتیڤەکان بە ڕاست دەزانن، کە ناو دەبرێت بە "لەگەڵ ژیاندا" (واتە دایک ناچارە بە بەخێوکردنی منداڵەکەی}، هەریەکە لەم سێ گریمانانە بنەڕەتین. حاکمی دادگای باڵا Byron White ڕەتی دەکاتەوە کە لە دەستووردا ئەم مافە فەراهەم کرابێت، بەڵکوو دەستوور مافی بڕیاردانی گەڕاندۆتەوە بۆ دادگا. ڕۆژنامەنووس و نووسەر George

Will لەسـەر ئـەم بابەتـە دەنووسـێت:

لـە ١٩٧٣دا بڕیارێکـی یاسـایی دەر کـرا کـە تێیدا ئاوڵەمـە بـە "ژیانێکـی چاوەڕوانکـراو" {واتـە ئاوڵەمـە هێشـتا مـرۆڤ نییـە، بەڵکـوو دەکرێـت لـە داهاتـودا ببێتـە مـرۆڤ} درایـە قەڵـەم. بێمانایـی بایۆلۆجـی ئـەو بڕیـارە ئەمـڕۆ لەلایـەن زانسـتی کۆرپەناسـییەوە لـە شـەئنی کـەم کراوەتـەوە. جیـا لەوەش (ڕۆی) ئـەم بێماناییـە دوو جـار دەسـەلمێنێت: کـەس نازانێـت کـەی ژیانـی مـرۆڤ دەسـت پـێ دەکات، بەڵام دادگای بـالا دەزانێـت کـەی ژیانێکـی "مانـادار"ی مـرۆڤ دەسـت پـێ دەکات. دادگا بڕیـاری داوە کـە کۆرپەلـەی نـاو سـک لـە قۆناغـی سـێیەمی کۆرپەلەییـدا مرۆڤـە، چونکـە دەتوانێـت ژیانێکـی "مانـادار" لـە دەرەوەی منداڵدانـدا بەسـەر بەرێـت. دادگا دەڵێـت، ویلایەتـەکان بۆیـان هەیـە لەباربردنـی کۆرپەلـە لـە قۆناغـی سـێیەمی گەشـەیدا یاسـاغ بکـەن، بـەڵام نـەک ئـەو کاتـەی پزیشـکەکان ڕاپـۆرت دەدەن لـەوەی کـە کۆرپەلەکـە مەترسـیی بـۆ سـەر ژیانـی دایکەکـە دروسـت دەکات. ناوێکـی سـەرنجڕاکێشـە، "دایـک."

ئـەو بۆچوونەشـی کـە پشـتگیریکەرانی "لەگەڵ-ژیانـدا" هەیانـە، بـۆ کۆنەسـەرڤاتیڤە مەسـیحییەکان، بەتەواوەتـی بێبنەمایـە. مۆرمـەرەکان {گروپێکـی نـاو ئایینـی مەسـیحییە} مێنەنایتـەکان {گروپێکـی ئایینییـە، کـە پێداگـری لەسـەر مانـەوەی ژیـان دەکات بـە سـادەیی}، موسـڵمانەکان، بودییـەکان، هیندۆسـەکان، هەمـوو ئەمانـە دژی لەباربردنـن و ئیدانـەی دەکـەن. بـەڵام جوولەکـەکان هەڵوێسـتی جیاوازیـان لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە هەیـە، زۆربەیـان ئیدانـەی دەکـەن( بـۆ نموونـە شـوێنکەوتووانی گروپـی ژیـان و ئیفـرەت). گروپـە نادینییەکانیـش کـە بەرهەڵەسـتی لەباربـردن دەکـەن، برتیـن لـە گروپـی بێخـودا و ئەگنۆسـتیکەکان، گروپـی بتپەرسـتەکان، گروپـی لیبراڵـەکان بـۆ ژیـان، گروپـی فێمینیسـتەکان بـۆ ژیـان، تـا دەگاتـە گروپـی هاورەگەزبـازەکان بـۆ ژیـان (هەمـوو ئـەم گروپانـەش لـە ماڵپەڕەکانیانـەوە

گوزارشـتیان لـە هەڵوێسـتی خۆیـان کـردووە).

**دیارترین گریمانە بێبنەماکان برتین لەمانەی خوارەوە:**

*ئـەو گریمانـەی کـە دەڵێت، هەسـتەکانی مرۆڤ بـەردەوام جێـی متمانـەن.* ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە، کـە بـڕوا و ویسـتەکان دەتوانـن زۆر بەباشـی بۆچوونەکانمـان بشـێوێنن، کارێـک بکـەن، بـە شـێوەیەکی ناڕاسـت و ناتـەواو شـتەکان ببینیـن و ببیبیسـتین. کەواتـە هەسـتەکانمان بـەردەوام جێـی متمانـە نیـن.

*ئـەو گریمانـەیەی کـە دەڵێت، ئەگـەر ڕایـەک بـە شـێوەیەکی بەربڵاو بڵاو بـۆوە، کەواتـە دەبێـت ڕاسـت بێـت.* داسـتان و ئەفسـانەکان دەشـێت زۆر بەناوبانـگ و دیـار بـن، بـەڵام ئایـا مەرجـە ڕاسـت بـن.

*ئـەو گریمانـەیەی کـە دەڵێت مـادام کەسـێک خـاوەن هـۆی ئەقڵییە، کەواتـە بیرکردنـەوەکانـی هەمیشـە لـە ڕووی لۆجیکییـەوە ڕاسـتن.* هـۆ ئەقڵییـەکان دەشـێت بـە شـێوەیەکی نارەخنەیـی لـە کەسـانی تـرەوە وەرگیرابـن و لـە سـیاقێکی جیـاوازدا بـەکار بهێنرێنـەوە. بـەڵام تەناتـەت ئەگـەر وەریـش نەگیرابـن لـە کەسـێکی تـرەوە، ئـاواش ڕێـی تـێ دەچـێ کـە نالۆجیکی بـن.

*ئـەو گریمانـەی کـە دەڵێت باوەڕ ڕاستی تێدایە.* بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ڕێی تێدەچی کە باوەڕێـک بـە شـێوەکی عاتفی لەسـەر بنەمایەکی هەڵـە دروست بوو بێت.

*ئـەو گریمانـەی کـە دەڵێـت ئایدیـا ئاشـناکان یاسـاییترن وەک لـە نائاشـناکان.* بـەڵام ئاشـنابوون بـە ئایدیایـەک تەنهـا ئـەوە دەگەیەنێت کـە تـۆ

پێشتر ئایدیایەکت بیستووە، یان خوێندۆتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئەم ئاشنایەتییە گەرەنتیی ڕاستیی ئایدیاکە ناکات.

*ئەو گریمانەیەی کە دەڵێت، ئەگەر ڕووداوێک بەدوای ڕووداوێکی تردا ڕووی دا، ئەوا دەبێت یەکەم هۆی دووەم بووبێت.* بەڵام لە ڕاستیدا نزیکی لە کاتی ڕووداندا، ڕەنگە تەنها ڕێکەوت بێت و هیچی تر.

*ئەو گریمانەیەی کە دەڵێت ڕای زۆرینە ڕایەکی دروستە.* زۆرینە زۆر جار هەڵە بوون _ بۆ نموونە، لە کوشتنی جادووگەرەکاندا، یان لە پشتگیریکردنی کۆیلەکاری. {یان هەڵبژاردنی هیتلەر، یان ژەهردەرخواردانی سوکرات}.

*ئەو گریمانەی کە دەڵێت، شتەکان دەبێت بەو شێوەیە بن، کە ئێستا هەن.* مرۆڤەکان بوونەوەرێکی ناتەواون {کامڵ نین}، هەر بۆیە داهێنانەکانی بە داهێنانی ئایدیاکانیشەوە، دەروازەی نوێ دەخەنە سەرپشت بۆ گەشەکردنی زیاتری ئەم بوونەوەرە، هەر بۆیە ئەم گریمانەیە ناڕاستە.

گرنگە لەیادت بێت کە هەمیشە گریمانەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەیان پێ دەدرێت، وەک لەوەی بە ئاشکرا دەر ببڕین، ڕێک وەک پێشەمەرجە شاراوەکانی ئارگۆمێنتەکان. کەواتە بۆ دۆزینەوەیان دەبێت گەشە بە توانای خوێندنەوەی (هەروەها گوێگرتن لە) پەیامی نێوان ڕستەکان بدەیت، ئەو پەیامانەی کە دەر نەبڕاون بە شێوەیەکی ئاشکرا، بەڵام ئامادەگییان هەیە. پاشان هەرکاتێک گریمانەکەت دەستنیشان کرد، بزانە گریمانەیەکی بێبنەمایە یان نا.

## تێڕوانینی تەنها یەکێك لەو دووانە

تێڕوانینی تەنها یەکێک لەو دووانە، واتە لە کاتی هەڵسەنگاندنی کێشەکاندا، تەنها یەک ڕێگەی ڕاست هەیە، ئەویش یان ئەوەتا بەتەواوەتی لەگەڵی دەبین، یان ئەوەتا بەتەواوەتی دژی ئەبین، واتە تەنها یەکێک لەو دووانە. بە مانەیەکی تر، ئەم تێڕوانینە، تێڕوانینێکی پەڕگیرانەیە و نایەوێت بە شێوازێکی مامناوەندی بگرێتە بەر. بەڵام سەیر ئەوەیە، زۆربەی جار مەعقولترین شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکاندا شێوازی مامناوەندییە، نەک پەڕگیرانە. بۆ نموونە، با سەرنجی ئەم کێشە ئاڵۆزە بدەین، کە مەسەلەی چاکسازی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتییە welfare reform. یەکێک لە هەڵوێستە پەڕگیرەکان ئەوەیە، کە ئەم سیستەمە وەک خۆی و بێ گۆڕانکاری بهێڵینەوە. هەڵوێستە پەڕگیرانەکەی تریش بریتییە لە لەناوبردنی ئەم سیستەمە بە شێوازێکی تەواوەتی. ئایا ناکرێت هیچکام لە دیدانە ڕاست بن؟ ڕەنگە. بەڵام هەڵوێستی دروست بۆ ئەوەی بگەینە وەڵامی دڵنیا، ئەوەیە کە *هەموو* دیدەکان لەبەرچاو بگیرێت، بەوانەشەوە کە ڕەگی دەمارگیرییان تێدایە. ڕەنگە دەرئەنجام بگەینە ئەوەی کە باشترین چارەسەر بریتی بێت لە *گۆڕان لە سیستەمەکەدا بەرەو باشتر*. نەک هێشتنەوەی وەک خۆی یان لەناوبردنی سیستەمەکە بە شێوازێکی تەواوەتی.

نموونەیەکی تر، بریتییە لە کێشەی ڤاوچەری قوتابخانەکان {واتە ئەو یارمەتییە داراییەی کە حوکمەتە دەیدات بە خێزانەکان تا منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە نموونەییەکان} کە زۆر جار بەم شێوەیە دەخرێتە بەر باس "ئایا دەبێت ئاستی قوتابخانە حوکمییەکان بەرز بکەینەوە، یان ڤاوچەر بدەین بە خێزانەکان تا لەسەر بڕیاری خۆیان منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە نمونەییەکان؟" بەڵام لە ڕاستیدا مەرج نییە مەحکوم

بیت بە هەڵبژاردنی یەکێکیان و ڕەتدانەوەی ئەوەی تریان. بەڵکوو دەتوانی پشتگیری لە *هەردووکیان* بکەیت، واتە هەم بودجەی تەرخانکراو بۆ قوتابخانە حکومییەکان زیاد بکرێت، هەم ڕێش بە باوان بدرێت، کە ئازاد بن بەو پارەیەی کە حکومەت دەیانداتێ بۆ منداڵەکانینان تا لە هەڵبژاردنی قوتابخانەکاندا هاوکارییان بکات.

نموونەیەکی تر بۆ ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە کە زیاتر لەم دواییەدا قسەی لەسەر دەکرێت، بریتییە لەوەی کە بۆچی ژمارەیەکی زۆری کوڕانی زانکۆ بەراورد بە کچەکان دوا دەکەون لە تەواوکردنی خوێندندا. لە بەرنامەیەکی دیالۆگی تەلەڤزۆنیدا، یەکێک لە میوانەکان کە پرۆفیسۆرێک بوو، دەیوت زۆر لە مامۆستاکان لە ترسی ئەوەی نەکەونە بەر ڕەخنەی فیمینیستەکانەوە، گرنگیی زیاتر بە خوێندکارە کچەکان دەدەن وەک لە کوڕەکان. میوانێکی تر ئەم ئارگومێنتەی بەتەواوەتی ڕەت کردووە و تاوانەکەی خستە ملی باوکان، کە فشار لە کوڕەکانیان دەکەن زیاتر گرنگی بە وەرزش بدەن. هەریەک لە میوانەکان بە پێویستیان دەزانی زەربێک بەسەر ڕای بەرامبەردا بهێنن، بەڵام لە ڕاستیدا پێویستی بەمە نەدەکرد. چونکە ئەم کێشەیە ڕەنگە *هەردوو* هۆکارەکە کاریگەرییان هەبێت، بگرە ڕەنگە *چەندان هۆی تریش هەبێت.*

هەرکاتێک کە سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی کێشەیەکیت و هەستت کرد تەنها دوو ئەگەر لەبەرچاو دەگریت، خۆت هۆشیار بکەرەوە لەوەی نەوەکوو ئەگەری تریش لەگۆڕێ بێت، ئەگەر هەبوو، گرنگە بایەخی تەواویان پێ بدەیت.

## پەیڕەوکردنی گەمژانە Mindless Conformity

پەیڕەوکردن، واتە مامەڵکردن وەک ئەوەی کە ئەوانی دی دەیکەن. لە هەندێک حاڵەتا پەیڕەوکردنی ئەوانی تر {یان لاساییکردنەوەی ئەوانی تر} ژیرانەترین جۆری کردارە. بە هۆی پەیڕەوکردنە لە ئەوانی ترەوە کاتێک منداڵەکان لە سۆپا و ئاگردانەکان دوور دەکەونەوە، یان پێش پەڕینەوە لە شەقامەکان سەیری ڕاست و چەپ دەکەن. ئێمە هەموو لە کاتی چوون بۆ ناو تەلارە گەورەکان پەیڕەو لە یەک دەکەین، بۆ نموونە، کاتی چوونەژوورەوە و هاتنەدەرەوە لە دەرگا تایبەتەکانەوە، یان لە کاتی بەکارهێنانی پلیکانە کارەباییەکان، یان لە کاتی سەرەگرتندا فێر بووین لە کۆتایی هێڵەکەوە بوەستین، نەک خێرا بچینە بەشی پێشەوە. ئەم جۆرە لە پەیڕەوکردن یان چاولێکردنانە هەم ژیان ئاسانتر دەکات، هەم سەلامەتتر (ڕەنگە ئەو کەسەی کە نۆرەبڕیی لێ دەکەیت، کەتە و بەهێزتر بێت، بگرە ڕەنگە چەکدار/ریش بێت!) جۆرێکی تر لە پەیڕەوکردنی دروست، بریتییە لە لاساییکردنەوەی کەسە نموونەییەکان _ ئەو کەسانەی کە شایانی ئەوەن وەک نموونە سەیر بکرێن و لاساییان بکرێنەوە. ئەم جۆرە لە پەیڕەوکردن زیاتر لەوانی تر یارمەتیمان دەدەن تا ببینە تاکێکی باشتر.

لە بەرامبەردا، پەیڕەوکردنی گەمژانە واتە لاساییکردنەوەی ئەوانی تر بێ بیرکردنەوە. کاتێک کە ئێمە لەوە تەمڵتر و ترسنۆکترین کە بۆخۆمان بیر بکەینەوە، بۆیە بە شێوەیەکی پاسڤانە پەیڕەو لەوانی تر دەکەین. لە تاقیکردنەوەیەکی بەناوبانگدا، هەشت قوتابی بەشدارییان کرد، تاقیکردنەوەکە لە تاقیگەیەکدا بەئەنجام گەیەنرا، کە تێیدا حەوت قوتابی ئاگاداری تەواوی تاقیکردنەوەکە بوون، بەڵام هەشتەمیان ئامانجی

تاقیکردنەوەکە بوو. لە تاقیکردنەوەکەدا قوتابییان لاپەڕەیەکی سپییان دەخرایە بەردەست، کە تەنها چوار هێڵی تێدا کێشرابوو لە سەرەوە بۆ خوارەوە. پرسیارەکە ئەوە بوو، کە کام لە سێ هێڵەکەی خوارەوە هێڵی یەکەم کە درێژترینیان بوو، لە درێژیدا ڕێک بەقەد هێڵەکەی سەری سەرەوەیە؟ لە ڕاستیدا هێڵی دووەم لە درێژیدا ڕێک یەکسان بوو بە هێڵی یەکەم و هێڵەکانی تر یان کورتتر یان درێژتر بوون لە هێڵی یەکەم. هەر حەوت قوتابییەکە کە پێشوەخت ئاگاداری ئامانجی تاقیکردنەوەکە بوون، بەئارەزوو وەڵامی *هەڵەیان* دەستنیشان دەکرد، بەمەش قوتابیی هەشتەم کە ئاگاداری ئامانجی تاقیکردنەوەکە نەبوو، دەکەوتە ژێر کاریگەریی هاوڕێکانیەوە. *ئیدی قوتابییەکە لەنێوان ئەوەی کە وەڵامی ڕاست هەڵبژێری و جیاوازیی خۆی لە هاوڕێکانی پیشان بدات، یان وەڵامی هەڵە هەڵبژێرێت بەڵام پشتگیری گروپەکە بەدەست بهێنێت، سەری لێ شێوابوو.* ڕەنگە بڕوا نەکەیت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە تەنها یەک کەس لەکۆی هەرپێنج کەسێک کە بەشداریی تاقیکردنەوەکەی دەکرد، دەیتوانی وەڵامی ڕاست دەستنیشان بکات.

زۆر لە ڕیکلامکاران تەشویقی پەیڕەوکردنی گەمژانە دەکەن. نموونەیەکی باش بۆ ئەم تەشویقکردنە ئەوەیە، کە لە یەکێک لە ڕیکلامەکانی بیرەی بەدوایزەردا دەوترێت "بێ دوودڵی و بێ پرسیار، بینۆشە بیرەی بەدوایزەر." دیارە هەر ڕیکلامکاران بەم کارە هەڵناسن، بگرە زۆر لایەنی تریش هەن کە تەشویقی پەیڕەوکردنی گەمژانە دەکەن، لەوانە، نادیی شەوانە کە یاریی وەرەقەی تێدا دەکرێت، کەنیسەکان، حیزبە سیاسییەکان، سەندیکا و ڕێکخراوەکان، هەموو ئەمانە دەتوانن فشار لە ئەندامەکانیان بکەن بۆ پەیڕەولێکردن. سەیرەکە لەوەدایە، تەنانەت ئەو لایەنانەشی کە دامەزراون تا هانی بیرکردنەوەی ئازاد و جیاواز بدەن، ڕەنگە ببنە هێزێک بۆ پەیڕەلێکردنێکی کوێرانە. بۆ نموونە، هیپپییەکان کە لە

شەست و حەفتاکاندا لە تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەدا بوون و دژی جەنگ و لەگەڵ ئاشتی بوون. ئەم هیپییانە لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵ جیاوازیدا بوون و دژی سەپاندنی یەک مۆدێلی ژیانکردن بوون، بەڵام هەندێکیان بە شێوەیەک مامەڵەیان دەکرد، کە لە پەرگیریدا بۆ داکۆکیکردن لەو بۆچوون و بەها و شێوە ژیانەی کە بە ڕاستیان دەزانی، لە خودی ئەو مۆدێلە زۆرەملێیە نزیک بوونەوە، کە خەباتیان دژی دەکرد. نموونەیەکی تر، نووسەر نات هێنتۆفە، کە پشتگیرییەکی زۆری لێ دەکرا لەلایەن هاوپیشە لیبراڵەکانەوە بۆ ئەو بەرگرییە سەرسەختەی کە لە ئازادی دەیکرد، بەڵام هەر ئەوەندەی هێنتۆف ڕای گەیاند کە ئەو لەو بڕوایەدایە یاسا دەبێت بەرگری لە ئاوڵەمە بکات fetus {قۆناغە سەرەتاییەکانی دروستبوونی منداڵ}، زۆر لە هاوەڵەکانی کەوتنە ناوزڕاندنی ناوبراو. هەروەها ئەو کۆنسێرڤەتیڤانەی کە لەگەڵ یاسای قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکدان و ئەو نووسەرە ڕەشپێستانەی کە دژی یاساکان هەردوو لا وەک یەک کەوتوونەتە ژێر فشاری لایەنەکانی خۆیان، تا وەها هەڵوێستێک بنوێنن کە لەگەڵ تێڕوانینی کۆی گشتی گرووپەکەیاندا دێتەوە.

بۆ دوورکەوتنەوە لە چاولێکردنێکی گەمژانە، دەبێت هەڵوێستە لەسەر هەرشتێکی سەرنجڕاکێش و جوان بکەیت، کە وات لێ دەکەن تا وەک ئەوانی تر بیر بکەیتەوە و قسە بکەیت و کردار بنوێنیت. لەبری تەسلیمبوونی کوێرانە بەوانی تر، پێویستە لە خۆت بپرسیت، کە چ شتێک لەواندا مەعقول و ڕاستە تا شوێنی بکەویت، بەبێ گوێدانە ئەوەی کە زۆرینە پەیڕەوی لێ دەکەن یان کەمینە.

## ڕەهاگەرایی Absolutism

ڕەهاگەرایی واتە بڕوابوون بە پێویستیی ڕێساکان rules، بەلام ڕەتدانەوەی حاڵەتە لەڕێسابەدەرەکان. ڕەهاگەراکان لەو بڕوایەدان کە ڕاستیی کێشەکان ڕوون و بێگومان و سادەن، لە کاتێکدا لە واقیعدا زۆربەی جار حەقیقەت ناڕوون و جێگومان و ئاڵۆزە. بە هۆی چاوەڕوانییە نامەعقولەکانیانەوە، ڕەهاگەراکان جیکەڵدانەی بیرکردنەوەیان بچووکە، هەر بۆیە لە بەردەم ئەگەری زیادەڕۆییکردن و پەلەکردندان لە حکومدانەکانیاندا. هەروەها، هەر کە بڕیاریان لەسەر شتێک دا، ئیتر بە شێوەیەکی دۆگمایی بەرگری لێ دەکەن، کە ئەمەش پێچەوانەی هەڵوێستی بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکانە. واتە ڕەهاخوازەکان چاویان لە ئاست ئەو بەڵگانەدا دادەخەن، کە دۆگماکانیان دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

کاتێک کە دەڵێن ڕەهاگەراکان موعەرەزن بۆ هەڵە و کەسانی دۆگمایین و نایانەوێت ڕاکانیان بگۆڕن، مەبەستمان ئەوە نییە کە کەسانی دی خاڵین لەم لاوازییانە. (وەکوو لە چاپتەرەکانی پێشوودا سەرنجمان دا، هەموو مرۆڤێک موعەرزە بۆ بۆ ئەم هەڵە ئەقلییانەوە و هەڵەی تریش). مەبەستەکە تەنها ئەوەیە، کە ڕەهاخوازەکان زیاتر موعەرەزترن بۆ هەڵە وەک لە کەسانی تر _ ئەمەش بە هۆی ئەو ڕقەوە، کە بۆ حاڵەتە جیاوازەکان هەیانە. گرنگە سەرنجی ئەوەش بدەین، کە تۆ دەتوانیت بڕوا بە هەندێک شتی ڕەها بهێنیت، بەبێ ئەوەی بشبیتە کەسێکی ڕەهاگەر. بۆ نموونە، دەتوانیت لەو بڕوایەدا بیت کە مرۆڤکوشتن هەموو کات لە ڕووی ئەخلاقییەوە هەڵەیە، بەلام لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا، وەکوو بەرگریکردن لە خود، ڕەوایە و شیاوی لۆمەکردن نییە.

کلیلی سەرکەوتن بەسەر ڕەگەهاگەراییدیا بریتییە لە: کاتێک دەست

دەکەیت بە لێکۆڵینەوە لە کێشەیەک، تەنانەت ئەگەر پێشتریش بیرت لێ کردبێتەوە، ئەوا خۆت ناچار بکە بە قبوڵکردنی هەقیقەت وەک ئەوەی کە هەیە، نەک وەک ئەوەی لەسەر داخوازیی خۆت سادە و سەرنجڕاکێش بێت.

## ڕێژەگەرایی Relativism

ڕێژەگەرایی تەواو پێچەوانەی ڕەهاگەراییە. لە کاتێکدا ڕەهاگەراکان بوونی هەر هەڵاوێرێک لە ڕێساکاندا ڕەت دەکەنەوە، بەڵام ڕێژەگەراکان دەڵێن، مادام هەڵاوێر لە ڕێساکاندا هەیە، کەواتە بە هیچ شێوەیەک نابێت هیچ ڕێسایەک هەبێت. هەڵەی جەوهەریی ڕێژەگەراکان بریتییە لەو بۆچوونەی کە حەقیقەت دروست دەکرێت وەک لەوەی بدۆزرێتەوە. ئەگەر کەسێک بیەوێت قسە لەسەر ڕاستیی شتێک بکات، ئەوا ڕێژەگەراکان پێی دەڵێن "تۆ باس لە حەقیقەتی کێ دەکەیت؟ چونکە حەقیقەتەکەی من ڕەنگە لەوەی تۆ جیاواز بێت." ئەوان لەو بڕوایەدان، هەرکەسێک بڕوای بە هەرشتێک هێنا، ئەوا ڕاستییە، چونکە ئەو بڕوایە لە پەیوەندیدا بەو کەسەوە ڕاستە. هەروەها ڕێژەگەرایی بڕوای بە ڕێبازی خودێتی subjectivity هەیە نەک بابەتی objectivity لە کێشە ئەخلاقییەکاندا _ بە مانایەکی تر، چوارچێوە ئەخلاقییەکان تەنها ئەو کەسانە دەگرنەوە، کە بڕوای پێ دەکەن. بۆچوونی ڕێژەگەراکان، بەکورتی بریتییە لە "ئەگەر کەسێک لەو بڕوایەدا بوو هەرشتێک کە ئەو دەیکات لە ڕووی ئەخلاقییەوە ڕێپێدراوە، کەواتە ئەو شتە لە پەیوەندیدا بەو کەسەوە درست و ڕێپێدراوە."

ڕێژەگەرایی ئیدانەی هەریەکە لە بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و لێکۆڵینەوە لە ئیتیک و پرۆسێسە یاساییەکان دەکات. مەبەست لە بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، بریتییە لە جیاکردنەوەی ڕاستی لە هەڵە {ناڕاست}، مەعقول

لـە نامەعقـول؛ کەواتـە ئەگـەر هیـچ شـتێک هەڵـە و خـراپ و نامەعقـول نەبێت {وەک ڕێژەگەرایـی دەڵێـت}، کەواتـە بیرکردنـەوەی ڕەخنەیـی دەبێت کایەیەکی بێئامانـج و بێمانـا. بە هەمـان شـێوە، ئەگـەر هەرشـتێک کە کەسـێک دەیەوێـت بیـکات، چـاک بێـت و هیـچ شـتێک خـراپ نەبێـت، کەواتـە گوتـاری ئەخلاقی شـتێکی نابێت بـۆ وتـن شـیاوی گوێلێگرتـن بێت. بـە هەمـان شـێوە، ئەگـەر بڕیـاردان بـۆ ئەنجامدانـی کارێـک خـۆی لـە خۆیدا شـەرعییەت بدات بـە ئەنجامدانـی کارەکـە، کەواتـە یاسـاکانی دژی دەسـتدرێژیی سێکسـی، منداڵبـازی و مرۆڤکوشـتن، دەبنـە پێشـێلکردنی مافـی تاوانبارەکـە.

سـادەترین تاقیکردنـەوەی هـەر بۆچوونێـک بریتییـە لـەوەی کـە ئایـا دەتوانرێـت بـە شـێوەیەکی بـەردەوام لـە ژیانـی ڕۆژانـەدا بـەکار بهێنرێـت. ڕێژەگـەراکان ناتوانـن بەبـێ دژوەسـتانەوەی خۆیـان بەرەنـگاری ڕاسـتیی بۆچوونەکانـی ئەوانـی تـر ببنـەوە. وەک چـۆن ناشـتوانن هیچـکام لـە خەتەنەکردنـی مـێ لـە باکووری ئەفەریقا، جینۆسـاید لـە چەقـی ئەورووپادا، بازرگانیـی کۆیەلـە لـە ڕۆژهـەڵات و ڕەگەزپەرسـتی لـە ئەمەریـکادا، بەبـێ نکۆڵیکـردن لـەو بڕوایـەی خۆیـان، کـە گوایـە ئەخـلاق کێشـەیەکی زاتییـە - خودییـە، ڕەخنـە بکـەن. بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ڕێژەگەراییـدا، پێویسـتە زووزوو بیهێنیتـەوە یادی خـۆت، کـە هەندێـک ئایدیا و هەندێـک سـتانداردی مامەڵەکـردن، باشـترن لەوانـی تـر و ئەرکـی بیرکردنـەوەی ڕەخنەییـە مومتـازی ناویـان بدۆزێتـەوە.

## لەگەڵ یان دژی گۆڕان

ئایـا تـۆ لەگـەڵ گۆڕانیـت یـان دژی گۆڕانیـت؟ تەنهـا وەڵامـی مەعقولـی برتییـە لـەوەی کـە "دەکەوێتـە سـەر ئـەوەی گۆڕانەکـە چییـە." هەندێـک لـە گۆڕانـەکان، کێشـەکان بـەرەو چارەسـەرکردن دەبـەن، بـەڵام هەندێکـی تـر

کێشـەکان قووڵتر دەکـەن. لەگـەڵ ئەمەشـدا، زۆر کـەس ناتوانـن بـە چاوێکی بابەتییانـەوە لـە کێشـەی گـۆڕان بڕوانـن. ئـەوان یـان ئەوەتـا لەگـەڵ گۆڕانـن یـان دژی گۆڕانـن. لایەنداری بۆ گـۆڕان لـە ئێسـتادا زیاتـرە لـە جـاران، دیـارە ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە کـە ئـێمە لـە سـەردەمێکدا دەژیـن، پـڕە لـە گۆڕانـی نوێ و کتوپڕ، بەتایبـەت لـە کایـەی تەکنەلۆژیـادا، لەبـەر ئـەوەی هەندێـک لـە گۆڕانـەکان سوودبەخشـن، ئیدی تووشـی ئـەو کاڵفامییـە دەبیـن، کـە هەمـوو گۆڕانـەکان باشـن.

بـەڵام لەگـەڵ ئەوانەشـدا لایەنداریـی دژی گـۆڕان، ئێستاشـی پێـوە بێـت، لـە لایەنداری بـۆ گـۆڕان باوتـرە. یەکێـک لـە هـۆکان بریتییـە لـە ئاشـنایەتی familiarity. ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە کـە زۆربـەی هـەرە زۆرمـان ئـەو ئایدیایانەمـان لا پەسـەندە، کـە پێیـان ئاشـناین و هـەر لەگـەڵ ئەمانەشـدا هەسـت بـە ئاسـوودەیی دەکەیـن.

کاتێـک گالیلـۆ وتـی "زەوی بـەدەوری خـۆردا دەخولێتـەوە" خەڵکـی بەمـە تـووڕە بـوون، ئەمـەش بەشـێکی لەبـەر ئـەوە بـوو، کـە هـەزاران جـار خۆرهەڵاتـن و خۆرئاوابوونیـان بـە چـاوی خۆیـان بینیبـوو، کـە خـۆر بـە جووڵانەوەکـە هەڵدەسـتا، بـەڵام بەشـەکەی تـری دەگەڕایـەوە بـۆ ئـەوەی کـە لەوەوپێش نەیانبیسـتبوو زەوی خولانەوەکـە ئەنجـام بـدات. ئایدیـا نوێکـەی گالیلـۆ بـۆ ئـەوان هەڕەشـەیەک بـوو بـۆ سـەر بڕوا جێگیرەکەیـان، کـە زەوی چەقـی کۆمەڵـەی خـۆرە. ئـەم ئایدیایـە وەک شـتێکی بێخـەوش لـە مێشـکیاندا هەڵگیرابوو. بەشـێکی بنەڕەتـی تێگەیشـتنی ئەوانـی پێـک دەهێنـا سـەبارەت بـە گـەردوون؛ بگـرە ببـوو بـە شـێک لـە دینەکەیـان. بـەڵام ئێسـتا ئـەم گالیلۆیـە لەپـڕ قـوت بۆتـەوە و داوایـان لـێ دەکات ئـەو ئایدیایـەی سـاڵانێکە وەک شـتێکی بێخـەوش لـە مێشـکیاندا هەڵیـان گرتـووە، فڕێـی بـدەن. ئەمـەش

بێگومـان پەرچەکـرداری لـێ دەکەوێتـەوە.

هـەر زووو دوای داهێنانـی پاسـکیل، خەڵکـی دەیانـوت ئـەم پاسـکیلە مایەی سەرشـۆڕییە بـۆ خانمـان، پزیشـکان دەیانـوت، پاسـکیل هۆکارێکە بـۆ هیسـتریا و شـەهوەتبازی و بێشـعوری و خۆشـی لەڕادەبـەدەر.

پزیشـەکەکان دەیانـوت، پاسکیلسواری چەنـدان حاڵەتـی لێ دەکەوێتـەوە، لەوانـە: nymphomanaia {نەخۆشـییەکی دەروونییـە، کـە نەخـۆش زیـاد لـە ڕادەی سروشـتی ئـارەزووی سـێکس دەکات}، هەسـتیاری hysteria، ورووژانـدی هەسـتی سێکسـی voluptuous sensation، حەزکـردن بـە سێکس لە دەرەوەی چوارچێوە قبوڵکراوەکانlubricious overexcitment ، تێکچوونـی هەسـتەوەری sensual madness4 . نموونـەکان لەسـەر پەرچەکـردارەکان دژی شـتە نوێـکان زۆرن؛ هەندێـک کـەس لەسـەرەتای جوولانـەوە کۆمەڵایەتییـەکان دژی ئیشـکردنی منـداڵان دەیانـوت، ئـەم جوولانەوانـە٬ پیلانگێڕیی کۆمەنیستەکانە {دژی ئازادی}. هەروەهـا کاتێک بۆ یەکەم جـار ئەستێرەناسـەکان گەیشـتنە سـەر زەوی، زۆر کـەس نەیدەتوانی بـڕوا بەمـە بـکات، بـۆ نموونـە، جارێکیـان ڕای پیاوێکـی پیریـان وەر گـرت، ئەویـش وتـی: "ئـەوەی کـە مـرۆڤ بگاتـە سـەرزەوی، هیـچ نییـە جگـە لـە مەحـاڵ، ئـەم هەواڵـە تەنهـا درۆودەلەسـەی ڕاگەیاندنـە و هیچـی تـر."

هۆیەکـی تـر کـە وا دەکات لایەنداریـی دژی گـۆڕان ئەوەنـدە بەربـڵاو بێـت، بریتییـە لـە بۆچوونـی "هـی مـن باشـترە." ئێمـە ئـەو بیرکردنـەوە و ڕەفتارانـەی کـە خوومـان پێـوە گرتـوون، وەک تەنهـا شـێوازی دروسـت دەیانبینین. ئایدیا نوێیەکان هەستی سـەلامەتبوونمان دەخەنـە مەترسییەوە، هـەر بۆیـە دەمانەوێت نکوڵییـان لـێ بکەیـن. ئـەم ترسـە تەفسیری ئەوەمـان

بۆ دەکات، کە بۆچی زۆر کەس بە هەندێک دابونەریتی بێماناوە ئەنووسین*. بۆ نموونە، پیاوی ناو هۆنراوەکەی Robert forst"دیواره چاککراوەکە" کە بەردەوام سەرقاڵی نۆژەنکردنەوەی دیواری نێوان خۆی و دراوسێکەیانە، بەبێ ئەوەی هۆیەکی باش هەبێت بۆ ئەمە، بەڵکوو تەنها لەبەر ئەوەی وەختی خۆی، باوکی هەمان شتی کردووە. بە هەمان جۆر، با سەیری ئەم نموونەیەش بکەین، کە بریتییە لە دووبارەکردنەوەی ڕێگەکەنی پێشوو بە شێوەیەکی نارەخنەیی: دایکێک بە کچەکەی دەڵێت "قەت کڵاوەکەت لەسەر مێزەکە و پاڵتۆکەشت لەسەر جێگەی نوستنەکەت دامەنێ." کچەش ئەم ئامۆژگارییە لەگوێ دەکات، بەدرێژاییی ساڵان بە وەفادارییەوە پەیڕەوی لێ دەکات. ڕۆژێکیان، پاش چەندەها ساڵ، هەمان شت بە کچە گەنجەکەی خۆی دەڵێت، کچەی منداڵیش لێی دەپرسێت، "بۆچی؟" لەو کاتەیا ژنەکە بۆی دەر دەکەوێت کە بەدرێژاییی ئەو هەموو ساڵە ئەوەندە فزوڵی نەبوو تا لەدایکی بپرسێت ئەمە بۆ. ئاخرییەکەی بەئاگا دێتەوە، پرسیار لە دایکە تەمەن هەشتا ساڵەکەی دەکات. دایکیشی لە وەڵامدا پێی دەڵێت، ئەو کاتەی من کچێکی بچووک بووم، زۆر لە منداڵانی گەڕەک ئەسپێیان پێوە بوو، هەر بۆیە دایکم تێی گەیاندم کە نابێت نە کڵاو لەسەر مێزەکە و نە قەمسەڵەکەم لەسەر جێگەی نوستنەکەم بەجێ بهێڵم." ئەو ژنە بەدرێژاییی هەموو تەمەنی کامڵبوونی خۆی تەنها جارێک پرسیارێکی ئاڕاستەی ئەو ڕەفتارە نەکرد، کە ئایا مەبەست لێی چییە، کە ئایا ڕاستە یان نا.

---

* نەکەوێتە ئەو هەڵەیەوە، کە هەتا نەریتێک کۆنتر بێت، ئەوەندە لە نرخی کەم دەبێتەوە. تەقلیدێکی دێرین، ڕێی تێدەچێ زۆر لە تازەترین ئایدیای باو ژیرانەتر بێت. دیارە تەنها ڕێگەش بۆ ئەوەی بۆت دەر کەوێت کە وایە یان نا، بریتییە لەوەی بایەخ و لێکدانەوەیەکی بابەتی بدەیتێ.

سەرەڕای ڕێگرییەکانی بەردەم گۆڕان، بەڵام هەندێک ئایدیای نوێ هەر سەر هەڵدەدەن و خۆیان دەسەلمێنن. ڕەنگە وا بیر بکەینەوە، کە ئەوانەی بۆ ئایدیا نوێیەکان دەجەنگن، ئەو ڕووبەڕووبونەوە و ڕێگرانەیان لەیاد ناچێتەوە، کە لەپێناو ئایدیا نوێیەکاندا ڕووبەڕوویان بونەتەوە. بەڵام سەیر لەوەدایە، کە هەر زوو شەڕەکانی خۆیان لەبیر دەچێتەوە. لە ڕاستیدا، ئەمانیش هەندێک کات، هەمان هەستی ترس و ناسەلامەتیی هەست پێ دەکەنەوە کاتێک ئایدیا نوێکانیان دەکەونە بەردەم نەشتەری ڕەخنەوە لەلایەن ئەوانەوە، کە داوای گۆڕان دەکەن. یەکێک لە نموونەکان دەتوانین لە کایەی دەروونناسیدا ببینین. سیگمۆند فرۆید و شوێنکەوتووەکانی، تەنها لەبەر ئەوەی دەیانوت ڕەهەندی سێکسی ڕەهەندێکی بەهێزە لە دروستبوونی کەسایەتیی مرۆڤەکاندا، زۆر بەتوندی هێرشیان کرایە سەر و پەراوێز خران لەلایەن کەسانێکەوە کە سەردەمانێک خۆیان ئاڵاهەڵگری ئایدیای نوێ بوون. ئەو ڕق و دوژمنایەتییە بەرامبەر فرۆید هەبوو، لەڕاستیدا ئەوەند بەهێزبوو، تەنانەت شابەرهەمەکەشی *لێکدانەوەی خەونەکان*، کە لە ۱۹۰۰دا چاپ کرا فەرامۆش کرا، بە ئەندازەیەک، کە ئەم بەرهەمە مەزنە بەدرێژاییی ۸ ساڵ ئینجا ٦٠٠ دانەی لێ فرۆشرا.

بەڵام پاش ئەوەی ئایدیاکانی فرۆید قبوڵ کرا، شوێنەکەوتووانی بۆچوونەکانی لێبووردەتر نەبوون؛ لە ڕاستیدا ئەمانیش بەتوندی هەر ڕەخنەیەکیان ڕەت دەکردەوە، کە ڕووبەڕووی بۆچوونەکانی فرۆید دەکرایەوە. بۆ نموونە، کارین هۆرنی یەکێک بوو لەو نووسەرانەی کە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی فرۆید کۆک نەبوو کە دەیوت، "ئیرەییبردنی پێ بە پیاوبوونی پیاو penis envy" هۆکارێکی سەرەکییە لە دارشتنی کەسایەتیی ژندا. ئەم نووسەرە ژنە لەو بڕوایەدا بوو، نەخۆشیە دەروونییەکان زیاد لە هۆکارێکیان هەیە و ناکرێت تەنها هۆکاری سێکسی

بـە تەنها هـۆکار بدەیەنـە قەڵـەم، بەڵکوو هـۆکارە کولتوورییەکانیـش ڕۆڵـی بەرچـاو دەگێڕن. هـەر لێرشـەوەیە کـە دەتوانرێت هەوڵـی چارەسـەرکردنی نەخۆشییە دەروونییـەکان بدەیـەن، بـۆ نموونە، بە دەسـتکاریکردنی تێڕوانینی کەسـە نەخۆشـەکان بـۆ خـودی خۆیـان. دەسـتکەوتی ئـەم بۆچوونانـە (کـە ئەمڕۆ بـە شـێوەیەکی بەربـڵاو پشـتگیریی لـێ دەکرێـت) ئـەوکات لەلایـەن شـوێنکەوتووانی فرۆیـدەوە بریتـی بـوو لـەوەی کـە ئـەم خانمـە نووسـەرە زۆر بەتونـدی ڕەخنـەی لـێ بگیـرێ و ڕەت بکرێتـەوە.

بـۆ زاڵبـوون بەسـەر دژبـوون یـان لایەنداریکردنـی گـۆڕان، چاودێریـی کاردانەوەکانـی خـۆت بکـە لـە ئاسـت ئایدیـا نوێکانـدا. بەلاتـەوە سـەیر نەبێـت ئەگـەر لـە کاتـی ڕووبەڕووبوونـەوەی ئایدیایەکـی نوێـدا، حـەزت بـە قبوڵکـردن، یـان ڕەتدانـەوەی کـرد. کاردانـەوەی یەکەمـت بـە شـێوەیەکی نارەخنەیی هەرگیـز قبـوڵ مەکـە. بەڵکـوو حوکمـدان بەسـەر ئایدیاکـەدا دوا بخـە بـۆ کاتێـک، کـە بـە شـێوەیەکی بـاش ئایدیاکـە تاقـی دەکەیتـەوە. بەبێ لەبەرچاوگرتنـی کۆنـی یـان تـازەی ئایدیاکـە، قبوڵـی بکـە، ئەگـەر دەر کـەوت بنچینەیەکی بەهێزی هەیـە و بـاش بیـری لـێ کراوەتـەوە، ڕەتیشـی بکـەرەوە ئەگـەر وا نەبـوو.

# ڕاهێنانەکان

هەریەک لەم دیالۆگانەی خوارەوە تاقی بکەرەوە. بە شێوەیەک، کە هەموو گریمانەکان دەستنیشان بکەیت بەوردی و بەدیقەت. پاشان هەوڵ بدە بڕیار بدەیت، کە ئایا بۆ هەر گریمانەیەک پاساوی مەعقول هێنراوەتەوە یان نا.

a.. ئیلفا: هەواڵە خۆشەکەت بیستووە؟ پێدەچێ ئەمساڵ قوتابخانە لە کاتی خۆیدا نەکرێتەوە.

ئۆلگا: ئەمە چۆن؟

ئۆلفا: ڕەنگە مامۆستاکان مان بگرن.

ئۆلگا: مانگرتن؟ چەند بێمانایە. بەڵام ئەوان موچەیەکی باش وەردەگرن.

b. جانیس: ئەمشەو چ فیلمێک پیشان دەدرێت لە سینەما؟

مایک: ناوی فیلمەکە نازانم. بەس دەزانم کە لەسەر لیزبیانەکانە {هاوڕەگەزبازی مێ}. ئەتەوێت سەیری بکەیت؟

جانیس: نا، سوپاس. چاوەڕێی بەرهەمێکی مانادار دەکەم.

c. بۆریس: نیلسۆن خراپترین مامۆستایە. نمرەدانانەکەی زۆر نادادپەروەرانەیە.

بریگێت: بۆچی؟ چیی کردووە؟

بۆریس: چیی کردووە؟ لە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵدا پەنجای بۆ داناوم، پاش ١٢ کاتژمێر کۆششکردنی بەردەوام. ئەڵێی هەر ئێستا بچم لەلای ڕاگری کۆلێژ سکاڵا بکەم.

d. سمس: هاریسن و ژنەکەی کێشەی خێزانییان هەیە. گرەو دەکەم ئیتر پێکەوە ناخەون.

جۆنس: چۆن دەزانی؟

سمس: لە سوپەرمارکێتەکە زانیم. هێلین بە گەیلی وتبوو، گەیلیش بە منی وت.

جۆنس: هەر لە سەرەتاوە زانیم ئەم هاوسەرگیرییە سەر ناگرێت. جێب هاریسن پیاوێکی زۆر وەڕسکەرە. لۆمەی ڕوز ناکەم گەر لێی جیا ببێتەوە.

٢. توانای بیرکردنەوەی ڕەخنەییی خۆت بەسەر ئەم حاڵەتانەی خوارەوەدا جێبەجێ بکە. دڵنیا بە لەوەی ئاگاداری هەموو گریمانەکانی خۆت هەیت و بڕیار بدە لەسەریان، ئایا لەسەر بناغەیەکی بەهێز بنیات نراون.

a. لە شاری کامبریج، پیاوێک ئەوەندە قەڵس دەبێت بە چیمەنە نەبڕاو و دەوەنە بەرزەکانی دراوسێیەکەی کە گەیشتۆتە پەنجەرەی دووەمی ماڵەکەی، دەچێت لە دادگا سکاڵا دەکات. دراوسێی کابرا لە دادگا دان بەوەدا دەنێت کە بۆ ماوەی چوارده ساڵە نە چیمەنەکەی بڕیوە و نە دەوەنەکەش، بەڵام بەرگری لە خۆی دەکات و دەڵێت من حەزم لەوەیە باخچەکەم شێوەیەکی سروشتیی هەبێت، نەک دەستکرد، بۆیە نایانبڕم. حاکم بڕیار دەدات کابرا مافی سروشتیی خۆیەتی باخچەکەی بەو شێوەیە بهێڵێتەوە، کە دڵی دەیخوازێت. لەو بڕوایەدایت بڕیاری

دادوەرەکە دادوەرانـە بـووە؟

b. هەندێـک لـە باوانـەکان {دایـک و بـاوکان} کـە کـچ و کوڕەکانیـان خوێنـدکاری زانکـۆن، لـەو بڕوایـەدان منداڵەکانیـان لەلایـەن گروپـە دینییەکانـەوە بـە لاڕێدا دەبرێـن. بۆیـە منداڵەکانیـان لـە زانکـۆ دەر دەکـەن. ئایـا دەبێـت ڕێیـان پـێ بدرێـت تـا ئەمـە بکـەن؟

c. هەندێک لـە باوانـەکان منداڵەکانیان نانێرنـە قوتابخانـە، لەبـەر ئـەوەی پێیان وایـە لـە ماڵـەوە دەتوانن باشتر پەروەدەیان بکەن. ئایا دەبێت ڕێیان پێ بدرێت؟

d. زۆر لـە ماتۆڕسـوارەکان ڕەخنـە لـە یاسای ئـەو ویلایەتانـە دەگرن، کە ماتۆڕسـوارەکان و نەفەرەکانیش ناچـار بـە لەسـەرکردنی کڵاوی سـەلامەتی دەکەن. لـەو بڕوایەدایت کـە ئـەوان دەبێت ئازاد بن لـەوەی بڕیار بدەن کڵاو بکەنـە سـەریان یان نـا. ئایا لەگـەڵ بۆچوونی ماتۆڕسوارەکاندا کۆکیت؟

٣. هەریـەک لـەم گوزارانـەی خـوارەوە بـەوردی بخوێنـەرەوە، ئایا هیـچ هەڵەیەکی تێدایە. ئەگـەر هەڵەیـەک هەبوو، دەستیشانی بکە و بـە شـێوەیەک ڕوونـی بکـەرەوە، کـە ئەگـەر کەسـێک ئـەم چاپتەرەشـی نەخوێندبێتـەوە، بتوانێت تێبگات.

a. تاکە شـوێنگرەوەیەک بۆ هەڵوێسـتێکی، کارێکی پۆزەتڤانـە، وەرگرتنی جیاکردنەوەیە دژی کەمینەکان؟

b. ئێمە یان دەبێت بڕوا بە کرەیشـنیزم {واتە بڕوابوون بە دروسـتکردنی گـەردوون و ژیان لەلایـەن خـوداوە} بکەین، یاخـود بـە تیۆریی پەرەسـەندن. واتـە شـتێکی تـر لـەو بەینـەدا نییـە.

٤. هەندێـک نموونـە بـۆ خۆگونجاندنـی {خـۆ وەک ئەوانـی تـر لێکـردن، لاساییکردنەوەی ئەوانـی تـر}ی ویسـتراو {بـاش}، لەگـەڵ هەندێـک

خۆگونجاندنی نەویستراو {خراپ} بهێنەرەوە. ڕوونی بکەرەوە بۆچی لات ویستراو یان نەویستراون.

٥. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ڕیکلامەکان بە شێوەیەک دیزاین کراون، تا حەزی لاساییکردنەوە {خۆ وەک ئەوانی تر لێکردن} زیاد بکەن. بەلایەنی کەمەوە سێ ڕیکلامی چاپکراو، یان ڕیکلامی تەلەڤزیۆنی باس بکە، کە بەم شێوەیە دیزاین کراون. پاشان ڕوونی بکەرەوە کە چۆن دەبنە هۆی زیادکردنی حەزی چاولێکەری، بە شێوەیەک، کە ئەو کەسەشی ئەم چاپتەرەی نەخوێندۆتەوە، بەباشی تێبگات.

٦. لە هەریەک لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا، کەسێک سەرقاڵی خۆ وەک ئەوانی تر لێکردنە. لە هەریەک لەو حاڵەتانە بکۆڵەرەوە و ئەو لاساییکرنەوەیە کە کەسەکان پێی هەڵدەستن، چ کاریگەرییەکی لەسەر خۆیان و کەسانی چواردەوریان جێ دەهێڵێت. بەرمەبنای ئەو کاریگەرییانە بڕیار بدە، ئایا لاساییکردنەوەکە خوازراوە یان نا. ئایا بڕیارەکەت بەرمەبنای بڕی لاساییکرنەوەکەیە، یان ئەو کەشەی بارودۆخەی کە لاساییکردنەوەکەی تێدا ڕوو دەدات، بە هەرحاڵ، ڕوونی بکەرەوە لە چ دۆخێکدا لاساییکردنەوەکەت لا پەسەندە و بۆچیش.

a. بێرت، کوڕێکی سیازدە ساڵانە. هاوڕێکانی زۆر کەتنبازن، بەدوای فرسەتێکدا دەگەڕێن، تا سووکایەتی بە خەڵک بکەن. ئەگەر یەکێک لە قوتابییانی پۆلەکەیان قەڵەو بێت، یا شەرمن بێت، یان زۆر زیرەک نەبێت، ئیتر ئەوان لێی دەکەن بە هەلا. ئەگەر ئەو قوتابییەش توورەبوونی پیشان دا، ئیتر ئەوان لێی نابڕنەوە. چونکە وەک هێمایەک بۆ لاوازیی کەسە وەری دەگرن. بێرت دەزانێت ئەم ڕەفتارانە هەڵەیە و هیچ چێژێکیشی لێ

وەر ناگریت، بەڵام بۆ ئەوەی لاواز دەر نەکەویت لە بەردەم هاوڕێکانیدا، بەردەوامە لە هاوڕێیەتییان و بگرە جاربەجاریش بەشدار دەبێت لەگەڵیاندا. ئەو باش دەزانێت ئەگەر بەتەواوەتی لەگەڵیاندا نەبێت، ئەوا هاوڕێکانی وەک کەسێک دژایەتیی دەکەن.

b. ڕۆز لە کارگەیەکی جلوبەرگ کار دەکات. پاش ماوەیەک لە کارکردن، بۆی دەر کەوت بەرهەمی کرێکارەکانی تر بە شێوەیەکی زۆر نامەعقول کەمە، بە ئەندازەیەک، ئەو دەیتوانی دووئەوەندی ئەوان کار بکات، بێ ئەوەی خۆی زۆر ماندوو بکات. بەڵام ئیشکەرە خاووخلیچکەکان بەم ڕێگە یان بەو ڕێگە تێدەگەیەنن، ئەگەر ئەم بەم گورجوگۆڵییە کار بکات، خاوەن کارەکە بە خاووخلیچکیی ئەوان دەزانێت و داوای کاری زیاتریان لێ دەکات. بەڵام باش دەزانێت ئەگەر وا بکات، ئەوا هەمووان پشتی تێ دەکەن و دەیخەنە پەراوێزەوە، لەبەر ئەوە، ئەویش بڕیاری دا وەک ئەوان کار بکات.

c. ئەلێکس نوێنەری ماسیگرەکانە لە پەرلەمان. لە گەرمەی گفتوگۆکردنی بابەتێکی گرنگدا، لۆبیکارێکی بەتوانا لێی نزیک دەبێتەوە و پێی دەڵێت، ئەگەر بەم شێوەیە دەنگ بدەیت کە پێت دەڵێم، ئەوا داهاتووی سیاسیت ڕوو لە باشی دەکات. ئەم لۆبیکارە باسی چەند نوێنەرێک بۆ ئەلێکس دەکات و پێی دەڵێت تۆ بڕۆ بیانهێنە سەر ئەو بڕوایەی کە بەم شێوەیە دەنگ بدەن، کە پێم وتی. ئەلێکس پێیان دەڵێت و ئەوانیش لە بەرامبەردا وەڵامی دەدەنەوە "ئێمە دەنگ دەدەین بەو لایەنەی کە داوای دەکەیت، تۆش ئەگەر پشەکەی خۆت بەلاوە گرنگە، هەمان شت بکە" ئەویش ئامۆژگارییەکەیان بەگوێ دەکات و هەمان هەڵوێست دەنوێنێت.

٧. تۆ زیاتر مەیلت بەلای ڕەهاگەرایيدایە یان بەلای ڕێژەگەرایيدا؟ لە کام کایەیەدا زیاتر ئەگەری ئەوە هەیە بۆچوونی هەڵەی لەم چەشنەت

{واتـە ڕەهاگەرايـی و ڕێژەگەرايـی} هەبێـت؟ سياسـەت؟ ئايـن؟ كێشـە كۆمەلايەتييـەكان؟ كێشـە ئەخلاقييـەكان؟ وەلامێكـی ورد و بەديقـەت بدەرەوە. هەتـا باشـتر خـۆت بناسـيت و بزانيـت لـە چ بوارێكـدا زياتـر ئەگـەری ئـەوە هەيـە بكەويتـەوە هەڵـەوە، ئەوەنـدە زياتـر ئەگـەری سـەركەوتنت بەسـەر كێشـەكاندا دەبێتـە ئەگەرێكـی زينـدوو.

٨. ئايا زياتر لەگەڵ گۆڕانيت يان دژەگۆڕانيت؟ ئايا لـە هەندێك بـواری ژيـان لەگەڵيت و لەوانـی تـر دژيت؟ چەندێك دەتوانـی ورد بە لـە وەلامەكانتا.

٩. هەريـەك لـەم گوزارانـەی خـوارەوە پێشـنيارى گۆڕانێك دەكـەن. بزانـە كاردەنـەوەی تـۆ بەرامبـەر پێشـنيارەكان ئەرێنييـە يـان نەرێنـی، يـان هەندێـك كات لەبەينـی هەردووكيانـدا. پاشـان يەكەبەيەكـە ئايديـاكان هەڵبسـەنگێنە، دڵنيـا بـە لـەوەی هـەر لايەنگريەكـت هەيـە، وەلای دەنێيـت، تـا بتوانيـت بـە شێوەيەكی بابەتـی حوكميـان لەسـەر بدەيت. {ڕەنگـە هەندێـك لـەم ڕاهێنانانـە بێمانـە دەر بكـەون، لـەو ڕووەوە كـە چـۆن دەشـێت داوای گـۆڕان لـە هەندێـك لـەو شـتانەدا بكەيـەن، كـە سـالانێكی زۆرە لەسـەری ڕێـك كەوتووين. بـەلام ڕاهێنانـەكان لـەوەدا مانـادارن كـە وامـان لـێ دەكات بيـر لـەو هۆيانـە بكەينـەوە، كـە حوكمەكانمـان لەسـەر بنيـات نـاوە}.

a. سـەروەريی قـەومـی، نەتـەوەی هەمـوو نەتـەوەكان، بـە ئەمەريكاشـەوە دەبێـت دەسـتی لـێ هەڵبگيرێـت بـۆ نەتـەوە يەكگرتـووەكان، تـا چيـدی ئـەم سـنوورە دەسـتكردانە مرۆڤـەكان لـە يەكـدی دانەبـڕن.

b. شەڕەكەڵەشـێر و شەڕەسـەگ و شـەڕەگا، پێوسيتە لـە ڕێـی تەلەڤزيۆنەكانـەوە بـلاو بكرێنـەوە، تـا ئـەو بينـەرە كەمانـەی چێـژ لـەم جـۆرە "وەرزش"ـە دەبينـن، لـە مافـی بينينـی ئـەوەی حـەزی لـێ دەكـەن، دانەبڕێـن.

c. پێويسـتە دادگای فيدڕاڵـی ياسـايەك دەر بـكات، كـە ژنـان لەپـاش

هاوسەرگیریش هەر بە ناوی خۆیانەوە بمێننەوە (واتە قەدەغە بکرێت کە بە ناوی مێردەکەیانەوە بانگ بکرێن).

d. گۆڕستانەکان دەبێت دەرگاکانیان بە ڕووی ئەو کەسانەدا کراوە بێت، کە بۆ کاتبەسەربردن ڕووی تێ دەکەن و هەندێک چالاکیی تێدا ئەنجام بدەن. چالاکیی وەکوو پاسکیللێخوڕین، ڕاکردن، ماسیراوکردن، پیاسەکردن و وەرزش بەگروپ (دیارە ئەوەی کە شیاو بێت بۆ ئەو شوێنە بچووکە).

e. کارمەندانی بەندیخانە، چ ئەوانەی فیدڕاڵ و چ ئەوانەی ناوەند، دەبێت بە ڕۆژ ڕێ بەو بەندانە بدەن کە نەخۆشیی دەروونییان هەیە، تا بێنە دەرەوە و بەدوای ئیشدا بگەڕێن و لە کۆلێژەکاندا وانە بخوێنن (ئەم حاڵەتە تەنها سایکۆپاسەکان ناگرێتەوە).

f. کۆلێژەکان دەبێت مەرجێکی نوێ دانین بۆ ئەو خوێندکارانەی دەیانەوێت لە زانکۆکاندا بخوێنن، ئەویش ئەوەیە کە هیچ قوتابییەک مافی هاتنەزانکۆی نییە، تەنها ئەوانە نەبێت، کە بۆ ماوەی سێ ساڵ یان زیاترە ئامادەییان تەواو کردووە.

g. بۆ ئەوەی ڕێژەی بەشداری دەنگدان زیاد بکرێت، باشترە بلیتی یانیسب بدرێت بە دەنگدەران (خەڵاتەکەش لەلایەن کۆمپانیا جۆربەجۆرەکانەوە تەرخان بکرێت).

h. ئەوانەی کە خانەنشین دەکرێن، دەبێت وەک یاریدەدەری مامۆستاکان دابمەزرێن، تەنانەت ئەگەر بڕوانامەی زانکۆشیان نەبێت.

i. هەموو تاکێک دەبێت ناسنامەی نەتەوەییی پێ بدرێت و ناچاریش بکرێت بەردەوام هەڵی بگرێت، تا وەک هاووڵاتییەکی ئەمەریکی خۆی بناسێنێت.

j. کەنیسە و پەرستگای جوولەکەکان دەبێت هەموو ئەو سنوورانەی لە بەردەم ژناندا دایان ناون تا بەشداری نەکەن لە ئاهەنگە میوزیکییە

ئایینییەکان و پیدانی ئامۆژگاری، هەڵی بگرن. هەروەها دەبێت ڕێیان پێ بدرێت وەکوو وەزیر و قەشە و مالووم {واتە مەلا لە ئایینی جوولەکەدا} دەستبەکار بن.

k. زانکۆ دەبێت پارەی زیاتر لە قوتابییانی قوناغی سێ و چوار وەر بگرێت، وەک لە قوتابییانی قۆناغی یەکەم و دووەم.

١٠. Bill Beausay کە دەروونناسێکی بواری وەرزشییە، ڕای وایە وەرزشیش وەک جۆری فیلمەکان دەبێت پۆلێن بکرێن بۆ X، R، G {x بۆ سەرووی هەژدە ساڵ، R بۆ خوار هەژدە، G بۆ منداڵ} ئەمەش بە گوێرەی ئەو خەتەریات و توندوتیژییەی لە وەرزشەکاندان. ئەو دەڵێت، بە هیچ جۆرێک نابێت منداڵ بەشداریی وەرزشی پلەی X بکات. ئەم جۆرە وەرزشە بریتییە لە ماتۆرسواری، پێشبڕکێی ئۆتۆمۆبیل، هۆکی، تۆپی پێ، بۆکسێن و پێشبڕکێی ئەسپسواری. بڕیار بدە لەوەی کە ئایا ئەم پێشنیارە حەکیمانەیە. دڵنیا بە لەوەی بەرەنگاری ئەو مەیلە دەبیتەوە، کە دژی گۆڕانە.

١١. بڕیاری خۆت بە قبوڵکردن یان ڕەتدانەوە لەسەر هەریەک لەم ئارگۆمێنتانەی خوارەوە بدە. دڵنیا بە لەوەی هەم بیرکرنەوەی "هی من باشترە" و هەم هەموو ئەو هەڵانەی تریش کە لە بیرکردنەوەدا ڕوو دەدەن و لەم چاپتەرەدا ئاماژەیان پێ دراوە، کۆنترۆڵ دەکەیت و دوور دەکەویتەوە لێیان، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بێلایەن و بابەتی حوکمیان لەسەر بدەیت. ئەگەر ویستیشت، دەتوانی پێش ئەوەی بڕیاریان لەسەر بدەیت، لێکۆڵینەوەی زیاتریان لەسەر ئەنجام بدەیت.

a. ڕیکلامکردن بۆ بیرە و شەراب لە تەلەڤزیۆنەکانەوە دەبێت قەدەغە بکرێت، چونکە ئەو ڕیکالامانە خواردنەوە مەزن دەکەن، بە شێوەیەک،

کە خەڵکی هەست بە خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و بەختەوەری بکەن لە کاتی خواردنەوەدا. دیارە ئەم جۆرە ریکلامە هەڵخەڵەتێنەرانە، کەمتر ترسناکتر نین لە ریکلامە خراپەکانی جگەرە. ڕیکلامکردن بۆ خواردنەوە کحولییەکان بەدڵنیاییەوە هۆکارێکی کاریگەرە لە زیادکردنی خواردنەوە و خراپبەکارهێنانی مادده کحولییەکان، هەم لەسەر کەسە پێگەیشتووەکان و هەم لەسەر گەنجەکان.

b. هەڵبژاردنی شاجوان لە ئێستا بە ڕووکەش زیاتر لەسەر توانا ناوەکییەکانە وەک لەسەر جوانیی ماددی، وەک لە کۆندا باو بوو. بەڵام پێوەرە شاراوەکە هەر هەمان شتە "جوانی لە ئافرەتاندا بە پلەی یەکەم مەسەلەیەکی ماددییە. تەنها ئەوانە دەتوانن بەشداریی پێشبڕکێکە بکەن، کە خاوەن سینگێکی پڕ و دەموچاوێکی جوان و بەژنوباڵایەکی بەرز و ڕێکن." ئەم جۆرە هەڵبژاردنانە سووکایەتی بە پێوەرە ڕاستەقینەکانی ژنی (یان پیاوی) ڕاستەقینە دەکات، کە بریتییە لە جوانی ناخ و کەسایەتی.

c. *تێبینییەک لەسەر باکگراوندی ئارگومێنتەکە: یەکێک لەو هۆیانەی کە وای کردووە کێشەی دادگاکان زۆرتر بن، بریتییە لەو سکاڵانامانەی کە بەندکراوەکان لە دژی حکومەتی مەرکەزی یان حکومەتی فیدراڵی بەرزی دەکەنەوە، بۆ نموونە، سکاڵا لە دژی خواردنی ڕۆژانەی بەندکراوەکان، چونکە بەدڵی ئەوان نین. لە کتێبخانەی بەندیخانەدا کتێبی یاسایی هەیە، کە بەندکراوەکان سوودی لێ دەبینن بۆ ئامادەکردنی سکاڵانامەکانیان. بوونی ئەم جۆرە کتێبانە لە کتێبخانەی بەندیخانەکاندا هاوکاریی بەندکراوەکان دەدەن، تا ئەو جۆرە سکاڵایانە بنووسن.*

*ئارگومێنتەکە:* ئەم سکاڵانامە بێمانایانە دادگاکانیان پڕ کردووە. هەبوونی کتێبە یاساییەکان لە کتێبخانەی بەندیخانەکاندا هانی بەندکراوەکان دەدەن تا ئەم جۆرە سکاڵایانە بنووسن. هەر بۆیە دەبێت ئەم جۆرە کتێبانە لە کتێبخانەی بەندیخانەکاندا دەربهێنرێن.

d. کاروبارەکانی سەرۆکایەتی لە ئەمەریکا لەوە زۆرتر و گرانترە، کە بەتەنها بە یەک کەس بەئەنجام بگەیەنرێن، کەواتە پۆستی سەرۆکایەتیی ئەمەریکی دەبێت لە تەنها کەسێکەوە بگۆڕێت بۆ بۆردێکی سێکەسی.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی ئەو تاوانانەی پاڵنەرەکەیان ڕقلێبوونەوەیە لە قوربانی. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماقوڵترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولییەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان بە شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

**دیبەیت لەسەر ئەو تاوانانەی پاڵنەرەکەیان ڕقلێبوونەوەیە لە قوربانی hate crimes:**

هەنووکە لە زۆر وڵاتدا یاسای تایبەت هەیە کە سزای داناوە بۆ تاوانە ڕق-هۆکارەکان، بە شێوەیەک، کە ئەو سزایە توندترە لەسەر هەمان

تـاوان، لـە کاتێکدا کـە بـە پاڵنـەری جیـاوازی ڕق ئەنجـام درابێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە تاوانـە "ڕق-هـۆکارەکان" پێناسـەی جیـاوازی بـۆ دەکرێـت، بـەلام بـە شـێوەیەکی گشـتی، دەتوانرێت پێناسـە بکرێت بـەو تاوانانـەی کـە کەسـێک بـە هـۆی یەکێـک لـەم هۆکارانـەوە ڕووبـەڕووی دەسـتدرێژی و تـاوان دەبێتـەوە: ڕەگـەزی، ڕەنگـی پێسـتی، ئینیمـای نـەژادی و نەتەوەیـی، بنەچەیـی، ئاینـی، یان بـە هـۆی کەمئەندامێتییـەوە. هەندێک لە کاربەدەسـتانی حکومـی داوە دەکـەن سـزای ئـەم تاوانانـە توندتر بکرێتـەوە لـەوەی هەیـە. ئـەوان دەڵێـن، بـە هـۆی توندترکردنـی سـزاکەوە هـەم قوربانییانـی ئـەم جۆرە تاوانـە دەپارێزرێن و هـەم پەیامێکی هۆشـیارکەرەوەش دەنێرن بـۆ تاوانکاران، کـە بـە هیـچ شـێوەیەک لـەو کەسـانە خۆش نابین، کـە هەوڵـی سڕینەوەی جیاوازییـەکان دەدەن. بـەلام لـە بەرامبـەردا کەسـانێک هـەن کـە ڕای جیاوازیـان لەمـەڕ کێشـەکەوە هەیە. ئـەوان دەڵێن، هەموو ئـەو تاوانانەی لەژێـر نـاوی "تاوانـە ڕق-هـۆکارەکان"ەوە پۆلێـن کـراون، وەکـوو تەخریـب و ناوزڕانـدن و کوشـتن، ڕوو دەدەن، جـا بەبـێ بوونـی ڕق یـان بـە بوونـی ڕق، هەروەهـا هەنووکـە یاسـا هەیـە بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو تاوانانـە. هەروەهـا ئـەوان دەڵێن، تەنهـا ڕێگـە بـۆ زانینی ئـەوەی کـە چی لـە خەیاڵی تاوانبارەکاندا بـووە لـە کاتـی ئەنجامدانی تاوانەکەیاندا، ئەوەیە کە بکەوێتـە گفتوگـۆ لەگەڵیانـدا. هەروەهـا ئـەم کەسـانە دەڵێـن ئـەوەی کـە دوو جـار سـزای کەسـێک بدەیـت، جارێـک بـۆ ئـەوەی کردوویەتـی و جارێکـی تریش بـۆ ئـەوەی بیـری لـێ کردۆتـەوە، لـە ڕاسـتیدا نەگونجـاوە بـۆ کۆمەڵگەیـەک، کـە بـە دەسـتوور فەراهەمـی مافـی "ئازادیـی ڕادەربڕینـی" دەکات.

# چاپتەری دەیەم

# ئەو هەڵانەی لە کاتی بەئەنجامگەیاندنی پرۆسەدا ڕوو دەدەن

## Errors of Procedure

لە چاپتەری نۆدا، هەڵەکانی ناو بۆچوونەکانمان، دیدەکانمان بەسەر کردەوە کە لەمپەری گەورە لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا دروست دەکەن، تەنانەت پێش ئەوەش کە ئێمە بچینە قۆناغی گوزارشتکردن لە کێشەکانەوە. لەم چاپتەرەدا لەو هەڵانە دەکۆڵینەوە، کە لە پرۆسەی گوزارشتکرن لە هەندێک کێشەی دیاریکراودا ڕوو دەدەن، لەو هەڵانەش، وەکوو: *گرنگیدانێکی نایەکسان بە بەڵگەکان، دوو ستانداری، ئەنجامگیریی پێشوەخت، زیادەڕۆییکردن لە گشتاندن و نموونەی باودا، زیادەڕۆییکردن لە سادەکردنەوەدا و هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدار.*

### گرنگیدانێکی نایەکسان بە بەڵگەکان

وەک ئەوەی کە بۆمان دەر کەوت کە لەگەڵ ئەوەشدا خۆشە وا بزانیت بە شێوەیەکی بێلایەنی و بابەتی لە کێشەکان دەکۆڵیتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەدەگمەن نەبێت، ئەمە ڕوو نادات. چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە لایەک لە لایەنەکاندا هەر مەیلان دەبین. لەگەڵ ئەمەشدا، هیچ شتێکی سەیر یان شەرمهێنەر لەم ڕاستییەدا نییە. چونکە ئەمە کاردانەوەیەکی

سروشتییە بۆ تۆ و بۆ هەموو کەسێکی تریش. لەگەڵ ئەمانەشدا، گرنگە تێبگەیت چۆن ئەم مەیلە دەشێت تووشی هەڵەی گرنگیدانی نایەکسانیی بەڵگەکانت بکات. یەکێک لە شێوەکان، ئەم هەڵەیە بریتییە لە گەڕان تەنها بەدوای ئەو بەڵگانەدا، کە پشتڕاستی ئەو دیدە دەکاتەوە، کە بەلاتەوە ڕاستە. شێوەکەی تری ئەم هەڵەیە کاتێک ڕوو دەدات، کە ڕووبەڕووی ئەو بەڵگانە دەکرییتەوە، کە بەرەنگاری دیدە پەسەندەکەی تۆ دەکەنەوە ـ لەم حاڵەتەدا گرنگی بەو لێکدانەوەیە دەدەیت، کە پشتگیریی دیدەکەی تۆ دەکەن، لە کاتێکدا لێکدانەوەی تر هەن کە زۆر مەعقولترن، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕووبەڕووی بۆچوونەکەت دەوەستنەوە، گرنگیی تەواویان پێ نادەیت. لە لێکۆڵینەوەیەکدا، Thomas Gilovich پیشانی داوە کە لە کۆی بیرکردنەوەکانی ڕۆژانەماندا، ئەو دوو جۆرە هەڵەیە ڕوو دەدەن کە باس کران.

با سەرنجی ئەم نموونەیە بدەیەن، کە لەسەر هەڵەی لەبەرچاوگرتنی بەڵگەکانە بە شێوەیەکی نایەکسان، با وای دانێین داوات لێ دەکرێت هەڵوێستی خۆت دەر بڕیت لەسەر ئەوەی کە ئایا مافی وانەوتنەوەی بەردەوام بۆ مامۆستایانی زانکۆ tenure کاریگەریی پۆسەتڤی دەبێت لەسەر چۆنێتیی وانەوتنەوە یاخود نا*. هەڵوێستی بەرپرسیارانەی تۆ بەرامبەر ئەم کێشەیە کاتێک دەبێت، کە هەم بەڵگەی ئەوانەی پشتگیریی ئەم مافە دەکەن و هەم ئەوانەشی ئەم مافە ڕەت دەکەنەوە بە شێوەیەکی یەکسان هەڵ بسەنگێنیت. بەڵام ئەگەر هەڵوێستەکەت لایەندارانە بێت،

* tenure واتە مافی وانەوتنەوەی بەردەوام، کە زۆر جار دوای ئەزموونێکی درێژخایەنی وانەوتنەوە بە مامۆستاکە دەدرێت. کاتێکیش مامۆستایەک بووە خاوەنی ئەم مافە، ئیدی زۆر زەحمەتە بۆ زانکۆ تا لەسەر کار لای ببات، مەگەر مامۆستاکە هەڵەیەکی زەق و گەورە بکات. لەگەڵ ئەمەشدا، وانەوتنەوە لە خوار ستانداردی داوا کراوەوە بۆ وانەوتنەوە بەدەگمەن نەبێت، کێشەیەک بۆ ئەم جۆرە مامۆستایانە دروست ناکات.

ئەوا گرنگیی زیاتر دەدەیت بە بەڵگەکانی لایەک و بەڵگەکانی تر نادیدە دەگریت. بە هۆی ئەمەشەوە، ڕەنگە بەڵگەی زۆرت بەرچاو بکەویت، بە شێوەیەک، کە براوا بە خۆت ببینیت کە ڕێی تێ ناچێت شتێکی ماندار لە سەر ڕای بەرامبەر بوترێت. بەڵام لە ڕاستیدا، تۆ هەرگیز ئەمە نازانیت، چونکە کە تۆ هەر لە سەرەتاوە گرنگی *بە بەڵگەکانی بەرامبەر نەدەیت و چاویان لە ئاستا دابخەیت،* ئیدی چۆن دەتوانیت بزانیت.

خراپترین ڕەهەندی ئەم جۆرە هەڵەیە، ئەوەیە کە زۆر جار ناخودئاگایانە ڕوو دەدات، هەروەها ئەوە تەنها قوتابییاکان نین کە دەکەونە ئەم هەڵەیەوە. بگرە تەنانەت هەندێک جار لێکۆڵەرە پرۆفیشناڵەکانیش تێی دەکەون. (لەبەر ئەم هۆیەشە تەنانەت لە کاتی خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەرە شارەزا و بەناوبانگەکانیش، دەبێت چاوتیژ بیت لە ئاست ئەگەری نابابەتی و لایەنداربوونی نووسەرەکاندا.) بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، باشتر وایە سەرەتا ئەو بەڵگانە لەبەرچاو بگریت کە پێچەوانەی بۆچوونی تۆن، پاشان بچیتە سەر ئەو بەڵگانەی پشتگیریی بۆچوونەکەی تۆ دەکەن. هەروەها بەدوای ماعقولترین لێکدانەوەی ئەقڵانیدا بگەڕێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئایا ئەو بەڵگانە هاوبۆچوونتن یاخود نا.

## دوو ستانداردی Doubl standard

وەک لە ناوەکەیەوە دەر دەکەویت، دوو ستانداردی واتا بەکارهێنانی ستانداردێکی ئاستنزم لە کاتی حوکمداندا بەسەر ئەو بۆچوون و تێڕوانینانەی کە لەگەڵیداین و لە بەرامبەردا بەکارهێنانی ستانداردێکی زۆر بەرز لە کاتی هەڵسەنگاندن و حوکمدان بەسەر ئەو بۆچوونانەدا، کە جیاوازن لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە بە ڕاستی دەزانین. ئەو کەسانەی بەم شێوەیە بیر دەکەنەوە، هەموو ئەو ناتەبایی و دژ-خۆیی contradictions

و زیادرەڕۆییی بێماناکانەی ناو ئارگۆمێنتەکانی خۆیان پشتچاو دەخەن، بەڵام شتی ورد و بێمانا لەسەر ئارگۆمێنتەکانی بەرامبەریان دەڵێن. هەموو ئەو وشانەشی بەکاری دەهێنن، ڕەنگدانەوەی ئەم بیرکردنەوەیەیە. هەڵسوکەوتی ئەم جۆرە کەسانەش وەسف دەکرێن بە "خەیاڵپڵاوی im-aginative"، "زۆرداری forceful" و "ڕاشکاوی forthright" لە کاتی هاوڕابووندا لەگەڵ کەسانی تر، بەڵام لە کاتی ناکۆکیدا ڕەفتارەکانیان وەسف دەکرێن بە "شەڕانی" و "خودپەرستێتی".

ئەم هەڵەی دوو ستانداردییە لە کێشەکانی ناو ئازادیی ڕادەربڕینیشدا باوە: زۆر خەڵک بە دەنگی بەرز داوای مافی "ئازادیی ڕادەربڕین" دەکەن بۆ ئەو بابەتانەی هاوڕان لەسەری، لێ هەر ئەوان داوای سانسۆر دەکەن لەسەر ئەو کێشانەی دژین.

بۆ دوورکەوتنەوە لەم جۆرە هەڵەیە، دەبێت پێشوەخت بڕیار بدەیت کە چ جۆرە پێوەرێک بەکار دەهێنیت لە کاتی حوکمداندا و پەیوەستبوون بە هەمان پێوەرەوە، ئەگەر تەنانەت زانیارییەکانی سەر کێشەکە لە قازانجی ڕای شەخسیی خۆشتا نەبوو.

## ئەنجامگیریی پێشوەخت Hasty conclusion

ئەنجامگیریی پێشوەخت یان سەرپێیی بریتییە لە حوکمدانێکی ناکامڵ _ واتە حکومدانێک، بەبێ ئەوەی بەڵگەی پێویست، تەواو هەبێت تا دروستی حوکمدانەکە پشتڕاست بکاتەوە. دیارە پێویست بە زەبتوڕەبتی ئەقڵی دەکات، تا ئێمە خێرا باز نەدەین بۆ حوکمدان بەسەر کێشەکاندا، بەڵام بەداخەوە، زۆر کەس ئەم دیسپلینە ئەقڵییەیان فەرامۆش کردووە. ئەوان وەک خوویەک بە کام دەرئەنجام زووتر

بگەن، خێراتر قبوڵی دەکەن، بێ ئەوەی ئەوەندە ئەرک بکێشن کە بە خۆیان بڵێن، ئایا دەکرێت بە دەرئەنجامی تر، بگرە باشتریش بگەین. ئەگەر پیاوێک ببینن کە لەگەڵ ئافرەتێکدا سواری تاکسی دەبێت، جگە لە هاوسەرەکەی خۆی، خێرا دەڵێین ئەمە حەتمەن دەنکێتی، بەبێ ئەوەی ئەوەندە عەزێت ببینن کە بڵێن دەشێت ئەمە خزمی بێت، یان هاوپیشەی بێت، یان کەسێک بێت کە پەیوەندیی بە ئیشەکەیەوە هەیە. ئەگەر ڕۆژێک هاوڕێیەکیان بەلایاندا تێپەڕێت بێ ئەوەی قسەیان لەگەڵدا بکات، خێرا دەگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە سەنگی بۆ دانەناون و سووکایەتیی پێ کردوون، لە کاتێکدا ڕێی تێدەچی کە هاوڕێیەکان داڵخە بردبێتیەوە یان هەر نەیبینیبێتن.

دەرئەنجامگیریی پێشوەخت نەک هەر تەنها لە ژیانی ڕۆژانەدا، بگرە لە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیشدا دەشێت ڕوو بدات. یەکێک لە گەورەترین ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر توانای زیرەکیی مرۆڤ بەئەنجام گەیەنراوە، بە حوکمدانێکی پێشوەخت و سەرپێییانە کۆتایی هاتووە؛ تەنانەت دوای سەدەیەکیش، دەتوانین دەرئەنجامە خراپەکانی لێکۆڵینەوەکە ببینین. لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، گروپێک لە دەروونزانەکان هەڵسان بە بەئەنجامگەیاندنی تاقیکردنەوەی ژیری بۆ نزیکەی دوو ملیۆن سەربازی تازەهاتوو بۆ جەنگ. دەرئەنجامەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

کۆچکردووەکانی باکووری ئەورووپا ١٣. کۆچکردووەکانی باشوور و ناوەڕاستی ئەورووپا ١١ و ژمارەی زیرەکی ئەمەریکییە ڕەشپێستەکانیش بریتی بوو لە ١٠. دەروونناسەکان گەیشتن بەو دەرئەنجامەی کە ئەمەریکییە ڕەشپێستەکان و دانیشتووانی باشووری ئەورووپا، "گەمژەن" morons (ئەم زاراوەیە ئەو کاتە وەک زاراوەیەکی

زانستی قبوڵکراو بوو.) ئەم دەرئەنجامە کاریگەرییەکی زۆری دانا لەسەر دووبارە داڕشتنەوەی یاسای کۆچکردن لە ساڵی ١٩٢٤دا، کە بەئاشکرا دانیشتووانی باشوور و ناوەڕاستی ئەورووپا جیاکارییان دەرهەق کرا و هەر ئەم دەرئەنجامەش وای کرد وێنەیەکی خراپی ئەمەریکییە ڕەشپێستەکان بڵاو ببێتەوە*.

ئەگەر لە کاتی خۆیدا ئەو دەروونناسانە ئەم پرسیارە سادەیەیان لە خۆیان بکردایە، کە ئایا بە "کەمژە" لەقەڵەمدانی کۆچکردووانی باشوور و ناوەڕاستی ئەورووپا، لەگەڵ ئەمەریکییە ڕەشپێستەکان، تەنها دەرئەنجامی مومکینە کە دەشێت پێی بگەین یان نا؟ ئەوا ئەوکات دەیانزانی کە دیزاینکردن و بەڕێوەبردنی تاقیکردنەوەکە دەشێت هەڵە و کەموکووڕیی تێدا بێت. بۆ نموونە، دەیانتوانی بزانن ڕێنماییەکانی تاقیکردنەوەکە لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر جیاوازیی تێدایە _ هەندێکیان پێیان وترابوو دوای تەواوکردنی هەر بەشێک، ئینجا بچنە سەر بەشی دواتری تاقیکردنەوەکە، بەڵام ئەم تێبینییە بەوانی تر نەوترابوو _ ئەمە جگە لەوەی ئەوانەی لە بەشی دوای دواوەی هۆڵەکەدا دانیشتبوون، هەندێک جار نەیاندەتوانی بە هیچ شێوەیەک ڕێنماییە گرنگەکانی تاقیکردنەوەکە ببیستن. جگە لەمانەش، دەروونناسەکان دەیانتوانی هەست بەوەش بکەن، کە یەک جۆر فۆڕم

* بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بڕوانە:
Stephn Jay Gould, *The mismeasure of man*. (نیو یۆرک: نۆرتۆن، 1981) چاپتەری پێنج. لە دواتردا زۆر لەو دەروونناسانەی کە دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیان قبول کرد، هەڵسان بە بەکارهێنانی تاقیکردنەوەی پێوانەی ژیری IQ لە بواری پەروەردەدا، ئەمەش بووە هۆی ناوداركردنی لێکۆڵینەوەکە. یەکێک لەو دەروونناسانە Carl Brigham بوو، کە دواتر تاقیردنەوەیەکی تایبەت بە خۆی دامەزراند، کە ناسراوە بە Scholastic Aptitude Test (SAT).

دابەش کراوە بەسەر ئەوانەدا، کە دەیانتوانی هەم بخوێننەوە هەم بشنووسن، لەگەڵ ئەوانەدا کە تەنها دەیانتوانی بە زمانەکە {واتە بە ئینگلیزی} قسە بکەن، لەگەڵ ئەوانەشدا کە تەنانەت نەیاندەزانی نە بخوێننەوە نە بنووسن.

{سەرەڕای ئەو هۆکارانەی لە سەرەوە باس کران} دەتوانین چ لێکدانەوەیەک بۆ دەرئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە بکەین؟ بۆ گرووپە جیاوازەکان، نمرەکانیان جیاواز بوون؟ بە شێوەیەکی گشتی، کۆچکردووانی باکوور بۆ زیاتر لە بیست ساڵ دەبوو کە هاتبوونە ئەمەریکاوە، بۆیە لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر لێهاتوو بوون و تا ڕادەیەکی باشیش پەروەردەیەکی چاک کرابوون. لە بەرامبەردا، ئەوانی باشوور و ناوەڕاست ئەوەندە نەبوو هاتبوونە ئەمەریکا، هەر بۆیە نە زمانی ئینگلیزییەکی باشیان دەزانی، نە چانسی پەروەردەیەکی باشیشیان هەبوو، (چونکە زۆرینەیان هەژار بوون). هەرچی دەربارەی ئەمەریکییە ڕەشپێستەکانیشە کە لە ئەمەریکادا لەدایک ببوون، هەرگیز چانسی پەروەردەکردنێکی باشیان پێ ڕەوا نەدەبینرا.

بۆ دوورکەوتنەوە لە دەرئەنجامگیریی پێشوەخت، لە سەرەتادا هەموو دەرئەنجامە ڕێتێچووەکان بەکراوەیی بهێڵەرەوە. دواتر بەرمەبنای بەڵگەی پێویست، تەواو بڕیار لەسەر هەڵبژاردنی یەکێک لەوانە بدە {دیارە ئەوەی بەڵگەکان پشتڕاستی دەکەنەوە}. لەیادت بێت هیچ شەرم و نەنگییەک لەوەدا نییە کە کاتی حکومدانەکانت بەسەر کێشەکاندا دوا بخەیت، تا ئەو کاتەی بەڵگەکان ڕێت پێ دەدەن.

## زیادەڕۆیی لە گشتاندن و نموونەی باودا
## Overgeneralization and stereotyping

گشتاندن چالاکییەکی ئەقڵییە، کە بە هۆیەوە لە ئەزموونێکی یان نموونەیەکی دیاریکراوەوە دەرئەنجامێکی یان حوکمێکی بەرفراوان بەدەست دێنین یان دەدەین. بۆ نموونە کە منداڵێک گوێی لە سەگێک دەبێت کە دەوەڕێت، ئیدی وەڕین لای ئەو دەبێتە سیفەتێک، کە هەموو سەگەکانی تریش هەیانە. دیارە ئەم گشتاندنە ڕاستە، بە لەبەرچاوگرتنی Basenjis {سەگێکی تیسکن و زۆر بچووکی ماڵییە، کە ناتوانێت بوەڕێت} کە لە دەرەوەی ئەم گشتاندنەیە. هەروەها کاتێک دایکێک بە منداڵەکەی دەڵێت، "ڕۆڵە، ئاگاداری ئەو قەڵەمە بە، بچێت بە چاوتا، کوێرت دەکات،" ئیدی منداڵەکە تێدەگات کە هەموو قەڵەمەکانی تریش ئەم توانایەیان هەیە، دووبارە ئەم گشتاندنەش ڕاستە. وەک ئەم نموونە سادانە پیشانمان دەدەن، گشتاندن نەک هەر سروشتییە، بگرە لە پرۆسەی فێربوونیشدا ڕۆڵێکی جەوهەریی هەیە و ناتوانرێت فەرامۆش بکرێت. چونکە ئێمە هەرگیز ناتوانین. هەموو شتەکان پێکەوە ببینین، وەکوو هەموو سەگەکان، هەموو قەڵەمەکان، هەموو شاخەکان، هەموو ڕووبارەکان، هەموو مامۆستاکان، یان هەمووی هەرشتێکی تر. بەڵکوو ئێمە تەنها دەتوانین نموونە لە پۆلی شتەکان ببینین. جا نموونە بە تاک یان بە گروپ. پاشان لەو نموونانەوە گشتاندن ئەنجام دەدەین.

تا ئەو کاتەی بە ئاگاییەوە بە گشتاندن هەڵدەستین، ئەوا سوودبەخش و پۆزەتڤە. بەلام بەداخەوە زۆر ئاسانە کە ئەم گشتاندنە *زیادەڕۆییی* تێدا بکرێت _ واتە گشتاندنی سیفەتێکی دیاریکراو بەسەر هەموو ئەندامەکانی گروپێکدا. لە کاتێکدا تەنیا هەندێک لە ئەندامەکانی ئەو گروپە هەڵگری ئەو سیفەتەن. بۆ نموونە، ئەگەر سەردانێکی شاری نیو یۆرک بکەیت و بە

ڕێکەوت چەند کەسی قسەڕەق و وشک ببینیت، ئەوا لەسەر هەقی ئەگەر بڵێیت، "هەندێک لە نیو یۆرکییەکان قسەڕەقن،" بەڵام نەکوو بڵێیت "زۆربەی هەرە زۆری نیو یۆرکییەکان قسەوشک و زمانزبرن" چ جای ئەوەی بڵێیت "نیو یۆرکییەکان قسەڕەقن"*. بەڵام ئێمە ڕۆژانە گوێمان لە زیادەڕۆییکردن دەبێت لە گشتاندندا، نەک هەر تەنیا لەسەر خەڵکی نیو یۆرک، نا، بەڵکوو لەسەر لیبراڵییەکان، کۆنسەرڤاتیڤەکان، ئەوانەی دووبارە بوونەتەوە بە مەسیحییەکی تۆخ، سیاسەتمەدارەکان، هاوڕەگەزبازەکان، فیمینیستەکان، ژینگەپارێزەکان و ڕۆشنبیرەکان و زۆری تریش.

نموونەی باو stereotyping {بۆ نموونە دەڵێن فلان میللەت یان فلان گروپ بە فلانە شت بەناوبانگن} بریتییە لە زیادەڕۆییکردن لە گشتاندندا بە شێوەیەک، کە دژی گۆڕانە و هەوڵی مانەوەی خۆی دەدات بەبێ دەستکاریکردن. زۆرترینی نموونەکانیش بریتین لە نموونەی نەتەوەیی و ئایینی. بۆ نموونە، نموونەی بەربڵاو هەیە لەسەر جوولەکەکان، پۆڵەندییەکان، ئەمەریکییە ڕەشپێستەکان، ئیسپانییەکان، ئیتاڵییەکان، فەندەمێنتاڵەکان، کاسۆلیک مەزهەبەکان، بێخودایان atheists، پیاوە سپیپێستەکانی ئەورووپا. وەک چۆن ڕەنگە خۆشت هەستت پێ کردبێت، هەر گشتاندنێک کە ئامادە نەبێت بگۆڕێت و دەستکاری بکرێت، ئەوا ئەچێتە خانەی نموونەی باوەوە. هەرچەندە نموونەی باوی شتەکان دەکرێت هەم پۆسەتڤ بێت هەم نێگەتڤ، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نێگەتڤە. بەداخەوە.زۆر کەس کە نموونەی خراپی گروپەکەی خۆیان ڕەت دەکەنەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک

---

* تێبینیی ئەوە بکە، کە هەر گشتاندنێک ئەگەر ئاوەڵفرمانی چەندایەتی وەکوو *زۆربەی، هەندێک، چەندانی* تێدا نەبوو، ئەوا گشتاندنەکە هەموو ئەندامەکانی گروپەکە دەگرێتەوە. هەر بۆیە ئەگەر بڵێیت "نیو یۆرکییەکان زمانزبرن،" ئەوا وەکوو ئەوە وایە وتبێتت، " هەموو نیو یۆرکییەکان قسەڕەقن."

دوودڵ نین لەوەی نموونەی خراپ لەسەر گروپەکانی تر بڵاو بکەنەوە.

ئایا هەموو ئاماژەدانێک بە سیفەتەکانی گروپێک دەچێتە بابی داتاشینی نموونەی باوەوە؟

ئاماژەدان بە شێوازی دیاری، باوی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی گروپەکان هیچ نەنگییەکی تێدا نییە. لە سەردەمی کۆندا چینییە کۆنەکان لە زۆربەی زۆری خەڵکانی تر دەسترەنگینتر و داهێنەرتر بوون؛ لە کۆتاییی سەدەی نۆزدە و زۆربەی سەدەی بیستدا، پیشەسازیی تەکنەلۆجیی ئەڵمانیا ڕێبەر بوو لە سەرانسەری زەویدا؛ لەم دەیانەی کۆتاییدا، ژاپۆنییەکان نموونەی داهێنان و بەتەنگەوەهاتنی یەکسانی بوون. بەڵام هەموو شێوازە کولتوورییە باوەکانیش مەرج نییە جێی شانازی و شیاوی پێداهەڵدان بن. بۆ چەندان سەدە ئیسپانییەکان و پرتوگالییەکان وەک پیشەیەکی سووک و نزم سەیری کاری دەستیان دەکرد، کە کۆچیشیان کرد بۆ ئەمەریکای لاتین، ئەم دیدەیان لەگەڵ خۆیاندا برد. بەڵام ئەمڕۆ سریلانکییەکان هەڵگری ئەم بۆچوونەن. ئەم بۆچوونەی کە بە شێوەیەکی بەربڵاو لەو کۆمەڵگەیانەدا بوونیان هەبووە و هەیە، دەشتوانرێت باس بکرێت، بەبێ گشتاندن و ناونانی هەموو ئیسپانی و سریلانکییەکان بە کەسانی تەمەڵ و ئیشنەکەر. (بە هەرحاڵ، ئەو شێوازی بیرکردنەوەیەی کە کاری دەستکرد کەمنرخ دەکات، دەرئەنجامی بیرگردنەوەیەکی نائەقڵانی و هەڵەیە، نەک ئیشنەکەری و تەمەڵیی هەڵگرەکانی) وەک Thomas Sowell دەڵێت، لێکۆڵینەوە لە هەموو شێوازە کولتوورییە باوەکان بە ویستراو و نەویستراوەوە، بە سوودبەخش و زیانبەخشەوە، زۆر گرنگن لە تێگەیشتنی چۆنێتیی مانەوە و تیاچوونی هەر گروپ و نەتەوەیەک، بگرە سەرلەبەری شارستانیش.

زیادەڕۆییکردن لە گشتاندن و نموونەی باودا، ڕێگرن لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا. چونکە لەمپەرن لە بەردەم بینینی ئەو جیاوازییانەدا، کە لەناو تاکەکانی گروپەکاندا هەن. بۆ دوورکەوتنەوە لەم جۆرە هەڵانە، دەبێت بەرەنگاری ئەو ویستە ببیتەوە، کە دەخوازێت، تاک تاکی مرۆڤەکان، یان شوێنەکان، یان شتەکان هەموو بخاتە ژێر یەک پۆلێنبەدیی وشک و نەگۆڕەوە. لە کاتی گشتاندندا لەیادت بێت، هەتا ئەزموونت {یان شارەزاییت، لەسەر ئەو بابەتەی حوکمی لەسەر دەدەیت} سنووورداتر بێت، ئەوەندە دەبێت خاکی سنگفراوانە جەخت لەسەر بۆچوونەکەت بکەیت. لەم هێڵکارییەی خوارەوەدا، زاراوەکانی وەکوو (*دانەیەک یان زیاتر، جاروبار، ڕێی تێدەچێت*) ئەمانە پێویست بە ڕادەیەکی کەمی ئەزموون و شارەزایی دەکەن. بەڵام هەر ڕۆیشتنێک چ بەلای ڕاستدا و چ بەلای چەپدا، پێویست بە ئەزموونی زیاتر دەکات.

گۆڕان لە بڕی بابەتەکەدا

هیچ بەشێکی/بەشێکی زۆر کەمی/کەمێکی/دانەیەک یان زیاتر/هەندێکی/زۆربەی/هەر هەمووی

گۆڕان لە چەندایەتیی کاتدا

هیچ کاتێک/بەدەگمەن/زۆر بەکەمی/جاروبار/هەندێک جار/هەمیشە/هەموو کات

گۆڕان لە پلەی دڵنیاییدا

بەدڵنیاییەوە نا/ئەگەرێکی لاوازە/ڕێی تێدەچی/ئەگەرێکی بەهێزە/بەدڵنیاییەوە بەڵێ

## زیادەڕۆییکردن لە سادەکردنەوەدا Oversimplification

سادەکردنەوە هەر تەنیا بەسوود نییە، بگرە پێویستیشە، بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا کە مەعریفە بە شێوەیەکی خێرا، بەردەوام لە گۆڕاندایە. ئەوانەی کە شارەزاییەکی باشیان لە بوارێکدا هەیە، زۆر پێویستیان بە سادەکردنەوە هەیە، لەو کاتەدا کە پەیامێک دەدەن بەوانەی کە بڕێکی کەمتر یان هەر هیچ لەسەر کایەکەی ئەوان نازانن. مامۆستاکان بۆ قوتابییەکانیان، ئیشکەرە بەئەزموونەکان بۆ ئیشکەر تازە و بێئەزموونەکان، پارێزەکان بۆ موشتەرییەکانینان، دکتۆرەکان بۆ نەخۆشەکان، زاناکان بۆ خەڵکی، هەموو ئەمانە پێویستیان بە سادەکردنەوە هەیە لە کارەکانیاندا. سادەکردنەوە واتە دابەزاندنی ئاستی ئاڵۆزی بابەتەکان بۆ ئاستێک، کە کەسانی تر بتوانن تێی بگەن.

بەلام *زیادەڕۆییکردن* لە سادەکردنەوەدا، هەر ئەوەندە نییە کێشە ئاڵۆزەکان سادە بکاتەوە تا خێراتر هەزم بکرێن، بەڵکوو سادەکردنەوەکە دەچێتە خانەی شێواندنەوە. لەبری ئەوەی وەکوو سادەکردنەوە ڕۆڵ بگێڕێت، لە ئاشناکردنی کەسەکان بە ئایدیاکان، زیادەڕۆییکردن لە سادەکردنەوەدا سەریان لێ دەشێوێنێت. بەداخەوە ئەو گوزارانەی زیادەڕۆیییان تێدا دەکرێت، دەشێت وەک بیرکردنەوەیەکی قووڵ دەر بکەون، لەم کاتەشدا پێویستمان بە بیرتیژییەکی باشە. با سەرنجی ئەم دوو نموونەی خوارە بدەین کە زیادەڕۆیییان تێدا کراوە.

نموونەی ١: ئەگەر قوتابییەکان فێر نەبن، ئەوا مامۆستا بەرپرسیارە.

شیکردنەوە: فێرنەبوونی قوتابییان هەندێک جار مامۆستاکە لێی بەرپرسیارە، هەندێک جاریش هەڵەی قوتابییانە، کە بە ئەرکی خۆیان

هەڵناسـن. لەبـەر ئـەوەی ئـەم گوزارەیـە فێرنەبوونـی قوتابییـان بەتەنهـا دەخاتـە سـەر بەرپرسـیاریتیی مامۆسـتا. کەواتـە بریتییـە لـە زیادەڕۆییکـردن لـە سـادەکردنەوەدا.

نموونەی ٢: ئێمە باشتر لەوانی تر خۆمان دەناسین.

شـیکردنەوە: ڕاسـتە ئێمـە لـە هەندێـک شـتی تایبـەت بـە خۆمانـدا زیاتـر لەوانـی دی خۆمـان دەناسـین: بـۆ نموونـە، هیواکانمـان، خەونەکانمـان، خەیاڵاتەکانمـان. بـەڵام هەندێـک شـتی تـر هـەن، کـە ئەوانـی تـر ڕوونتـر لـە خۆمـان دەتوانـن ببینـن، چونکـە ئێمـە نائاگایانـە بەرگـری لەیـەک وێنـەی چەقبەسـتووی خۆمـان دەکەیـن: بـۆ نموونـە، ئـەو خەوشـانەی لـە کەسـایەتیماندا هـەن وەکـوو ئیرەیـی، درێـژدادڕی لەسـەر شـتی کەمنـرخ، دووڕوویی، هەموو ئەمانـە زۆر کات ئەوانـی تـر تـەواو هەسـتی پـێ دەکـەن. کەواتـە ئـەو گوزارەیهـی سـەرەوە زیادەڕۆیـی دەکات لـە سـادەکرنەوەدا.

زیادەڕۆییکـردن لـە سـادەکردنەوەدا، بـەزۆری لـەو بابەتانـەدا ڕوو دەدات، کـە خەڵکـی هەسـت و سـۆزێکی بەهێزیـان هەیـە دەربـارەی. بـۆ نموونـە کاتێـک {لـە ئەمەریـکادا} بەپێـی یاسـا داوا کـرا لـە هەمـوو خـاوەن چێشـتخانەکان، کـە دەبێـت بەبـێ لەبەرچاوگرتنـی نـەژاد، ئاییـن، نەتـەوە، خزمەتـی هەمـوو کەسـێک بکـەن. هەندێـک لـە خـاوەن چێشـتخانەکان بەمـە قەڵس بوون. ئـەوان دەیانوت، کەسێک کە پارە بەزەحمـەت پەیاکراوەکەی خۆی لـە چێشـتخانەیەکدا بخاتـە گـەڕ، دەبێت ئـەو مافەشـی هەبێت کە لـە چێشـتخانەکەی خۆیـدا خزمەتـی هەرکـەس نـەکات، کـە نایەوێـت. خـاوەن چێشـتخانەکان تەنیـا بیریـان لـەم لایەنـەی کێشـەکە دەکـردەوە کـە بۆیـان گرنـگ بـوو، هـەر بۆیـە وایـان دەزانـی کـە ئەمـە تەنیـا ڕەهەنـدی کێشـەکەیە. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ڕەهەندێکـی گرنگـی تریشـی هەبـوو، کـە بریتیـی بـوو لـە

مافی هاووڵاتیان بۆ چوون بۆ شوێنە گشتییەکان.

بە هەمان شێوە، کاتێک بەڕێوەبەرایەتیی فڕۆکەوانەی فیدڕاڵ (FAA) داوای کرد hang glider {فڕۆکەیەکی زۆر بچووکی بێ مەکینەی چارۆکەدار} و ultralight motorized {فڕۆکەیەکی بچووک بە مەکینەیەکی زۆر بچووکەوە} بکەونە ژێر سنووری بەڕێوەبەرایەتییەکەیانەوە، کۆمەڵەی فڕۆکە بچووکەکان نارەزایەتییان پیشان دا. کۆمەڵەکە دەیانوت، "حکومەت هیچ مافێکی نییە کە دەست بداتە ئەو وەرزشانەی لە دەرەوەی شوێنە داخراوەکاندا ئەنجام دەدرێن وەکوو ڕاکردن و خۆهەڵدانەخوارەوە لە گرد و تەپۆڵکە دوورەدەستەکان. "کۆمەڵەکە تەنیا یەک لای کێشەکەیان دەبینی، ئەو لایەی کە کاری تێ کردبوون. ئەگەر کێشەکە تەنیا ئەو ڕەهەندەی هەبایە، ئەوا نارەزاییەکەی ئەوان لە جێی خۆیدا دەبوو. بەڵام ڕەهەندێکی گرنگی تریش هەیە: سەلامەتڕاگرتنی ئاسمان بۆ هەموو کەس، تەنانەت بۆ ئەوانەشی کە بۆ مەبەستی بازرگانی و بۆ خۆشیی خۆیان {وەکوو ئەندامانی کۆمەڵەکە} بەکاری دەهێنن. (FAA، چەندین جار ئەو فڕۆکە بچووکانەیان بینیوە کە لە بەرزیی زیاتر لە ١٢,٠٠٠ پێوە بوون). هەر بۆیە بە فەرامۆشکردنی ئەم ڕەهەندە گرنگەی کێشەکە {کە ڕەهەندی سەلامەتیی کێشەکەیە}، کێشەکە زیاد لە پێویست سادە دەکرێتەوە.

حەزی ناوبانگ و دەستکەوتی ئابووری، پاڵی بە هەندێک لە ڕۆژنامەنووسانەوە ناوە بۆ بەجێهێشتنی بێلایەنی و بەدیقەتبوون لە لایەک و هەستیارکردنی بابەتەکانینان لە لایەکی ترەوە. هەر بۆیە ژمارەیەکی بەرچاو لە هەواڵ و لێدوانەکان دەچنە خانەی خەملاندن و بوختان و ڕای بێبنەماوە. هەر بۆیەش دەبینین چۆن لە بەرنامە تەلەڤزیۆنییەکانەوە دەنگهەڵبڕین و ڤیژەڤیژە لەنێوان میوانە بیرجیاوازەکاندا جێی گفتوگۆ

ئەقڵانییەکانی گرتۆتەوە. دەرئەنجامی هەستیارکردنی بابەتەکان لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە {واتە پەیامەکانی ڕاگەیاندن، هەست و سۆزەکانمان دەدوێنن لە بری ئەقڵمان} بریتییە لە زیادەڕۆییکردن لە سادەکردنەوەدا. بەئەگا بە لە هەر زیادەڕۆییکردنێک لە سادەکردنەوەی هەرشتێک، کە دەیخوێنیتەوە یان دەیبیستیت و دوور بکەوەرەوە لە دووبارەکردنەوەیان لە بیرکردنەوە و دەربڕینەکانی خۆتدا.

## هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدار The post Hoc Fallacy

Post hoc کورتکراوەی زاراوەیەکی یۆنانییە، کە بریتییە لە post hoc ergo hoc، واتا "بە هۆی ئەمەوە، کەواتە دەبێت ئەمە وا بێت." ئەم زاراوەیە گوزارشتە لە ئایدیایەک دەکات، کە بریتییە لە: کاتێک دوو ڕووداو بە دوای یەکدا ڕوو دەدەن، کەواتە هەر دەبێت پەیوەندییەکیان پێکەوە هەبێت. ئەم دیدە لەوێدا بەهەڵەدا چووە، کە نزیکی لە زەمەنی ڕووداندا مەرج نییە بریتی بێت لە نزیکی لە پەیوەندیی نێوان هۆ و ئەنجام cause and effect. چونکە دەشێت شتێک تەنیا بە ڕێکەوت لەدوای شتێکی ترەوە ڕوو بدات و هیچ پەیوەندییەکی سەبەبی بە پێش خۆیەوە نەبێت.

ئەم جۆرە هەڵەیە، پێدەچێت بنچینەی زۆربەی بۆچوونە خورافییەکان بێت. بۆ نموونە، پاش کەمێک تێپەڕبوون بە ژێر پلیکانەدا، یان دوای شکاندنی ئاوێنەیەک، یان دوای بینینی پشیلەیەکی ڕەش؛ دوای هەموو ئەمانە شتێکی خراپت لێ دەقەومێت. ئیدی ئەگەر جارێک لە جاران بە ڕێکەوت لەدوای یەکێک لەو ڕووداوانە شتێکی خراپ ڕوو بدات، ئەوا دەیبەستنەوە بەو شتە پڕوپووچانەوە.

سام قوتابییەکە، هەمیشە لە وانەی ئینگلیزیدا دوا دەکەوێت. دوێنێ

مامۆستا ئاگاداری کردەوە، کە ئەگەر ئەمجارە دوا بکەوێت، نابێت بێتە پۆلەوە. ئەمڕۆ ئەنجامی تاقیکردنەوەی ئینگلیزی هاتۆتەوە، نمرەکەی سام ٥٠ بوو. سام خراپی نمرەکەی ئەبەستێتەوە بە تووڕەبوونی دوێنێی مامۆستاوە بە هۆی دواکەوتنی بەردەوامی لە پۆل. بەمەش، سام کەوتۆتەوە ناو هەڵەی هۆ و دەرئەنجامی ناپەیوەندیدارەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، ڕەنگە بە هۆی دواکەوتنی سامەوە، مامۆستاکە ئەو نمرە کەمەی پێ دابێت. بەڵام ڕەنگیشە وا نەبێت. ڕەنگە پێش تووڕەبوونەکەی مامۆستا، دەفتەرەکەی سام چێک کرابێت، یان ڕەنگە سام خۆی هەر بایی ئەوەندە وەڵامی دابێتەوە. بە هەرحاڵ، بەبێ بەڵگەی تر، سام باشترە هیچ حوکمێک نەدات.

هیچ خەوشێک لەوەدا نییە مرۆڤ بیر لە پەیوەندیی سەبەبیی نێوان هۆ و ئەنجام بکاتەوە. لە ڕاستیدا بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان زیاتر لە هەرکەسێکی تر دەپرسن، ئەمە بۆ ڕووی دا؟ {کە پرسیارە لەسەر پەیوەندیی سەبەبیی هۆ و ئەنجام}. هەموو ئەوەی کە پێویستە بیکەیت بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵەی هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدار، ئەوەیە کە حوکمی هەبوونی پەیوەندیی هۆ و ئەنجام بەسەر کێشەکاندا نەدەیت، تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبیت لەوەی لێکدانەوەکانی تر، لەناویشیاندا ڕێکەوت، ڕاستی مەسەلەکەت نادەنە دەست.

# ڕاهێنانەکان

١. ئیبۆنیکس Ebonics دیالێکتیکی ئەمەریکییە ئەفەریقییەکانە، هەندێک لە پەروەردەکاران داوایان کرد ئەم دیالێکتیکە بە شێوەیەکی ڕەسمی وەک دووەم زمان لە قوتابخانەکانی کالیفۆرنیادا بەکار بهێنرێت. یەکێک لە ڕەخنەگرەکان بەم شێوەیە لەسەر ئەم پێشنیارەی نووسی، "بە شێوەیەکی سادە بدوێن، ئیبۆنیکس هیچ نییە جگە لە زمانی بازاڕیی ئەمەریکییە ئەفەریقییەکان. ئەگەر ئەم دیالێکتیکە مانایەکی هەبێت، ئەوا تەنیا لە سەر شەقامەکان هەیەتی - زمانی گەوادەکانە، زمانی گرووپی عەسابەکانی سەر شەقامەکانە، زمانی پیاوکوژ و شەلاتییەکانی سەر شەقامەکانە، زمانی ئەوانەن کە لە قوتابخانە دەر کراون، شێوە ئینگلیزییەکی موزەیەفە، کە پەیوەندیی هەیە بە شکستی ئەمەریکییە ڕەشپێستەکانەوە" ٤ ئایا هیچ شتێکت خوێندۆتەوە لەم چاپتەرەدا، کە پەیوەندیی بەم کۆتەیشنەوە هەبێت؟ ڕوونی بکەرەوە.

٢. نووسەرێک دەربارەی چۆنێتیی یادکردنەوەی یادی لەدایکبوونی مەسیح ڕەخنەی گرت و وتی، تا ئێستا مانای یادەکە بریتی بووە لە نقومبوون لەژێر یاریی منداڵاندا، تیپی ڕەنگاوڕەنگ، داری دەستکرد، خواردن و کێک "بەڵام ئێمە دەبێت مانای ونبووی ڕاستەقینەی ئەم یادە دووبارە بدۆزینەوە. یەکێک لە مەبەستەکانی نووسەرەکە بریتی

بوو لە "هەتا کۆمەڵگەی ئەمەریکی زیاتر مەسیحی بێت، بەڵام بە مانای ڕاستەقینەی مەسیحیەت، ئەوەندە زیاتر لە ئاست کێشە ئەخلاقییەکاندا هەستیارتر دەبێت. کە ئەمەش لە بەرژەوەندەی هەمووانداپە - بە مەسیحی و نامەسیحییەوە، بە بێخودا و ئەگناستیکەکانەوە {ئەوانەی نازانن ئاخۆ خودا هەیە یان نا}." هیچ شتێکت خوێندۆتەوە لەم چاپتەرەدا کە پەیوەندیی بەم ئەم کۆتەیشنەوە هەبێت؟ ڕوونی بکەرەوە.

٣. چارلس کە کوڕێکی بێخودایە {واتە باوەڕی بە بوونی خودا نییە}، توێژینەوەیەک دەکات لەسەر نوێژکردن لە قوتابخانە گشتییەکاندا. ئەو باش ئاگاداری ئەو ئارگۆمێنتانەیە کە دژی نوێژکردنن لە شوێنە گشتییەکاندا، بەڵام هیچ ئاگاداری ئارگۆمێنتەکانی لاکەی تر نییە. چارلس لەو بڕوایەدایە، مادام ئەم توێژینەوەیە خۆی دەینووسێت و خۆشی بڵاوی دەکاتەوە، کەواتە هەم بێتام و هەم بێئەقڵانەشە دەبێت ئەگەر خۆی سەرقاڵ بکات بەو سەرچاوانەی کە ئەم خۆی دەزانێت پێچەوانەی ڕای ئەون و بەدڵنیاییشەوە لەگەڵیاندا ناکۆک دەبێت. هەر بۆیە سنووری خوێندنەوەی خۆی تەسک دەکاتەوە، تەنها بۆ ئەو سەرچاوانەی کە دژی نوێژکردنن لە قوتابخانەکاندا. ئایا لەگەڵ چارلس هاوڕایت یان نا؟ بۆچی؟ ڕوونی بکەرەوە.

٤. باسی حاڵەتێک یان زیاتر بکە، کە تۆ یان کەسێکی ناسیاوی خۆت کەوتبێتنە هەڵەی بانێکە و دوو ستانداردەوە. هەڵەکە بە شێوەیەک شی بکەرەوە {لەبەر ڕۆشنایی ئەم چاپتەرەدا} کە ئەو کەسەشی ئەم چاپتەرەشی نەخوێندبێتەوە، بتوانێت تێی بگات

٥. باسی حاڵەتێک یان زیاتر بکە، کە تۆ یان کەسێکی ناسیاوی خۆت

کەوتبێتنە هەڵەی هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدارەوە. هەڵەکە بە شێوەیەک شی بکەرەوە {لەبەر ڕۆشنایی ئەم چاپتەرەدا} کە ئەو کەسەشی ئەم چاپتەرەشی نەخوێندبێتەوە، بتوانێت تێی بگات.

٦. لە کۆتایی مانگی هەشتدا، خێزانێکی ئەمەریکیی چینی بە ناوی لیسەوە گواستیانەوە بۆ نزیکماڵی لیۆس، پاشان لیۆس و سوزان، کە یەکێکە لە منداڵەکانی ماڵی لی و کچێکە هاوتەمەنی خۆیەتی، یەکیان ناسی. هەفتەیەک دوای ئەوە، لە قوتابخانە لیۆس بەلای سوزاندا تێپەڕی، بەڵام سوزان تەنانەت هەر سەیریشی نەکرد. بۆ کام لەم دەرئەنجامانەی خوارەوە لیۆس لەسەر هەق دەبێت لەسەر هەڵوێستەکەی سوزان؟ (ئەتوانیت زیاد لە دانەیەک هەڵبژێریت، یان هەر هەمووشیان ڕەت بکەیتەوە.) وەڵامەکانت شی بکەوە بە پشتبەستن بەم چاپتەرە.

a. سوزان بە شێوەیەکی بێڕێزانە مامەڵەی کردووە؟
b. سوزان کەسێکی بێڕێزە؟
c. ماڵی لیس ماڵێکی بێڕێزن؟
d. چینییە ئەمەریکییەکان بێڕێزن؟
e. چینییەکان بێڕێزن؟
f. ئاسیاییەکان بێڕێزن؟

٧. ئێوارەیەک لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆژنامەدا، جین، بۆی دەر کەوت کە نوێنەرەکەی لە کۆنگرێس دەنگی بە نەخێر داوە لەسەر پرۆژەی ڕاکێشانی ڕێگەی خێرا بۆ ناوچەیەک. بەڵام جین هاتەوە بیری کە بەم دواییە لە ٦٣٪ی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە کە بڕیار بوو ڕێگەکەیان بۆ بچێت، لە ڕاپرسییەکدا بە بەڵێ پشتگیریی پێشنیارەکەیان کردووە. بۆیە دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە نوێنەرەکەی متمانەی ئەمی لای خەڵکی

لاواز کردووه، بۆیه له نامەیەکدا بەرەقی داوا له نوێنەرەکەی دەکات، که پێویسته لەسەری پشتگیریی ئیرادەی زۆرینەی خەڵکی بکات. ئایا جین بەرپرسیاره له هەر هەڵەیەک، که له بیرکردنەوەیدا بێت؟ وەلامەکەت ڕوون بکەرەوه.

٨. ڕامۆنا و ستورات گفوگۆیانه لەسەر ئەوەی ئایا کوڕه ده ساڵانەکەیان هەندێک کاری ناوماڵی پێ بسپێردرێت وەکوو بردنەدەرەوەی زەرفی خۆڵەکه و بڕینی چیمەنی باخچەکه یان نا. ستوارت دەڵێت "ئەو کاتەی که منداڵ بووم، هاوڕێیەکی نزیکم بەردەوام ئەوەنده سەرقاڵ بوو به هەندێک ئیشی ڕۆتینیی ناوماڵی ڕۆژانەوه، قەت نەیدەتوانی یاری لەگەڵ ئێمه بکات. بەردەوام بێزاری به ڕووخساریەوه دیار بوو، که گەورەش بوو، زیاتر دڵتەنگیی پێوه دیار بوو. هەر لەو کاتەوه بەڵێنم داوه، هەرگیز هیچ ئەرک و بەرپرسیارێتییەک نەخەمه سەر ئەستۆی کوڕه منداڵەکەی خۆم. خۆی که گەوره بوو، ئەوەندەی دەبێت که ئیشی زیاد بێت. "ئەنجامگیرییەکی ستوارت لەبەر ڕۆشنایی ئەم چاپتەردا هەڵبسەنگێنه.

٩. ئەم ئایدیایانەی خوارەوه هەڵبسەنگێنه. بڕیار بده لەسەر ئەوەی که کامیان زیاد له پێویست ساده کراونەتەوه. هۆکانی حوکمەکانت بەوردی بخه ڕوو.

a. "بۆ کردنی هەرشتێک که دڵم دەخوازێت بیکەم، بۆ بڕیاردان لەسەر ڕاستبوونی هەرشتێک، بۆ بڕیاردان لەسەر هەڵەبوونی هەرشتێک، من تەنها پێویستم به ڕاوێژکردنه به خۆم" (جان جاک ڕۆسۆ).

a. هەڵبژاردن بۆ پۆستەکان، دەبێت لەسەر ئەساسی ستانداردە ئێتیکییه بالاکان بێت، نەک لەسەر بڕیاری زۆرینەی خەڵکی.

b. چەک مرۆڤ ناکوژێت، مرۆڤ مرۆڤ دەکوژێت.

١٠. توانای بیرکردنەوەی ڕەخنەییی خۆت بەسەر ئەم حاڵەتانەی خوارەوەدا جێبەجێ بکە. بەڵام بەدیقەت و وریا بە نەکەویتە ئەو هەڵانەی کە لەم چاپتەرە و لە چاپتەرەکانی تریشدا باس کراون.

a. پیاوێکی خەڵکی ئۆکلاهۆما {ویلایەتێکی ئەمەریکییە}، بە هۆی تاوانێکی قێزەونەوە بە ٩٩ ساڵ زیندانی سزا درا. لایەنی شکاتکەر توانییان ئەم سزا گەورەیە بسەپێنن بەسەر کابرادا، چونکە ئەو پێشتر بە تاوانی ماڵبڕین، ١١ ساڵ زیندانی کرابوو. مافناسی حوکمی district attorney {لە ئەمەریکادا لە هەر ناوچەیەک و مافناسێک هەیە، کە ڕۆڵی نوێنەری حکومەت دەبینێت لەو ناوچانەدا} لەسەر کەیسەکە وتی، "خەڵکی ئیدی بێزار بوون لە تاوان _ ئەوان دەیانەوێت شەقامەکان لەوانە پاک بکرێنەوە، کە بەردەوام یاسا پێشێل دەکەن." تۆ پشتگیریی ئەم سزایە دەکەیت لەم کەیسەدا؟

b. مێردمنداڵێکی کەنێتیکتی {ویلایەتێکی ئەمەریکایە} کە بە چەقۆ دراوسێیەکی خۆیانی کوشتبوو، دەیوت، من هیچ تاوانێکم نییە، چونکە شەیتان لەو کاتەدا کۆنترۆڵی کردم و تاوانەکەی پێ ئەنجام داوم. بەڵام ئەم بەرگریکرنە نەیتوانی بێتاوانیی بسەلمێنێت و سزا درا. کۆکیت لەگەڵ بڕیاری دادگادا کە مێرمنداڵێکی ئاوا سزا بدات یان نا؟

c. ژنێکی شاری نیو یۆرک لەگەڵ دراوسێکەیدا ئەبێت بە دەمەبۆڵەیان لەسەر منداڵەکانیان. لە تووڕەبووندا ژنەکە وشەی بریندارکەر و ڕەگەزپەرستی دژەساماى دژ بە دراوسێیەکەی بەکار دەهێنێت. لەبەر

ئـەوەی لـە نیـو یۆرکـدا بەکارهێنانـی ئـەم چەشـنە زاراوانـە وەکـوو فیتنـە و هەڵگیرسـاندنی کێشـەی ڕەگەزپەرسـتی و ناکۆکیـی نەتەوەیـی دەدرێتـە قەڵـەم، بۆیـە ژنەکـە بۆ مـاوەی ٣٥ کاتژمێر لـە چاکسـازیی کۆمەڵایەتـی بەنـد کـرا. پێـت وایـە ئـەم چەشـنە یاسـایە مەعقوڵیەتـی تێـدا بێـت؟

d. قوتابخانەیەکـی ئامادەیـی لـە ویلایەتـی کالیفۆرنیـا لـە وانـەی زیندەوەرزانیـدا تەشـریحی جەسـتەی مـرۆڤ و سـەگ و پشـیلە دەکـەن. مامۆسـتاکە لاشـەکانی لـە زانکـۆی پزیشـکییەوە بەدەسـت دەگات. ئـەم تەشـریحەت پـێ باشـە لـەم قۆناغـی خوێندنـەدا؟

e. هەندێک خەڵک لەو باوەڕەدان، چیدی بڕوانامـەی زانکۆ نابێت وەک مەرجێک بۆ وەرگرتنی کار لەبەرچاو بگیرێت. هۆی بڕواکەشیان ئەوەیە، کە تۆ دەتوانیت لەبار بیت بۆ زۆر کار بەبێ ئـەوەی هیچ بڕوانامەیەکیشت هەبێت (یان بەپێچەوانـەوە، واتـە لەگـەڵ ئەوەشـدا خاوەن بڕوانامەیت، بـەڵام بۆ زۆر کار لەبار نیت)، بۆیـە پێویسـتە تەنها پێوەر کە خاوەنکارەکان لە دامەزراندنـی کارمەندانـدا بـەکاری بهێنـن، دەبێـت بریتـی بێـت لـە توانـا. تـۆ لەگـەڵ ئـەم دیدەدا کۆکیت؟

١١. لـە ڕاهێنانـی ژمـارە یەکـدا، دواتلـێ کـرا بڕگەیـەک هەڵبسـەنگێنیت دەربـارەی دیالێکتیکـی ئیبۆنێکس. نووسـەری ئـەو بڕگەیە، کێن هامبلنـە، کە پیاوێکی ئەمەریکی ئەفەریقییە و میوانی بەردەوامـی بەرنامەیەکی دیالۆگی ڕادیۆییـە. ئایـا زانینـی ئـەوەی کـە کێـن پیاوێکـی ڕەشپێسـتە، هـۆکارە بـۆ ئـەوەی هەڵسـەنگاندنەکەت بـۆ ئـەو ئیقتیباسـە بگۆڕێـت؟ ئایـا ئـەم گۆڕانـە پێویسـتە؟ بـۆ نـا یان بـۆ ئا؟

١٢. لە ڕاهێنانی ژمارە دوودا، کوتەیشنێکت هەڵسەنگاندن، نووسەری ئەو کۆتەیشنە پیاوێکی ئیسپانییە بە ناوی Roger Hernandez. ئایا زانینی ئەوەی کە ڕۆگێر پیاوێکی ئیسپانییە، هۆکارە بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنەکەت بۆ ئیقتیباسەکە بگۆڕێت؟ ئایا ئەمە پێویستییە؟ ئەگەر نا، بۆ؟ ئەگەر ئا، بۆ؟

## ڕای جیاواز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی ئازادیی ڕادەربڕین و کۆدەکانی قسەکردن لە زانکۆ. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆوچونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر مەعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت،* ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان بە شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەی مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

*ئازادیی ڕادەربڕین و کۆدەکانی قسەکردن لە زانکۆ:* لە زانکۆی شادۆ، ئالان چارلس کۆرس و هارڤی سلڤێرگەیت هەستان بە دۆکۆمێنتکردنی ئەو سانسۆرانەی بەم دواییە خراوەتە سەر ئازادیی ڕادەربڕین لە زانکۆکانی

ئەمەریکادا. ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لە نموونە قەدەغەکراوەکانی قسە و کردار، کە ئەم دوو نووسەرە ئاماژەیان پێ داوە. ئەمانە نموونەی دەربڕین و کاری یاساغکراون. لە زانکۆدا هەرشتێک ببێتە هۆی لەدەستدانی متمانە بە خود، یان هەرشتێک جۆرێک لە مەترسیی تێدا بێت بۆ ئەوانی تر. دووەم، گوێنەدان بە ئەزموونی ژن، سێیەم، نوکتەی بەربەرەڵا، شتێکی تریش دووبارەکردنەوەی شتێکە، کە ئەوانی دی وەک دەستدرێژی لێکی بدەنەوە.

ئەم دوو نووسەرە هەبوونی ئەم چەشنە سانسۆرانە بە خراپ دەدەنە قەڵەم، بەڵام لە بەرامبەردا کەسانێک هەن، وای دەبینن ئەم سانسۆرانە ڕۆڵێکی جەوهەری دەگێڕن لە فەراهەمکردنی ژیانێکی شارستانیانە لە زانکۆکاندا.

# چاپتەری یانزەیەم

## هەڵەکانی دەربڕین Erroes of Expression

ئێمە تا ئێستا قسەمان لەسەر دوو جۆر هەڵە کردووە: ئەوانەی کە لە قۆناغی بیرکردنەوەدا دەبنە ڕێگر لە بەردەم بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا تەنانەت پێش ئەوەی گوزارشتیشیان لێ بکەین و ئەو هەڵانەی لە پرۆسەی مامەڵەکردن لەگەڵ هەندێک کێشەی تایبەتا تووشمان دەبن. لەم چاپتەرەدا، سەرقاڵی جۆری سێیەم دەبین: ئەو هەڵانەی لە کاتی دەربڕینی ڕاکانماندا بۆ ئەوانی تر تووشمان دەبن، جا بە زارەکی بێت یان بە نووسراو. ئەم جۆرەش ئەم هەڵانە دەگرێتەوە: گۆڕینی کێشەکە، *دژیەکی، سووڕانەوە لە بازنەیەکدا، گوزارەی بێمانا، هەڵەی پسپۆڕەکان، شوبهاندنی نەگونجاو، مەیلە نائەقڵانییەکان.*

لێرەدا ڕەنگە تۆ پرسیارێک بە خەیاڵتدا بێت، ئایا ئەو هەڵانەی لە سەرەوە ڕیز کران، ناچنە خانەی هەڵەکانی *بیرکردنەوەوە*؟ ئەگەر وایە، ئیدی بۆچی ناومان ناون هەڵەکانی *دەربڕین*؟ هەردوو پرسیارەکە زۆر جوانن. هەڵەکانی ئەم چاپتەرە و ئەوانی کە لە پێشوودا و ئەوانەشی کە لە داهاتوودا باسیان دەکەین، هەموویان هەڵەی فکرن، بیرن. چونکە هەموویان لە ئەقڵدا دروست دەبن، جا ئاگایەنە بن یان نائاگایانە. هەر بۆیە ئێمە تەواو ئەو حەقەمان بە دەستەوەیە، هەمووی لەژێر یەک ناوی

گەورەدا کۆ بکەینەوە، بۆ نموونە، "هەڵەکانی فکر" یان "کەموکووڕییە لۆجیکییەکان." لە ڕاستیدا زۆر کتێبیش کە دەربارەی بیکردنەوەی ڕەخنەییین، هەر بەم شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون.

بەڵام هۆی ئەوەی کە لە چوار کاتیگۆریدا ئەم هەڵانە پۆلێن دەکەین، ئەوەیە کە هەڵەکان زۆر کات لە ئاستی جیاواز جیاوازی ئەم پرۆسە بەرفراوەنەدا ڕوو دەدەن، کە پێی دەڵێن بیرکردنەوە. با هەڵەکانی دەربڕین لە مێشکیشدا ڕوو بدەن، بەڵام لەو کاتەدا ئێمە دەتوانین بەباشی دریکیان پێ بکەین، کە لە ڕێی زار و نووسینەوەوە دێنە دەرەوە و گوزارشتیان لێ دەکرێت. مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵەکاندا بە شێوەی گروپی جیاجیا "بۆ نموونە، هەڵەکانی دەربڕین" یارمەتیمان دەدەن لە دەسنیشانکردنی ئەو کاتەدا، کە پێویستە ڕووبەڕوویان ببینەوە.

## دژیەکی
## Contradiction

یەکێک لە جەوهەریترین پرنسیپەکانی لۆجیک بریتییە لە لە پرنسیپی دژیەکی، کە دەڵێت *هیچ گوزارەیەک ناتوانێت لە یەک کاتدا و بە هەمان شێوە هەم ڕاست بێت و هەم هەڵەش*. باشترین ڕێگە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستیی گوزارەیەک، بریتییە لە هەوڵدان بۆ دەرخستنی ناڕاستیی گوزارەکە. ئەمانەی خوارەوە تەنها هەندێکن لە ڕێگەکان:

*ئارگومێنت*: O. J. Simpson هەڵساوە بە کوشتنی Brown Simpson.

*لێدوان*: پرنسیپەکە داوامان لێ دەکات بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئایا ئەو کوشتوویەتی یان نا. بەڵام ئەی ئەگەر کەسێکی بەکری گرتبێت بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە؟ ئەوا لەم کاتەدا ئەو هەم کوشتوویەتی و هەم نەشیکوشتووە؟ بەڵێ، بەڵام " بە هەمان شێوە نا" ئەو ژنەکەی کوشتووە،

بەڵام بەو مانایە نا کە خۆی بە دەستی خۆی ڕاستەوخۆ تاوانەکەی کردبێت، بەڵکوو بەو مانایەی کە بەرپرسیاری تاوانەکەیە)

*ئارگۆمێنت:* Buster کێشی ١٩٨ پاوەندە. (*لێدوان:* ئەو یان ئەوەتا کێشی ١٩٨ پاوەندە یان ئەوەتا کێشێکی تری هەیە. ناکرێت هەردوو گریمانەکە ڕاست بێت. بەڵام ئەی ئەگەر هەر دوای ئەوەی کە کێشەکەیت پێوا، Buster دەمی پڕ بکات لە کێک و قوتی بدات، بەمەش ١٠ ئۆنس {٢٨. ٣٤٩ گرام} کێشی زیاد بکات. ئەوا لەم کاتەدا دەبێت بڵێین لە چرکەیەکدا کێشی ١٩٨ پاوەندە و هەر چرکەی داوی ئەوە، کێشی تۆزێک زیادی کرد).

*ئارگۆمێنت:* Franklin D. Roosevelt یاریزانێکی پاڵەوانێتی ئۆلۆمپی بوو، کە دواتر بوو بە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. (*لێدوان:* ئەم گوزارەیە ڕووبەڕووی پرنسیپی دژیەکی دەبێتەوە، چونکە تەنها بەشێک لە گوزارەکە ڕاستە _ ئەو هەرگیز یاریزانی ئۆلۆمپی نەبووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر گوزارەکە بەوردی بخوێنینەوە، دەبینین کە لە دوو بەش پێک هاتووە، بەڵام چڕ کراوەتەوە لە یەک گوزارەدا، کە یەکێکیان ڕاستە و ئەوی تریشیان هەڵە)

هەوڵ بدە پرنسیپی دژیەکی بەسەر گوزارەکانی خۆشتدا بەکار بهێنە و نائومێدیش مەبە لەوەی کە هەموو کات نەتوانی پێچەوانەکەی بسەلمێنیت. ئەم پرنسیپە ئامادەگییەکی بەهێزی هەیە لە کایەی بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا. بە شێوەیەک، هەموو بوارە جۆربەجۆرەکان هەر لە ئەندازیاریی بیناسازییەوە تا ئاژەڵناسی، هەموو پشت دەبەستن بەم پرنسیپە.

لە چ کاتێکدا دژیەکی ڕوو دەدات؟ کاتێک کەسێک لە ئێستادا شتێک دەڵێت و لە دواییشدا شتێکی پێچەوانەی ئەمەی ئێستای دەڵێت. گومانلێکراوێک ئەمڕۆ دان بە تاوانەکەیدا دەنێت و بەیانی پەشیمان دەبێتەوە. بۆ نموونە، ڕێژەگەران بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە هەرکەسە بۆ خۆی حەقیقەتی خۆی دروست دەکات و هیچ بۆچوونێک لە بۆچوونێکی تر بایەخدارتر نییە، هەر بۆیە دژی خۆیان دەوەستنەوە، لە کاتێکدا هێرش دەکەنە سەر ئەو کەسانەی کە بەم بانگەشەیە ڕازی نین. نووسەرێک تیۆرییەک سەر ڕێگە دەخات، کە جیهانی ماددی وەهم و ناڕاستە و تەنها جیهانی ناماددی یان ڕۆحیی، جیهانی حەقیقییە، بەڵام ڕەنگە لەسەر کێشەیەکی ماددی، دراوسێکەی ڕاپێچی دادگا بکات. هەندێک لە فیلمسازە دەوڵەمەندەکان، زیاد لە جارێک لە بەرنامە دیالۆگییە تەلەڤزیۆنییەکاندا بانگەشەی ئەوە دەکەن، ئەو دیمەنە توندوتیژی و سێکسییانەی ئەمانە لە فیلمەکانیندا بەرهەمی دەهێنن، هیچ کاریگەرییەک لەسەر ڕەفتاری بینەران بەجێ ناهێڵێت، بەڵام هەر دوای چرکەیەکی تر، بەباشی باسی هەوڵەکانی نەهێشتنی ئایدز و خواردنەوەی نابەرپرسیارانەی ماددە هۆشبەرەکان دەکەن لە میدیاکانەوە، کە گوایە دەتوانن جیهانێکی باشتر دروست بکەن.

بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەی دژەیەکیدا، چاودێریی ئەو شتانە بکە، کە دەیاننووسیت و دەیانڵێیت. هەر چرکەیەیش هەستت بە نەگونجاوی و ناکۆکی کرد، بەوردی لێی ورد ببەرەوە، بزانە ئایا کێشەکە سەر دەکێشێت بۆ دژیەکی یان نا. ئەگەر سەری کێشا بۆ دژیەکی، ئەوا دووبارە لە کێشەکە بکۆڵەرەوە. بە شێوەیەک، کە تەنها ئەو گۆشەنیگایە پەسەند بکە کە هەم پتەوە و هەم مەعقول.

## خۆدووبارەكردنەوە

خۆدووبارەكردنـەوە واتـە وتنـەوەی يـەك ئايديـا بـە شـێوەی جيـاواز، بـەو هيوايـەی قەناعـەت بـە وەرگر بهێنێت. كاتێك گوزارەيەكی كورت دووبـارە دەكرێتـەوە، ئاشـكرا ديـارە. بـۆ نموونـە، كەسـێك دەڵێـت "ڕێـژەی تـەڵاق لـە ئێسـتادا لـە بەرزبوونەوەدايـە، چونكـە ژمارەيەكـی زۆرتـری خێزانـەكان هەڵدەوەشـێن،" كەم كەس هەيە خۆدووبارەكەرەوە نەبێت. بـەڵام سـەرنجی ئـەم ئايديايە بدە لـە ڕستەيەكی درێژتردا: "ڕێژەی تـەڵاق لـەم نەوەيـەدا بـە شـێوەيەكی بەرچـاو زياتـرە لـە نەوەكانـی پێشـووتر، پێش ئـەوەی ئامـاژە بـە هـۆكان بدرێـت، پێويسـتە هەندێـك هـۆكار لەبەرچـاو بگيرێـت، وەكـوو جياوازيـی تەمەنـی نێـوان دوو كەسـەكە. بـەڵام زۆربـەی پسـپۆڕان لـەو بڕوايـەدان هـۆی ئـەم دياردەيـە دەگەڕێتـەوە بـۆ زۆريـی ئـەو خێزانانـەی كـە لەبەريـەك هەڵدەوەشـێن." هەمـان خۆدووبارەكردنـەوە، بـەڵام لـە فۆرمێكـی درێژتـردا كـە وای كـردووە خێـرا هەسـتی پـێ نەكرێـت. ديـارە مـەرج نييـە نووسـەرەكان بـە ئـارەزوو خۆيـان دووبـارە بكەنـەوە، بـەڵام ئـەوەی كـە گرنگە بوترێت ئەوەيە، كە زۆربەمـان ئـەو ئاگاييـە هۆشـيارييەمان نييـە تـا هەسـتيان پـێ بكەيـن.

بـۆ ئـەوەی بتوانيت خۆدووبارەكردنـەوە لـە نووسـينەكانتا دەستنيشـان بكەيت و لای بەريت، هـەر ئەوەنـدە بـەس نييە بيخوێنيەتـەوەو لەگـەڵ خۆتـا كـۆك بيـت. بەڵكوو دەبێت دڵنيـا بيت لـەوەی بەڵگـەی گونجـاوت هەيـە بـۆ پشتڕاسـتكردنەوەی بانگەشـەكانت، نـەك هـەر نووسـينەوەی بانگەشـەكەت، بـەڵام بـە شـێوەكەی تر.

## گوزارە بێماناکان

دروشـمی بەناوبانگی ڕیکلامـی کۆمپانیـای Dean Witter کـە بـە دەنگێکـی بـەزر و لەخۆڕازیبوونـەوە دەوترێتـەوە، برتییـە لـە "ئێمـە سـەرکەوتنی هـەر وەبەرهێنەرێـک بـە جیـا دەپێویـن." ئەگـەر دەنـگ لـەم دروشـمەدا پێـوەر بێـت بـۆ مانـاداری، ئـەوا ئـەم ڕیکلامـە زۆر مانـادار دەبـوو. بـەڵام پێـوەر بریتییـە لـە مانـای خـودی وشـەکان، کـە لـەم دروشـمەدا نییـە. لـە باشـترین حاڵەتـا ئـەم دروشـمە دەیەوێـت بڵێـت، هـەر وەبەرهێنەرێـک وەک یـەک داتـا مامەڵـەی لەگەڵدا دەکرێت، پاشـان هەمـوو داتـاکان کۆ دەکرێتەوە بۆ زانینـی ستاتیسـتیکی گشـتی کۆمپانیاکـە. لـە ڕاسـتیدا هیـچ شـتێکی تـازەی تێدا نییـە. لـە کۆمپانیاکانـی تریشـدا داتـا هـەر هەمـان مانـای هەیـە. نموونەیەکـی تـر بـۆ گـوزارە بێمانـاکان، دروشـمەکەی LensCrafters، کـە دەڵێـت "کارێـک دەکەیـن کاژێـر دوای کاژێـر باشـتر ببینـن." ئـەم دروشـمە وێنـەی چاویلکەسـازێکی زۆر دڵسـۆز پیشـان دەدات، کـە بـەردەوام شـێوازی باشـتر و باشـتری پشـکنین بەکار دەهێنێت لەپێنـاو باشـترکردنی ئاسـتی بینایـی نەخۆشـەکاندا، بەڵام لـە ڕاسـتیدا ئەمـە بانگەشـەیەکی بێمانایـە، کـە کۆمپانیایـەک بتوانێـت کاژێـر دوای کاژێـر چاویلکەیەکـی باشـتر لـەوی پێشـوو دروسـت بـکات.

هەمیشـە کەسـەکان لـە کاتـی گوزارشـتکرن لـە ڕاکانیـان، پێیـان باشـە یـان بـە پێویستیشـی دەزانـن ئامـاژە بـەو هۆیانـەش بدەن، کـە شـەرعییەت دەداتـە بیرکردنـەوە و کردەوەکانیـان. گـوزارە بێمانـاکان ئەوانـەن کـە هۆکانیـان هیـچ مانایەکیـان نییـە. بازرگانێکـی ئۆتۆمۆبیلـی دەسـتی دوو لـە ڕیکلامێکـدا دەڵێـت، "ئەگـەر تـەواو ئیفلاسـیش بیـت، مـن عەقدەکـەت هـەر بـۆ ئیمـزا دەکـەم. تەنـات پێش ئـەوەی سـەیارەکەشـت ببینیـت، ئێمـە بەرپرسـیارێتیی تـەواوی سـەیارەکەت لەئەسـتۆ دەگریـن. ئێمـە دڵنیایـن لـە بازاڕمـان، چونکـە تەنهـا سـەیارەی

کولێتی بەرز دەفرۆشین. "بینەرێکی بەدیقەت ڕەنگە بە خۆی بڵێت، باشە باشبوونی سەیارەکان چۆن گەرەنتیی ئەوە دەکەن کە کڕیارەکان دەتوانن قەرزەکانینان بدەنەوە؟ (دیارە کە گەرەنتیی ناکات). ئەم سەروتارانەی خوارەوەش کە لە گۆڤارێکی ڕیکلامی کۆمپانیایەکی ئەساسی ناوماڵدا بڵاو کراوەتەوە، نموونەیەکی تری گوزارە بێماناکانن: "هەواڵێکی خۆش، بە هۆی ئەو قازانجە بێنموونەیەی لە فرۆشتنی کەلوپەلەکانمان بەدەستمان هێناوە، بۆ ماوەی دە ڕۆژی تریش بە هەمان نرخ کۆمپانیاکەمان کراوەیە." ڕەنگە لە خۆمان بپرسین، باشە ئەگەر ئەوەندە زۆری لێ فرۆشراوە، چۆنە هێشتا بەشی دە ڕۆژی تریش مەوادیان ماوە؟ (بەگومانترین کەسمان ڕەنگە بەم شێوەیە ڕیکلامەکە لێک بداتەوە: "بە ئەندازەیەک شکستمان هێنا لە فرۆشتنی شتەکانمان، کە کونوکەلەبەرمان پڕە لە مەوادی بێنرخ، ئێمە خەون دەبینین پێتانەوە تا بێن و بیانکڕن).

بۆ دیاریکردنی گوزارە بێماناکانی خۆت، بە هەمان ئەو گوڕوتینە ڕەخنەییەوە بۆچوونەکانی خۆت هەڵبسەنگێنە، کە هی ئەوانی تری پێ هەڵدەسەنگێنیت. لە خۆت بپرسە، ئایا ئەوەی کە دەیڵێم، هەر بەجیدی مانایەکی هەیە؟

## هەڵە لە پسپۆڕیدا Mistaken Authority

هەڵە لە پسپۆڕیدا، واتە پێدانی مافی قسەکردن بە کەسێک، وەک پسپۆڕێک لە کاتێکدا پسپۆڕیی لەو بابەتەدا نییە، کە قسەی لەسەر دەکات. ئەم جۆرە هەڵەیە لە ئێستادا زۆر بووە لە میدیاکاندا بە هۆی جادووی کاریزماتیکییانەی کەسە بەناوبانگەکانەوە. بۆ نموونە، لە چاوپێکەوتنێکی تەلەڤزیۆنیدا، بێژەرەکە لە Cybill Shepered ئەکتەری پرسی" ئایا ڕۆڵبینینت لە درامایەکی تەلەڤزیۆنیدا هیچ زانیارییەکی پێ دایت لەسەر تاوانی

منداڵەباربردن؟" ئەگەر ڕۆڵبینین لە درامایەکدا دەربارەی منداڵەباربردن بتکاتە پسپۆڕ لەسەر کێشەکە، ئەوا ناشبێت ڕۆڵبینینی فیتەرێک توانای سەیارەچاککردنەوە بدات بە ئەکتەرەکە لە واقیعدا، یان ڕۆڵبینینی دکتۆرێکی جوانکاری توانای نەشتەگەری بدات بە ئەکتەرەکە؟ ئەم هەڵەیە لە ئاستی شاراوەشدا ڕوو دەدات، کاتێک پسپۆڕێک لێدوان لەسەر کایەیەک دەدات، کە پسپۆڕیی تێدا نییە. کە ئەمەش زیاتر لەوەی بە خەیاڵتا دێت، ڕوو دەدات.

بۆ ئەوەی خۆت لەم هەڵەیە بەدوور بگریت، دڵنیا بە لەوەی هەموو ئەو سەرچاوانەی بەکارت هێناون لە لێکۆڵینەوەکانتا، لەلایەن کەسی پسپۆڕەوە نووسراون.

## بەراوردکردنی هەڵە False Analogy

بەراوردکردن یان بەیەکچوواندن واتە ڕوونکردنەوەی شتێکی نادیار بە ئاماژەدان بە شتێکی تر، *جیاواز* بەڵام *ئاشکراتر*. بۆنموونە، بڵێیت "ئەمە لە کاریگەربووندا وەک ئەوە وایە." بەیەکچوواندن دەشێت سوودبەخش بێت، بە تایبەتی بۆ ڕوونکردنەوەی ئایدیا ئاڵۆزەکان، بەڵام ئەگەری خراپبەکارهێنانیشی، ئەگەرێکی زیندووە. بەراوردکردن قبوڵ کراوە تا ئەو شوێنەی دوو شتەکە {دوو بابەتی بەراودکراو بە یەکتر} بە فیعلی هەڵگری سیفەتە هاوبەشەکان بن. با سەرنجی ئەم نموونەیە بدەین، کە لێکچوواندن بە شێوەیەکی باش بەکار هاتووە. نووسەر باس لە کێشەی هەندێک لە ڕەشتپێستەکانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی دەکات، کە دانیشتووانی شارەکانن، لەو بڕوایەدایە کە هەموو کێشەکان ناگەڕێنەوە بۆ کۆیلایەتی. باسکرنی شێرپەنجە هاوکاریی دەکات تا بۆچوونەکەی ڕوون بکاتەوە:

ئێمە هەموو دەتوانین لە پرنسیپدا لەوە تێبگەین، کە هەبوونی

دیاردەیەکی مێژوویی گەورەی خراپ، مەرج نییە هۆکار بێت بۆ هەموو کێشە بچووکەکانی تر... شێرپەنجە نەخۆشییەکی ترسناک و کوژەرە، بەڵام لە ڕێی شێرپەنجەوە نە دەتوانین لە هەموو نەخۆشییە ترسناکەکانی تر بگەین و نە لە ترسناکترینی ناویان.

لە بەرامبەردا بەراوردکردنی هەڵە، بانگەشەی ئەو لەیەکچوونانە دەکات کە بوونی نییە. نموونەیەکی بەدناوی بەیەکشوبهاندن ئەوەیە، کە لەلایەن توندڕەو و تیرۆریستەکانەوە بەکار دەهێنرا بۆ شەرعیەتدان بە کوشتنی خەڵکی: "بۆ ئەوەی ژەمێکی ئۆملێت {خواردنێکە بە تێکەڵکردنی هێلکە و گۆشت دروست دەکرێت} دروست بکەیت، دەبێت هەندێک هێلکە بشکێنیت. "کەسێکی بیرکەرەوە دەستبەجێ کە گوێی لەمە دەبێت، دەڵێت، "بەڵام مرۆڤەکان و هێلەکەکان زۆر لە یەک جیاوازن!"

کاتێک کە شتەکان بە یەک بەراورد دەکەیت، دڵنیا بە لەوەی کە سیفەتی هاوبەشی مەعقول و واقیعییان هەیە و هیچ جیاوازییەکی جەوهەرییان نییە.

## مەیلە نائەقڵانییەکان Irrational Appeal

مەیل یان پاڵنەری نائەقڵانی، وا دەکات کەسەکان ئایدیاکان قبوڵ بکەن بە هۆی ئەو هۆیانەوە، کە هەموو شتێکن، بەس ئەقڵانی نین. ئەم مەیلانە پێمان دەڵێن، "پێویست ناکات بە شێوەیەکی ڕەخنەیی لە ئایدیایەک ورد ببینەوە یان بەراوردی بکەین بە ئەڵتەرناتیڤەکانی - بەڵکوو تەنها قبوڵیان بکە و تەواو." لە واقیعدا {لە ژیانی ڕۆژانەدا} زۆر پێویستە بە شێوەیەکی ڕەخنەیی لە ئایدیاکان بڕوانین، چونکە هەندێک کات ئایدیا ناڕاستەکان وەک ڕاست دەر دەکەون و دەشبێت بشزانین ئایدیا ناڕاستەکان دەکرێت

دەرئەنجامی زۆر زیانبەخشیان لێ بکەوێتەوە.

باوترینی ئەو پاڵنەرە نائەقڵانییانە بریتین لە مەیل بۆ *سۆز*، بۆ *دابونەریت*، بۆ *مامناوەندیتی*، بۆ *پسپۆڕەکان*، بۆ *بڕوا باواکان* و بۆ *لێبووردەیی*. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموو مەیلێک بۆ سۆز، بۆ دابونەریت، بۆ مامناوەندیتی، بۆ پسپۆڕەکان، بۆ بڕوا باواکان و بۆ لێبووردەیی بە*ناچاری* نائەقڵانی بێت. هەندێکیان کە بەسەریان دەکەینەوە و دەیانبینین کە ڕەوان؛ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی داوامان لێ دەکات هەڵسین بە جیاکردنەوەی مەیلە نائەقڵانییەکان و مەیلە ئەقڵانییەکان.

## مەیلی نائەقڵانی بۆ سۆز، عاتیفە emotion

مەیل یان پاڵنەری ئەقڵانی بۆ سۆز هەر تەنها هەستەکان ناهەژێنێت، بەڵکوو گرنگیی پەیوەندیی خۆی و ئەو ئایدیایەش پیشان دەدات، کە عەرز دەکرێت یان کە ئەم گوزارشتی لێ دەکات. بۆ نموونە، لە ڕاپرسییەکدا دەربارەی شوفێرە سەرخۆشەکان، دیمەنی ڕووداوێکی هاتووچۆی خەمناکمان پیشان دەدات، تا هاوسۆزی و هەوخەمیمان بۆ قوربانییانی ڕووداوەکە بهەژێنێت و بە حەماسەتەوە بڵێین، "نابێت شۆفێری و خواردنەوە تێکەڵ بکرێن." بانگەوازکردن بۆ کاری خێری نێودەوڵەتی، لە ڕێی پیشاندانی دەموچاوی برسی و ماندووی منداڵە برسییەکانەوە، دەمانوروژێنن تا هەڵوێست بنوێنین و بڵێین لە کاتێکدا ٨٠ سەنت نرخی خواردنی منداڵێکە، ئیدی ئەم برسێتییە بۆ؟ ئەم مەیل یان پاڵنەرە عاتفییانە شەریعەتی ئەقڵییان هەیە، لەبەر ئەوەی پەیوەندییان هەیە بە ئایدیاکانەوە {ئایدیا ئەقڵانی}، یان لانی کەم داوامان لێ دەکەن بیر لەو پەیوەندییە بکەینەوە.

لـە بەرامبـەردا، مەیلـی پاڵنـەری *نائەقلانـی* سـۆز، هەسـت و سـۆزەکان وەک *جێگرەوەی* بیر، ئەقڵ بـەکار دەهێنێت. ئـەم جۆرە مەیلـە هەسـتەکانی وەکـوو تـرس، ڕق، گونـاه، خۆشەویسـتی بـۆ خێزان و بـۆ وڵات، هەسـتی بەزەیـی هانـت دەدات، بـێ ئـەوەی مەعقولیەتـی ئـەم هەسـتانەمان پیشـان بـدات. سیاسـییەک ڕەنگـە بانگەشـەی ئـەوە بـکات، کـە بەرنامـەی ئابـووری ڕکابەرەکـەی خـواردن لـە دەمـی منداڵەکانیش دەر دێنێت، یـان پـارەی ئاسایشـی کۆمەڵایەتیـی بەتەمەنـەکان هەڵدەلووشـێت، بەبـێ ئـەوەی یـەک دۆکۆمێنتیش بۆ پشتڕاستکردنەوەی تۆمەتەکانی بخاتـە ڕوو. مافناسـێک لە هەوڵـی بەرگریکردنـدا لـە مەعمیلەکـەی، بـاس لـە خۆشـەویستیی ئـەو دەکات بۆ دایکی، میهرەبانیی ئـەو بـۆ ئاژەڵـەکان، خۆشویسـتن و خـەمخۆریی ئـەو بۆ ژیـان، بـەو هیوایـەی سـۆز و هاوخـەمیی دادوەرەکان بـۆ مەعمیلەکـەی ڕابکێشێت، تـا ئـەو بەڵگانـە چاوپۆش بکـەن، کـە دژی ئـەو هـەن. سـەیرترین نموونـەی ئـەم جـۆرە مەیلـە کـە لـە دادگاکانـدا ڕووی دابێـت، ئەوەیـە کـە پیاوێـک پـاش ئـەوەی هـەم دایـک و هـەم باوکـی خـۆی دەکوژێـت، داوای سـۆز و بەزەیـی لـە دادوەرەکان دەکات، چونکـە هەتیـوە!

## مەیلی نائەقڵانی بۆ دابونەریت

مامەڵـەی *ئەقڵانـی* لەگـەڵ نەریتـدا دەپرسێت، تـا چ ڕادەیـەک نەریتـە کۆنـەکان شیاوی ئـەوەن تازەیان بکەینـەوە و پەیڕەوییـان لێ بکەین. بـەڵام مامەڵـەی *نائەقڵانـی* لەگـەڵ دابونەریتەکانـدا دەڵێت دەبێت پەیڕەوییـان لێ بکەین، چونکە هـەر وامـان کردووە لـە ڕابردوودا. مەیلی نائەقڵانـی لـەم چەشـنە بەدرێژاییی مێـژوو ڕێگـر و ئاسـتەنگی پێشـکەوتن بـوون لـە بـوارە جۆربەجۆرەکانـدا، لـە زانسـتەوە بـۆ تەکنەلۆجیـا و بـواری پزیشـکی. لـە سـەرەتادا، خەڵکـی دژی فلچـەی ددان، چەتر، فڕۆکـە، تەلەفۆن، کۆمپیوتـەر، لە ڕاسـتیدا هەمـوو داهێنانەکانـی تریـش بـوون، چونکـە "باووباپیرانمـان ژیانێکـی سـادە و

خۆش ژیـان، بـێ ئـەوەی ئـەم هەمـوو ئامێـرە تـازە داهێنراوانـەش بـەکار بهێنـن." بەدرێژاییی چەنـدان سـاڵ، پزیشـکەکان لـە کاتـی بینینـی نەخۆشـە جیاوازەکاندا دەسـتیان نەدەشـۆری، بۆ؟ چونکـە ئـەوکات نەریـت نەبـوو کـە دەستنەشـۆرینی پزیشـک دەبێتـە هـۆی گواسـتنەوەی نەخۆشـی.

## مەیلی نائەقلانـی بۆ مامناوەندێتی Moderation

مامەڵـەی ئەقلانـی لەگـەڵ مامناوەندێتیـدا دەپرسـێت، بۆچـی هەتـا زیاتـر ئایدیایـەک یـان کردارێـک مامناوەندتـر بێـت، زیاتـر پەسـەندتر دەبێـت وەک لەوانـەی کـە کەمتـر مامناوەندێتییـان پێـوە دیـارە. بـەڵام مامەڵـەی نائەقلانـی لەگەڵ مامناوەندێتیدا لـەوەوە دەست پـێ دەکات کـە مـادام ئـەو ئایدیایە یان کردەوەیـە مامناوەنـدە، کەواتـە بەناچـاری هەمـوو کات ڕاسـتە، کـە ئەمـەش حوکمێکـی پێشـوەخت و هەڵەیـە. بـا لـە کێشـەی کۆیلایەتـی ورد بینـەوە لـە سـەردەمی شـەڕی ناوخـۆدا {مەبەسـت وڵاتـی ئەمەریکایـە}. هەندێـک وەک کێشـەیەکی ئەخلاقیی گەورە سـەیری کێشـەکەیان دەکرد و ڕقیان لێی دەبۆوە و داوای نەمانـی یەکجارەکیی ئـەم دیاردەیەیان دەکرد. بـەڵام هەندێکی تر لـە بەرامبـەردا لـەو بڕوایـەدا بـوون، کـە وەک هەرشـتێکی تریـش کڕیـار مافـی خاوەندارێتیـی بەسـەر کۆیلەشـەوە هەیـە، چونکـە کڕیونـی. لـەم ناوەنـدەدا، بۆچوونـی مامناوەنـد ئـەوە بـوو کـە ئـەوەی بـاوەڕی پـێ نییـە، بـا کۆیلـەی نەبێـت و ئەوەشـی بـڕوای پێیەتـی، بـا هەیبێـت. (بەدڵنیاییشـەوە کۆیلـەکان مافی وتنی حەرفێکیـان نەبـووە لەسـەر کێشـەکەیان). ئاشـکرایە لەمڕۆدا هیچ مرۆڤێکـی هۆشـمەند پشـتگیری لـەو دیـدە مامناوەندەیـی جـاران نـاکات.

## مەیلی نائەقلانـی بۆ پسپۆڕانAuthority

ئـەو پسـپۆڕەی یـان ئەوسـەرچاوەیەی کـە بـۆ پشـتگیریی ڕایەک وەر گیـراوە، دەکرێـت کەسـێک، یـان کتێبێـک، یـان دۆکۆمێنتێـک، یـان دامەزراوەیـەک بێـت

(دادگای باڵا). مامەڵەی ئەقڵانی لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا بریتییە لە "باشە، ئەمە بۆچوونی شارەزایەک یان زیاترە لە بوارەکەدا، بەڵام ئایا بۆ دەبێت قبوڵیان بکەین؟" لە بەرامبەردا مامەڵەی نائەقڵانی بۆ ئەم حاڵەتە بریتییە لە "باشە، ئەمە بۆچوونی شارەزایەک یان زیاترە لە بوارەکەدا. کەواتە بێ دوودڵی وەک ڕاستی قبوڵیان دەکەین." لەبەر ئەوەی شارەزایان و پسپۆڕان خاوەنی ئەو توانا جادووییە نین کە وایان لێ بکات نەکەونە هیچ هەڵەیەکەوە، کەواتە ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە، بۆچوونی شارەزایان ئاسایییە بێ پرسیار و گومان قبوڵ بکرێن، بۆچوونێکی گەمژانە و نائەقڵانییە.

## مەیلی نائەقڵانی بۆ بیروباوەڕە باوەکان common belief

قبوڵکردنی *ئەقڵانییانەی* بیروباوەڕە باوەکان کاتێک دەبێت، کە بتوانێت مەعقولیەتی ئەو بیروباوەڕانە پیشان بدەیت. بەڵام مامەڵەی *نائەقڵانی* دەربارەی بیروباوەڕە باوەکان، واتە قبوڵکردنیان، تەنها لەبەر ئەوەی زۆرینەی خەڵکی قبوڵیان کردووە و بە دروستی دەزانن {بە بۆچوونی من، پیادەکردنی ئایین نموونەیەکی باشە بۆ بیرکردنەوە}. ئەم مەیلە نائەقڵانییە زۆر کات دەتوانین لەم چەشنە گوزارانەدا بیاندۆزینەوە "هەمووان ئەوە دەزانین،" "ئەوەی دەماخی لە سەردا بێت، ئەمە ڕەت ناکاتەوە" یان "ئەمە لای هەمووان قبوڵ کراوە." گرفتی بیروباوەڕە باوەکان لەوەدایە، بۆ ماوەیەکی زۆر قبوڵ دەکرێن، دواتر دەر دەکەوێت هیچ مانا و مەعقولێتییەکیان تێدا نەبووە، بۆ نموونە، قوربانیکردنی کچە پاکیزەکان لەپێناو باشبوونی داهاتی کشتوکاڵدا، کوشتنی ساوا فڕێدراوەکان، چونکە دەبوونە مایەی داباریندی تووڕەیی خودا. جەوهەری بابەتەکە ئەوەیە، کە بڕوابوونی هەندێک یان تەنانەت زۆربەی خەڵکی بە شتێک خۆی بۆ خۆی بەڵگەی تەواو نییە تا ئێمەش بڕوا بەو شتە بکەین و شوێنی

بکەوین.

## مەیلی نائەقڵانی بۆ لێبووردەیی Tolerance

مامەڵی *ئەقڵانی* لەگەڵ لێبووردەییدا، واتە لەبەرچاوگرتنی ئەو هۆ ئەقڵانییانەی کە شەرعییەت دەدەنە لێبووردەییەکە. بەلام مەیلی *نائەقڵانی* وا دەکات بڵێین "لەبەر ئەوەی لێبووردەیی بەگشتی شتێکی چاکە، کەواتە هەڵوێستی دروستە لە هەموو حاڵەتەکاندا، بەم حاڵەتەشەوە." کە لە ڕاستیدا ئەمە بێمانایییەکی تەواوە. هەندێک تاوانی وەکوو تیرۆریزم، دەستدرێژیی سێکسی، منداڵبازی، ئەمانە دەبێت بە دەنگی بەرز ئیدانە بکرێن. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا لێبووردەییی بەرامبەر بە تاوانبارەکان هەبوو، تاوانەکان زیاد دەکەن و قوربانییەکانیش لێقەوماوتر دەبن.

باشترین ڕێگە بۆ جیاکردنەوەی مامەڵەی ئەقڵانی لە مەیلی نائەقڵانی بۆ لێبووردەیی ئەوەیە کە بزانیت ئاخۆ ئەو مەیلە پرسیاری بۆ دەبێت *ئێمە لێبووردە بین*، لە خۆی کردووە یان نا؟ ئەگەر پرسیارەکە بە وەلامی مەعقول وەلام درایەوە، کەواتە مەیلەکە مەیلێکی ئەقڵانییە. ئەگەر وا نەبوو، کەواتە داواکردنی لێبووردەیی شەرعی نییە و ناعەقڵانییە.

# ڕاهێنانەکان

١. ئایا تۆ کەوتوویتە کام لەو هەڵانەی کە لەم چاپتەرەدا باس کران؟ هەڵەکان ڕوون بکەرەوە و باسی ئەو دۆخەش بکە، کە هەڵەکە ڕووی داوە.

٢. ئەم دیالۆگانەی خوارەوە بەوردی بخوێنەرەوە. ئەگەر هەر هەڵەیەکت بەرچاو کەوت کە لەم چاپتەرە و لە چاپتەرەکانی ٩ و ١٠دا باس کراون، دەستنیشانینان بکە. پاشان بڕیار بدە لەسەر ئەوەی کە کام لە گۆشەنیگاکانی دیالۆگەکە لەوانی تر مەعقولترە و هۆی هەڵبژاردنەکەشت ڕوون بکەرەوە، ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەوە، کە تا ئێستا لەم کتێبەدا باس کراون.

*باکگراوندی دیالۆگەکە: لە چەند دەیەی ڕابردوودا بەرپرسیارانی زانکۆکان لە مشتومڕی ئەوەدا بوون، کە ئاخۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانە قەدەغە بکەن کە قوتابییان لە ڕۆژنامەکانی خۆیاندا بڵاویان دەکردەوە، کە تێیاندا وشەی ئابڕوبەر و سێکسیی تێدا بوو. دیارە ئێستاش مشتومڕ بەردەوامە، بەڵام بابەتی مشتومڕەکان گۆڕاون. هەندێک لە قوتابییان لە وتارەکانیاندا هەوڵی سووککردنی ئەمەریکییە ڕەشتپێستەکان و ژنان و هاوڕەگەزبازەکان دەدەن. هەندێکی تریان هانی قوتابییان دەدەن تا وێنە لەسەر دیواری کۆلێژەکان بکێشن و دژی بیروباوەڕی باو بجووڵێنەوە.*

ئێرنیست: ڕاسته ئەو بابەتانە ڕەنگە منالآنە و سادە بن، بەلآم هیچ هۆیەک نییە تا سانسۆر بکرێن.

جۆرجینا: ئەوە بە ڕاستتە؟ پارەی خوێندن بۆ بەشێک لە خێزانەکان بڕێکی زۆرە و من دڵنیام لە زۆربەی کۆلێجەکان بەو پارەیەی کە بۆ چالاکیی قوتابییان تەرخان کراوە، مەسرەفی ڕۆژنامەکان دەکرێن. باشە چ دادپەروەرییەک لەوەدایە، پارە لە قوتابییان بسەنرێت بۆ چاپکردنی ئەو بابەتانەی کە سووکایەتییان پێ دەکات، یان بۆ ئەو بابەتانەی کە هانیان دەدات تا ببنە یاساشکێن، کە دواجار هەر خۆیان باجەکەی دەدەن؟

ئێرنیست: باشە بۆ تۆ هەموو شتێک ئەبەستیتەوە بە پارەوە؟ دۆلارێک یان شتێک زیاتر لە پارەی هەر قوتابییەک تەرخان دەکرێت بۆ ڕۆژنامەکان. توو خوا ئەمە شتە. ئەمە ئەو مافە ناداتە هەر قوتابییەک، تا یاسای فاشییانە لەسەر ڕۆژنامەکان دەر بکات. بابەتەکان یان بە ڕۆحییەتی گاڵتەوگەپەوە نووسراون، یان بۆ ئەوەیە گۆمی بەها باوەکان بشڵەقێنێت. بۆیە سانسۆردانان ڕەوا نییە. خۆ ئەگەر مێشوولەیەک وەڕست بکات، خۆ ناکرێت بەو چەکەی کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فیلێک بەکاری دەهێنیت، مێشوولەکە دەر بکەیت. ڕەنگە تۆ ئەوە بکەیت، بەلآم لە ڕاستیدا هیچ کەسێکی ئاقڵ وا ناکات.

٣. ئەم ئارگۆمێنتانەی خوارەوە هەڵبسەنگێنە، ئەو میتۆدانە بەکار بهێنە، کە لە چاپتەری حەوتدا فێر بوویت. ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەوە، کە لەم چاپتەرە و لەوانەی پێشوودا باس کران.

*باکگراوندی بابەتەکە: لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لێرەولەوێ خەڵکێک هەن کە دژی بەردەوامبوونی نەریتە ئاینییەکانن لە قوتابخانە گشتییەکاندا. بەتایبەت دژی ئەو گوزارەیەن کە دەڵێت، "ئەمەریکا لەژێر ڕەحمەتی خودادایە." ئەوان بەم شێوەیەی خوارەوە گوزارشت لە ئارگۆمێنتەکەیان*

دەكەن:

*ئارگۆمێنتەکە:* ئەو نەریتە ئایینییەی کە لە قوتابخانە گشتییەکان و حکومییەکاندا دووبارە دەکرێتەوە، کە دەڵێت ئەمەریکا لەژێر ڕەحمەتی خودادایە، هیچ نییە جگە لە تۆخکردنەوە و بەهێزکردنی ئایین، ئەمەش پێچەوانەی دەستوورە، چونکە بەپێی دەستوور، دەوڵەت و کەنیسە {ئایین} دەبێت لەیەک جیا بن و تێکەڵ بەیەک نەکرێن. کەواتە نابێت ڕێ بەم جۆرە نەریتانە بدرێت لە قوتابخانەکاندا.

b. *باكگراوندی کێشەکە: کێشەی زبل - پاشەڕۆ، کێشەیەکی گەورەیە و زۆر کۆمەڵگەی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە. ئەم ئارگۆمێنتەی خوارەوە، هەوڵ دەدات چارەیەک بۆ لایەک لە لاکانی کێشەکە بدۆزێتەوە.*

*ئارگۆمێنتەکە:* هەرشتێک بەهای ماددیی هەبوو، ئەگەری فڕێدانی کەمترە (یان لانی کەم، داوای فڕێدانیشی، دووبارە ئامادە دەکرێتەوە بۆ بەکارهێنان). هەر بۆ نموونە، ئەگەر بۆ هەر بتڵێک لایەنی پەیوەندیدار بڕی ٢٥ سەنت بدات بە بەکاربەر، ئیدی بەکاربەر دوای بەکارهێنانی، بتڵەکە فڕێ نادات و بە پارە دەیفرۆشێتەوە. بەم ڕێگەیەش، لانی کەم بەشێکی کێشەی پیسوپەڵۆخی چارە دەبێت.

٤. لەم کێشانەی خوارەوە ورد ببەرەوە. ئەگەر هەستت کرد پێویستت بە زانیاریی زیاتر هەیە بۆ ئەوەی بڕیارێکی ورد و دورست بدەیت، ئەوا بەدەستیان بێنە. پاشان مەعقولترین بۆچوونی ناو بۆچوونەکان لەسەر کێشەکان دەستنیشان بکە. ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەوە، کە لەم چاپتەرە و لەوانی پێشووتردا باس کران.

a. زۆر کەس لەو بڕوایەدان پۆرنۆگرافی {میدیای سێکی} ڕەگەزی مێ دەچەوسێنێتەوە، بەوەدا کە وەکوو ئامراز پیشانیان دەدات، نەک وەک مرۆڤ. هەروەها پۆرنۆگرافی ئەو هەستە لەسەر وەرگرەکانی جێ دەهێڵێت، کە ژنان بە تاسەی ئەوەوەن، کە بەزۆر سێکسیان لەگەڵدا

بکرێت. لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا کۆکیت یان نا؟

b. راپۆرتەکانی چاودێری مافی مرۆڤ ئاماژە بەوە دەدەن، کە تاوانەکانی وەکوو زیندانیکردن بەبێ دادگاییکردن، داپلۆسین، بگرە کوشتنیش، لە ژمارەیەک لەو ولاتانەدا روو دەدەن، کە هاوکاریی دەرەکی لە ئەمەریکاوە وەر دەگرن. زۆر کەس لەو بڕوایەدان کە ولاتی ئەمەریکا دەبێت راگرتنی ئەو تاوانانە بکات بە پێشمەرج بۆ ئەو ولاتانە، تا مافی وەرگرتنی ئەو هاوکارییانەیان هەبێت. لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا کۆکیت یان نا؟

c. دادگای بالای جۆرجیا بڕیاری دا هیچ باجێک لەو کەنیسانە نەسەنرێت، کە لەلایەن ئەو ژنانەوە بەرێوە دەبرێن، کە بە خۆیان دەڵێن"گاور و فاڵچی." شیاوی باسە، ئەو ژنانە خۆیان پاڵپشتیی ماددیی کەنیسەکەیان دەکەن. ئایا تۆ پشتگیری لە بڕیاری دادگا دەکەیت؟

b. لە رۆژگاری ئەمرۆماندا تاوانەکانی وەکوو ماڵبرین وکوشتن و توندوتیژی لە هەڵکشاندان، بە شێوەیەک، کە هەموو جارێک لە نۆرەی هەواڵەکاندا بەرچاومان دەکەون. هەروەها پۆرنۆگرافی بە شێوەیەکی ئاسان و فراون دەست مێردمنداڵەکان دەکەون. هەندێک پێیان وایە وتنەوەی وانەی ئایین لە قوتابخانەکاندا تا رادەیەکی باش چارەسەری ئەم کێشە کۆمەلایەتییانە دەکات. ئایا وایە؟

e. لەم دوایییەدا زۆر کەس قسە لەسەر ئەوە دەکەن، کە بودجەی تەرخانکراو بۆ بواری سەربازی بە شێوەیەکی ئاشکرا زیادی کردووە. ئەوان دەڵێن، لەسەرەتای نەوەدەکاندا ئەو پارەیەی کە بۆ بواری بەرگری خەرج دەکرا، ئەوەندە کەم بوو، ببووە جێی مەترسی. ئایا وایە؟

f. زۆر جار دەوترێت کۆنسەرڤاتیڤەکان تەنها لەبەر ئەوەی کە بیرتەسکن، بۆیە دژی سێکی پێش هاوسەرگیرین. ئایا ئەمە تەنها هۆیە؟

g. Elian Gonzaleaی تەمەن شانزە ساڵ لەگەڵ دایکی و شەش

کەسی تردا بڕیاریان دا بە هۆی بەلەمێکی بچووکەوە لە کوبا هەڵبێت. لە فلۆریدا بەلەمەکە نقوم دەبێت و تەنها ڕزگاربوو ئیلانە. ئەو ماسیگرەی ئیلان ڕزگار دەکات، ئیلان دەبات بۆ لای خزم و کەسوکارەکانی لە مایامی. بۆ ماوەی یەک مانگ ئەو هەرا یاساییەی لەسەر ئەم هەواڵە هەڵگیرسا، میدیاکانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو. ناکۆکییە یاساییەکە ئەوە بوو، کە ئایا ئیلان دەبێت لە ئەمەریکادا بمێنێتەوە؛ ئەو وڵاتەی دایکی لەپێناویدا گیانی سپارد، یان دەبێت ئیلان بگەڕێنرێتەوە بۆ کوبا بۆ لای باوکی. ئەوە بوو لە کۆتاییدا گەڕاندیانەوە بۆ کوبا. ئایا ئەو بڕیارە بڕیارێکی دروست بوو؟

## ڕای جیاواز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی پیادەکردنی ئایینی فرەخودایی لە کاتی بەئەنجامگەیاندنی ئەرکە سەربازییەکاندا. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر مەعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش سەر وا دەبێت،* ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان بە شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی

کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

## پیادەکردنی ئایینی فرەخودایی لە کاتی بەئەنجامگەیاندنی ئەرکە سەربازییەکاندا:

لە مانگی ۸ی ۱۹۹۷، فۆرت هۆک لە تەکساس، بوو بە یەکەم بنکەی سەربازی کە ڕێی بە پراکتیزەکردنی ئایینی ویکا Wicca دەدا {ویکا یەکێکە لەو ئایینانەی کە دەچنە ژێر خانەی ئایینە فرەخوداکانەوە}. هەر دوای ئەمە، پێنج بنکەی سەربازیی تر یەک بەدوای یەک ڕێیان بە پراکتیزەکردنی ئەم ئایینە دا. بەپێی ئەو ڕێنماییانەی کە سوپای ئەمەریکیی کاروباری ئایینی لە بنکە سەربازییەکاندا پێی بەڕێوە دەبات، ئایینی ویکا پۆلێن کراوە لەگەڵ فاڵچێتی، فرەخودایی، بتپەرستی، درودیزم. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئاماژە بە جیاوازییەکانی ئایینی ویدا دراوە وەکوو بڕوابوون بە پیرۆزی و نەگۆڕیی هەموو خوداکان. بە پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنە باوەی کە لەسەر ئەم گروپە دینییە هەیە، ئەوان بە هیچ جۆرێک شەیتانناپەرستن. هەر گروپێک لە گروپەکانی ئایینی ویکا لەلایەن قەشەیەکی دیاریکراوەوە ڕێنمایی دەکرێن. شوێنکەوتووانی ئەم ئایینە بە چاوی ڕێز و شکۆوە لە هەموو ئایینەکانی تر دەڕوانن، هەر بۆیە لە بەرامبەریشدا داوا دەکەن ئەمانیش وا سەیر بکرێن. لە ساڵی ۱۹۹۹دا، کۆنگرێس مان بۆب باڕ بەتوندی ڕەخنەی لە ڕێپێدانی جێبەجێکردنی ئەم ئایینە گرت لە بنکە سەربازییەکاندا لەلایەن کۆنگرێسەوە. لە بەرامبەردا، ویکییەکان دەڵێن، ئەو ئازادییە دەستوورییەی ئازادیی ئایینی فەراهەم کردووە، ئەمانیش دەگرێتەوە، وەک چۆن جوولەکە و مەسیحیەت و ئیسلامی گرتۆتەوە. هەر بۆیە دەڵێن، مادام بنکە سەربازییەکان ڕێی بە شوێنکەوتووانی ئەو ئایینە جیاوازانە داوە تا مومارەسەر ئایینیی خۆیان بکەن، کەواتە ئەگەر ڕێ لەمان بگرن، ئەوا لە مافێکی دەستووری بێبەش کراون.

## چاپتەری دوازدە

## هەڵەکانی پەرچەکردار Errors of Reaction

بەر لەوەی دەست بکەیت بە لێکۆڵینەوەی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، هەرگیز ئەو هەموو تەڵە نەبیراوانەت بە خەیاڵدا نەدەهات، کە وان لەسەر ڕێگەی بیرکردنەوەدا. تا ئێستا ئێمە شەش هەڵەی بواری گۆشەنیگا و شەش هەڵەی بواری پرۆسیجەر و حەوت هەڵەی بواری دەربڕینمان تاووتوێ کردووە _ کە دەکاتە ١٧ پێکەوە، بەڵام هێشتا کارمان تەواو نەبووە. جۆری دواهەمینی هەڵەکان، برتییە لە لەهەڵەی وەڵامدانەوە، کە ڕوو دەدات *پاش ئەوەی* ئەوانی تر بۆچوونە گوزارشتلێکراوەکانمان هەڵدەسەنگێنن یان ڕەخنەی لێ دەگرن. چی وا لە ئێمە دەکات تا بکەوینە ئەم جۆرە هەڵەیەوە؟ ڕەنگە باشترین وەڵامی ئەم پرسیارە ئەو وەڵامە بێت، کە ساڵانێک لەمەوپێش لەلایەن Roland W. Jespon لە کتێبەکەیدا کە لەسەر بیرکردنەوەیە، ئاماژەی پێ دراوە:

هەر کە بووینە خاوەن بۆچوونێک لەسەر کێشەیەک، ئیدی خۆبەزلزانینمان دەبێتە ڕێگر بۆ ئەوە دان بەهەڵەی بۆچوونەکەی خۆماندا بنێین. کاتێک ڕووبەڕووی بۆچوونەکانمان دەبنەوە، ئێمە ئەوەندەی خەمی ئەوەمانە کە دژیان بوەستینەوە، ئەوەندە گرنگی بەوە نادەین کە ئاخۆ تا چ ڕادەیەک مەعقولیەت لە ڕەخنەکانیاندا هەیە؛ لە خەمی ئەوەداین

پشتگیریی نوێ بۆ بۆچوونەکانمان بدۆزینەوە، نەک داننان بەو ڕاستییەدا، کە ڕاکانمان لە بەردەم ئەم فاکتە نوێیانەدا هەڵە دەر چوون. هەموو دەزانین کە چەند خێرا پەست دەبین بە هەر ڕایەک کە بۆچوونەکمان ڕەت بکاتەوە؛ یەکەم شت کە هەستی پێ دەکەین ئەوەیە، کە دان نەنێین بە شکستی بۆچوونەکامان و یەکەم شتیش کە بیری لێ دەکەیەنەوە، ئەوەیە "چۆن ئەتوانم خۆم بدزمەوە؟"

ئەم پێداگرییە لەسەر خۆدزینەوە لە هەرشتێک کە بۆ خۆمان بە بۆچوونەکانماندا هەڵ نادات، ڕەنگدانەوەی ئەو حەزە یان ئەو تاسەیەیە، کە دەیەوێت ئەو وێنەیەی خۆمان بۆ خۆمان هەمانە، بە نەگۆڕی بمێنێتەوە. هەریەکە لە ئێمە وێنەیەکی خۆی بۆ خۆی هەیە، کە هەمیشە وێنەیەکی پەسەند و خوازراوە. ئێمە حەز دەکەین خۆمان وەک کەسێکی ژیر، بەرپرسیار، زیرەک، ورد، بەدیقەت، چاونەترس، خەمخۆر و شتی تریش ببینین. دیارە دەشمانەوێت ئەوانی تریش هەر وا بمانبینن. هەڵە و کەموکووڕی لە کەسایەتیماندا، دەتوانن ئەو ناوبانگەی کە دەمانەوێت هەمانبێت، لەکەدار بکەن، بۆیە لەبری ئەوەی ڕووبەڕوویان ببینەوە، ئێمە خۆمان لە کەموکوڕییەکانمان دەدزینەوە و نکۆڵییان لێ دەکەین. بۆ نموونە، منداڵێک کە تووڕە دەبێت و چەپۆکێک ئەکێشێت بە هاوڕێکەیدا، دەیەوێت بڵێت، "هەڵەی من نەبوو، ئەو پێم پێدەکەنی، بۆیە منیش وام کرد." قوتابییەک کە ئەنجامێکی خراپ بەدەست دەهێنێت، ڕەنگە بڵێت "مامۆستا نمرەیەکی خراپی پێ دام" (بەڵام ئەگەر سەرکەوتووش بێت، ئەوە دەڵێت "توانیم نمرەیەکی باش بەدەست بهێنم"). کەسێک کە لە شوێنێکدا ئیش دەکات و هەڵەیەک دەکات، ڕەنگە بڵێت، "هەڵەی منی تێدا نییە، چونکە ڕێنماییەکان خۆیان هەڵەن."

هەندێک کەس دەتوانن خۆیان لەو مەیلە - تاسەیە ڕزگار بکەن، کە نایەوێت ئەو وێنە جوانەی بۆ خۆمان هەمانە، لەکەدار بکرێت، بەڵام بەداخەوە، زۆرینەمان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەبینە قوربانیی ئەم مەیلە. ئەوانەی شانازی بە خۆیانەوە دەکەن، کە دادوەرییەکی دادپەروەرانە دەکەن لەبەینی خەڵکیدا، ڕەنگە تا ڕادەیەکی زۆر کامڵ بن و بە چاوێکی بابەتی و هاوسەنگەوە لە کێشەکان بڕوانن، بەڵام کاتێک بۆ نموونە، کە دەبنە کاندیدێکی سەرکەوتوو لە هەڵبژاردندا، بەڵام پاشان دەر دەکەوێت کە پۆستەکانیان بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان بەکار هێناوە، ئەوا نکۆڵی لە بەڵگەکان دەکەن و لایەنی ئۆپەزیسیۆن بە دووڕوو تۆمەتبار دەکەن و دەڵێن لە چەند ساڵی داهاتوودا ئەوە ئەوانن، کە پۆستەکانیان خراپ بەکار دەهێنن. ئەم جۆرە کەسانە هەموو ئەمانە دەکەن، تەنها بۆ ئەوەی ئەو وێنەیەی کە بۆ خۆیان هەیانە، وەک کەسانێک کە دەتوانن بێلایەنانە و بابەتیانە حوکم بدەن، بە نەگۆڕی بمێنێتەوە.

خەڵکی واشمان هەن کە لەو بڕوایەدان توانایەکی لەڕادەبەدەریان هەیە بۆ خۆکۆنترۆڵکردن و دان بەوەدا نانێن کە بۆ نموونە، بوونەتە کۆیلەی جگەرەکێشان یان مەیخواردنەوە، بگرە بەوپەڕی تواناوە بەرگری لە خووەکانیان دەکەن. ("تا ئێستا کەس بەتەواوەتی *نەیسەلماندووە* کە جگەرەکێشان خراپە بۆ تەندروستی؛ جگە لەمەش، کرژیی مەزاجم خاو دەکاتەوە،" یان دەڵێن "من ناخۆمەوە، لەبەر ئەوەی کە پێویستە بخۆمەوە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە چێژی لێ دەبینم؛ هەرکاتێک بمەوێت، دەتوانم دەستی لێ هەڵبگرم") ئەوانەی کە وێنەیەکی تێروتەسەلیان لەسەر خۆیان هەیە، کەسێک بیریان دەخاتەوە کە قەرزاری فلان کەسن، وا وەڵام دەدەنەوە، وەک ئەوەی کە ئەمان بەرپرسیار نەبن لە قەرزاربوونەکە و هەڵەی ئەو کەسەیە کە بیریان دەخاتەوە. ئەوانەی کە خۆیان وەکوو

خەمخۆر بۆ ئەوانی تر دەبینن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خاڵین لە هەر حوکمێکی پێشینە، ڕەنگە هێرش بکەنە سەر هەرکەسێک، کە بە شێوەیەکی بێلایەنانە یان دروستکەرانە ئاماژە بە بۆچوونێکی پێچەوانەی ئەوان بدات. لە هەریەک لەم حاڵەتانەدا، ئەوەی کە هاوبەشە، مەیلی کەسەکانە بۆ مانەوەی وێنە پەسەندکراوەکەی خۆیان بە نەگۆڕی.

بۆ زۆر لە تاکەکان پێداگری لەسەر نەگۆڕینی ئەو وێنەیەی کە بۆ خۆیان هەیانە، پابەندە بەو ڕۆڵەوە کە لە ژیاندا دەیگێڕن. Sam وا لە خۆی دەڕوانێت، وەک باوکێکی خەمخۆر کە ئامادەی هەموو شتێکە لەپێناو منداڵەکانیدا و وەک هاوڕێیەک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. ڕۆژێک لە دەمبۆڵەیەکدا کوڕەکەی لەپڕ پێی دەڵێت کە ساڵەهایە ئەوەندە گرنگیی داوە بە ئیش و بەختەوەریی خۆی، ئەوەندە خەمی منداڵەکانی نەبووە. پاشان سام لەسەر ڕاست و دروستیی ڕای کوڕەکەیان لە هاوسەرەکەی دەپرسێت. سام چاوەڕێی ئەوەیە ژنەکەی پێی بڵێت تۆمەتی کوڕەکەیان ناڕەوایە، بەڵام ئەو بەهێمنی، بەڵام زۆر بە ئازارەوە پێی دەڵێت، کوڕەکەیان نەک هەڵەیە، بگرە زۆریش لەسەر حەقە. سام بەتووڕەیی و دڵێکی زامدارەوە، لە ماڵ دەر دەپەڕێت، دڵنیایە لەوەی ساڵانێکە بەهەڵەدا چووە.

بۆ هەندێکی تر ئەوەی ئەو پەرچەکردارە دروست دەکات، ئەو ڕۆڵە نییە کە لە ژیاندا دەیگێڕن، بەڵکوو ئەو سیفەتانەیە، کە وا هەست دەکەن هەیانە، تەنانەت هەندێک کات بریتییە لەو کەسانەی کە چاودێرییان دەکەن. ئایا ئەوانە هاوڕێمانن یان نا؟ وەک دایک و باوک مامەڵەمان لەگەڵ دەکەن یان وەک هاورێیەک؟ بەڕێوەبەرن یان وەک هاوپیشەیەک لێمان دەڕوانن؟ لە ڕاستیدا ئێمە بەگشتی هیچ گرنگی نادەین بەوەی

هەندێک کەس چۆن لێمان دەڕوانن، بەڵام بۆ هەندێکی تر، تا ڕادەی نەخۆشی وێنەی خۆمان لە چاوی ئەواندا بەلاوە گرنگە.

بەکورتی، هەڵەکانی پەرچەکردار، ئەو هۆیانەن کە بەکاریان دەهێنین بۆ خۆدزینەوە لەو ڕەخنانەی کە ڕووبەڕووی خۆمان و ئایدیاکانمان دەبنەوە. لەم چاپتەرەدا پێنج جۆری دیاریکراوی ئەو هەڵانە دەخەینە بەر باس: ڕەتکردنەوەی دەستبەجێ، گۆڕینی بابەت، خۆدزینەوە لە ئەرکی سەلماندن، straw man و هێرشکردنەسەر ڕەخنەگر.

## ڕەتکردنەوەی دەستبەجێ Outomatic rejection

وەک بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەگر، پێویستە بۆ قبوڵکردنی یان ڕەتدانەوەی هەر ئارگۆمێنتێک یان بانگەشەیەک، بەوانەشەوە کە تەحەدای ڕاستی بۆچوونەکانمان دەکەن، پێویستمان بە بناغەیەکی ئەقڵی هەیە. تەنها ڕێگە بۆ دامەزراندنی ئەو بناغەیە بریتییە لە هەڵسەنگاندنی تەحەداکان و پەیوەستبوونێکی ڕاستگۆیانە بە گرنگی و بایەخی ئەو تەحادایانە. بەدڵبوون یان بەدڵنەبوون، ڕازیبوون یان ڕازینەبوون، تەنها بەس نییە. هەرکاتێک ڕەخنەیەکت ڕەت کردەوە بەبێ هەڵسەنگاندن، ئەوە تۆ کەوتوویتە هەڵەی ڕەتکردنەوەی دەستبەجێوە.

چەند ساڵێک لەمەوپێش لەگەڵ مامۆستایەکی هاوڕێمدا گفتوگۆمان لەسەر بابەتێکی سەرنجراکێش دەکرد، کە لەسەر کاریگەرییەکانی ماریوانا بوو {جۆرە مادەیەکی هۆشبەری ڕۆکییە}. وتارەکە لە *گۆڤاری تەندروستیی ئەمەریکیدا* بڵاو کرابۆوە، کە ئاماژەشی بە ڕاپۆرتێکی تەندرستی دابوو لەسەر بەکاربەرەکانی ئەم مادەیە. نووسەرەکە گەیشتبوو بەم دەرئەنجامە: "بە پێچەوانەی ئەوەی کە لەسەر ئەم مادەیە

دەوترا، دەرئەنجامەکانی ماریوانا هەر ئەوە نییە کە هەستێکی دڵخۆشی کەمێک زیاد لە ڕادەی ئاسایی دەداتە بەکاربەرەکانی، بەڵکوو کاریگەریی ئەقڵی خراپیش بەجێ دەهێڵێت." هەروەها نووسەرەکە ئاماژەی بە هەندێک کاریگەریی تری ئەم ماددەیە دابوو، لەوانە: "بچڕانی ئاگایی دەربارەی خود، تەمەڵی و لەشداهێزران، شڵەژان و کەمبوونەوەی هەستکردن بەوەی کە هەیە {واقیع}." بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم بانگەشانە، ئاماژە بە سیازدە کەیسی ڕاستەقینە درابوو.

هاوڕێیەکم لای درکاندم، کە ئەویش تا ڕادەیەکی زۆر هەمان ئەو سیفەتانەی تێدا بووە، لە سیازدە حاڵەتەکەدا باس کرابوون، ئەو کاتەی کە لە کاتی قوتابیبوونیدا ماریوانای بەکار هێناوە. بە هۆی بەکارهێنانی ماریواناوە زۆر سیفەتی ناجۆری تێدا دەر کەوتبوو، وەکوو پیسوپەڵۆخی، بێ تەحەمولی و لەیادچوونەوە. هەروەها نەتوانینی تێڕامان لە پۆلدا و سەرئێشەیەکی زۆری بەردەوام. بەڵام ئەوکات هەر تەنها ئەو بۆچوونە زانستییانەی ڕەت نەدەکردەوە کە ماددەکەی بە زیانبەخش دەدایە قەڵەم، بەڵکوو تەنانەت ئەوەشی ڕەت دەکردەوە، کە *ئەوکات ئەو ماددەیەشی بەکار هێنابێت*. ئەو دیدەی کە بۆ خۆی هەیبوو، ئەوەندە بەهێز بووە، کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەردەوامی و بە شێوەکەی ئۆتۆماتیکی ئەو بەڵگانەی ڕەت کردۆتەوە، کە تەحادای وێنە پەسەندکراوەکەی خۆی کردووە.

هاوڕێیەکی وانەبێژی خۆم، ئەزموونێکی هاوشێوەی لەگەڵ ئەم جۆرە لە ڕەتکردنەوەدا هەبووە. ئەزموونەکەی پەیوەندیی بە خوێندنەوەی کتێبێکەوە هەبوو لەسەر تەکنیکەکانی وانەوتنەوە. یەکێک لە چاپتەرەکانی کتێبەکە ئەو شێوازەی لە وانەوتنەوە ڕەخنە دەکرد، کە شێوازی هەرە پەسەندکراوی هاوڕێکەم بوو. بۆیە ئەویش هەستی بە توڕەبوون کردبوو

لە بەرامبەر نووسەرەکە. لە ڕاستیدا هاوڕێکەم جگە لە مەیلی بەرگریکردن و پاراستنی ئەو وێنەیەی کە بۆخۆی هەیبوو، هیچ ئارگۆمێنتێکی ئەقڵیی نەبوو بۆ ئەوەی پاساوی ڕقەکەی خۆی پێ بداتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە جگە لە خۆی وشەکانی ناو کتێبەکەی بەردەستی، هیچ کەسێکی تر لەو دەورووبەرەدا نەبوو، بەلام ئەو بە هۆی مەیلە بەهێزەکەیەوە و بۆ خۆڕزگارکردن لە خەجاڵەتیی ئەوەی کە هەڵەیە، دەستبەجێ ئارگۆمێنتەکانی نووسەرەکەی ڕەت کردۆتەوە. بەلام دوای تێپەربوونی کات و دوای هەوڵدانێکی زۆر، وەک خۆی دواتر لای من دانی پێدا نا، توانیی حەقی تەواو بدات بە ئارگۆمێنتەکانی نووسەرەکە و بابەتییانە بیر لە بابەتەکدا بکاتەوە.

مەیلی ڕەتدانەوەی دەستبەجێ لە ڕاستیدا ڕەنگە زۆر بەهێز بێت. یەکێک لە ڕێگە باشەکان بۆ خاوکردنەوەی ئەم مەیلە، بریتییە لە دوورخستنەوەی سۆز و ئیگۆ لە یەکتری. وا لە ئایدیاکانت بڕوانە وەک شتی ماددی، کە دەتتوانی بیانپارێزیت و فرێشیان بدەیت، نەک وەک ئەوەی کە ئایدیاکان بریتی بن لە بوونی خودی خۆت. ئەمە وات لێ دەکات کەمتر لە سەنگەری بەرگریکردنێکی کوێرانە بیت لێیان.

## گۆڕینی بابەتە Changing the Subject

گۆڕینی بابەت، واتە گۆڕینی لەپڕی ئاراستەی گفتوگۆ. هەموو گۆڕانێکیش لە ئاراستەی گفتوگۆشدا مەرج نییە بە زەرورەت هەڵە بێت. ڕەنگە ئاراستە نوێیەکە بەرەو دڵنیاییەکی زیاترمان ببات، یان ڕەنگە شێوازێکی کاتی، بەلام جوانی ڕەتدانەوەی شتێک بێت. وای دابنێ کەسێک پرسیارێکی نەگونجاو و شەخسیت لێ دەکات، بۆ نموونە وەکوو "داهاتی ساڵانەت چەندە؟" یان، "ئەوە بۆچی تا ئێستا منداڵتان نییە؟" لەبەر ئەوەی ناچار

نیت وەڵامی وەها پرسیارێک بدەیتەوە، بۆیە ئەتوانی شتێک بڵێیت کە ئەسڵەن پەیوەندیی بە پرسیارەکەوە نییە، وەکوو، "ئەبێت کام هەڵبژاردە ئەمجارە کاسەکە ببات" یان بڵێیت "هاوینی ئەمساڵی باکوور هێجگار گەرم بوو." ئەم شێوازە زۆر ڕەوایە تا بەرامبەرەکەت بزانێت کە پرسیارەکانی چەند نامەعقول بوون.

گۆڕینی بابەت تەنها ئەو کاتە هەڵەیە، کە بابەتەکە خۆی گونجاو و مەعقولە و مەبەست لە گۆڕانی بریتی بێت لە چەواشەکاری. بەداخەوە، ئەم چەشنە لە گۆڕین باوە، بەتایبەت لەو چاوپێکەوتنانەدا، کە لەگەڵ کەسە ناودارەکاندا ئەنجام دەدرێت. پرسیارکەرەکە پرسیار لە شتێک دەکات و پرسیارلێکراویش وەڵامی شتێکی تر دەداتەوە. کەسە زۆرزانەکان بە ناوهێنانی بابەتی پرسیارلێکراو لە وەڵامەکانینادا ئەو مانایە دەگەیەنن، کە ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆیانە وەڵامی پرسیارەکەیان داوەتەوە، لە کاتێکدا ئەمە تەنها بریتییە لە خۆڵکرنەچاو. بۆ نموونە، کاندیدکراوێک بۆ پۆستی سەرۆکایەتیی کەنەدا، لە وەڵامی پرسیارێک لەسەر منداڵلەباربردن، ئاوا وەڵام دەداتەوە:

هیچ کێشەیەک هێندەی منداڵلەباربردن، میللەتەکەمانی دابەش نەکردووە لە سەدەی بیستەمدا. ئەوەی کە زۆر من بێزار دەکات، ئەوەیە کە زمانی گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکە تا دێت توندتر دەبێت، هەروەها ئەو بەدگومانیدروستکردنە لەسەر نیازپاکیی یەکتر، کە وای کردووە دیالۆگی دروست لەسەر کێشەکە مەحاڵ بێت. ئێمە پێویستمان بەو دیبەیتە دروستەیە، کە دەتوانین لێوەی بگەینە چارەسەرەکان، ئەگەر من هەڵبژاردنم بردەوە، پەیمان دەدەم هەموو هەوڵی خۆم بدەم، تا ئەو دیبەیتە دروستکەرە بەئەنجام بگەیەنین.

لە ڕاستیدا ئەو وەڵامە، وەڵامێکی ڕوون و ڕەوانە بۆ *پرسیارێک، کە نەکراوە!* لە هەمان کاتدا ئەو پرسیارەی کە *کرا*، بە بێوەڵامی ماوەتەوە. لە حاڵەتی وادا لە جێی خۆیەتی بەگومانەوە لە نیازی وەڵامی کاندیدکراوەکە بڕوانیت، چونکە هەر وەڵامێکی ڕاستەوخۆی پرسیارەکە، گرووپێک لە دەنگدەرەکان دەتۆرێنێت. لە ڕاستیدا ڕەنگە پێش دەستپێکردنی بەرنامەکە، یەکێک لە ڕاوێژکارەکانی پێی گوتبێت، "هەر پرسیارێک لەسەر منداڵلەباربردن کرا، بابەتەکە بگۆڕە و وەڵامی مەدەرەوە."

سیاسەتمەدارەکان تەنها گرووپ نین کە بابەتەکە دەگۆڕن بۆ وەڵامنەدانەوەی پرسیارە قورسەکان، یان بۆ خۆدوورخستنەوە لە حاڵەتە شەرمهێنەرەکان. ئەم تەکنیکی خۆڕزگارکردنە لە وەڵامدانەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەکار دێت. لە بواری دادوەریدا، بۆ نموونە دەڵێن، جارێک یاریدەدەری پارێزەرەکە بەپەلە کاغەزێک دەداتە پارێزەرەکە، کە دەڵێت، "وا دەر دەکەوێت هیچ قەزیەیەکمان نەبێت. سکاڵاکاران جاڕسکەن"

گۆڕینی بە ئەنقەستی بابەت، ئامانجی دیالۆگەکە بە لاڕێدا دەبات. بۆ خۆدەربازکردن لەم هەڵەیە، ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی پرسیارە زەمەتەلکان ببەرەوە. ئەگەر وەڵامی پرسیارەکەت زانی، بیڵێ. ئەگەریش لەوە زەحمەتتر بوو کە بتوانیت وەڵامێکی ڕوون و ئاشکرا بدەیتەوە، ئەوە لە کاتی وەڵامدانەوەدا ئاماژە بەوە بکە، کە وەڵامەکەت ئیشکالئامێزە و هۆکارەکانیش ئاماژە پێ بدە. ئەگەر ئەوەندەش زانیاریت نەبوو تا تەنانەت وەڵامێکی ئیشکالئامێز و نادڵنیاش بدەیتەوە، ئەوا بڵێ نازانم. هیچ کەسێکی هۆشمەند بە چاونزمەوە سەیرت ناکات، تەنها لەبەر ئەوەی ڕاستگۆیانە دانت بە نەزانیی خۆتا ناوە.

## خۆدزینەوە لە ئەرکی سەلماندن
## Shifting the burden of proff

لەم ڕەوتەدا، خۆدزینەوە لە ئەرکی سەلماندن، واتە داواکردن لە ئەوانی تر تا ناڕاستیی بۆچوونەکەت بسەلمێنن. بۆ نموونە، بیڵ دەڵێت، "گەورەترین هۆکاری بەرزبوونەوەی ڕێژەی تێچوونی چارەسەری پزیشکی لەم ولاتەدا، بریتییە لەو دەرمانە گران و ناپێویستانەی پزیشکەکان بۆ نەخۆشەکانی دەنووسن." پاشان باربارا لە بیڵ دەپرسێت، کە ڕوونی بکاتەوە بۆچی پێی وایە ئەمە سەرەکیترین هۆکارە. بیڵیش دەڵێت،" دەتوانیت ئاماژە بە هیچ بەڵگەیەک بکەیت، کە ناڕاستیی بۆچوونەکەم بسەلمێنیت؟ ئەگەر ناتوانیت، ئیتر بۆ پرسیار دەکەیت". بیڵ لێرەدا کەوتە هەڵەی خۆدزینەوە لە ئەرکی سەلماندن. چونکە ئەوە کە لەسەر ڕاکەی پێداگری دەکات، کەواتە دەشبێت ئامادە بێت تا ڕاستیی بۆچوونەکەی بۆ ئەوانی تر بسەلمێنێت، نەکوو داوا لەوانی تر بکات، تا ناڕاستییەکەی بسەلمێنن. یاسای گەمەکە ئەمەیە: هەرکەسێک کە حوکمێک دەدات، هەر خۆشی بەرپرسیارە لە سەلماندنی حوکمەکەی و هەتا حوکمەکەشی دوورتر بێت لەوەی کە کەسە خاوەن زانیارییەکان لە بوارەکەدا لەسەری کۆکن، ئەوەندە ئەو بەرپرسیارێتییە زیاد دەکات و ئاڵۆزتر دەبێت.

ئەگەر تۆ پێش دەربڕینی ڕاکانت ئەوە لەبەرچاو بگریت کە ئەوانی تر ڕەخنەت لێ دەگرن و داوای پشتگیری و سەلماندنت لێ دەکەن، ئەوا پێش دەربڕینیان بیر لە بەڵگە و هۆکان دەکەیتەوە بۆ بەرگریکردن لێیان، بەمەش ئەگەری کەوتنە ئەم هەڵەیەوە زۆر کەم دەبێتەوە.

## Straw man

ئـەم تێرمـە لەلایـەن لۆجیکناسـەکانەوە داهێنـراوە بـە مەسـتی ئامـەژەدان بـەو ئارگومێنتانـەی کـە بەتاڵـن، بێناوەڕۆکـن. ئـەم تێرمـە هاومانەیە لەگەڵ وشـەی *داهۆڵـدا*، کە بریتییە لـە چەنـد دارێـک، کە بە شـێوەی بـاڵای مـرۆڤ و بـە جلـی مـرۆڤ دادەپۆشـرێت، بـەو هیوایـەی مـەل و باڵندەکان لە کێڵگە و دەغڵەکاندا بترسێنێت. ئـەم هەڵەیـە straw man واتـە لەسـەر زاری کەسـێکی تـرەوە هەندێـک شـتی بێنـاوەڕۆک بڵێـت، پاشـان بێنـاوەڕۆک و بێماناییـان دەر بخەیـت، ئەمـەش لەپێنـاو خۆشـاردنەوەی کەسـی قسـەکەر و بەرپرسـیارکردنی بەرامبـەر. وای دابنێ تۆ و هاوڕێکـەت گفتوگۆ دەکەن لەسەر ئـەوەی کە ئایا فرۆشتنی چەکە هێرشبەرەکان قەدەغـە بکرێن یـان نـا. گفتۆگۆکـە بـەم شـێوەیەیە:

تـۆ: مـن دژی هـەر چەشـنە سـنووردانانێکم لەسـەر فرۆشـتنی چـەک. فرۆشـتنی دەمانچـە، قەنـاس، تاپـڕ، یـان چەکـی هێرشـبەر، هیـچ جیاوازییـەک دروسـت نـاکات. چـەک هـەر چەکـە و مافـی دەسـتووریش هـەر مافـی دەسـتوورییە.

*هاوڕێکـەت*: تـۆ دەڵێیـت فرۆشـتنی جـۆرە جیاوازەکانـی چـەک "هیـچ جیاوازییەکـی لـێ ناکەوێتـەوە." بـەڵام مـن دەڵێـم جیاوازییـان لـێ دەکەوێتـەوە، چونکـە ئـەو چەکانـە زۆر لـە یـەک جیـاوازن. چەکـە هێرشـبەرەکان جیاواز لەوانـی تـر دیزایـن نەکـراون بـۆ ڕاوکـردن، یـان بـۆ بەرگریکـرن، بەڵکـوو ئـەوان دیزایـن کـراون بـۆ کوشـتنی خەڵـک، زۆر جاریش بە شـێوەیەکی هەڕەمەکی. هـەر لەبـەر ئەمـەش کـە دەبێت قەدەغـە بکرێـن.

*تـۆ [دەزانیـت وەڵامـی هاوڕێکـەت زەحمەتـە بـە درۆ بخرێتـەوە، بۆیـە هەسـت دەکەیت هێرشـت کراوەتـە سـەر و دەبێت بەرگـری لـە خـۆت بکەیت]*. واتـە تـۆ دەڵێیـت کـە دەبێت مافـی ئـەوەت هەبێت، کـە چ جـۆرە چەکێـک بفرۆشـرێت، چیـش نەفرۆشـرێت. ئەمـە هەمـان ئـەو خۆبەزلزانینەیـە، کـە ئەوانـەی خۆیـان نـاو ڕیفۆرمیسـتە کۆمەلایەتییـەکان، دەڵێـن، ئـەوەی نـرخ بـۆ دەسـتوور دادەنێـت، دەبێـت لێشـی بترسـێت.

لێـرەدا تـۆ کەوتیتـە هەڵـەی straw man. ئەگـەر هاوڕێکـەت بەئـاگا بێـت لـەم جـۆرە هەڵەیـە، یەکسـەر پێـت دەڵێـت: "یەکـەم جـار بـە نـاوی منـەوە شـتی بێمانـا دەڵێیـت و پاشـان مـن دەکەیـت بـە بەرپرسـیار لـە ئاستیان. بـەلام مـن دەخـوازم تـۆ وەلامـی ئـەوە بدەیتـەوە، کـە مـن وتـم."

بـۆ خۆدوورخسـتنەوە لـەم هەڵەیـە، پێویسـتە زۆر بەئـاگاوە و زۆر بـەوردی ئامـاژە بـە وشـە و ئایدیاکانـی ئەوانـی تـر بکەیـت.

## هێرشـکردنە سـەر ڕەخنەگر Attacking the critic

هێرشـکردنە سـەر ڕەخنەگـر، هەوڵێکـە بـۆ لێـدان لـە ئایدیایـەک یـان ئارگۆمێنتێـک بـە هـۆی ناشـرینکردنی ئـەو کەسـەی کـە وتوویەتـی. کەسـەکان بەگشـتی کاتێـک دەکەونـە ئـەم هەڵەیـەوە، کـە ئایدیاکانیـان یـان هەڵسـوکەوتەکانیان ڕەخنـە دەکرێـن. لەبـری ئـەوەی وەلامـی ڕەخنەکـە بدەنـەوە و لەسـەر کێشـە سـەرەکییەکە، کـە بۆچـوون یـان کردارەکانیانـە، کەچـی کێشـەیەکی موزەیـف دروسـت دەکـەن و وەلامـی دەدەنـەوە، کـە کەسـی ڕەخنەگـر ئامانـج و نیـازە شـاراوەکانی پشـت ئـەم کێشەدروسـتکردنەیە. کاتێـک paula Jones سـەرۆک کلینتۆنـی

تۆمەتبار کرد، بەوەی کە ڕەفتاری سێکسیی نادروستی بەرامبەر ئەنجام داوە، یەکێک لە وتەبێژەکانی سەرۆک لە لێدوانێکدا وتی، "ئەتوانی بە سەد دۆلار چیت بوێت تێی بپەڕێنی،" دیارە مەبەستی بوو بڵێت کەسایەتیی paula جێی گومانە.

لە دواییشدا، پاش ئەوەی ژنی تریش هەمان تۆمەتیان دایە پاڵ سەرۆک، ئیدی ڕاوێژکارەکانی کاریان لەسەر ستراتیژێک دەکرد، تا پیشانی بدەن هەر ژنێک تۆمەتی وا لەسەر سەرۆک دروست بکات، یان لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواو نییە، یاخود لە ڕووی ئەخلاقییەوە، هەر بۆیە تۆمەتەکانیان پڕوپووچن. دواتر، پاش ئەوەی Dick Morris، کە یەکێک بوو لە ڕاوێژکارەکانی پێشووی کلینتۆن، وەک ڕاوێژکار دەستبەکار بوو لە Fox News و شیکردنەوەیەکی پێشکەش کرد لەسەر ئەو تۆمەتانەی دەدرانە پاڵ سەرۆک و ئەو پلانەی کە بۆ پاکڕاگرتنی سەرۆک بەکار خرابوو، هەندێک لە کەسە بەئەمەکەکانی کلینتۆن دەیانوت، قسەکانی دیک، ئەرزشێکی نییە. چونکە ڕەفتاری نابەجێی بەرامبەر بە ئافرەتان کردووە و بە هۆی بوغزی لەکارلابردنی لە کۆشکی سپی، ئەم تۆمەتانەی هەڵبەستووە.

هێرشکردنەسەر ڕەخنەگر هەڵەیە، چونکە ئایدیا و کەسەکان یەک شت نین. هەرچەندە سەرنجڕاکێشیش بێت، لە پاڵنەرەکانی پشت ئایدیای کەسێک بکۆڵینەوە، بەڵام ئەمە هیچ لەسەر کوالیتیی خودی ئایدیاکان ناڵێت. بگرە هەندێک کات کەسانێک کە پاڵنەرەکانیان جێی گومانە یان هەر بەتەواوەتی درۆزنیشن، بەڵام لە حاڵەتێک لە حاڵەتەکاندا ڕاستی دەڵێن. دیارە ئەمە بە مانای ئەوە نایەت، کە ڕاستگۆیی و نیەتپاکی گرنگ نییە یان ئەوەی کە بێ پرسیار

ڕای ئەوانە قبوڵ بکەین، کە هۆی مەعقولمان هەیە تا گومان لە ڕاستگۆییان بکەین. بەڵکوو ئەمە تەنها بە مانای ئەوە دێت، کە هەڵەیە گومانەکان یان حوکمەکان لەسەر کەسەکان بخەینە جێگەی ئایدیا و بۆچوونەکانیان.

# ڕاهێنانەکان

١. کام یەک لەم گوزارانەی خوارەوە لەگەڵ ئەو دیدەدا هاوتایە، کە لەم چاپتەرەدا باس کرا، ڕەنگە هیچ کامیشان هاوتا نەبێت.

a. تاسەی هێشتنەوە و نەگۆڕینی ئەو وێنەیەی بۆ خۆمان لە زەینماندا هەیە، ناتوانین خۆمانی لێ ڕزگار بکەین.

b. تاسەی هێشتنەوە و نەگۆڕینی ئەو وێنەیەی بۆ خۆمان لە زەینماندا هەمانە، مەیلێکی ئاساییە.

c. تاسەی هێشتنەوە و نەگۆڕینی ئەو وێنەیەی بۆ خۆمان لە زەینماندا هەمانە، تاسەیەکی درۆزنانەیە.

d. تاسەی هێشتنەوە و نەگۆڕینی ئەو وێنەیەی بۆ خۆمان لە زەینماندا هەمانە، دەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت.

٢. کام لەو هەڵانەی لەم چاپتەرەدا باس کران، ئەنجامت داون؟ باسیان بکە و ئەو هەلومەرجەش بخە ڕوو کە هەڵەکان تێیدا ڕووی داوە.

٣. هەموو لەسەر ئەوە کۆکین، کە لێبووردنی ئەوانەی کە سووکایەتییان پێ کردووین، ئاسان نییە. بەلام فەیلەسوفی کۆنی ڕۆمانی، سێنیکا، دەڵێت، پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاستە_ *لێبووردن لەوانەی سووکایەتیمان پێ کردوون،* زەحمەتە. ئایا ئەمە ڕایەکی مەعقولانەیە؟

ئەگەر وایە، ئایا هیچ شتێک فێر بوویت لە چاپتەری نۆ تا دوازدە، کە تیشک بخاتە سەر ئەم بۆچوونەی سێنیکا؟ ئەگەریش ئایدیایەکی ئاقڵانە نییە، بۆ؟

٤. دادگای باڵای ئەمەریکی کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر دەوڵەتدا، توانای بڕیاردانی خۆی نەدایە دەست کەنیسە. بەمەش دادگا مافی کەنیسە سەرکوت دەکات، بەڵام بەپێی یاسای Massachusetts، کەنیسە بۆی هەیە هەر بار و خواردنگەیەک دابخات کە لە سنووری ٥٠٠ پێدا نزیک لە کەنیسەن و خواردنەوەی کحولی دەفرۆشن. ئایا بڕیاری دادگا ئاقڵانەترین بڕیار بووە؟ لە کاتی وەڵامدانەوەدا، ئاگاداری ئەو هەڵانە بە کە لە چاپتەری ٩-١٢ باس کراون.

٥. ئافرەتێک لە نامەیەکدا بۆ "Dear Abby" گلەیی لە کوڕەکەی دەکات، کە لە کاتی هاوسەرگیریدا ناوی خێزانەکەی گۆڕیوە بۆ ناوی خێزانی هاوسەرەکەی. ئەویش لەوەڵامدا پێی دەڵێت، کە کوڕەکەی کەسێکی کامڵە و ئازادە لە بڕیارەکانیدا. بۆیە دایکی دەبێت بە سینگفراوانییەوە ئەمە قبوڵ بکات. جێی گومان نییە کە زۆر کەس وەڵامەکەیان پێ باش بوو، بەڵام زۆریش ناڕازی بوون و پێیان وا بوو شتێکی سەیرە و بگرە ناپیاوانەشە کە پیاوێک دەست لە ناوی باووباپیرانی خۆی هەڵبگرێت. لەم گۆشەنیگایەوە، ئەمە سووکایەتییە بە باوانی خۆی. ئەم کێشەیە هەڵبسەنگێنە و ئاگاداری ئەو هەڵانە بە، کە لە چاپتەری ٩ تا ١٢ باس کراون.

٦. لە هەندێک لە بەشە ناوخۆییەکاندا، لە کاتێکدا کە زەرەر بە کەلوپەلی بەشە ناوخۆییەکاندا دەگەیەنرێت و کەسە بەرپرسەکان

ناناسرینەوە، ئەوا هەموو قوتابییەکان ناچار دەکرێن پارەی چاککردنەوە بدەن. زۆر لە قوتابییەکان ئەمە بە نادادپەروەرانە دەدەنە قەڵەم. ئەوان دەڵێن زۆر کات زیانەکان لەلایەن میوانەکانەوە ئەنجام دەدرێت نەک قوتابییەکان. ئەم قوتابییانە دەڵێن، تەنانەت ئەگەر ئەنجامدەران خودی قوتابییەکانیش بن، ئەوا هەر بێدادییە، چونکە لەم کاتەدا زۆر لەوانەش کە بەرپرسیاریش نین، دەبێت باجی ئەوانە بدەن کە بەرپرسیارن. ئایا ئەم ڕەخنانە لە یاساکە ڕەوایە؟ یان ئایا ئەم یاسایە دادپەروەرانەترین ڕێگەچارەیە یان نا؟ لە وەڵامەکانتا ئاگاداری ئەو هەڵانە بە، کە لە چاپتەری ٩ تا ١٢ باس کراون.

٧. Sherri قوتابیی قۆناغی دووەمی زانکۆیە. لە کاتی پشووەکاندا، ئەو زۆر تووڕە و عەسابگەرمە لەگەڵ باوانیدا. لە بەهانە دەگەڕێت تا ڕەخنەیان بکات و بەهاکانیان ڕەت بکاتەوە، گاڵتە بە ڕاکانیان دەکات لەسەر هەڵسوکەوتەکانی. لە کاتی گەڕانەوەشدا بۆ زانکۆ، بە شاتەشات و بۆڵەبۆڵەوە بە دایکی و باوکی دەڵێت، ئێوە هەرگیز ناز و خۆشەویستیی تەواوتان پێ نەداوم. دایک و باوکی دەستەپاچەن و تێناگەن لە هەڵسوکەوتی کچەکەیان. ئەوەی کە دایک و باوکی نایزانن، ئەوەیە کە بۆ لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوودا ئەو ناچێتە بەشە ناوخۆییەکان و لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەژی، جگە لەمەش، ئەو پارەیەی کە دایک و باوکی دەیدەنێ، دەیدات بە هاوڕێ کوڕەکەی. ئایا ئەم فاکتە چ کاریگەرییەکی لەسەر ڕەفتاری کچە بەرامبەر باوانی هەیە؟ ڕوونی بکەرەوە.

٨. ئەم ئارگۆمێنتانەی خوارە هەڵبسەنگێنە بە پەیڕەوکردن لەو ڕێگەیەی لە چاپتەری حەوتدا فێر بوویت. ئاگادار بە لەو هەڵانەی لەم چاپتەرە و چاپتەرەکانی تریشدا خرانە ڕوو.

٩. ئارگۆمێنت: گرتنیی ئاژەڵانی کێوی و پیشاندانیان بۆ خۆشیی مرۆڤەکان، پێشێلکردنی مافە سروشتییەکانیانە. هەر بۆیە باخچەی ئاژەڵان دەبێت قەدەغە بکرێت.

a. باکگراوەندی کێشەکە: لە ١٩٩٣دا ڕێکخراوێکی هاوڕەگەزبازی سکاڵای لەسەر ڕێکخەری کەرنەڤاڵی Day Parade تۆمار کرد، کە Ancient Order of Hiberains (AOH) بوو. تۆمەتەکە ئەوە بوو، کە گوایە AOH بە شێوەیەکی نایاسایی ڕێکخراوە هاوڕەگەزبازەکانی لە کەرنەڤاڵەکە دوور خۆستۆتەوە، کە ئەمەش جیاکارییە. AOH بەم شێوەیەی خوارەوە بەرگری لە خۆی کرد:

ئارگۆمێنت: ئەم کەرنەڤالە تەرخان بوو بۆ شکۆدارڕاگرتنی یەکێک لە پیاوە پیرۆزەکانی ئایینەکەمان. دینەکەمان فێرمان دەکات کە هاوڕەگەزبازی گوناهە. ئەگەر ناچار بکرێن تا ڕێ بە ڕێکخراوێکی هاوڕەگەزبازی بدەین تا بەشداری یادکردنەوەکە بێت، ئەوە مافەکانمان پێشێل کراوە.

C. باکگراوەندی کێشەکە: لەم سالانەی دواییدا ژمارەیەکی زۆری خەڵکی گلەیی لە ڕادەی دیمەنی توندوتیژ و بابەتی سێکسی دەکەن، کە لە تەلەڤزیۆنەکانەوە پەخش دەکرێن. وتەبێژانی پیشەسازیی تەلەڤزیۆن بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیەی خوارەوە تۆمەتەکانیان ڕەت کردۆتەوە:

ئارگۆمێنت: لە سەردەمی ئێستادا، واقیعانەتر لە ٢٠ یان ٣٠ ساڵ لەمەوپێش، میدیا ژیان دەخاتە ڕوو. ئێمە پێمان وایە ئەم خستنەڕووە نە کێشەی کۆمەڵایەتی دروست دەکات، نە قوڵتری دەکات و تا ئەو کاتەشی کە لێکۆڵینەوەکان پێچەوانەی ئەمە نەسەلمێنن، ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر کاری خۆمان، ڕاستگۆیانە و چاونەترسانە.

D. سالانێکە تاوانباران لە بەرامبەر مافی چاپکردن و بەفیلمکردنی

چیرۆکەکانی ژیانیان، پارە وەر دەگرن. هەتا تاوانەکان قیزەونتر بن، ئەمان زیاتر پارە وەر دەگرن. لە ڕاستیدا ئەمە هیچ نییە جگە لە خەڵاتکردنی تاوانباران لە بەرامبەر تاوانەکانیان. ئەو پارەیەی کە تاوانباران وەری دەگرن، دەبێت بۆ خۆیان نەبێت، بەڵکوو دەبێت دابەش بکرێت بەسەر کەسوکاری قوربانییەکاندا.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی ئەوەی ئایا هەڵوێستە پشتگیریکەرەکان ئامانجەکانی خۆیان پێکاوە. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. ئەگەریش هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر ماعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولییەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت،* ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە، کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان بە شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

### ئایا هەڵوێستە پشتگیریکەرەکان ئامانجەکانی خۆیان پێکاوە؟

هەڵوێستە پشتگیریکەرەکان affirmative action بەو هاوکاری و پشتگیرییانە دەوترێت، کە حکومەت تەرخانی دەکات بۆ ئەو لایەنانەی کە

بە هۆی جیاکارییەوە زەرەرمەند بوون، وەکوو ژنان و کەمینەکان. بە هۆی ئەم هەڵوێستانەوە حکومەت مامەڵەیەکی *تایبەت* لەگەڵ قوربانییانی جیاکاریدا دەکات. بگرە هەر بە ئەوەشەوە ناوەستێ کە هەلی یەکسانیان لەگەڵ پاشماوەی کۆمەڵگەدا بۆ برەخسێنێت، بەڵکوو زیاتریش دەکات. پشتگیریکەرانی ئەم سیاسەتەی حکومەت دەڵێن، ناکرێت کەسانێک کە هەلی یەکسانیان بۆ نەڕەخساوە تا بخوێنن و خۆیان پێبگەیەنن، ئێستا داوایان لێ بکەیت وەکوو کەسانی ئاسایی لە زانکۆکان بخوێنن و هەلی کاریان لە بازاڕدا دەست بکەوێت. هەر بۆیە هاوکاریکردنێکی تایبەتی ئەم جۆرە کەسانە تەنها ڕێگەی چەسپاندنی دادوەرییە. بەڵام لە بەرامبەردا ناڕازیکەرانی ئەم سیاسەتە دەڵێن، هەلی خوێندن و هەلی کارکردن تەنها دەبێت بۆ ئەو کەسانە بێت، کە بە باشترین شێوە ئامادەن، بەبێ لە بەرچاوگرتنی ڕەگەز و نەژاد و قەومیەت. ئەگەر لە بەرامبەر لێهاتووییدا ڕەگەز و نەژاد بکرێنە پێوەر بۆ وەرگرتنی هەلی خوێندن و کار، ئیدی کوڕی دکتۆرێکی ڕەشپێست و ژنی کابرایەکی دەوڵەمەندی ئیسپانی بۆ فرسەتەکانی ژیان لەپێشتر دەبن وەک لە کوڕ و ژنی کابرایەکی سپیپێستی هەژار. هەروەها لە وەها حاڵەتێکدا، کەسێکی کەمتوانا بەس لەبەر ئەوەی ژنە، فرسەتی کاری زیاتر دەبێت لە کەسێکی بەتوانا، بەس لەبەر ئەوەی پیاوە. هەر بۆیە ناڕازیکەران دەڵێن، ئەم سیاسەتە جگە لەوەی کە نامەعقول و ناعەقڵانییە، کینە و ڕقیش بڵاو دەکاتەوە.

# چاپتەری سیانزەیەم

## هەڵەکان پێکەوە The Errors in Combination

لـە چاپتەرەکانـی پێشـوودا سـەرقاڵی لێکۆڵینـەوە بوویـن لـەو هەڵانـەی کـە لـە قۆناغـە جیاوازجیاوازەکانـی پرۆسـەی بیرکردنـەوەدا ڕوو دەدەن. ئـەو چاپتەرانـە دوو ئەنجامـی سـەرەکییان هەبوو: بۆ دوورخستەنەوەی هەڵـەکان لـە بیرکردنـەوەی خۆتدا، هەروەها بۆ دەستنیشـان کردنیان لـە بیرکردنـەوەی ئەوانـی تردا. هـەر هەڵەیـەک بەجیا مامەڵـەی لەگەڵدا دەکرا _ ئەنجامگیریـی پێشـوەخت یـان زۆر سـادەکردنەوە، گریمانـەی بێبناغـە، زیـاد لـە پێوسـت گشـتاندن و هەروەهـا هـی تریـش. هەڵـەکان زۆر کات بـەم شـێوەیە، واتـە بەجیا بەتەنها ڕوو دەدەن. بـەلام لەگـەڵ ئەمەشـدا دەتوانـن بـە تێکەڵکراویش ڕوو بدەن. بۆ نموونـە، هەڵەیەکی وەکوو "هـی مـن باشـترە" دەکرێت سـەر بکێشـێت بۆ دژایەتیکردنـی گۆڕان، ئەمـەش سـەر بکێشـێت بۆ هەڵبژاردنێکی لایەنگیرانـە نـەک بابەتییانـەی بەڵگـەکان. دەرئەنجامـی ئەمانـەش بریتییـە لـە دەرئەنجامگیرییەکی ناکامڵ/پێشـوەخت. لەگـەڵ ئەوەشـدا هەڵە تێکەڵکراوەکان زۆر و زەوەنـدن، بـەلام هەمـوو لـە یـەک شـتدا هاوبەشـن: ڕێگـری و بارگرانییەکی گەورەتـر لـە بـەردەم بیرکردنـەوەی ڕەخنەییدا دروسـت دەکـەن، زیاتـر لـەو بارگرانییـەی کـە هەڵەیـەک کـە بەتەنهـا خـۆی دروسـتی دەکات.

پێش ئـەوی زیاتر لەسـەر هەڵە تێکەڵکراوەکان بدوێین، با پووختەیـەک

لەسەر هەڵە تاکەکان بخەینە ڕوو لەگەڵ ستراتیژییەکانی خۆدوورخستەنەوە لێیان. ڕەنگە بێتەوە یادت کە جەوهەریترین هەڵەی بیرکردنەوە بریتییە لە "هی من باشترە،" کە بە هۆیەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی کە ئایدیاکانی ئێمە لە ئایدیاکانی ئەوانی تر بەرزتر و لەپێشترە، تەنها لەبەر ئەوەی ئایدیاکان هی خۆمانن. لە کاتێکدا لە واقیعدا ئایدیاکانی ئێمەش دەشێت وەک ئایدیاکانی ئەوانی تر هەڵە بن. بۆ زاڵبوون و دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، دەبێت وەک چۆن بۆ ئایدیای ئەوانی تر ڕەخنەیین، ئاواش ڕەخنەییانە مامەڵە لەگەڵ ئایدیاکانی خۆشماندا بکەین. لە خوارەوەش ئاماژە دەدرێتەوە بە هەڵەکانی تر و ڕێگەچارەکانیان.

## هەڵە لە بۆچووندا

| | چۆنێتیی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی |
|---|---|
| گریمانە بێبناغەکان | ئەوگریمانانە دەگرێتەوە، کە خۆبەخۆ وەک ڕاستی وەر گیراون، بەبێ ئەوەی بیریان لێ کرابێتەوە. کاتێک ئایدیایەک وەک بەڵگەنەویستێک وەر دەگیرێت، بەڵام لە بەردەم ئەزموونی کەسێکی تردا، یان حاڵەتێکی تردا دەکەوێت، ئەوا مانای وایە ئەو گریمانەیەی کە ئایدیاکەی لەسەر بنیات نراوە، بێبناغەیە. گریمانەکان بەدەگمەن نەبێت، بەئاشکرا ناخرێنە ڕوو، هەر بۆیە بۆ ئەوەی دەسنیشانیان بکەیت، پێویستە بتوانیت پەیامی نێوان دێڕەکان بخوێنیتەوە. |

**تێڕوانینی تەنیا یەکێک لەو دووانە**

ئەمە تێڕوانینێکی پەرگیرانەیە، بەو
مانایەی تەنها دیدی پەسەند لای
بریتییە لە بەرەهاقبوڵکردن یان
بەرەهاڕەتدانەوە. هەر بۆیە ئەم هەڵەیە
ئەو ئەگەرە لەناو دەبات، کە ڕەنگە
مەعقولترین بۆچوون، بۆچوونی
مامناوەند بێت، نەک پەرگیرانە. بۆ
دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، دەبێت
هەموو ئەگەرەکان لەبەرچاو بگیرێت،
نەک تەنها بۆچوونە پەرگیرەکان.

**پەیڕەوکردنی گەمژانە**

ئەم هەڵەیە کاتێک ڕوو دەدات، کە
ئێمە گەمژانە پەیڕەویی ئایدیاکانی
ئەوانی تر دەکەین، تەنها لەبەر ئەوەی
تاقەتمان نییە بیر بکەینەوە یان
ناوێرین بیر بکەینەوە. بۆ زاڵبوون
بەسەر ئەم هەڵەیەدا، هەوڵ بدە
خووی ڕەتدانەوەی فشارە ناوەکی و
دەرەکییەکان لە خۆتدا سەوز بکە، تا
بتوانیت ببیتە خاوەن بیرکردنەوەی
خۆت.

ڕەهاگەرایی

ئەم هەڵەیە بریتییە لە بڕوانەبوون بە جیاوازبوون. ئەمە وا دەکات هەقیقەت وەک شتێکی سادە و بێناکۆکی ببینین، ئەمە لە کاتێکدا هەقیقەت لە واقیعدا زۆر کات هەم ئاڵۆزە و هەم پڕناکۆکی. بۆ ڕزگاربوون لەم هەڵەیە، هەقیقەت وەک خۆی وەر بگرە، نەک وەک ئەوەی کە لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆتدا بگونجێت.

ڕێژەگەرایی

ڕێژەگەرایی، واتە ناکرێت هیچ دیدێک لەوی تر باشتر بێت، چونکە هەر ئەوەندەی بوویتە خاوەنی ئایدیایەک، ئیدی ئۆتۆماتیکی ئایدیاکە ڕاست دەر دەچێ. بیهێنەوە یادی خۆت، کە هەندێک لە ئایدیاکان و کردارەکان باشتر و ڕاستترن لەوانی تر. ئیشی بیرکردنەوەی ڕەخنەییش ئەوەیە، کە باشترینی ناویان دەستنیشان بکات.

لایەنگیری یان دژبوون بە گۆڕان

لایەنگیربوونی گۆڕان، واتە گۆڕان هەمیشە ڕووەو باشترینە. بەلام دژبوونی گۆڕان، واتە گۆڕان هەمیشە ڕووەو خراپترینە. بۆ ڕزگاربوون لەم حاڵەتە، بۆ هەر ئەگەرێکی گۆڕان یان دژەگۆڕان، بەوردی هەموو ئەگەرەکانی تر لە بەرچاو بگرە، پاشان بڕیار بدە.

## ئەو هەڵانەی لەم پرۆسەیەدا ڕوو دەدەن

| هەڵەکە | چۆنێتی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی |
|---|---|
| لەبەرچاوگرتنێکی لایەندارانەی بەڵگەکان | یەکێک لە شێوەکانی ئەم هەڵەیە، بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو بەڵگانەدا، کە پشتڕاستیی حوکمدانەکەت دەکەنەوە و لەبەرچاونەگرتنی ئەوانەی کە ڕەخنەی دەکەن. شێوەیەکی تری ئەم هەڵەیە بریتییە لە لێکدانەوەی لایەندارانەی بەڵگەکان بۆ بەرژەوەندیی خۆت. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، *سەرەتا* لێکۆڵینەوە لەو بەڵگانە بکە، کە ڕەخنەت دەکەن، پاشان ئەوانەی کە ستایشت دەکەن. |
| دوو ستانداردی | ئەم هەڵەیە واتە بەکارهێنانی دوو پێودانگی جیاواز بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگانەی کە پشتگریت دەکەن و ئەوانەی کە تەحەدات دەکەن. بۆ خۆڕزگارکردن لەم هەڵەیە، هەر *لە سەرەتاوە* بڕیار بدە کام پێودانگ بەکار دەهێنیت بۆ هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان، هەر بەو پێودانگەشەوە بمێنەرەوە تا کۆتایی، بێ لەبەرچاوگرتنی پشتگیری یان ڕەخنەگرتنی بەڵگەکان بۆ ڕاکانت. |

ئەنجامگیریی پێشوەخت

ئەنجامگیریی پێشوەخت، بریتییە لە حوکمدانێکی ناکامڵ و کرچوکاڵ _ واتە بڕیاردان بەبێ بوونی بەڵگەی پێویست بۆ پشتڕاستکردنەوەی حکومدانەکە بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، یەکەم جار هەموو دەرئەنجامە ڕێتێچووەکان لەبەرچاو بگرە. پاشان ئەو دانەیە هەڵبژێرە، کە زۆرترین بەڵگەت هەیە بۆ پشتڕاستکردنەوەی.

زیادەڕۆیی لە گشتاندن و نموونەی باودا

زیادەڕۆیی لە گشتاندن واتە سەپاندنی ئەوەی بەسەر هەندێک لە ئەندامانی گروپدا دەچەسپێت، بەسەر کۆی گروپدا. نموونەی باویش ئەو گشتاندنەیە، کە زیادەڕۆیی تێدا کراوە و بە شێوەیەکی سەرسەختانە بەرگریی لێ دەکرێت بۆ مانەوە. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەلانە، بەرگری لەو مەیلە بکە، کە دەیەوێت کەسەکان، شوێنەکان، شتە جۆربەجۆرەکان هەموو لەژێر یەک پۆلبەندی وشکدا کورت بکەیتەوە. هەروەها لەیادت بێت چەندە ئەزموونەکانت دیاریکراوبن، ئەوەندەش دەبێت چەختکردنەوەکانت خاکی بن.

**زۆر سادەکردنەوە**

زۆر سادەکردنەوە لەوە تێدەپەڕێت، کە ئاسانکردنەوەی ئاڵۆزییەکان بێت، تا بتوانین ئاسانتر تێیان بگەین _ بەڵکوو ئایدیاکان بەسەر یەکدا ئەترنجێنێ و تێکیان دەدات. لەبری هۆشیارکردنەوە، زۆر سادەکردنەوە خەڵکی گەمژە دەکات. بۆ نەکەوتنە ئەم هەڵەیەوە، دیدە سادەکان قبوڵ مەکە و ڕووبەڕووی ئاڵۆزیی ئایدیاکان ببەرەوە وەک خۆیان.

**هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدار**

ڕەگی ئەم هەڵەیە لەو ڕایەدایە، کە مادام شتێک بەداوی شتێکی تردا ڕوو دەدات، کەواتە بەدڵنیاییەوە دەبێت پەیوەندییان پێکەوە هەبێت، لێ لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەمە تەنها ڕێکەوت بێت. بۆ دوورخستنەوەی ئەم هەڵەیە، هیچ حوکمێک لە سەر هەبوونی پەیوەندیی لەنێوانیاندا مەدە، تا ئەو کاتەی ئەگەرەکانی تر تاقی دەکەیتەوە، بە ئەگەری ڕێکەوتیشەوە.

# هەڵەکانی دەربڕین

| هەڵەکان | چۆنێتیی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنیان |
|---|---|
| دژیەکی | دژیەکی یان ناکۆکبوون لەگەڵ خۆتدا، واتە بانگەشەکردنی ڕاستی و هەڵەبوونی ئایدیایەک لە یەک کاتدا. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، ئەوەی کە دەیڵێیت و ئەوەشی کە دەینووسیت، بخە ژێر چاودێرییەوە. لە هەرساتێکدا ناکۆکیت بینی، بەوردی لێی بکۆڵەرەوە. بزانە ئاخۆ کێشەکە تەنها کێشەی دەربڕینە یان نا و برتییە لە ناکۆکی و دژیەکی. ئەگەر دژیەکی بوو، بە ئارگۆمێنتەکەتدا بچۆرەوە و ناکۆکییەکە مەهێڵە. |
| خۆدووبارەکردنەوە | ئەم کێشەیە کاتێک ڕوو دەدات، کە بۆ پشتڕاستکرنەوەی گوزارەیەک، تەنها خودی گوزارەکە دووبارە دەکرێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، دڵنیا بە لەوەی بانگەشەکەت بە بەڵگەی ئەقڵی پشتڕاست کراوەتەوە، نەک تەنها بانگەشەکەت بەکار هێناوەتەوە بە شێوەیەکی جیاواز. |

**گوزارە بێماناکان**

گوزارە بێماناکان ئەوانەن کە بەڵگەکانی ناویان بەڵگەی نائەقڵانی و بێمانان. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، دڵنیا بە لەوەی کە بانگەشەکانت بە بەڵگەی ئەقڵیی پەیوەندیدار پشتڕاست کراونەتەوە.

**هەڵە لە پسپۆڕیدا**

واتە پێدانی پسپۆڕی بە کەسێک لە بابەتێکدا، کە نییەتی. بۆ خۆدوورخستنەوە لەم هەڵەیە، دڵنیا بە هەموو ئەو سەرچاوانەی بەکاری دەهێنیت لە نووسین یان لە قسەکردنەکانتدا، خاوەنەکانیان خاوەن پسپۆڕین لەو بابەتەدا، کە قسەی لەسەر دەکەن.

**بەیەکشوبهاندنی هەڵە**

بەیەکشوبهاندن هەوڵدانە بۆ شیکردنەوەی شتێکی ناڕۆشن لە ڕێی ئاماژەدان بە شتێکی *جیاواز، بەلام* ڕوونتر. بەیەکشوبهاندنی هەڵە کاتێک ڕوو دەدات کە هیچ پەیوەندییەکی لۆژیکی لەنێوان دوو بابەتەکەدا نییە. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، دڵنیا بە کە لێکچوونی ئەقڵانی و ڕاستەقینەی هاوبەش هەن لەنێوانیاندا و دوو بابەتەکە جیاوازی جەوهەری و بنەڕەتییان نییە.

| | |
|---|---|
| مەیلی نائەقلانی | مەیلەکان بۆ سۆزەکان، دابونەریت، مامناوەندێتی، بڕوای باو و لێبووردەیی دەشێت هەم ئەقلانی بن و هەم نائەقلانی. نائەقلانین، کەواتە قبوڵکراویش نین، کاتێک لە پەیوەندیدا بەو بابەت و کێشەیەوە کە لەژێر لێکۆڵینەوە گفتوگۆدایە، نامەعقولانە دەر دەکەون. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، دڵنیا بە لەوەی مەیلەکەت مەیلێکی ئەقلانییە. |

## هەڵەکانی پەرچەکردار

| هەڵەکان | چۆنیێتیی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنیان |
|---|---|
| ڕەتدانەوەی دەستبەجێ | ڕەتدانەوەی دەستبەجێ واتە ڕەتدانەوەی ئەو ڕەخنانەی کە ڕووبەڕووی ئایدیاکان و هەڵسوکەوتەکانت دەکرێنەوە، بەبێ ئەوەی لە ڕەخنەکانیش تێگەیشتبێتیت. چارەسەری ئەم هەڵەیە لەوێدایە، کە وەکوو هەر شتومەکێکی تر لە ئایدیاکانت بڕوانیت، کە دەتوانیت بیانگۆڕیت، نەک ئەوەی کە ئەوان بریتی بن لە جەوهەریبوونت. ئەمە وات لێ دەکات کەمتر هەڵوێستێکی بەرگریکەرانە بگریتە بەر. |

| | |
|---|---|
| گۆڕینی بابەت | گۆڕینی بابەت، واتە گۆڕینێکی دەستئەنقەست و *هەڵخەڵەتێنەرانەی* ئەو بابەتەی لەژێر نەشتەری گفتۆگۆدایە. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، ڕووبەڕووی پرسیارە قورسەکان ببەرەوە نەک لێیان هەڵبێیت لە ڕێی هەوڵدان بۆ گۆڕینی بابەتی گفتوگۆکە. |
| خۆدزینەوە لە ئەرکی سەلماندن | واتە لەبری ئەوەی خۆمان ڕاستیی بانگەشەکانمان بسەلمێنین، داوا لەوانی تر دەکەین کە *ناڕاستیی* بانگەشەکانمان بسەلمێنن. دەبێت ئەوە بزانین کە بەرپرسیارێتیی پشتڕاستکردنەوەی بانگەشەیەک دەکەوێتە سەر شانی ئەوەی کە دەیکات، نەک ئەوەی کە گومان لە ڕاستیی بانگەشەکە دەکات. کەواتە بەرپرسیارێتیی سەلماندنی ڕاکانت لەئەستۆ بگرە. |
| Sraw man | واتە قسەهەڵبەستن بەدەم ئەوانی ترەوە، پاشان دەرخستنی ناڕاستیی لەو قسانەدا، بە مەستی ساغکردنەوەی هەڵەکان بەسەر ئەوانی تردا. بۆ دوورکەوتنەوە لەم هەڵەیە، زۆر بە دیقەتەوە کۆتی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی ئایدیاکانی ئەوانی تر بکە. |
| هێرشکردنە سەر ڕەخنەگر | ئەم هەڵەیە هەوڵێکە بۆ لێدان لە گرنگیی ئایدیایەک یان ئارگۆمێنتێک لە ڕێی لێدان لە خاوەنی ئایدیاکە یان ئارگۆمێنتەکەوە. ڕوونە کە چارەسەری ئەم کێشەیە بریتییە لە خستنەگەڕی تواناى بیرکردنەوەی خۆت لەسەر بابەتەکە، نەک خاوەن بابەتەکە. |

## نموونەی هەڵەکان پێکەوە

ئێستا با هەندێک لە نموونەی ئەو هەڵانە باس بکەین، کە پێکەوە ڕوو دەدەن و تێبگەین کە چۆن کار لەو کەسانە دەکەن، کە بە هەڵەکان هەڵدەستن.

### نموونەی یەکەم

کڵاودی ئەندامێکی چالاکی حیزبێکی سیاسییە. ئەو بە ئەندازەیەک دڵگەرمە بۆ پارتەکەی، کە لەو بڕوایەدایە بەرنامە و کاری و کاندیدەکانی بریتین لە فریادڕەسی نەتەوە. نیوەڕۆیەکیان لەگەڵ نێلیدا کە هەر سووکەسەلامێکیان هەیە، نانێک دەخۆن. لە کاتی نانخواردندا، بابەتی قسەکردنیان دەگۆڕێت بۆ مشتومڕی سیاسی. کڵاودی باسی کاندیدی حیزبەکەی خۆیان و کاندیدی حیزبی بەرامبەر دەکات. بۆ کڵاودی، کاندیدەکەی خۆیان بلیمەتێکی عەمەلی و تیۆرییە و ڕکابەرەکەشی لە دیدی ئەوەوە هەر زۆر گەمژەیە. کڵاودی شەلم کوێرم ناپارێزم، هێرش دەکاتە سەر ڕابردووی ڕکابەرەکەیان و خێزانەکەشی، لەویشەوە دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە کارەساتی گەورە بەسەر وڵاتدا دێت گەر هەڵبژاردن بباتەوە.

پاش گوێگرتن بۆ ماوەیەک، نێلی بەرەنگاری ڕاکانی کڵاودی دەبێتەوە. ئەو زۆر بەهێمنی هەندێک فاکت دەخاتە ڕوو، کە حوکمە بێبنەماکانی کڵاودی ڕەت دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە نێلی هیچ مەخزایەکی شەخشیی نییە لە ڕەخنەکردنی ڕاکانی کڵاودیدا، بەڵکوو بە شێوەکی هێمن و بابەتییانە ڕەخنەی کردووە، بەڵام ئەو تووڕە دەبێت. ئەو نێلی بەوە تاوانبار دەکات کە قسەکانی ئەمی شێواندووە و شتگەلێک بە دەمی

ئەمـەوە هەڵدەبەسـتێت، کـە ئـەم نـەی وتـووە لـە کاتێکدا کـە وتووشـیەتی.

بـا لـە گۆشـەنیگای ئـەو کێشـانەوە کـە تـا ئێسـتا باسـمان کـردن، بۆچوونەکانی کلاودی شی بکەینەوە. هەڵـەی یەکەمی کلاودی بریتی بوو لە "هی من باشترە،" کە وای لێ کرد نابینا بێت لە ئاست کەموکوورییەکانی بەرنامـە و کاندیدی حیزبەکـەی خۆیـان. هەروەهـا واشـی لێ کـرد کـە هیـچ چاکـە و باشییەک لـە هـی حیزبی ڕکابـەردا نەبینێت. بـە مانایەکی تـر، ئـەم هەڵەیـە وای لێ کـرد زیادەڕۆیی بکات لـە نرخاندنـی حیزبەکـەی خۆیـان و زیادەڕۆییش بـکات لـە کەمنرخاندنـی حیزبـی ڕکابـەر. ئـەم هەڵەیـە سـەری کێشـا بۆ هەڵـەی دووەم، کە بریتییە لە زیادەڕۆییکردن لە سادەکردنەوەدا. دواتریـش کـە نێـل ڕەخنـەی گـرت و هەڵەکانـی پیشـان دا (کـە ئەمـە نێلێش نەیکردایـە، درەنـگ یـان زوو، کەسـێکی تـر هـەر دەیکـرد)، کلاودی تـوورە بـوو و کەوتـە هەڵـەی سـێیەمەوە، کـە بریتییـە لـە بەرگریکـردن لـە گـۆڕان و درێـژەدان بـە بۆچوونـە هەڵـەکان. لەبـەر ئـەوەی هەتـا کەسـێک توندتـر و دۆگمایانەتـر بـاوەش بـکات بـە ئایدیایەکـدا، ئەوەنـدە کەمتـر ئەگـەری ئـەوە هەیـە دان بنێـت بـە هەڵـەی ئایدیاکـەدا. هـەر بۆیـە بەداخـەوە کلاودی بەدڵنیاییـەوە شـتێکی ئەوتـۆ لـە گفتوگۆکـەوە فێـر نەبـوو.

### نموونەی دووەم

کاتێـک سـام کوڕێکـی سـیازدە سـاڵان بـوو، هیـچ مەیلێکـی بـۆ جگەرەکێشـان نەبـوو، بـەڵام ئەوەنـدە هاوڕێکانـی سـەریان خسـتە سـەری و گاڵتەیـان پـێ کـرد، تـا سامیش ناچـار بـوو دەسـت بداتـە جگەرەکێشـان. ئـەو بـۆ ئـەوەی خـۆی وەک یەکێـک لـە هاوڕێکانـی پیشـان بـدات و پێیـان بڵێـت مـن هیچـم لـە ئێـوە کەمتـر نییـە، دەسـتی دایـە جگەرەکێشـان و وەک ئـەوان بـە پـۆزەوە جگەرەکـەی بـە لالێویـەوە دەگـرت. کاتێـک جگەرەکێشـانەکەی

سام لە چالاکییەکی جاروبارەوە بوو بە خوویەکی رۆژانە و کار گەیشتە ئەوەی ئیدی پاکەت هەڵبگرێت، باجدانەکەشی گەورەتر بوو، بە شێوەیەک پارەی لە دایک و باوکی دەدزی، تەنها بۆ کڕینی جگەرە. ئەو دەیوت، "جگەرەکێشان ئیدی لە خوێنمایە و من چیدی ناتوانم بێ ئەو بژیم."

ئێستا سام لە تەمەنی چلساڵیدایە و خاوەن دوو منداڵە و بەردەوامیشە لە جگەرەکێشان. ئەو ئێستا دەکۆکێت و سینگی لیرخەلیرخی تێ کەوتووە و تەنگەنەفەس بووە. لە کاتی بینین یان بیستنی هەر راپۆرتێکی پزیشکی لەسەر زیانە کوشندەکانی جگەرە، سام تووڕە دەبێت. چونکە ئەو رای وایە کە "تا ئێستا نەیانتوانیوە *بیسەلمێنن* جگەرەکێشان زیانی تەندروستیی لێ دەکەوێتەوە. مرۆڤ بەدەستی خۆیەتی جگەرە زیانی پێ بگەیەنێت یان نا."

لەم دواییەدا کە کارگەکانی بەرهەمهێنانی تووتن تۆمەتبار کران بە زیادکردنی ماددەی نیکۆتین و شاردنەوەی بەڵگەکانی زیانی جگەرە، سام بەرگریی لێ دەکردن و دەیوت، "ئەو کەسانە زۆر دەوڵەمەندن و هیچ پاڵنەرێکیان نییە بۆ ئازاردانی ملیۆنان پیاو و ژن و منداڵ." ئەوەی کە سام زۆر تووڕە و دەهری دەکات، بریتییە لە قەدەغەکردنی جگەرەکێشان لە شوێنی ئیش و فڕۆکەخانە و شوێنە گشتییەکانی تردا. ئەو دەڵێت، "من بەوانی تر ناڵێم چ بکەن، لەکوێ و لە چ کاتێکدا، ئیتر چۆن ئەوانی تر ئەو مافە بە خۆیان دەدەن کە تەداخولی ژیانی من بکەن."

هەڵەی یەکەمی سام بریتی بوو لە "خۆ وەک ئەوانی تر لێکردن"، (لەبری دزیکردن، بەدیلی تر هەبوو، بۆ نموونە ئیشێکی پارت تایم). خراپبوونی باری تەندروستی لە کۆکینەوە بۆ تەنگەنەفەسی، بەڵگەیە

لەسەر ئەوەی کە سام کەوتۆتە هەڵەی دژەگۆڕین و بەرگریکردن و درێژەدان بە وێنەی پەسەندکراوی خۆی. هەروەها هەڵچوونیش بەرامبەر راپۆرتە پزیشکییەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەوتۆتە هەڵەی "گریمانە بێبناغەکانەوە" و چونکە ئەو رای وایە کە تاکەکان هەموو ئەوەندە هۆشیاریی پزیشکییان هەیە کە دەتوانن جگەرە بکێشن و زیانیشیان پێ نەگات. بەرگریکردنەکەشی لە خاوەن کۆمپانیاکان هەڵەیە، چونکە لەسەر ئەوە دامەزراوە، کە پارەداربوون بەسە بۆ ئەوەی هەڵە نەکەیت. لە کۆتاییشدا سام کەوتۆتە هەڵەی زۆر سادەکردنەوەوە دەربارەی جگەرەنەکێشان لە شوێنە گشتییەکاندا، چونکە سام کێشەی جگەرەکێشی پاسڤی {ئەو کەسەی خۆی جگەرەکە ناکێشێت، بەڵکوو بە هۆی کەسێکی جگەرەکێشی نزیکیەوە هەوا دووکەڵاوییەکە هەڵدەمژێت} لەبەرچاو نەگرتووە.

### نموونەی سێیەم

ستیڤن، قوتابیی قۆناغی یەکەمە لە کۆلێژی گەشەپێدانی تەکنیکی. لە هەفتەیەکدا سێ وانەی ئینگلیزیی هەیە لە کاتژمێر هەشتدا، بەڵام چونکە ئەو خەوخۆشە و بەیانیان درەنگ هەڵدەستێت، ئەمە پەستی دەکات. لە یەکەم وانەدا ستیڤن شتێک دڵخۆشی دەکات، ئەویش ناوی مامۆستایەکەیەتی، کە ستینە. ستیڤن لە دڵی خۆیدا دەڵێت، چ شتێک لەوە باشترە بۆ منداڵێکی جوولەکەی خەوخۆش، کە مامۆستایەکی جوولەکەی هەبێت. لە ماوەی چەند هەفتەی سەرەتادا، ستیڤن هەموو هەلێک دەقۆزێتەوە تا خۆی لە مامۆستا نزیک بکاتەوە. بۆ نووسینی راپۆرتەکانی، لە سەرەتادا ئەو بابەتانە هەڵدەبژێرێت، کە تێیاندا دەتوانێت جوولەکەبوونی خۆی زەق بکاتەوە (بەو نیازەی سەرنجی مامۆستا بۆ خۆی راکێشێت). ئیدی ستیڤن زووزوو خۆی لە پۆل دەدزێتەوە و لە کۆی چوار راپۆرت، تەنها

دانەیەک دەنووسێت، چونکە پێی وایە مامۆستا گرفتێکی بۆ دروست ناکات و شتەکە ئاسایی وەر دەگرێت. هەرکات مامۆستا دەبینێت، چیرۆکی هەڵبەستراوی بۆ دەهۆنێتەوە دەربارەی بێبەختیی خۆی. لە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵدا، ستیفن ٥٠ وەر دەگرێت، بەڵام دڵخۆشیی خۆی دەداتەوە و بە خۆی دەڵێت، مامۆستا تەنها بۆ ترساندن نمرەی کەمی پێ داوە و کۆتاییی ساڵ نمرەکەی بۆ بەرز دەکاتەوە. هەر بۆیە لە جاران زیاتر کەمتەرخەمی دەکات و ئەرکەکانی پشتگوێ دەخات. ساڵ تەواو دەبێت و ستیفن لە وانەی ئینگلیزیدا دەکەوێت. ستیفن بڕوا بە چاوی خۆی ناکات و ڕادەکات بۆ لای مۆستاکەی، ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت، "من هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بۆم ڕوون کردنەوە کە تەنها ئەو قوتابییانە دەتوانن دەر بچن، کە ڕۆژانە ئامادە بن لە پۆلدا و ئەرکەکانی خۆیان دڵسۆزانە بەئەنجام بگەیەنن، من بەداخم بۆ کەوتنەکەت، بەڵام تۆ شیاوی دەرچوون نەبوویت." لەو ساتە بەدواوە، ستیفن نە سڵاوی لە مۆستاکەی دەکرد و هەرکاتێکیش لە کافتریا یان لە بەشی ناوخۆیی قسەوباس لەسەر مامۆستا بووایە، یەکسەر ستیفن دەکەوتە ناوزڕاندنی مامۆستاکەی.

یەکەم هەڵەی ستیفن بریتی بوو لە گریمانەی بێبناغە، چونکە ئەو تەنها لەبەر ئەوەی مامۆستاکەی ناوی ستەین بوو، ئیدی بڕیاری یەکلاییکەرەوەی لەسەر جوولەکەبوونی مامۆستاکەی دابوو، ئەمە لە کاتێکدا (زۆر کەس هەمان ناویان هەیە و جوولەکەش نین.) لەپاڵ ئەمەشدا، کەوتبووە هەڵەی نموونەی باوەوە، بەوەدا کە وایزانی کە مادەم مامۆستاکەی جوولەکەیە، کەواتە دەبێت یارمەتیی بدات، چونکە هەموو جوولەکەکان بەرامبەر بە یەکتری هەر وان. ئەم هەڵانە وایان لێ کرد کە ئاقڵانەترین لێکدانەوە بۆ نمرەی نیوەی ساڵی ڕەت بکاتەوە و پشگوێی بخات. لە کۆتاییی ساڵیشدا کە لە وانەکەدا کەوت، لەبری ئەوەی

دان بنێت بە هەڵەی خۆیدا و پەشیمان بێتەوە و بیرکردنەوەی بگۆڕێت، کەچی پێداگری کرد لەسەر مانەوەی ئەو وێنەیەی کە بۆ خۆی هەیەتی و لەبری ئەوە، کەوتە سەرزەنشتکردنی مامۆستاکەی.

## چەند ئاماژەیەکی گرنگ بە تێرمەکان

ڕەنگە جاروبار ئاسان نەتوانی هەڵەکان بە ناوی گونجاوی خۆیانەوە بناسیتەوە. بۆ نموونە، ڕەنگە ئاسان هەڵەکانی زۆر سادەکردنەوە، ئەنجامگیریی پێشوەخت و گریمانەی بێبناغە، لێک جیا نەکەیتەوە( ئەمەش زۆر کات مایەی ناڕەحەتییە و سەرلێشێواندنە). ئەم بەراوردکارییەی خوارەوە هاوکاریت دەکات تا ئەم کێشەیە بنەبڕ یان لانی کەم، کەم بکاتەوە.

| زۆر سادەکردنەوە | ئەنجامگیری خێرا | گریمانەی بێبناغە |
|---|---|---|
| ڕاستەوخۆ ئاماژەی پێ دەدرێت. | ڕاستەوخۆ ئاماژەی پێ دەدرێت | ناڕاستەوخۆ ئاماژەی پێ دەدرێت. |
| شاراوەی ئارگۆمێنت دەر دەکەون. لە جەختکردنەوەیەکی سادەدا یان واقیع دەشێوێنێت یان بە ئاماژەدان بە بەشێکی بەڵگەکە یان بە هیچ بەشێکی. | لە دەرئەنجامی ئارگۆمێنتەکاندا بەڵگەیەک گرنگ یان زیاتر فەرامۆش دەکات | زۆر جار لە شێوەی پێشمەرجی ئارگۆمێنتێکدا دەر دەکەون یان ئەوەتا بە بەڵگەی بێمانا پشتڕاست کراوەتەوە، یان بە بەڵگەی مانادار. |

ناسینەوەی تێرمەکان بۆ خۆی چاکە، بەڵام لەوە گرنگتر توانای پێزانینی هەڵەکانی ناو بیرکردنەوەیە و گوزارشتکردنە لەو هەڵانە پێیان. لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەمە دەتوانرێت بە زمانێکی سادەی بێ گرێوگۆڵ ئەنجام بدرێت.

# ڕاهێنانەکان

١. لە ١٩٠٣دا کاربەدەستانی کارگەی مارسیدیس پێیان وا بوو ژمارەی ئۆتۆمبێلی بەرهەمهاتوو لە ساڵێکدا هەرگیز لە ملیۆنێک تێپەڕ ناکات، لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو لێخوڕانەی کە شۆفێری دەبێتە پیشەیان، لە ملیۆنێک تێپەڕ ناکات. ئەگەر سەیرێکی مێژووی دروستکردنی ئۆتۆمۆبێل بکەین لە سەدەی بیستەمدا، ئەوا پێکەنینمان بەو پێشبینییە دێت. بەڵام کام جوومگەی بیرکردنەوەی کاربەدەستەکان هەڵەیە؟ ئەوان کەوتوونەتە کام هەڵەی دیاریکراوەوە، یان کام کۆمەڵە هەڵەوە؟

٢. تا ماوەیەکی نزیک لەمەوپێش، لە هەندێک لە ویلایەتەکاندا دادوەران لەو بڕوایەدا بوون، کە بۆ ئەوەی کەسێک تۆمەتی دەستدرێژیی سێکسیی بەسەردا ساغ بکرێتەوە، پێویستە لانی کەم یەکێک لەم مەرجانەی تێدا بێت: a. ئەو هێزەی کە تۆمەتبارەکە بەکاری هێناوە، ئەوەندە زۆر بووبێت، کە قوربانییەکەی تا ڕادەی مردن یان برینداربوونی سەخت تۆقاندبێت. b. قوربانییەکە بەوپەڕی توانایەوە بەرگری لە خۆی کردبێت c. لانی کەم شایەتحاڵێک داوای قوربانییەکە پشتڕاست بکاتەوە. ئایا ئەم مەرجانە لە جێی خۆیدایە؟ ئەو هەڵەیە یان ئەو هەلانە چین کە لە بیرکردنەوەی ئەواندا هەیە، ئەمە ئەگەر هیچ هەڵەیەک هەبێت؟ وەڵامەکان ڕوون بکەرەوە.

٣. ژمارەیەک پرۆفیسۆر لە باشووری کالیفۆرنیا سیناریۆیەکیان

دارشت لەپێناو تاقیکردنەوەیەکدا. سیناریۆکە بریتی بوو لە هێنانی ئەکتەرێکی بەتوانا تا وانە بە سێ گروپ لە کەسانی شارەزا بڵێتەوە. تا سیناریۆکەیان دەر نەکەوێت، شووناسێکی دروستکراویان دا بە کابرا (د. میرۆن ل. فۆکس لە زانکۆی ئەلبێرت ئەنیشتاین) لەگەڵ بابەتێکی قەبە بە ناوی (جێبەجێکردنی تیۆری گەمە ماتماتیکییەکان لە بواری پەروەردەی فیزیکیدا). کابرای ئەکتەریش بە ڕستەی بێمانا و پڕناکۆکییەوە لێکچەرەکەی تەواو کرد. ئەکتەرەکە بەردەوام وشەی ئاڵۆز و پڕمەخزای و تێرمی زانستیی بەکار دەهێنا. لە کۆتاییی وانەکەدا و لە بڕگەی پرسیار و وەڵامدا، کابرا زۆر بێماناتر ئەیدا بەسەر یەکدا. *لەگەڵ ئەمەشدا، تەنانەت یەک کەس لە کۆی ٥٥ کەسی شارەزا، نەیانزانی کە ئەمانە هەڵخەڵەتێنراون.* سەیر لەوەدا بوو هەموو لەو بڕوایەدا بوون کە شتێکی مانادار فێر بوون. هەندێک بە مامۆستایان هەڵدەدا و دەیانوت: "وانەیەکی زۆر باش بوو، بەڕاستی چێژم لێ بینی... نموونەکانی زیندوو بوون... زۆر ناتق و زمانپاراو بوو." باس لەو هەڵانە بکە کە لە چاپتەری ٩_١٢ بەسەر کرانەوە کە دەتوانن لێکدانەوە بۆ خۆشباوەڕیی ئامادەبووان بکەن.

٤. ئەم نموونانەی خوارەوە شی بکەرەوە، وەک چۆن نموونەکانی کلاودی و و سام و ستیفن لەم چاپتەرەدا شی کرانەوە:

ئان و دان کە ژن و مێردن، کچێکی تەمەن ٢٢ساڵیان هەیە لە قۆناغی کۆتاییی زانکۆدایە و بەڵام مێبازە. ئان و دان کە بەمە دەزانن، تووشی شۆک دەبن. ئەوان وا پەروەردە کراون کە مێبازی واتە فەسادی ئەخلاقی. ئاسان ناتوانن ئەم ڕاستییە قبوڵ بکەن، بۆیە دەکەونە یەکتریتۆمەتبارکردن_ئان بە دان دەڵێت، تۆ قەت نازت نەداوە بە کچەکەمان و دانیش بە ئان دەڵێت، تۆ ئەوەندە نازدارت کرد، تا وای لێ هات. پاش چەند سەعاتێک لە دەمەبۆڵە، ئینجا ئەکەونە سەرکۆنەکردنی

زانکۆ. ئان هاوار دەکات و دەڵێت، "تۆ وا دەزانی کەسانی خوێنەوار ئەوەندە وشیارن تا لە مەترسیی داڕووخانی ئەخلاقی بگەن، لە کاتێکدا ئەو هەموو کچانەیان ترنجاندووە بەسەر یەکدا لە بەشە ناوخۆییەکاندا."
دان بە دەنگی بەرز دەڵێت، "نەفرەت لە زانکۆ، نامەیەک بۆ سەرۆکی زانکۆ دەنووسم، تا سەرۆکی بەش دەر بکات."

٥. لە هەریەک لەم کێشانەی خوارەوە ورد بەرەوە، ئەگەر پێویستت بە زانیاریی زیاتر بوو لەسەر کێشەکان تا حوکمێکی دروستیان لەسەر بدەین، ئەوا بەدوایدا بگەڕێ. پاشان مەعولترین بۆچوون لەسەر کێشەکان دەستنیشان بکە. ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەی بیرکردنەوەوە کە لەم چاپتەرەدا باس کران.

a. کاتێک گرتووخانەی ئەلاباما زیاد لە پێویست قەرەباڵغ بوو، بە ئەندازەیەک، لە توانای گرتووخانەکەدا نەما بیانگرێتە خۆ، حاکمی بەرپرسی ویلایەتەکە بڕیاری بە ئازادکردنی پێشوەختی ٣٠٠ بەندکراو دا، لەناو ئەوانەشدا، چەندان پیاوکوژ و لاقەکەر و کەسی ترسناک هەبوون. ئارگومێنتی حاکمەکە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بڕیارەکەی بریتی بوو لە پاراستنی مافی بەندکراوەکان دژی "سزادانی دڵڕەقانە و نائاسایی" کە بە هۆی زۆر قەرەباڵغیی گرتووخانەکەوە بەندکراوەکان ڕووبەڕووی دەبوونەوە. ئایا هاوبیری لەگەڵ حاکمەکەدا؟

b. بە پێی یاسایەکی بەخشندانەی ئەمەریکی، ئەگەر هەندیک گروپ دەست لە چالاکیی لۆبیکرن هەڵبگرن، ئەوا حکومەت باجیان لێ وەر ناگرێت. بەڵام هەندێک گروپ، لەوانە، ئەمێریکن لێجن و فۆرین وۆرس کە خاوەن مێژوویەکی درێژن، جیا کرانەوە بەوەی کە مافی چالاکیی لۆبییان لێ نەسەنرێتەوە. ئەوە بوو ئەوانیش چالاکیی لۆبیی درێژخایەنیان لەسەر کێشەکانی وەکوو بەرەسمی دانپیانانی پرۆژەی جۆگەی پەنەما، پارکی نیشتیمانیی ئالاسکا، ئەمنی قەومییەت، خزمەتگوزاریی گەیاندنی نامە لە

شەممەندا، بەئەنجام گەیاند، بەبێ ئەوەی باجیشیان لێ وەر بگیرێت. دواتر لە ساڵی ١٩٨٢ دادگای داواکاری ئەمەریکی ئەم مافەی لەم گروپانە سەندەوە بە بیانووی ئەوەی پێچەوانەی پاراستنی یەکسانییە کە لە دەستووردا پشتڕاست کراوەتەوە. هاوڕایت لەگەڵ بڕیاری دادگادا؟

٦. بە پشتبەستن بەو ڕێگەیانەی فێری بوویت لە چاپتەری حەوتدا، ئەم ئارگۆمێنتانەی خوارەوە هەڵبسەنگێنە. ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەوە کە لەم چاپتەرەدا باس کران.

a. پرۆفیسۆر ویلی، قوتابییەکانی بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی بەکار دەهێنێت، چونکە ناچاریان دەکات ئەو کتێبانە بکڕن، کە *خۆی نووسیونی، بەمەش بڕێک پارەی دەست دەکەوێت.*

b. بردنی کەیسی زۆر بچووک و بێنرخ بۆ دادگا، سەرئێشە بۆ دادگا دروست دەکات و کێشە بۆ کەسی بێتاوان دروست دەکات. هەر بۆیە لە جێی خۆیەتی کە ئەو کەسانەی کەیسی ئاوا دەبەنە دادگا و دەیدۆڕێنن، پێویستە پارەی مافناسی لایەنی بەرامبەر بدات.

c. من هەرگیز بەشداریی دەنگدان ناکەم لە هەڵبژاردنە گەورەکاندا. چونکە دەنگی من بە هۆی دەنگی کەسێکی تر کە بە پێچەوانەی من دەنگ دەدات، ئەرزشی نامێنیت. ئەمە جگە لەوەی سیاسەتمەداران هەموو هەر یەکن لە خواردنی پارەی گشتیدا، لەبەر ئەوە، گرنگ نییە کێ دەر دەچێ.

d. شەڕەسەگ، وەرزشێکە کە دوو سەگی ئامادەکراو بەشەڕ ئەدرێن تا دانەیەکیان ئەوی تریان دەکوژێت یان زۆر بەسەختی برینداری دەکات. ئەم وەرزشە لە زۆر ویلایەتدا قەدەغە کراوە، بەڵام ئایا ئەمە ڕەوایە؟ بە ڕای من، نا. ئەگەر من سەگێکم هەبێت، کەواتە من وەک خاوەنی ئەو سەگە دەبێت ئازاد بم لەوەی چیم پێ خۆشە، لەگەڵی بکەم {چونکە من *خاوەنی ئەوم*}.

e. ئەمەریکییەکان هەرکات سەیارەیەک، جلوبەرگێک، یان ئەدەواتی کارەبایی نێومـاڵ بکـڕن لـە وڵاتانـی بێگانـەوە، سـووکایەتی بـە کەلوپەلـی ئەمەریکی دەکـەن و کرێکارە ئەمەریکییـەکان بریندار دەکـەن. هـەر بۆیـە نیشتیمانپەروەری داوامان لێ دەکات شتی بێگانە نەکڕین، تەنانەت ئەگەر نرخەکەیان هەرزانتر بێت و کوالیتیشیان بەرزتر بێت.

f. بڕوابوون بە ژیانی پاش مەرگ، شتێکی بێمانایە، چونکە تا ئێستا کەسێک لە گۆڕەکەیەوە نەگەڕاوەتەوە تا باسی ژیانی ئەولامان بۆ بکات.

g. ئەو ژنانەی کە دەچنە بواری سەربازییەوە، پێویستە هەمان ئەو مەشقە گرانە جەستەییانە بکەن کە پیاوان دەیکەن. هەروەها دەشبێت بەشدارییان پێ بکرێت لە ڕیزی پێشەوەی بەرەکانی جەنگدا.

h. چەند ساڵێک لەمەوبەر لە ویلایەتی نیو یۆرک بەرپرسیارانی کاروباری کۆمەڵایەتی بڕیاریان دا ئەو کەسانەی کە یەکێک لەم حاڵەتانەیان هەیە: هاوڕەگەزبازان، لە ڕابردوودا ماددەهۆشبەرەکانیان بەکار هێناوە، تاوانێکیان ئەنجام داوە، بە پارەی سۆشیال ژیاون، یان کەموکورتیی ئەقڵی یان جەستەییی دیاریان هەیە، ئەوا نابێت لە هاوکاریی حکومەت بێبەش بکرێن. بە ڕای من، ئەمە جێی شەرمێکی گەورەیە. چونکە هەر کەسێک کە یەکێک لەم حاڵەتانەی هەبێت، ئەوا ناتوانێت بە ئەرکی باوانی پەروەردەی خۆ هەڵبستێت، هەروەها کارمەندانی حکومەت هیچ ناچار نین هاوکاری وەها کەسانێک بکەن و منداڵەکانیان بۆ بەخێو بکەن.

i. شتێکی سەیر و ئایرۆنیکییە کە لە کاتێکدا ئەستێرەی تۆپی باسکە، پێتی ڕۆسی، ڕەخنەباران دەکرا لەسەر ئەوەی گرەوی لەسەر ئەنجامی یارییە وەرزشییەکان دەکرد، بەڵام ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان پڕ بوون لەو نووسراوانەی لەسەر یانەسیبەکانی ئیلینۆیس و پێنسیلڤانیا بوون، کە داهاتەکانیان ملیۆنان ملیۆن دۆلارن و بە ملیۆنان خەڵک بەشداری تێدا دەکەن. هەموو ئەمانەش وەک شتێکی ئاسایی و ڕێگەپێدراو ئەنجام دەدرا.

بەلام ئەفسانەیەکی بواری تۆپی باسکە دوور خرایەوە لەو یارییە کە عاشقیەتی و درایە بەر ڕەخنە و تانە و توانج. ئەم دژبەیەکە گەورەیە تەنها دەتوانرێت بە نەفامییەکی گەورە و دووڕووییەکی مەزن لێک بدرێتەوە.

ز. بەدرێژاییی ئەم چەند دەیەی ڕابردوو، زۆربەی ئەمەریکییەکان لەسەر ئەو خەتە لیبراڵە بوون کە هەموو هاوولاتییەک شیاوی ئەوەیە خوێندنی زانکۆ بخوێنێت. لە ئەنجامدا ئاستی خوێندنی کۆلێژەکان هاتە خوارەوە و بڕوانامەی زانکۆش ئەرزشێکی نەما. بۆیە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بچینە سەر هێڵێکی ڕیالیستیکیانە. کۆلیجەکان دەبێت تەنها شوێنی ئەوانە بێت کە نەک تەنها بڕوانامەی ئامادەییان هەیە، بەڵکوو نمرەی زۆر باشیشیان تێدا هێناوە.

٧. هەریەک لەم دیالۆگانەی خوارەوە بخوێنەرەوە، ئەو هەلانە دەستنیشان بکە کە لەم چاپتەرەدا ئاماژەیان پێ کرا ئەگەر هەبوون. پاشان بڕیار بدە لەسەر ئەوەی کام بۆچوونەیان لەوی تریان ژیرانەترە و بۆچی.

تێبینییەک لەسەر باگراوندی کێشەکە: ڕاگەیاندنکارێکی سەر تەلەڤزیۆنی مژدەدەر، کە بزنسمانێکی تازە گرنگیدەر بوو بە ئایین، دوای خوێندنەوەی ئەم ئایەتە لە (سفری تەسنییە) لە ئینجیلدا، بایی ملیۆنێک دۆلار کاری هونەریی شکاند و فڕێی دانە ڕووبارەوە، کە دەڵێت: "دەبێت وێنەی ناهەمواری خوداکانیان لە ئاگردا بسووتێنرێن. حەز بە ئاڵتوون و زیوی سەریان مەکە و خۆتی پێوە مەڕازێنەرەوە با بە تەڵەیانەوە نەبیت، چونکە کفرکردنە بە خودای گەورەی تۆ." کارە هونەرییەکان زۆربەی ئاڵتوون، زیو، بەردی بەنرخ، عاج، دەربارەی دینە خۆرهەلاتییەکان بوون.

a. ئیلی: لە ڕاستیدا ئەمە زیاتر کارێکی گەمژانەیە، تۆ بیت ئەو هەموو

سـەروەتە فـڕێ بدەيـت. ئەگـەر ئـەو بەڕاسـتی لـە خەمـی ئيمانەکەيايەتـی، دەيتوانـی بـەو سـامانە هـاوكاری بـرا مرۆڤەكانـی بكردايـە.

سسيل: بۆ نموونە چۆن؟

ئيلی: دەيتوانی لەبری فڕێدانـی ئەو شتە بەنرخانە، بيفرۆشـتايە و پاشـان بـە پارەکـەی کـە مليۆنێـک دۆلار دەبوو، هـاوکاری کەسـە ليقەوماوەکانـی ئـەم جيهانـەی بکردايـە. يـان دەيتوانـی بيبەخشـيايەتە دامەزراوەيەکی دينـی ياخـود نەخۆشـخانەيەک. بـەڵام بـە فڕێدانـی ئـەو کەلوپەلانـە، خزمەتـی هيـچ لايەکـی نەکرد.

سسـيل: تـۆ تێناگەيـت، ئەزانـی بـۆ؟ چونکـە فرۆشـتنی ئـەم کەلوپەلانـە، ڕۆحـی کەسـانی ديـی پيـس دەکـرد. ئـەو پياوێکـی دينـدارە، کەواتـە هيـچ ڕێگەچارەيەکـی تـر نەبـووە جگـە لـە ملکەچکـردن بـۆ داواکانـی بايبـڵ.

b. *تێبينييـەک لەسـەر باگراونـدی کێشـەکە: ژنـە ئەفسـەرێکی پۆليـس لـە فلۆريـدا لـە ئيشـەکەی لا بـرا بـە تاوانـی گۆڕينـی ڕەگـەزی خـۆی بـۆ نێـر، بەڵام پۆليسـەکە داوای کـرد کـە هـەم پۆستەکەی بدەنـەوە هـەم قەرەبووی ماددیش بکرێتـەوە، چونکـە هێزی پۆليس مافێکـی دەستووريی ئەمـی پێشـێل کـردووە.*

کريسـتن: ئەگـەر حاڵەتەکـە وەک ئـەوە بێت کـە ئەفسـەرەکە باسـی دەکات، کەواتـە دەرکردنەکـەی لـە جێی خۆيدا نەبووە.

ڕێنـی: مـن بەپێچەوانـەوە، ئەفسـەری پۆليـس بەوەهـا کردەوەيەکـی ناشـرين، هێـزی پۆليـس ناشـرين دەکات.

کريسـتن: چـی ناشـرين و لەکەدارکردنێک لەوەدايە کـە کەسێک ڕەگـەزی خـۆی بگۆڕێت؟

ڕێنـی: سـەير و نەخـۆش و ناسروشـتی دەر دەکەوێـت. جگـە لەمـە، وا دەکات خەڵـک پێکەنينـی بـە هێـزی پۆليـس بێـت.

کريسـتن: هەڵەيـە، تەنهـا داوايـەک کـە بەشـی پۆليـس و خەڵکيـش لـە

ئەفسەرێک هەبێت ئەوەیە کە ئەو کەسە چ ژن بێت چ پیاو، بە ئەرکەکانی خۆی هەڵبسێت. ئەوەی کە بڕیار بدات ڕەگەزی خۆی بگۆڕێت، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوەی کە وەک ئارەزوویەک خوو بداتە کۆکردنەوەی پوول.

C. کوینتین: ڕادەیەکی زۆر کەمتر نەزانین لەوەی لە ئێستا هەیە، بوونی دەبوو ئەگەر بهاتبایە دایک و باوکان منداڵەکانیان لەسەر بۆچوونەکانی خۆیان پەروەردە نەکردایە.

لۆیز: بەڵام دایک و باوکان چۆن دەتوانن ئەوە بکەن؟

کوینتین: بەوەی ڕێ بدەن منداڵەکانیان ببنە خاوەن بۆچوونی خۆیان. هیچ یاسایەکی دیاریکراو نییە کە بڵێت لایەنگرانی حیزبی دیموکرات دەبێت دیموکراتی بچووک دروست بکەن لە منداڵەکانیان، یان پرۆستانتەکان ئایدیای پرۆستانتیزم بگوێزنەوە بۆ منداڵەکانیان.

لۆیز: بەڵام دەبێت چی بڵێن کاتێک منداڵەکانیان پرسیاریان لێ دەکەن دەربارەی سیاسەت و دین یان دیموکراسی؟

کوینتین: ئینسایکلۆپیدیایەکیان بدەنە دەست، یاخود ئەگەر دایک و باوکەکە توانییان باسێکی بابەتیی چەمکەکان بخەنە ڕوو، ئەوا بیکەن و تا دەتوانن چەمکەکان فرەڕەهەندانە بخەنە ڕوو، پاشان هانی منداڵەکانیان بدەن خۆیان بۆ خۆیان بۆچوونێک لە بۆچوونەکان هەڵبژێرن.

لۆیز: چۆن دەتوانرێت بە منداڵێکی سێ ساڵ بوترێت خۆت بۆچوونی خۆت لەسەر سیاسەت یان دین یان فەلسەفە هەڵبژێرە؟

کوینتین: لە حاڵەتی وادا، باوانەکان دەبێت ئەوەندە بڵێین کە لە توانای هەرسکردنی منداڵەکەدا بێت، پێشیان بڵێن کە کاتێک کە گەورەتر دەبن، خۆیان دەتوانن بڕیاری کۆتایی بدەن.

لۆیز: بەڵام ئەمە خزمەتی کۆمەڵگە یان منداڵەکان دەکات؟

کوینتین: هاوکاریی منداڵەکان دەکات تا بە حوکمە پێشینەکانی دایک

و باوکیان لەسەر شتەکان گەورە نەبن، هەروەها ڕێژەی گەمژەیی لە جیهاندا کەم دەبێتەوە بەم ڕێگەیە.

## ڕای جیاوز

ئەم پەرەگرافەی خوارەوە پووختە و کۆکراوەی ڕای جیاوازە لەسەر مەسەلەی ئایا ئافرەتان "شێوازێکی جیاوازیان هەیە بۆ فێربوون" وەک لە پیاوان. پاش خوێندنەوەی، سێرچێک بکە بە کتێبخانە و ئینتەرنێتدا، تا بزانیت ئەو کەسانەی زانیارییان هەیە لەسەر کێشەکە، چۆن باسی لێوە دەکەن. بەڵام دڵنیا بە لەوەی ڕای جیاواز بەسەر دەکەیتەوە. پاشان لاوازی و بەهێزیی هەریەک لە خوێندنەوەکان دیاری بکە. ئەگەر گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە بۆچوونێک بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوانی تر بەتەواوەتی هەڵەن، ڕوونی بکەرەوە کە چۆن گەیشتیتە ئەم دەرئەنجامە. وە ئەگەر هەستت کرد بۆچوونێک لەوانی تر مەعقولترە، بەڵام ئەوانی تریش هەریەکەیان بڕێک لە مەعقولیەتی تێدایە، *کە لە زۆربەی حاڵەتەکانیش هەر وا دەبێت*، ئەوا بۆچوونی خۆت بەرمەبنای کۆکردنەوەی هەموو خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکانی تر دابڕێژە، ڕوونیشی بکەرەوە کە بۆچی ئەمەی خۆت بە باشترین بۆچوون دەزانیت لەسەر کێشەکە. پاشان بۆچوونەکانت بە شێوەی نووسراو یان بە شەفەیی بخە ڕوو بۆ پۆلەکەت، بەو شێوەیەی کە مامۆستا بۆت دیاری دەکات.

### ئایا ئافرەتان "شێوازێکی جیاوازیان هەیە بۆ فێربوون" وەک لە پیاوان؟

لە ۱۹۸۰دا ماری بلێندڵی، بە هاوکاری کۆمەڵی نووسەری تر کتێبێکی بەچاپ گەیاند لەژێر ناوی "شێوازی فێربوون لای ئافرەتان." ئەم کتێبە بووە هۆی هەڵگیرساندنی زنجیرەیەک گفتوگۆ، کە تا هەنووکەش

بەردەوامـە. هەندێـک دەڵێـن، بەگوێـرەی ڕای ئـەو نووسـەرانە بێـت، ئـەوا ئافرەتـان کۆمەڵێ سـیفەتی تایبـەت بـە خۆیـان هەیە: لە پرۆسـەی فێربووندا زیاتر پشـت بـە حدس، لەخۆوەزانیـن intuitive دەبەسـتن وەک لـە شـێوازی ئەقڵـی، لـە گفتوگـۆدا زیاتـر حـەز بـە کۆکبـوون دەکـەن وەک ناکۆکبـوون، زیاتـر حـەز بـە پێکەوەبـوون دەکـەن وەک لـە بەتەنهابـوون. ڕەخنەگـران، لـە ناویشـیاندا کارۆڵ تاڤێرس نووسـەری کتێبی "نادروسـت هەڵسـەنگاندنی ئافرەتانـان" دەڵێـت، زەقکردنـەوەی ئـەم جیاوازییانـە هەڵەیـە، چونکـە لەسـەر هەڵـەی زۆر سـادەکردنەوە و زیادەڕۆییکردن لـە گشـتاندندا دامـەزراوە، هـەر بۆیـە لـە ڕاسـتیدا جیاوازییەکـی ئەوتـۆ نییـە لـە شـێواز و ڕێگـەی فێربـوون لای هـەردوو ڕەگەزەکـە و لەنێـوان تاکەکانـی یـەک ڕەگەزیشـدا (هەروەهـا لەنـاو کولتـوور و گروپـە جیاوازەکانیشـدا). بـە مانایەکـی تـر، مرۆڤـەکان چ نێر چ مێ، بەو شـێوازە بیر دەکەنـەوە کە لە پرۆسـەی پـەروەردەدا لە ماڵ و لـە قۆناغـە جیاوازەکانـی خوێندنـدا فێـر کـراون.

# بەشی سێیەم

# ستراتیج

لـە بەشـی یەکەمـی ئـەم کتێبـەدا "نـاوەڕۆک،" گرنگتریـن ئـەو "ئامـڕاز و یاسـا"یانەمان خستە ڕوو کە لە بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا ئامادەییان هەیە. لە بەشـی دووەمدا "تەڵە شـاراوەکان" قسـە لەسـەر ڕێگەکانی بەهەڵەداچوونی بیرکردنـەوەی ڕەخنەیـی کـرا، هەروەهـا چۆنێتیـی خۆڕزگارکـردن لێیـان. لـەم بەشـەی کتێبەکـەدا، هەنـگاو بـە هەنـگاو بـەو ڕێگەیانـە ئاشـنا دەبیـن کـە پێویسـتمان پێیانـە لـە مامەڵەکـردن لەگـەڵ کێشـە جۆربەجۆرەکانـدا. پەیڕەوکـردن لـەو ڕێگەیانـە وا دەکـەن کـە تـۆ بتوانیت ئـەو خـوو و توانایانـە پێکـەوە کـۆ بکەیتـەوە کـە هێـواش هێـواش بـەڵام بـە شـێوەیەکی کاریگـەر لـە چاپتـەرە یـەک لـەدوای یەکەکانـی پێشـوودا فێریـان بوویـت. لەیـادت بێـت، بیرکردنـەوە، بەکارهێنانـی چالاکییانـەی مێشـکە، ئەنجامدانـی ئـەم چالاکییـە، کتومـت وەکـوو یاریکردنـی تێنـس، یـان ژەنینـی پیانـۆ، ئۆتۆمبێـل لێخوڕیـن، یـان لێنانـی ژەمـی ئێـواران وایـە. واتـە نۆعییەتـی بیرکردنـەوەی پەیوەسـتە بـە چۆنێتیـی کردنەکەیـەوە.

لـە یەکـەم چاپتـەری ئـەم بەشـەدا "خۆناسـین" ئـەو ئایدیـا و تێگەیشـتنانە پێکـەوە کـۆ دەکاتـەوە کـە تـۆ لـە چاپتـەری یەکەمـی ئـەم کتێبـەوە دەربـارەی تێگەیشـتن لـە خـۆت بەدەسـتت هێنـاوە و ڕەنگـە ئایدیـا و تێگەیشـتنی نوێـش

ئامـاژە پـێ بـدات. (هـەتـا زیاتـر بەئاگاتـر بیـت لـە بەهێزی و لاوازیـی خـۆت، باشتـر دەتوانیـت توانـا و مـەهاراتەکانـت بخـەیتـەگـەڕ.) چاپتەرەکانـی دواتریـش گەشـتیکە بـە نـاو پرۆسـەی بیرکردنـەوەی ڕەخنەییدا، هـەر لـە *لێوردبوونـەوە* بـۆ *حکومـدان* و *دەربڕیـن* و ئـەوانـی تریـش.

# چاپتەری چواردەیەم

## خۆناسین

فەلسەفەی خۆرئاوا تا ڕادەیەکی زۆر لە ئامۆژگارییەکەی سوکراتەوە سەری هەڵدا "خۆت بناسە." لەو کاتەوە پیاو و ژنە هۆشمەندەکان گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییە کە خۆناسین کلیلی بەدەستهێنانی مەعریفەیە. وەکوو سیدنی جەی هاریس دەڵێت، "نەوەد لە سەدەی ئازار و ناڕەحەتیی جیهان لەو پیاو و ژنانەوە سەرچاوە دەگرێت کە خۆیان ناناسن، نە توانا و نە لاوازی و تەنانەت بەها ڕاستەقینەکانی خۆشیان ناناسن. زۆربەی هەرە زۆرمان گەشتی ژیان تەواو دەکەین، بەڵام تەواو وەک غەریبێک بە خۆمان."

بەشێک لەو شتانەی کە دەبێت دەربارەی خۆمان فێری بین، شتی جوان و باشن، بەڵام هەندێکی تریان بەناچاری شتی خراپ و ناخۆشن. بەڵام بەدڵنیاییەوە هەموو پێکەوە بەشدارییەکی گرنگ دەکەن لە گەشەدان بە کەسایەتیمان. ئەو ڕێگەیەی کە بە هۆیەوە دەتوانین دەستمان بەم مەعریفەیە بگات، بریتییە لە پرسیارە وروژێنەر و بەدیقەتەکان. لە خوارەوە بەشێک لە گرنگترین ئەو پرسیارانە دەخەینە ڕوو:

من کەسێکی کەمدوو یان چەندەبازم؟ بە شێوەیەکی گشتی گەشبین یان ڕەشبینم؟ کەسێکی ئیشکەر یان تەمەڵم؟ ترسنۆک یان چاونەترسم؟

جیدیم یاخود شتەکان لەسەر شان قورس ناگرم؟ خاکی یان لەخۆباییم؟ کێبڕکێخوازم یان نا؟ ئایا بە بڕوابەخۆبوونەوە ڕووبەڕووی کەسانی نەناسراو دەبمەوە یان دەشڵەژێم؟ ئایا لە حاڵەتە کتوپڕەکاندا دەتوانم ئارامیی ئەقڵی خۆم بپارێزم و ورد بیر بکەمەوە؟ ئایا هەرشتێک کە دەیکەم، بە بڕوابەخۆبوونەوە دەیکەم؟ ئایا کەسێکی ڕقاوی نیم بەرامبەر هەندێک خەڵک (بۆ نموونە هاوپۆلە زیرەکەکەم؟) ئایا بە شێوەیەکی ورد من دەچمە خانەی ڕابەرەکانەوە یان شوێنکەوتووەکانەوە؟

تا چ ڕادەیەک کەسێکی جێمتمانەم؟ ئایا دەتوانم نهێنیپارێز بم یان لانی کەم دەبێت کەسێک یان زیاتری لێ ئاگادار بکەمەوە؟ ئایا کەسێکی بەئەمەکم بۆ هاوڕێکانم؟ ئایا هەرگیز ئەوانی تر "بەکار دەهێنم" بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆم؟ تا چ ڕادەیەک هەستیارم بەرامبەر هەستی ئەوانی تر؟ ئایا هەرگیز بە نیازەوە هەستی ئەوانی تر بریندار دەکەم؟ ئایا ئیرەیی بەکەس دەبەم؟ ئایا چێژ لە ئاژاوەگێڕی وەر دەگرم؟ ئایا تۆوی بەدگومانی و بێمتمانەیی لەناو خەڵکیدا دەچێنم؟ ئایا لە خەمی ئەوەدام من ئەو کەسە بم کە تازەترین دیعایە و قسەی هەڵبەستراو بڵاو دەکاتەوە؟ ئایا لە پاشەملە زەمی هاوڕێکانم ناکەم؟ ئایا ڕاکانم لەسەر ئەوانی تر بە شێوەیەکی گشتی پیاهەڵدانە یان شکاندن؟ ئایا ڕەخنەگرتنی من لەوانی تر بەرمەبنای هەڵەکانی ئەوانی ترە، یاخود ئەو هەڵە دروستکراوانەی کە من دەیانخەمە پاڵیان تا خزمەت بە خۆئەڤینیی خۆم بکەم؟ ئایا لەسەر پەیمانەکانم سوورم و بەئەنجامیان دەگەیەنم؟ تا چ ڕادەیەک لە ئاست هەڵە و کەموکوڕییەکانی ئەوانی تردا لێبووردە و دڵگەورەم؟

ئایا ڕاستگۆم لەگەڵ ئەوانی تردا؟ و لەگەڵ خۆشمدا؟ تا چ ڕادەیەک

بابەتییانـە توانـا و مەهارەتەکانـی خـۆم دەبینـم؟ تـا چ ڕادەیـەک کەسـێکی زیرەکم؟ تا چ ڕادەیەک کۆشکەرم لە ئەرکەکانی قوتابخانەدا؟ بە چەند ڕۆڵی جۆربەجۆر هەڵدەستم بەرامبەر ئەوانی تر؟ کام لەو ڕۆڵانـە ڕەنگدانـەوەی ڕاستەقینەی کەسایەتیی خۆمـن؟ و کام لـەوان بـۆ شـاردنەوەی سـیفەتێک لـە سیفەتەکانمە کـە خەجاڵەتـی و شـەرمەزاریم بـۆ دێنـی گـەر ئەوانـی تـر ببینن؟ ئایا پلانەکانـم بـۆ داهاتـوو ئاقڵانـەن؟ ئایا لەژێر فشـارەکاندا دەتوانـم کارەکانـم بەباشـی ئەنجـام بـدەم؟

## لیستی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی
## Critical Thinking Inventory

لەپاڵ ئـەو پرسـیارانەی کـە ئاماژەیـان پـێ درا، چەندان پرسیاری تر پێشـنیار کراون بۆ بیرلێکردنـەوە لـە ١٣ چاپتەرەکـەی پێشـوودا. لـە خـوارەوە ئامـاژە بـەو پرسـیارانە دەدرێـت کـە هاوکاریـت دەکـەن لیسـتێک بـۆ ئـەو خـوو و هەڵسوکەوتانە دروست بکەیت کە کار لـە چۆنییەتیی بیرکردنـەوەت دەکەن:

١. بەوردی ئـەو هێزانـە چیـن کـە فۆڕمیان بەخشـیوە بە شـووناسـی من؟ چۆن ئەمەیـان کـردووە؟ چ کاریگەرییەکیان لەسـەر ئـەو وێنـە پەسـەندکراوە دانـاوە کـە خـۆم بـۆ خـۆم داتاشـیوە؟ لـە چ حاڵەتێکـدا مـن لـەوە دەکـەوم تاکێکـی سـەربەخۆ بـم لەژێر کاریگەریـی ئـەم هێزانـەدا؟

٢. لـە چ کاتێکـدا مـن بیرکەرەوەیەکـی ڕەخنەییـی باشـم (بـەو مانایـەی کە لـە چاپتـەری دوودا ئامـاژەی پـێ کـرا). هەروەهـا چ کاتێکیش مـن دەبمـە بیرکەرەوەیەکـی خـراپ؟ ئـەو حاڵەتانـە کامانـەن کـە وا دەکـەن مـن بگەمـە باڵاتریـن و نزمتریـن ئاسـتی بیرکردنـەوەی خـۆم؟

٣. تـا چ ڕادەیـەک خـاوەن دیدێکـی ئەقڵانـی بـووم بۆ چییەتیی حەقیقەت؟ (ئەگـەر پێویسـت بـوو چاوێـک بە چاپتەری سێدا بخشـێنەرەوە).

٤. تـا چ ڕادەیـەک کارامانـە دەتوانـم قسـەی هەڵبەسـتراو و پڕوپاگەندە لە

فاکت جودا بکەمەوە؟ هەروەها لە لێکجوداکردنەوەی ئەوەی کە زانراوە لەگەڵ ئەوەی کە تەنها خەملێنراوە یان پێشنیار کراوە؟ تا چ ڕادەیەک لەسەر شانم قورسە کە دان بنێم بە نەزانیی خۆمدا و بڵێم "نازانم؟"

٥. تا چەند دەرگیرم لە ئاست ئەو زەحمەتانەی دێنە سەر ڕێگەی خۆڕۆشنبیرکردنم؟

٦. تا چ ڕادەیەک بیرکردنەوەم دەچێتە خانەی "هی-من-باشترە"وە؟ (نەک تەنها لە پەیوەندیدا بە خۆمەوە، بەڵکوو بە نەتەوەکەشمەوە)؟ کاریگەریی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە چییە لەسەر کێشە تایبەتی و گشتییەکان؟ تا چ ڕادەیەک توانای گوێگرتنی لاواز کردووم لەو کەسانەی کە وەک من بیر ناکەنەوە؟ هەروەها توانای کۆنترۆڵکردنی هەستەکانم و ئیرادەی پێداچوونەوە و گۆڕینی بڕیار و تێگەیشتنەکانم؟

٧. ئەو بابەتانە کامانەن کە حەز دەکەم هەر لەخۆڕا وەک حەقیقەت وەریان بگرم؟

٨. تا چ ڕادەیەک بیرکردنەوەم لە جۆری "تەنها یەکێک لەم دووانە"یە؟ ئایا پێت وایە حەقیقەت هەمیشە دەبێت پەرگیرانە بێت و ئەگەری مامناوەند پێویستە هەمیشە ڕەت بکرێتەوە؟

٩. لەگەڵ چی و کێدا بەهێزترین مەیلم هەیە بۆ خۆهاوتاکردن، خۆ-وەک-ئەوانی-تر-لێکردن؟ لە چ حاڵەتێکدا ئەم مەیلە بۆ خۆهاوتاکردن تەداخولی کردووە لە حوکمدانەکانم؟

١٠. ئایا من مەیلم بۆ ڕەهاگەرایی هەیە. واتە هەمیشە حەقیقەت وەک یەکەیەکی سادە و بێخەوش دەبینم، یاخود ڕێژەگەرام و بڕوام وایە هەموو کەس دەتوانێت خۆی بۆخۆی حەقیقەتی خۆی بەرهەم بهێنێت؟ بە چ شێوازێک ئەم مەیلانە بوونەتە لەمپەر لە بەردەممدا وەک بیرکەرەوەیەکی ڕەخنەیی؟

١١. ئەو بابەتانە چین کە لایەندارانە حەز بە گۆڕانیان دەکەم؟ ئایا

من زیاتر دژ یاخود لەگەڵ گۆڕانم؟ ئایا هۆی ئەم مەیلە بۆ گۆڕان یاخود دژەگۆڕانە چییە؟ چۆن دەتوانم کۆنترۆڵیان بکەم؟

١٢. ئەو حاڵەتانە چین کە تێیاندا بۆچوونە تەرەفدارەکانم قبوڵ دەکەم، نەک ئەوەی رووبەڕوویان ببمەوە و کۆنترۆڵیان بکەم؟ لە چ دۆخێکدا لایەندارانە بەڵگەکان هەڵدەسەنگێنم بە شێوەیەک، خزمەت بە تەرەفگیرییەکەم بکات؟

١٣. تا چ ئەندازەیەک مامەڵە لەگەڵ کێشەکاندا دەکەم بە شێوازی دوو ستاندارد. واتە کەموکوورییەکانی ئەو ئارگۆمێنتانە پشتگوێ دەخەم کە هاوبۆچوونی خۆمن و شەڕ بەوانەش دەفرۆشم کە پێچەوانەی بۆچوونی خۆمن؟

١٤. ئایا تا چ ئەندازەیەک حەز دەکەم باز بەسەر وردەکارییەکاندا بدەم و حوکمی خۆم دەر بکەم؟ ئایا لە هەندێک کێشەی تایبەتیدا ئەم مەیلەم زیاد دەکات؟ ئەگەر هەیە، ئەو کێشانە چین؟ ئایا ئەم مەیلە بۆ گەیشتنە دەرئەنجام و حوکمی ناکامڵ، تەنها لەبەر تەمەڵییە؟ یان لەبەر ئەوەیە کە خۆم وەک کەسێکی بەئاگا و ڕۆشنبیر پیشان بدەم و کاریگەری لەسەر ئەوانی تر جێ بهێڵم؟

١٥. تا چ ئەندازەیەک من زیادەڕۆیی دەکەم لە گشتاندندا؟ کام جۆر لە نموونەی باو زیاد لەوانی تر خێراتر قبوڵ دەکەم: نەتەوەپەرەستی؟ ئایینی؟ یاخود نەژادی؟

١٦. تا چ ڕادەیەک کێشە ئاڵۆزەکان زیاد لە پێویست سادە دەکەمەوە؟ ئایا ئیرادەی ئەوەم نییە ڕووبەڕووی کێشەکان ببمەوە بە خۆیان و ئاڵۆزییەکانیانەوە؟ یان لەو وەڵامانە دەترسم کە ڕێک و ڕەوان و سادە و بێگرێ نین؟ بۆچی من وا بیر دەکەمەوە؟

١٧. بە زۆری دەکەومە کام هەڵەی دەربڕینەوە؟ ئەوەی کە مادەم b بەدوای aدا هاتووە، کەواتە دەبێت a هۆکار بێت بۆ ڕوودانی b؟ گۆڕینی

بابەت لەپێناو خۆدزینەوە لە گرانی و زەحمەتی بابەتی گفتوگۆلەسەرکراو؟ دژیەکی لەگەڵ خۆمدا؟ خۆدووبارەکردنەوە؟ دەربڕینی گوزارە بێماناکان؟ تێکەڵاوکردنی کەسە پسپۆڕ و ناشارەزاکان بە کەسە پسپۆڕەکان؟ بەیەکچوواندنی هەڵە؟ بەکارهێنانی مەیلە نائەقڵانییەکان؟

١٨. بە زۆری دەکەومە کام لەم هەڵانەی خوارەوە لە کاتێکدا کە وەڵامی ئەو ڕەخنانە دەدەمەوە کە لەسەر بۆچوونەکانم گیراون: ڕەتدانەوەی دەستبەجێ؟ خۆدزینەوە لە زەحمەتی سەلماندن، straw man، هێرشکردنە سەر ڕەخنەگر لەبری ڕەخنەی ڕەخنەگرەکە؟

## بەکارهێنانی لیستە تایبەتەکەی خۆت

لەپاڵ گرنگیی پرسیارەکانی سەرەوە، بەڵام هێشتا پرسیارێک هەیە کە لەوانیش گرنگترە: *چۆن دەتوانیت لیستە تایبەتەکەی خۆت بە باشترین شێوە بخەیتە گەڕ لەپێناو بیرکردنەوەیەکی قووڵتر و چالاکانەتردا*؟ وەڵامی ئەم پرسیارە وا هەنگاوبەهەنگاو لە خوارەوەدا دەدرێتەوە:

١. وەڵامی هەموو پرسیارەکانی لیستەکەی سەرەوە بدەرەوە، بەڵام ڕاستگۆیانە دان بنێ بە هەموو ڕاستییەکاندا، چ شیرین و چ تاڵەکان. (ئەگەر چاو لە ڕاستییە تاڵەکان بپۆشیت، ئەوا مانای ئەوە نییە کە لەناوت بردوون، بەڵکوو پشتگوێخستنیان دەبێتە هۆی بەهێزکردنیان)

٢. لەسەر وەڵامەکانت هەڵوێستە بکە، بە تایبەت لەو جوومگانەدا کە لاوازیت. چاوەڕێ مەبە وەک یەک لە هەموو جوومگەکاندا لاواز بیت. ئامانج و نیازی تۆ لێرەدا بریتییە لە ناسینی شێواز و خووی بیرکردنەوەت بە شێوەکی ئەوەندە باش، کە پێشبینی شێوازی بیرکردنەوەت بکەیت لە ڕووبەڕووبوونەوەی حاڵەتە جۆربەجۆرەکانی داهاتوودا.

٣. لە کاتی دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ کێشەیەکدا، ئەندێشەی ئەو لەمپەرانە بکە کە دێنە ڕێت و پاشان بیر لە ستراتیژی

ڕووبەڕووبوونـەی ئـەو لەمپەرانـە بکـەرەوە.

## ڕوبەڕووبوونەوە و بەرئەنجامە خوازراوەکەی

تێگەیشـتن لـە هەنـگاوە سـتراتیژییەکانی گەشـەکردنی بیرکردنـەوەی ڕەخنەیـی شـتێکە و چۆنێتیـی بەکارهێنـان و بـە کردەوەکردنـی چالاکانـەی ئـەو هەنگاوانـە شـتێکی تـرە. ئـەوەی دووەمیـان بەرەنـگاری و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زەحمەتـە. پێویسـتی بـە کۆششـێکی بـەردەوام هەیـە بـۆ ماوەیەکـی زۆر.

بـەڵام ئایـا ئـەم ڕووبەڕووبوونەوەیـە شـیاوی ئەوەیـە ئـەم کۆششـە بەردەوامـەی بـۆ بکەیـن؟ باشـە، بـا گرنگـی بیرکردنـەوە لەبەرچـاو بگریـن لە ژیانی ڕۆژانەماندا. شـارەزا دیارەکانی بواری پـەروەردە جەخت لەسـەر گرنگیی تێپەڕاندنی قۆناغـی لەبەرکردن دەکەنـەوە لـە پرۆسـەی فێربوونـدا و پێداگـری لەسـەر زەرورەتـی تێگەیشـتن و بەکارهێنانـی فاکتـەکان، ڕاستییەکان دەکەنـەوە لـە ژیانـی ڕۆژانـەدا. بـۆ تێگەیشـتن و سـوودبینین لـە وانەکانـی زانکـۆ، مەهارەتەکانـی بیرکردنـەوە، ڕۆڵـی زۆر کاریگەریـان هەیـە. بزنزمانـەکان و ڕابـەرە پرۆفیشـناڵەکان هەمـوو جەخـت لەسـەر گرنگیـی کارامەیـی بیرکردنـەوە دەکەنـەوە بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکان و دەرکردنـی بڕیـارە دروسـتەکان، دەربـارەی ئیـش و بـازاڕ. (هەمـوو ئـەو کتێبانـەی بـەم دواییـە لەسـەر نایاببوون excellence نووسراون، پێداگری لەسـەر گرنگیـی سـکێڵەکانی بیرکردنـەوە دەکەنـەوە.

سـەرەڕای ئەمانـەش، دەروونناسـەکان یـەک دوای یـەک تێکـڕا قسـە لەسـەر گرنگیـی سـکێڵەکانی بیرکردنـەوە دەکەنـەوە لـە ژیانـی ڕۆژانەمانـدا. شـێوازی بەربـڵاو لـە چارەسـەرکردنی نەخۆشـییە دەروونییـەکان لـەم

ولاتـەدا {لـە ئەمەریـکادا} لـە ڕاسـتیدا بریتییـە لـە چارەسـەر لـە ڕێگـەی گفتوگۆی هۆشیارکەرەوەوە. ئـەم شـێوازەی چارەسـەر لەسـەر ئـەو بنەمایە دامـەزراوە کـە زۆربـەی نەخۆشـییە دەروونییـەکان (نەخۆشییە دەمارییەکان) دەرئەنجامـی خووگرتنن بـە بیرکردنـەوەی هەڵـەوە. دەروونناسـی بەناوبانگ و دامەزرێنـەی سـەنتەری چارەسـەرکردنی نەخۆشـییە دەروونییـەکان لـە ڕێگـەی بیرکردنـەوەی ئەقڵانییـەوە، ئاڵبێـرت ئێلیس، دەڵێت، "مـرۆڤ دەتوانێت ژیانێک بژی پڕ لـە گەشـەکردن و داهێنـان و ئارامـی و سۆزداری لـە ڕێگـەی ڕێکخسـتن و دیسـپلینکردنی ئەقڵانییانـەی بیرکردنەوەکانیـەوە."

ئێلیسـیش وەکـوو دەروونناسـە بەناوبانگەکانـی پێـش خـۆی، گەیشـتۆتە ئـەو دەرئەنجامـەی کـە بـۆ ڕێکخسـتنی بیرکردنەوەکانمـان، پێویسـتە لـە ململانێ و زۆرانبازیدا بین لەگـەڵ پاڵنـەر و مەیلـە نێگەتیڤەکانیدا. ئـەو دەڵێت: "وەک چۆن فرۆید و کچەکەی، ئانا، گەیشـتوونەتە دەرئەنجامێکی بەدیقەت و ئادلێریش جەختـی لەسـەر کردۆتـەوە کـە مـرۆڤ ڕاهاتووە بە فەرامۆشـکردن و خۆنەسـازاندن لەگـەڵ کێشـەکانیدا، لەجیاتـی ئـەوە پشـتگوێیان دەخـا و بیانوویـان بـۆ دەهێنێتـەوە، دانیـان پێـدا نانێت، قەرەبوویـان دەکاتـەوە، دەیانناسـێنێت، فڕێیـان دەدات، خۆیـان لـێ لا دەدات، دەیانچەپێنێت، لەگـەڵ چەندیـن ڕێوشـوێنی بەرگریـی دیکـە.

بەکورتـی، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە لەمپەرەکانـی بـەردەم گەشـەکردنی بیرکردنـەوە زۆرن و ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو لەمپەرانـەش هەوڵێکـی پڕکۆششـە، بـەڵام هیـچ ڕێگەیەکـی تـر ئەوەنـدەی ئـەم ڕووبەڕووبوونەوەیە کاریگـەر و بـەکار نییـە لەسـەر بەرەوباڵابردنـی خـود و هەمـوو ڕەهەندەکانـی ژیـان بـە گشـتی.

# ڕاهێنانەکان

١. لەبەر ڕۆشنایی ئەو پرسیارانەدا کە لەم چاپتەرەدا باس کران، لە خۆت بکۆڵەرەوە. بەو ڕەهەندانەوە مەگیرسێرەوە کە هەنووکە دەیانزانیت، بەڵکوو هەوڵ بدە هۆشیاریی خودئاگاییت گەشە پێ بدەیت. هەروەها لایەنە نەخوازراوەکانت مەخەرە دەرەوەی بازنەی لێکۆڵینەوەکەت. پاشان لەسەر دۆزینەوەکان هەڵوێستە بکە.

٢. توانای بیرکردنەوەی ڕەخنەییت لەسەر هەریەکێک لەم حاڵەتانەی خوارەوە جێبەجێ بکە. دڵنیا بە لە بەکارهێنانی ئەو هۆشیارییە نوێیەی کە دەربارەی خودهۆشیاری-خۆناسین لەم چاپتەرەدا بەدەستت هێناوە. هەروەها پێشبینی بکە کە ئایا ئەگەر ئەو حاڵەتانە بەسەر تۆدا بێن، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەیت:

a. ژنێک دانیشتووی کالیفۆرنیایە، ئەو کاسۆلۆکییەکی دەمارگیرە و خاوەن دوو شوقەیە کە دەیدات بە کرێ، کوڕ و کچێک داوی لێ دەکەن کە شوقەکانیان بە کرێ بداتێ، بەڵام ئەو داواکەیان ڕەت دەکاتەوە بە هۆی ئەوەی کە پێکەوە دەژین بێ ئەوەی هاوسەرگیرییان کردبێت. دادگا بە تۆمەتی جیاکاری، ژنەکەی سزا دا و ژنەکەش دەڵێت، من تەنها پەیڕەوم لە بیروباوەڕی ئازادانەی ئایینی خۆم کردووە. دادگا غرامەی ٤٥٠ دۆلاری لێسەندووە، دواشی لێ کرد ڕەزامەندی و پەیوەستی خۆی لەسەر ئەم سێ خاڵەی خوارەوە پیشان بدات: ١. ژنەکە پێچەوانەی یاسا

و ڕێنماییەکانی دەوڵەت لەمەڕ مەسەلەی خانووبەرەوە مامەڵە کردووە ٢. ئەوەی کە گوایە ژنەکە پەیرەوی لە ئازادیی بیروباوەڕی ئایینیی خۆی کردووە، بانگەشەیەکی بەتاڵە. ٣. لە ئێستا بەدواوە ملکەچ دەبێت بۆ یاسای دەوڵەتِ لەمەڕ مافی یەکسانی کرێنشینانەوە ٤. ئایا دادپەروەری لەم کەیسەدا جێبەجێ کراوە؟

b. زۆر کەس دەڵێن هۆشیاریی خەڵکی لە ئاست خراپمامەڵەکردن لەگەڵ منداڵاندا بە ئاستێک بەرز بۆتەوە، کە چیدی منداڵ تووشی لێدان نابن. بەڵام هەندێکی تر دەڵێن لێدان مەرج نییە هەموو کات خراپ بێت، چونکە دەتوانێت منداڵ فێری باشە و خراپە و فێری خۆ-کۆنترۆڵکردن بکات. تۆ چی دەڵێیت لەسەر ئەم بابەتە؟

c. ژمارەیەک زیندانی داوایەکی یاساییان بەرز کردەوە لە دژی سیستەمی گرتووخانەکان. ئەوان گلەییی ئەوە دەکەن کە مافی ئازادیی ئایینیان لێ زەوت کراوە، چونکە لە گرتووخانەکاندا هیچ میحرابێک نییە تا ئەمان بە طقوساتی دینیی تایبەتیی خۆیان هەڵبستن کە بریتییە لە پاڕانەوە لە شەیتان. ئایا بەرپرسانی گرتووخانە دەبوو وەها مافێک بۆ گرتووەکانی فەراهەم کردبا؟

d. حکومەتی کەنەدی یاسایەکی پەسەندکرد بۆ کەمکردنەوەی سپۆنسەرشیپ لەلایەن کۆمپانیاکانی جگەرەوە بۆ ڕووداوە وەرزشی و کولتوورییەکان. بەپێی ئەم یاسایە، نابێت لۆگۆی کومپانیاکان لەسەر ئۆتۆمبێلەکانی پێشبڕکێ و ڕیکلامی ڕووداوەکاندا ببینرێت کە ئەم کۆمپانیایانە سپۆنسەری دەکەن٣. ئایا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پێویستە پەیرەوی لەم یاسایە بکات؟

e. لە کاتی هاتنەژوورەوەدا، ئەفسەرێکی پۆلیس دەبینێت کچەکەی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا سێکس دەکەن. کوڕەکە بەپەلە پانتۆڵەکەی هەڵدەکێشێت و ڕادەکاتە دەرەوە، بەڵام ئەفسەرەکە ئەیوەستێنێ و

زللەیەکی باشی لێ دەدا. ئەمەش وا دەکات دایکی کوڕەکە لە بنکەی پۆلیس شکات لە باوکی کچەکە بکات بە بیانووی ئەوەی کە "سوکایەتی" بە کوڕەکەی کراوە. لە ئەنجامی ئەمە، بڕیار درا کە ئەفسەرەکە سزا بدرێت بە دابەزینی پلەکەی و غرامەی ٧٠٠ دۆلار، بەڵام دواتر سزاکەی سووک کرا بۆ بڕینی تەنها موچەی یەک هەفتەی٤. هاوڕایت لەگەڵ چۆنێتیی چارەسەرکردنی کێشەکەدا؟

f. هەندێک لە پەروەردەکاران دەڵێن جیدیبوونی زانکۆکان لەچاو جاراندا دابەزیوە. بە دیاریکراوی، مەبەستیان ئەوەیە پێویستە تەنها ئەو قوتابییانە وەر بگیرێن کە توانای تەواویان هەیە، هەر بۆیە دەبێت کۆرسی ئامادەکاری نەمێنێت و مەرجەکانی وەرگرتنیش دەبێت زەحمەتتر بکرێن. کەواتە ئەو قوتابییانەی کە نمرەی ئامادەییان کەمە و ئاستیشیان نزمە، ناتوانن بێنە زانکۆوە. هاوڕایت لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا؟

g. قوتابییەکی زۆر لێهاتووی بەشی زمان لە زانکۆی پرینستن، لێکۆڵینەوەیەکی نووسی لەسەر ڕۆمانێک بۆ وانەی ئەدەبی ئەمەریکیی ئیسپانی، بەڵام مامۆستاکەی تۆمەتی قۆپیکردنی خستە پاڵ قوتابییەکە، واتە قوتابییەکە هەڵساوە بە بەکارهێنانی سەرچاوە لە لێکۆڵینەوەکە بەبێ ئاماژەدان پێیان. بەڵام قوتابییەکە ئەمەی ڕەت کردەوە، چونکە ئەو دەیوت، تەنها هەندێک "هەڵەی تەکنیکیی کردووە." لە ئەنجامدا، سەرۆکی بەش، بڕیاری دا بۆ ساڵێک خوێندنی قوتابییەکە دوا بخرێت، هەروەها کۆلێژی یاساش لە کەیسەکە ئاگادار بکاتەوە، چونکە قوتابییەکە فۆرمی تەقدیم کردبوو تا لە داهاتوودا یاسا بخوێنێت. قوتابییەکەش ئەم سزایەی پێ قبوڵ نەکرا، بۆیە لە دادگا شکاتی کرد. پێت وایە سەرۆک بەش بڕیارەکەی لە جێی خۆیدا بووە و زۆر توند نەبووە؟

h. دادگای فیدڕاڵی بڕیارێکی دەر کرد کە یادەکانی سەری ساڵ (لەوانە هانوکاه، ئیستەر و پاسۆڤەر) لە قوتابخانە گشتییەکاندا وەک

بۆنـەی کولتـووری یـاد بکرێتـەوە نـەک بکرێـت بـە پشـووی ڕەسـمی. مافناسـەکانی شـارەزا لـە بواری پـەرەوەردەدا ئـەم بڕیارەیان وا لێک دایـەوە کـە گۆرانییەکانـی وەکـوو "شـەوی بێدەنـگ" و ئەوانـی تـر، تەنها لـە وانـە ئایینییەکاندا یان لـە وانـە میوزیکییەکاندا بوترێتـەوە وەک یادکردنەوەیەکی کولتووری، نـەک وەکوو یادکردنەوەیەکی ئایینـی لـە هەمـوو وانەکاندا. ئایا تـۆ پێـت باشـە یادکردنـەوەی بۆنـە ئایینییـەکان لـە قوتابخانەکانـدا قەدەغـە بکرێـت؟

أ. ئیلازابێـس تایلـەر هـەر کـە زانـی فلیمێـک لەسـەر ژیانـی ئـەم لـە بەرهەمهێناندایە، لـە ڕێـی دادگاوە فیلمەکـەی وەسـتاند. ئـەو دەیـوت، ئەمـەی کـە ئێسـتا پێـی دەڵێـن درامـای دۆکۆمێنتـاری، هیـچ نییـە جگـە لـە مۆدێلێکی نوێـی ناوزڕانـدن و هێرشـکردنە سـەر ژیانـی تایبەتـی، بۆیـە مـن دژی ئـەو فیلمـەم. هەندێـک کـەس دژی ئـەم بۆچوونـەی تایلـەر وەسـتانەوە، چونکـە پێیـان وا بـوو ئەمـە جۆرێکـە لـە سانسـۆر و سـنووردارکردنی ئازادیـی ڕاگەیاندن. تۆ ئەڵێیت چی؟ (ئەگـەر دراما دۆکۆمێنتارییەکە لەسـەر کەسێکی بەناوبانـگ بـەڵام کۆچکـردوو بایـە، وەکـوو کـورت کۆبەیـن یـان ئێلڤیـس پریسـلی، ئـەوکات چـی؟).

أ. شـیرلی ماکلەیـن، ئەکتەرێکـی بەناوبانـگ و نووسـەرێکی پڕفرۆشـە. ئەم ژنـە بانگەشـەی ئـەوە دەکات کـە پێش ئـەم ژیانـەی ئێسـتای، زۆر ژیانـی تـر ژیـاوە. بـۆ نموونـە جارێـک وەک مامۆسـتایەکی پیـاو ژیـاوە کـە خـۆی دەکوژێـت بـە هـۆی لەدەسـتدانی کێبڕکێـی وەرزشـیی ئەتلانتیسـەوە. بڕوا بـەم چەشـنە بانگەشـانە دەکەیـت؟

# چاپتەری پانزەیەم

## بەدیقەتبوون Being Obser vant

کیمیاناسی فەرەنسی دەڵێت، "شانس دێتە سەر ڕێی ئەقڵە پەروەردەکراوەکان." هەر لێرەوەش دەتوانین بڵێین شانس لەو چاوانەدایە کە بەدیقەتن. زۆر شتی دیار لەوێدا و لەناو ژیانی ڕۆژانەماندا هەن، چاوەڕێی ئێمەن تا دیقەتیان بدەین، بەڵام ئێمە نادیدە وەریان دەگرین. بۆ نموونە، شتی زۆر سادە، ڕەنگی چاوی باوکت چییە؟ دایکت بەلای چەپ یان ڕاستدا قژی دادێنێت. دیوارەکانی ژووری نانخواردنەکە چ ڕەنگن؟ چەند خانوو لە گەڕەکەکەتاندا ڕەنگیان سپییە؟

بەدیقەتبوون هەر ئەوە نییە کە چێژ و زیندوویتی ببەخشێتە چالاکییە ڕۆژانەییەکانمان. بەڵکوو بیرکردنەوە ورد و ماقوڵەکان زۆر جار لەسەر ئەو شتە بچووکانە دامەزراون، کە تەنها بە هۆی بەدیقەتبوونەوە خۆیانمان بۆ مانیفێست دەکەن. ئەگەر دابڕان و پچڕپچڕی هەبێت لەو شتانەدا کە دەیانبینین و دەیانبیستین، ئەوا ئەو تێگەیشتنەش کە حوکمەکانمانی لەسەر دادەمەزرێنین دەربارەی ئەو شتانە، بەدڵنیاییەوە ناتەواو و کەلێندار دەبێت. جگە لەمانەش، هەتا بەدیقەتتر بین، کەمتر دەکەوینە هەڵەکانی بیرکردنەوەی وەکوو نموونەی باو، زۆر سادەکردنەوە و گریمانەی بێبناغەوە.

## بەدیقەتبوون دەربارەی خەڵکی

ئەوەی کە خەڵکی دەیڵێن و شێوەی وتنەکەشی (هەندێک کات ئەوەشی کە دەیشارنەوە نایڵێن) هەموو ئەمانە دەتوانن سەرەداوی گرنگ بن بۆ تێگەیشتن لە بۆچوونی نەوتراو و هەڵوێستەکانیان. سەرنجدانی ئەم چەشنە شتانە، هاوکاریمان دەکەن تا بۆمان دەر بکەوێت ئەوان بەرامبەر چ شتێک هەستیارن و لە چ ڕوویەکەوە تێگەیشتنیان لاوازە. هەر لێرەشەوە دەتوانین بگەینە باشترین شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا.

کاتێ خەڵکی گوێبیستی شتێک دەبن، هەندێک ئاماژەی تایبەت دەدەن، کە لە ڕێیانەوە دەتوانین تێبگەین کە حەز بەوە دەکەن کە دەوترێت یان نا. سەرلەقاندنی جارجارە، بزەیەکی دۆستانە، هەندێک کات پێکەنینیش، هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆ کۆکبوون و ڕازیبوون بەوەی کە گوێبیستی دەبن. بە دیوی ئەودیویشدا، سەرڕاوەشاندنێکی کەم، بەرزکردنەوەی برۆکان، هێنانەوەیەکی لێوەکان و مۆرەکردن، هەموو ئەمانە ئاماژەن بە ناکۆکبوون، حەزنەکردن بەوەی کە دەیبیستن. خەڵکی بەگشتی کاتێک کە حەز بەو بابەتە ناکەن کە قسەی لەسەر دەکرێت، هەندێک ئاماژە دەر دەبڕن، تەنانەت ئەگەر هەوڵیش بدەن بیشارنەوە. شێوەی سەیرکردنی کاتژمێرەکەیان، هەناسەهەڵکێشانێک کە بۆنی پەشیمانیی لێ دێت، سەرنج خستنە سەر شتێک یان کەسێک لە دەرەوەی ئەو کەسەی یان شتەی کە قسەی لەسەر دەکرێت، ئارامنەگرتن و جووڵەجووڵ، گۆڕینی بابەت و کەسەکان، هەموو ئەمانە ئاماژەن بە بێزاری و ناڕازیبوون.

زۆر شت دەتوانرێت بوترێت تەنیا بە هۆی سڵاوکردنی دوو کەس لە یەکتر. بۆ نموونە، تۆنی دەنگی کەسەکان ئەوە پیشان دەدات کە

ئـەوان ڕێـز لـە یـەک دەگـرن، خۆیـان بـە هاوتـای یـەک دەزانـن یـان نـا. هەندێکـی کـەم لـەو هێمـا و ئاماژانـە بـە هـۆی وردییانـەوە چـاوی کەسـە بەدیقەتەکانیـش ڕەنگـە نەیانبینـن. هەندێکـی تریشـیان لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ڕوون و دیارن، بـەڵام پێویسـت بـە سـەرنج-خسـتنە-سـەر دەکـەن، چونکـە وا دەکـەن کەسـەکان باشـتر لەیـەک تێبگـەن.

قوتابییـەک لـە پۆلـدا، لـە کاتـی تاقیکردنـەوەی نووسـیندا، دەسـت بڵنـد دەکات، تـا مامۆسـتا ڕێـی پـێ بـدات قەڵەمێـک لـە هاوڕێکـەی وەر بگرێـت. (نـۆ هەفتەیـە خوێنـدن دەسـتی پـێ کـردووە و تاقیکردنـەوەی نووسـینیش پێـش دوو هەفتـە لەمەوپێـش ڕاگەیانـدراوە) مامۆسـتاکە کەمێـک لێـی ورد دەبێتـەوە، پاشـان قەڵەمێـک لـە گریفانـی دەر دەهێنێـت و بـەرەو ڕووی قوتابییەکـە دەڕوات و دەیداتـێ. هیـچ وشـەیەکیش ناڵێـت، هیـچ ئاماژەیـەک لـە ڕووخسـاری مامۆسـتاکەدا نییـە کـە تووڕەبـوون یـان نارەزایەتیـی پێـوە دیـار بێـت. بـەڵام ئەگـەر قوتابییەکـە ورد و بەدیقـەت بێـت، ئـەوا دەبینێـت کـە مامۆسـتاکە ئـەم کەمتەرخەمییـەی قوتابییەکـەی لا پەسـەند نییـە.

ئەفسـەرە لێکۆڵـەرە باشـەکان ئەوانـەن کـە ورد و بەدیقەتـن، ئـەوان دەزانـن کـە سـەرەداوێکی بچـووک و کەمنـرخ ڕەنگـە لـە داهاتـوودا گرێکوێـرەی کەیسـێک بکاتـەوە. بـە هەمـان شـێوە پارێزەرە باشـەکانیش ئەوانـەن کـە ورد و بەدیقەتـن، بینینـی ترسـێک یـان قەلەقییـەک بـە دەموچـاوی شـاهیدێکەوە لـە کاتـی لێدوانـدا لـە دادگا، ڕەنگـە دەیـان پرسـیاری جیدی بـەدوای خۆیـدا بێنێـت. بـە هەمـان شـێوەش، ئێمـەش وەک بیرکـەرەوە ڕەخنەگرەکان، ئەگـەر ورد و بەدیقـەت سـەرنجی ڕەفتـار و گوفتـاری ئەوانـی تـر بدەیـن، ئـەوا دەتوانیـن قووڵتـر بیـر بکەینـەوە و باشـتر تێیـان بگەیـن.

## بەدیقەتبوون لە بوارە زانستی و پزیشکییەکاندا

ئەم هۆشیارییەی ئەمڕۆ دەربارەی هۆ و چارەسەری جەڵدەی دڵ هەیە، بە شێوەیەک لە شێوەکان قەرزاربارى لێوردبوونەوە و بەدیقەتبوونی تەنها یەک پزیشکە: د. جەیمس ب. هێریک،یەکەم کەسە کە توانی جەڵدەی دڵ لە نەخۆشێکی زیندوودا دەستنیشان بکات، بەبێ بوونی هۆکارە یاریدەدەرەکانی وەکوو پشکنینی خوێن و هێڵکاریی دڵ. بەم کارەشی، هێریک دەرگای بە ڕووی زانستی دڵناسیدا لە جیهانی مۆدێرندا کردەوە. تا سەردەمی هێریک، جەڵدەی دڵ وەک نەخۆشییەکی دڵ نەدەهاتە هەژماردن. ئەو نیشانەیەی کە ئەمڕۆ ئێمە جەڵدەی دڵی پێ دەناسینەوە، هەتا پێش دۆزینەوەکەی هێریک، وەک نیشانەی"گەدە ئێشانێکی توند" سەیر دەکرا. هێریک ئەوەی سەلماند کە زۆربەی حاڵەتەکانی جەڵدەی دڵ دەگەڕێتەوە بۆ چڕبوونەوە و جۆرێک لە خوێن مەیین لە خوێنهێنەرەکانی دڵدا، کە ئەم حاڵەتەش مەرج نییە هەموو کات کوشندە بێت. (دەبێت ئەوەش بڵێین ئەم پزیشکە بەدیقەتە پێش ئەم دۆزینەوەیەش، خاوەن دۆزینەوەیەکی ترە، کە ناسراوە بە sickle cell anemia، کە جۆرێکە لە نەخۆشییەکانی کەمخوێنی)١.

یەکێکی تر لەو بۆنانەی کە بە هۆی بەدیقەتبوونەوە قۆناغێکی نوێی مێژوویی دەستی پێ کرد، ساڵی ١٩٢٩ بوو. ئەلێکساندەر فلیمینگ بە ڕێکەوت کەڕووی کرد بەسەر ژینگەیەکی بەکتریای ستافیلۆکەوکەسی {جۆرێکی بەکترایە کە بە شێوەی هێشوو هەن}. پاشان سەرنجی دا کە تۆپەڵە بەکتریا ستافیلۆکەوکەسەکە شێتەڵ دەبوونەوە و لەبەریەک هەڵدەوەشان. ئیدی ئەلێکساندەر کەوتە وردبوونەوە و بیرکردنەوە لەو پێکهاتەیەی کە لە کەڕووەکەدا بوو، کە بووە هۆی ئەم شێتەڵکردنەی بەکتریاکان لەبەریەکتری. دەرئەنجام، ئەو پێکهاتەیەی دەستنیشان کرد کە

لەو کاتەوە تا ئێستا ژیانی ملیۆنان مرۆڤی ڕزگار کرد_ پەنسلین. چەند ساڵێک پێشتریش ۱۹۲۲ ئەلێکساندەر دۆزینەوەیەکی گرنگی تری دۆزییەوە. کاتێک سەرقاڵی ئیشکردن بوو لە تاقیگەکەیدا لەسەر دەفرێکی شووشەیی کە بەکتریای تێدا بەخێو دەکرد، دڵۆپێک ئاو لە لووتە تەڕەکەیەوە کەوتە خوارەوە بۆ ناو دەفرەکەی بەردەستی، پاش کەمێک، سەرنجی دا ئەو دڵۆپە ئاوە بەشێک لە بەکتریاکانی لەناو بردووە. دەرئەنجام، پێکهاتەیەکی دۆزییەوە کە لیسۆزیمییە، ئەم ماددەیە لە لیکی دەم و هەروەها لە فرمێسکی چاوانیشدا هەیە. لە ئێستادا هەندێک لە لێکۆڵەران دەڵێن کە ئەو لیسۆزیمییە ئەوەندە ماددەیەکی گرنگە، کە دەتوانێت هۆکارێکی گرنگ بێت بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیی شێرپەنجەدا.

بایۆلۆجیستی فەرەنسی، جاکیۆس مۆناد، کە خاوەن خەڵاتی نۆبڵە، دەڵێت کە دۆزینەوە گرنگەکەی کە بریتییە لە نەخۆشیی خەمۆکیی توند manic depresstion بە هۆی جینیتیکەوە دەگوازرێتەوە، بە هۆی وردبوونەوەی لە هەندێک داتای ئاسایی دۆزیوەتەوە. ئەو ئاوا چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە:

جارێکیان هەستم بە بێزاری کرد لە یەکێک لەو کۆبوونەوانەی کە زووزوو ئامادەی دەبووین. چاوم دەخشاند بەو داتایانەدا کە لە نەخۆشخانەی چارەسەری دەروونییەوە بە دەستم گەیشتبوون، لەپڕێکدا هەستم بە شتێکی گرنگ کرد، ئەویش ئەوە بوو کە ڕێژەی توشبووان بە خەمۆکیی توند لە ژناندا دوو ئەوەندەی ئەو ڕێژەیەیە کە پیاوان تووشی دەبن. بە خۆمم گوت، "ئەمە حەتمەن دەبێت هۆکارێکی جینتیکیی لەپشتەوە بێت. ئەمەش تەنها یەک مانای هەیە؛ جینێک بەرپرسیارە لە گواستنەوەی ئەم نەخۆشییە، کە پەیوەندیی بە ڕەگەزەوە هەیە." ۳

لێرەدا گرنگە سەرنجی شتێک بدەین ئەویش ئەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا

کە مۆناد سەرەتا بە خۆی وت (ئەمە حەتمەن دەبێت هۆکارێکی جینێتیکی لەپشتەوە بێت) بەڵام ئەم بۆچوونەی وەک سەلمێنراوێک وەر نەگرت، بەڵکوو بە شێوەیەکی زانستی سەلماندی ئینجا دڵنیا بوو لە ڕاستیی بۆچوونەکەی. چونکە ئەگەر وای نەکردایە، ڕەنگە بکەوتایەتە هەڵەی هۆ و ئەنجامی ناپەیوەندیدارەوە (بۆ یادهێنانەوە، سەیری چاپتەری دە بکە).

## مەودای کاریگەربوون

دەتوانین ئاماژە بە ژمارەیەکی بەرچاو لەو نموونانە بدەین دەربارەی کاریگەریی بەدیقەتبوون لە بوارە جۆربەجۆرەکان و ژیانی ڕۆژانەشدا. فیزیاناسێکی وەک ڕیچارد فینمان، یەکێکە لەو پیاوانەی کە خاوەن فزولیەتێکی یەکجار زۆر بوو، یان وەک خۆی دەیوت، "پاڵنەری مەتەڵ." هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە ئەم سەرسام بوو بە هەموو جۆرەکانی مەتەڵ و نهێنی، هەر لە بیرکارییەوە بۆ نهێنییەکانی زمانی هێرۆغلیفی، بە جۆرێک، کە کاتێک مەتەڵێکی هەڵدەهێنا، ئیدی خۆی مەتەڵێکی نویی دادەهێنا. کاتێک ئەو لە ڕێی وردبینەکەیەوە لە paramecia ی دەکۆڵییەوە، گەیشتە ئەو دەرئەنجامانەی کە پێچەوانەی تێگەیشتنی باو بوو دەربارەی بابەتەکە. سەرنجی زۆر شتی دەدا، بۆ نموونە لەپێناو تێگەیشتنی زیاتر لە مێروولە، خواردنی بۆ ڕۆ دەکردن و لێیان ورد دەبۆوە.

ڕۆژێکیان فینمان لە کافتریای زانکۆی کۆرنێل دادەنیشێت، دەبینێت قوتابییەک یاری بە قاپێک دەکات و هەڵی دەدات، قاپەکە بە شێوەیەکی ناهاوسەنگ لە هەوادا دەجووڵایەوە، و لەسەر قاپەکەش لۆگۆی زانکۆی کۆرنێلی لەسەر بوو کە ئەویش دەخووڵایەوە. لەم کاتەدا شتێک سەرنجی فینمانی بۆ خۆی ڕاکێشا_لۆگۆکە زۆر خێراتر لە دەفرەکە

دەخوولایەوە. ئەو لە خۆی دەپرسی، ئەم جیاوازییە بۆ؟ ئەمە بووە مەراقێک و لەگەڵیدا کەوتە زۆرانبازی تا دەرئەنجام گەیشتە تیۆرییەک بە ناوی "جووڵەی بەشەکانی گشتێک" کە دەربارەی پەیوەندی گۆشە و خوولانەوە و جووڵەی بینەزمە. کاتێک ئەم شتانەی بە هاوڕێیەکی خۆی دەڵێت، هاوڕێکەی بە بێنرخ و بێبنەما وەسفیان دەکات. بەڵام فێنمان سارد نابێتەوە، قووڵتر بیر لە بابەکە دەکاتەوە، دەرئەنجام، توانیی بە هۆی بیرکردنەوە لە قاپێکی هەڵدراوەوە خەڵاتی نۆبڵ بباتەوە!٤

نموونەی چیرۆکێکی تر کە بەدیقەتبوون دەبێتە هۆی داهێنان، لە شارۆچکەیەکی بچووکی ویلایەتی نیو یۆرک ڕوو دەدات. لەم شارۆچکەیەدا پیاوێکی بەئەزموون بە ناوی ئێریک هۆک دەژی، کە سەرقاڵی کاری فیتەرییە. ڕۆژێکیان سەرقاڵی پاککردنەوەی وەلف دەبێت، بەڵام وەلفەکە لە دەستی دەکەوێتە خوارەوە و دەکەوێتە دەفرێکەوە کە گیراوەی پاککەرەوەی ئاسنی تێدایە لە ژەنگ. ئێریک وەلفەکە بە پارچە دارێک دەر دەهێنێت، بەڵام سەرنج دەدات کە دارەکە هەرچی بۆیاخ و پیسییە لێی بۆتەوە و پاک پاک بۆتەوە. ئەم ڕووداوە فزوڵیەتی ئێریکی زیاد کرد و هانی دا کە گیراوەکە لەسەر کورسییەکی کۆنی تەختە تاقی بکاتەوە، سەرنجی دا، کورسییەکەش بە شێوەیەک پاک پاک بۆوە، وەک ئەوەی ئێستا دروست کرابێت. دوای ئەم دۆزینەوە شادومانکەرە، ئێریک لە ٣٥ ویلایەتی ئەمەریکادا زیاتر لە ٢٠٠ وەرشەی پاککردنەوە و دروستکردنی کەلوپەلی ناوماڵی دانا. هەموو ئەمانە دەرئەنجامی ڕووداوێک بوون، کە ڕەنگە کەسێکی ئاسایی هەر نادیدە و بێنرخ وەری بگرتایە.

لە کۆتاییی ١٩٥٠ کاندا، جۆن. ت. مۆڵۆی، وانەبێژ دەبێت لە قوتابخانەی تایبەتیی کۆنێکتکت. ئەو دەست دەکات بە دیقەتدانی پەیوەندیی دوو

شتی سەیر، ئەوانیش جۆری ئەو پێڵاوانەی مامۆستاکان لەپێی دەکەن و ڕادەی فێربوونی قوتابییەکان. ئەو دیقەتی دا، ئەو مامۆستایانەی کە پێڵاوی قەیتانداریان لەپێ دەکرد، قوتابییەکانیان باشتر فێر دەبوون وەک لەو مامۆستایانەی کە قۆنەرەی هەرزانبەهای شێوە پاپوجیان لەپێ دەکرد. ئەم پەیوەندییە مۆلۆی سەراسیمە کرد و هانی دا چەندین لێکۆڵینەوە بەئەنجام بگەیەنێت. لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا مۆلۆی دەربارەی بۆستنی تاوانبار، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو جلە ڕەنگکاڵانەی کە بۆستن سترانگلرە دەیپۆشین، بە شێوەیەکی بەرچاو ڕۆڵی هەبووە لە بردنەوەی متمانەی ئەو چەندین ژنەی کە بوونە قوربانیی دەستی بۆستن (بۆستن ئەو پیاوە بوو کە تاوانی خنکاندنی چەندان ئافرەتی بەسەردا ساغ بۆوە). هەروەها مۆلۆی گەیشتە ئەو دەرئەنجامەش کە ئەو کەسانەی وەک سکرتێری بەڕێوەبەر کار دەکەن، زووتر و خێراتر بڕیاری ئەو کەسانە جێبەجێ دەکەن کە جلوبەرگ و مامەڵەیان گوزارشت لە جۆرێک لە دەسەڵات دەکات وەک لەوانەی کە جلوبەرگێکی شڕ و بێنەزمیان پۆشیوە. ئەم وردبوونەوە و بەدیقەتبوونەی مۆلۆی، وای لێ کرد کتێبێکی بەناوبانگی وەکوو "جلپۆشین بۆ سەرکەوتن" بنووسێت و سەرمایەیەکی باشیش لە بواری ڕاوێژپێکردندا بەدەست بهێنێت.

بۆ زۆربەمان، بەدیقەتبوون ڕەنگە ئەو دەرئەنجامە کاریگەر و گەورەیەی نەبێت کە بۆ کەسانی وەکوو فینمن و هۆک و مۆلۆی هەیبوو. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا، ئێمە بە هۆی بەدیقەتبوونەوە دەتوانین بە شێوەکی باشتر پەیوەندی ببەستین و زیاتر فێر ببین لەو شتانەی لە دەوروبەرماندا ڕوو دەدەن. لە هەمووشی گرنگتر، ئێمە بە هۆی ئەم چالاکییەوە دەتوانین چالاکتر و ڕەخنەییانەتر بیر بکەینەوە.

## چۆن بتوانیت بەدیدقەتتر بیت

بەدیقەتبوون، واتە توانای بەکارهێنانی پێنج هەستەکەت، بە شێوەیەک، ڕێ لە مێشکت بگرن لە بێئاگاییدا دالْغە بیباتەوە. بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی خەڵکی، کەسانی بەدیقەت نین، چونکە هەموو لە گرنگیدان بە خۆیان نقوم بوون_واتە گیرۆدەبوون بەدەست بیرکردنەوە و هەستەکانیانەوە. کاتێک قسە دەکەن، ئەوەندە گرنگی ئەدەن بەوەی کە دەیڵێن و ئەوەندە چێژ لە دەنگی خۆیان ئەبینن، ئیدی گوێگرەکەی بەردەمیان لەبیر دەچێتەوە. بەڵام بۆ کەسانی ورد و بەدیقەت، بە پێچەوانەوە، فێر بوون کە چۆن ئاگاداری ئەو شتانە بن کە لە چواردەوریاندا ڕوو دەدات، هەر بۆیە هەستەکانیان تەنها لە گرنگیدان بە خۆیان سنووردار ناکەن.

ڕێگەیەکی باش بۆ ئەوەی ببیتە کەسێکی بەدیقەت ئەوەیە کە ڕاهێنان لەسەر هەستەکانت بکەیت بە شێوەیەک، کە بەئاگاییەکی زۆرترەوە لە شت و کەسەکانی دەوروبەرت ورد ببیتەوە. لەو شوێنەی کە ئیشی لێ دەکەیت یان ئەو شوێنەی کە لێی دەژیت، ئەم جارە کە چوویتە ئەوێ، سەرنجێکی زیاتر بخە سەر ئەو شتانەی کە ڕۆژانە فەرامۆشت کردوون: کەلوپەلەکانی ژوورەکە، چۆنێتیی ڕێکخستنی قەنەفەکان، کەسەکان لە کاتی قسەکردندا، چۆنێتیی وەستانی کەسەکان لە نزیک یەکترییەوە، کاردانەوە بچووکەکانی کەسەکان لە قسەکردندا. ئەمجارە کە چوویت بۆ هۆڵی سینەما یان بۆ کۆگایەک هەوڵ بدە هەست بەو شتانە بکەیت کە بەردەوام بێ گرنگیدان فەرامۆشت کردوون. کام خانووانە دیزاینێکی قەشەنگیان هەیە؟ چەند کەس سڵاویان لێ کردوویت یان بەدەمتەوە پێدەکەنن. ئەو کەسانەی کە بەلایاندا تێدەپەڕین، سەرقاڵی چین؟ ئایا خۆشحاڵن بەو شتەی پێوەی سەرقاڵن؟ گوێبیستی چەند دەنگی جیاواز

دەبیت؟ کام دەنگ لە هەموویان زەقترە؟ دەنگەکان خۆشن یان بێزارکەرن؟ چەند ستایلی جیاواز دەتوانیت دیقەت بەیت لەو کەسانەدا کە بە لاتدا تێدەپەڕن؟

کاتێک کە گۆڤارێک یان ڕۆژنامەیەک دەخوێنیتەوە، یان کە تەماشای تەلەڤیزیۆن دەکەیت، دیقەت لە شتە سەرنجڕاکێش و گرنگەکان بدە. دیقەت لە پەیوەندیی نێوان دێڕەکان بدە. وتاری گەردووناسێک دەربارەی شوێنی گەلەهەسارەیەکی نوێ، ڕەنگە بە شێوەیەک لە شێوەکان ئاماژە بە گرنگیی تەرکیز و دیسپلینە ئەقڵییەکان بدات. بەرنامەیەکی تەلەڤیزیۆنی دەربارەی بێنازکردن و هەراسانکردنی ڕەگەزی منداڵان، ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی کە خوێندنەوەیەکی تر بۆ ئەو دیمەنانە بکرێت کە هۆلیۆد بە ناوی ڕۆمانسیەت دەربارەی هاوسەرگیری و جیابوونەوە دەیخاتە بازارەوە.

## وەستان لەسەر وردبوونەوەکان

بەدیقەتبوون، هەندێک کات سەر دەکێشێت بۆ بیرکردنەوەی مانادار. بەڵام تۆ دەتوانیت لە ڕووی نۆعیەوە باشبوونی ئەو بیرکردنەوانە زیاد بکەیت لە ڕێی وەستان لەسەر ئەو شتە بچووکانەوە کە بە هۆی بەدیقەتبوونەوە درکیان پێ دەکەیت. باشترین ڕێگەش بۆ ئەم کارە بریتییە لە تەرخانکردنی کاتێک بۆ ئەم چالاکییە_ بەیانیان زوو، یان ئێواران، بەڵام باشترە ماندوو نەبیت. کاتێکی زۆریش ناوێت، ۱۰ بۆ ۱۵ خولەک بەسە. بەڵام پێویستە لەو ماوەیەدا هیچ شتێک دات نەبڕێت لەو چالاکییە. بەو شتانەیا بچۆرەوە کە بینیوتن یان بیستووتن لە ماوە ۲٤ کاژێری ڕابردوودا. لە خۆت بپرسە، مانایان هەیە؟ ئایا ئەمانە پەیوەندییان هەیە بە شتێک لە خۆیان گرنگترەوە؟ چۆن بتوانم توانای بەدیقەتبوون و وردبینیی خۆم زیاد بکەم لە پەیوەندیدا بەو شتانەوە؟

بۆ نموونـە با بڵێین تۆ دوێنـێ بەیانـی ئـەم پەنـدەت هاتۆتـە بەرگـوێ: "قانعبـوون بـە شـتی کـەم، قورسـە، قانعبـوون بـە شـتی زۆر، قورسـتر" وەسـتان و بیرکردنـەوە لـەم پەنـدە، ڕەنگـە بتگەیەنێتـە دەرئەنجامـی ئـەوەی کـە لـە کولتـووری زاڵدا بەختـەوەری دەبەسـترێتەوە بـە شـتی ماددییـەوە_ سـەیارەی نـوێ، مۆدێلـی نوێی جلوبـەرگ، هتد_ هـەر لێرەوە ڕەنگـە بگەیتـە ئەو دەرئەنجامـەی کە بەسـتنەوەی زۆربوونـی ڕادەی بەختـەوەری، هەمیشـە بە زۆرتربوونـی شـتی ماددییـەوە، تێگەیشـتنێکی هەڵەیـە.

هەروەهـا ئـەم نموونەیـەش، دادگای میشـیگان بڕیـاری دا کـە کوشـتنی ئاوڵـەوە {واتـە قۆناغـە زۆر سـەرەتاییەکانی دروسـتبوونی منـداڵ لـە منداڵدانـی دایکیدا} دەبێت وەک کوشـتنی مرۆڤ بـە دەسـتی ئەنقەسـت، لێک بدرێتـەوە. ئـەم بڕیـارەش دوای ڕووداوێـک بـوو، کـە تێیدا ژنێکـی دووگیان بە هـۆی خـۆلادان لـە سـەگێکی نەبەسـتراوەوە وەر گـەڕا و لـە ئەنجامـدا خۆیـی و ئاوڵەمەکـەی گیانیـان لەدەسـت دا، پیـاوی ژنەکـەش شـکاتی لـە خـاوەن سـەگەکە کـرد. (ئـەم بڕیـارەی دادگا، پێچەوانـەی بڕیارەکانـی پێشـووی بـوو، چونکـە پێشـتر کوشـتنی ئاوڵەمـە بـە تـاوان هەژمـار نەدەکـرا)٥ وەسـتان و بیرکردنـەوەت لـەم حاڵەتـە، ڕەنگـە سـەرنجت بگوازێتـەوە بۆ سـەر کێشـەکانی لەباربـردن.

# ڕاهێنانەکان

١. وەک لە پێشتریش باس کرا، شوێنێک هەڵبژێرە بۆ دیقەتدان لەوانی تر، بۆ نموونە، کافتریا یان مەیدانی زانکۆ. بڕۆ و لەوێ لانی کەم نیو کاژێرێک بمێنەرەوە. ببینە و دیقەت بدە. سەرنجی شتە بچووکەکان بدە، ئەو شتانەی کە ڕۆژانە نادیدە فەرامۆشیان دەکەیت. ئەو شتە نوێیانەی بە هۆی ئەم چالاکییەوە درکیان پێ دەکەیت، لە دەفتەرێکی تێبینیدا تۆماریان بکە.

٢. لە مامۆستایەکی قۆناغەکانی پێشووتری خوێندنت داوای یارمەتی بکە بۆ ئەوەی لە یەکێک لە وانەکانیدا ئامادە بیت. بڕۆ بۆ پۆلەکە و بەوردی دیقەتی کاردانەوەی قوتابییەکان بدە، بۆ نموونە ئەو ئاماژە ورد و شاراوانەی کە بێئاگا و بەئاگا دەینێرن. تێبینییەکانت تۆمار بکە.

٣. چەندێک دەتوانیت خۆت نارێکوپێک و پەڕپوت پیشان بدە. جلێکی کۆنی بێ تەنسیق بپۆشە. قژت بئاڵۆسکێنە و بە دوو دەستی پیسەوە خۆت بکە بە سۆپەرمارکێتێکدا، کابرای ژمێریار داگرەوە بە پرسیار. سەرنجی کاردانەوەی کڕیارەکانی تر و کابراش بدە، پاشان ڕۆژی دواتر بەتەواوی کەشخەیەتییەوە بڕۆرەوە و دیقەتی کاردانەوەی کابرا و کڕیارەکان بدە. پاشان دوو کاردانەوە جیاوازەکە بەراورد بکە.

٤. بیر بکەرەوە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری قوتابی و مامۆستا و کارمەندانی ئەو شوێنەی کە لێی دەخوێنیت. دیقەتی گۆڕانی ڕەفتارەکانیان

بدە لە شوێنە جیاوازجیاوازەکانی کۆلێژ یان خوێندنگەدا، بۆ نموونە، سەرنجی ڕادەی بەڕێزی و بێڕیزییان بدە.

٥. زۆر کەس بە شێوەیەک بوونەتە نێچیری ڕیکلامەکان، کە بە هیچ شێوەیەک ڕەخنەییانە بیر ناکەنەوە. بە ئاگاییەکی تەواوەوە دیقەتی ئەو ڕیکلامە بدە کە لە ڕۆژێکی ئاساییدا لە ڕێی تەلەڤیزیۆنەوە یان ڕۆژنامەوە یان ڕادیۆوە وەریان دەگریت. بزانە چ هۆکاریک بەکار هاتووە تا متمانەی تۆ بۆ بابەتی ڕیکلامبۆکراوەکە بەدەست بهێنێت، هەروەها بزانە تا چ ڕادەیەک زانیاری لەسەر بابەتەکە لە ڕیکلامەکەدا خراوەتە ڕوو. سەرنجەکان تۆمار بکە.

٦. لەسەر هەریەکە لەم وتانەی خوارەوە هەڵوێستە بکە:

- ئەگەر خەمی خۆم نەخۆم، کێ خەمم دەخوات؟ بەلام ئەگەر من بە تەنها خەمی خۆم بخۆم، کەواتە من چیم؟ ڕابی هیلێل
- گەشتکردن پیاوی ژیر ژیرتر دەکات، بەڵام پیاوی گەمژە گەمژەتر دەکات. تۆماس فولەر
- دۆزینەوەی بەختەوەری لەناو خۆماندا ئاسان نییە، بەلام دۆزینەوەی بەختەوەری لە دەرەوەی خۆماندا کارێکی نەکردەیە. ئاگنس ڕیپلەر
- تۆ هەرگیز ناتوانیت خودات خۆش بوێت ئەگەر سەرەتا دراوسێکەتت خۆش نەوێت. نەناسراوێک
- کەسی چاوچنۆک و تەماحکار بەردەوام برسین. هۆرەیس
- ئەوەی خۆی دەدزێتەوە، بەردەوام هەڵە دەکات. پەندیکی ئیسپا نییە
- کچەکە خۆی نازانێت سەما بکات، کەچی گلەیی لە میوزیکژەنەکان دەکات. پەندێکی جوولەکەیە

٧. هەریەک لەم ئارگۆمێنتانەی خوارەوە هەڵبسەنگێنە، بە پشتبەستن بەو شێوازەی کە لە چاپتەری حەوتدا فێری بوویت. ئاگادار بە نەکەویتە ئەو هەڵانەی بیرکردنەوەوە کە لە چاپتەری سیازدەدا ئاماژەیان پێ کرا.

a. باگراوندی کێشەکە: بە هۆی ئەو کاریگەرییە خراپەی کە پۆرنۆگرافی {ڕاگەیاندنی سێکسی} لەسەر کەسایەتی منداڵ هەیەتی، زۆر کەس لۆبیان دروست کردووە لەپێناو قەدەغەکردنی فرۆشتنی بابەتی سێکسی بە مێردمندالانی خوار هەژدە سالان. بەلام ئەوانەی کە دژایەتی ئەم داوایە دەکەن، ئەم ئارگۆمێنتەیان هەیە:

ئارگۆمێنتەکە: هۆشیارترین گەنجی ئەم سەدەیە، ئەوانەی ئێستان. ئەوان باشتر لە هەرکەسێکی تر تەنانەت لە دایک و باوکیشیان دەتوانن بڕیار بدەن لەسەر ئەو کتێبە یان ڕۆژنامەیەی کە دەیخوێننەوە. قەدەغەکردنی فرۆشتنی پۆرنۆگرافی بە کەسانی خوار هەژدە سالان، پێشێلکردنی مافی ئازادی بیرکردنەوەیە، بۆیە دەبێت ئەو قەدەغەکردنە جێبەجێ نەکرێت.

b. باگراوەندی کێشەکە: ژن و پیاوێکی نەزۆک گرێبەستێک لەگەڵ ژنێکی تردا دەبەستن تا منداڵێکیان بۆ بەرهەم بهێنێت، بەلام ئەم جۆرە گرێبەستانە جێی پرسیار و مشتومڕە. بۆ نموونە، چی ڕوو ئەدا ئەگەر لە ناوەڕاستی کاتی گرێبەستەکەدا ژنەکە پەشیمان بۆوە و پارەکەی بۆ گێڕانەوە و بڕیاری دا منداڵەکە بۆ خۆی هەڵبگرێتەوە؟ ئایا دەبێت ناچار بکرێت و ملکەچی گرێبەستەکە بێت؟ ئەوانەی کە دەڵێن نەخێر، بەم شێوەیە ڕاکەی خۆیان پشتراست دەکەنەوە:

ئارگۆمێنتەکە: لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گرێبەستەکان دەبێت جێبەجێ بکرێن، بەلام ئەم حاڵەتە جیاواز و ناوازەیە. دروستکردن و پەروەردەکردنی ڕۆحێکی نوێ لە سکی دایکدا، بەهێزترین پەیمان و گرێبەست دروست دەکات لە نێوان دایک و منداڵەکەدا. هەر بۆیە نابێت

هیچ جۆرە گرێبەستێک یان یاسایەک ئەو پەیمانە مرۆڤایەتییە لەناو بەرێت.

٨ تواناى بیرکردنەوەى رەخنەییانەى خۆت لەسەر هەریەک لەم کێشانەى خوارەوە تاقى بکەرەوە. بیر لەو ئەزموونانەى خۆت بکەرەوە کە بە هۆى کێشەکانەوە بەبیرت دێنەوە. (ئەگەر ئەزموونەکانت زۆر سنووردار بوون بیر لە کەسەکانى نزیکت بکەرەوە).

a. لەم ساڵانەى دواییدا دەیان کتێب و وتار بڵاو بوونەوە دەربارەى مەترسییەکانى "ئالودەبوون بە کارکردنەوە". بەڵام بە دەگمەن نەبێت، وتارێک نەنووسراوە دەربارەى مەترسییەکانى تەمەڵى درێژخایەن. بە راى تۆ، کام لەم دوو حاڵەتە بڵاوتر و مەترسیدارترن لەم سەردەمەدا؟

b. " بردنەوە گرنگ نییە، بەڵکوو گرنگترین شتە". ئایا ئەمە بیرکردنەوەیەکى باشە تا وەرزشەوانەکانى لەسەر پەروەردە بکەیت؟ ئایا جگە لە وەرزش، بۆ کێبڕکێکانى تریش دروستە یان نا؟

c. هەندێک پێیان وایە کە دەبێت باوان بە یاسا بەرپرسیارى یاسایى و دارایى منداڵانى سەرو شازدە ساڵیان بخرێتە ئەستۆ. ئایا ئەمە دیدێکى مەعقولە؟

# چاپتەری شانزەیەم

## هەڵبژاردنی بابەت/کێشە

لە سیاقی بیرکردنەوەی ڕەخنەییدا، وشەی "کێشە" {یان بابەت}، هەموو ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کە جێی ناکۆکی و مشتومڕ بن؛ بە مانایەکی تر، تێرمی کێشە، هاوواتای تێرمی ناکۆکییە controversy. باوترین و دیارترین کێشەکان ئەوانەن کە ڕۆژانە لە هەواڵەکانەوە دەیانبینین، بۆ نموونە کێشە ئەخلاقییەکان، یاساییەکان و سیاسییەکان: ئایا منداڵ-لەباربردن، تاوانی کوشتنە؟ ئایا ئەو نەوجەوانانەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن، پێویستە وەک کەسی گەورە سزا بدرێن؟ ئایا ئەو پارەیەی کە لە بانگەشەی هەڵبژاردندا خەرج دەکرێت، ڕۆڵێکی فاسدکەری نییە لە پرۆسەی هەڵبژاردندا؟ چەندان بابەت و کێشەی تریش هەن کە جێی ناکۆکی و مشتومڕن، لەوانە: جووتیارەکان بوون بە دوو بەشەوە، لەسەر بەکارهێنانی ماددە کیمیاییە مێرووکوژەکان و ئەو کاریگەرییە نەرێنییەی لەسەر سروشت جێی دەهێڵێت. شیکاروانانی بواری وەبەرهێنان، ڕای جیاوازیان هەیە لەوەی چەندێک، گەر هەر بڕوایشیان پێی بێت، لە داهاتی وەبەرهێنراوی کەسێکی مامناوەند بخرێتە پشکەکانی بواری تەکنەلۆژیاوە (بۆ قازانجکردن). شارەزایانی بواری پەروەردە، ناکۆکن لەسەر لایەنە باش و خراپەکانی مافی وانەوتنەوەی هەمیشەیی tenure.

نووسین و قسەکردن لەسەر کێشە باوەکان هێندە زۆرن کە هەندێ

کات دەگەنە ئاستی زۆر سادە و بێقولایی. (لە پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە چۆن رایەکی وەک ئەوەی کە هەموو کەس "ئازادە" لەوەی چۆن بیر دەکاتەوە، وای لە زۆر کەس کردووە قسە لەسەر زۆر شت بکەن بێ ئەوەی شارەزاییەکیشیان هەبێت دەربارەی بابەتی قسەلەسەرکراو) بەلام لەبەر ئەوەی بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان دەزانن کە هەلبژاردنی کێشەیەک بۆ بیرلێکردنەوە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە کۆی پرۆسەی بیرکردنەوەکەدا، بۆیە بە حەزەرەوە بابەتەکان هەڵدەبژێرن و ماف بە خۆیان نادەن لە هەموو کاسێکدا کەوچک بن.

## یاسای بنەڕەتی: هەتا سنووردارتر باشتر

ڕەنگە ئەم یاسایەت بەلاوە سەیر بێت، بەتایبەت ئەگەر لەوانە بێت کە بەردەوام بابەتی فراوان هەڵدەبژێرن بۆ وتار و ڕاپۆرتەکانیان. زۆر قوتابی لە ترسی ئەوەی نەتوانن تا ژمارەی دیاریکراو بنووسێت، دەکەونە ئەم هەڵەیەوە. ئەوان بەم جۆرە بیر دەکەنەوە: "ئەگەر من بابەتێکی دیاریکراو و سنووردار هەلبژێرم، ئەوا هەر زوو وشەم لێ دەبڕێت و ناتوانم بنووسم، بۆ نموونە بابەتەکانی وەکوو چانسی یەکەمبوونی تیپی Tampa Bay Buccaneers لە پالەوانێتیی ئەمساڵدا، یان دواهەمین لێکۆڵینەوە دەربارەی نەخۆشیی بەرزی پەستانی خوێن، یان ڕۆڵی شەڕی ساراتۆگا لە شۆڕشدا {ساراتۆگا، ئەو شۆڕشانە دەگرێتەوە کە ئەمەریکا لەپێناو سەربەخۆییی خۆی لەدەست بەریتانیا هەڵی گیرساندوون} هەر بۆیە بابەتێکی فراوان هەڵبژێرم باشترە، وەکوو وەرزش، نەخۆشی، یان جەنگ و خۆم لەم کێشەیە ڕزگار دەکەم."

خۆرزگارکردن لەم کێشەیە بەو ستراتیژەی سەرەوە، هیچ نییە جگە لە خەیاڵپڵاوی. ئەگەر بتەوێت حەق بدەیت بە بابەتێکی فراوان لە نووسینێکی ٥٠٠ وشەیدا، یان تەنانەت بە چەند هەزار وشەیەکیش، ئەوا

وەکوو ئەوە وایە هەوڵ بدەیت جلیکانییەک ئاو بکەیتە دەفریکەوە کە نیو لیتر ئاو دەگریت. تەنانەت ئەگەر نووسینەکە وەسفیکی سادەش بیت، سەر ناگریت، ئەگەر بابەتەکە فراوان بیت. ئەمە چ جای ئەوەی بتەویت نووسینیکی شیکاری بنووسیت لەسەر بابەتیکی فرەڕەهەند. لە حاڵەتیکی ئاواشدا، ئەوانەی کە نووسینەکەت دەخوێننەوە، دەیان و چەندان هۆی مەعقولیان هەیە تا لەگەڵت ناکۆک بن و ڕەخنەت بکەن. لەبەر ئەوە، خۆدزینەوە لە بەرپرسیاریتیی نووسین بە شیوەیەکی ماندار، بەوە چارە نابیت بابەتیکی فراوان هەڵبژیریت.

تاکە ڕیگەچارەی مەعقول بریتییە لە سنووردارکردنی کیشەکە. بۆ نموونە، ئەگەر کیشەکە پێنج یان دە ڕەهەندی گرنگی هەبیت، تۆ تەنها دانەیەک یان دوو ڕەهەندی هەڵبژیرە. چونکە کە وات کرد، ئەوا دەتوانیت حەقی تەواو بدەیت بە کیشەکە و لایەنە بچووکەکانیشی بخەیتە ڕوو. هەر ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەتا سنووردارتر چاکتر، واتە قووڵبوونەوە نەک سادە لەوحی، شاقووڵی نەک ئاسۆیی.

## چۆنێتیی بەرتەسککردنەوە کێشەکە/بابەتەکە

ئەم تێبینییانەی خوارەوە هاوکاریت دەکەن تا بتوانیت بەرفراوانیی کیشەیەک سنوردار بکەیت و تەنها سەرنج بخەیتە سەر ئەو ڕەهەندەی کە بەلاتەوە گرنگە و لە سنووری توانا و کاتی تودایە:

١. درکت بە چەند ڕەهەند کرد، ڕیزیان بکە: لە حاڵەتی کیشە زۆر گرنگ و جیناکۆکەکاندا، ڕەنگە تۆ زیاتر لە دەیان ڕەهەند دەستنیشان بکەیت.

٢. ئەو ڕەهەندانە دەستنیشان بکە کە دەتەویت لەسەریان هەڵویستە بکەیت: بەدەگمەن نەبیت، تۆ ناتوانیت حەقی تەواو بە هەموو لایەنە

جۆربەجۆرەکانــی کێشــەیەک بدەیــت. هــەر بۆیــە پێویســتە چەنــد لایەنێــک هەڵبژێریت، بـەلام نابێت تەنها هۆی دەستنیشانکردنەکە حەزی خۆت بێت، بەڵکوو دەبێت هـۆکاری لێکۆڵینەوەکـە و کات و توانـای خۆشـت لەبەرچـاو بگریـت.

٣. لــە چەنــد پرســیارێکی ڕوون و دیاریکـراودا، ئـەو ڕەهەندانـە دابڕێـژەرەوە کـە هەڵـت بـژاردوون: سـوودی ئـەم پرسـیارانە ئەوەیـە کـە ڕێگرن لەوەی سـەرنجت پـەرش ببێتـەوە و لەسـەر ئـەو لایەنانە لای بدەیت کـە بڕیـارت لەسـەر داون. پرسـیارەکان بنووسـەرەوە، پاشـان لـە مـەودای لێکۆڵینەوەکەتدا جاروبار وەرەوە سـەریان تـا دڵنیا بیت کە لەسـەر هێڵێکی ڕاسـت و دروسـت و بەبەرهـەم ئیشـەکەت بەردەوامـە.

با ئەم چەند تێبینییانە لەسەر چەند کەیسێکی عەمەلی تاقی بکەینەوە:

## کەیسی پۆرنۆگرافی

تێرمـی *پۆرنۆگرافی* لە زمانـی یۆنانییـەوە وەر گیراوە کە بە مانای "نووسین لەســەر لەشفرۆشــی" دێـت. بـەلام بەکارهێنانـە مۆدێرنەکـەی وشـەکە، تەنهـا لەشفرۆشــی ناگرێتــەوە. پۆرنۆگرافــی هــەر نووســینێک، وێنەیــەک، گرتەیەکـی ڤیدیۆیـی دەگرێتـەوە کـە سێکسـییانە و وروژێنەرانـە دەخرێتـە ڕوو، هەرچەنـدە جگـە لـە ڕەهەنـدی سێکسـی، لایەنـی توندوتیـژی و هێـز دەخرێتـە ڕوو، بـەلام بـە شـێوەیەکی کاڵتـر. دوژمنەکانـی پۆرنۆگرافی زۆرن، لــە سیاســییە کۆنســێرڤەتیڤەکانەوە بــۆ گروپــە دینییــەکان، لەوانیشــەوە بــۆ فێمینیســتەکان. پۆرنۆگرافـی هەمـوو کات بابەتێکـی گـەرم بـووە، بـەلام لـەم دواییـەدا توندتـر و گـەرمتر قسـەی لەسـەر دەکرێـت. هۆکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە لـە ئێسـتادا زیاتـر لـە هـەر کاتێکـی تـر لـە بڵاوکراوەکان و لـە تەلەڤیزیـۆن و تـۆڕی ئینتەرنێتـدا بابـەت و مـاددەی سێکسـی و توندوتیـژی بـڵاو دەبنـەوە. بـەلام پرسـیاری جەوهـەری و سـێنتراڵ لـە کـۆن و لـە

ئێستاشـدا هـەر یەکـە و نەگـۆڕاوە، ئەویـش ئەوەیـە کـە ئایـا *پۆرنۆگرافـی زیانبەخشـە یان نا؟*

| ڕەهەندەکان | پرسیارەکان |
| --- | --- |
| وەرگرەکان | ئایا وەرگرەکانی پۆرنۆگرافی کێن؟ مێن یان نێرن؟ منداڵانن یان گەورەکان؟ |
| بابەتەکان-جۆرەکان | ئایا کام جۆر لە سێکس لە کتێب و گۆڤار و فیلمە پۆرنۆگرافییەکاندا دەخرێتە ڕوو؟ سێکسی کەسانی سەڵتن یان ئەوانەی هاوسەرگیرییان کردووە؟ ئایا دوو ڕەگەزییە یان هاوڕەگەزی؟ ئایا سێکسی ئارەزوومەندانەیە یان بەزۆر؟ کەسی گەورە بۆ گەورە؟ یان گەورە بۆ منداڵ؟ یان سێکسی مرۆڤ و ئاژەڵە؟ ئایا ئەو پەیام و مانایە چییە کە ئەو جۆرە لە سێکس دەیەوێت بیگەیەنێت؟ |
| دارایی | ئایا ئەکتەرە بەشداربووەکانی فیلمە سێکسییەکان پارە وەر دەگرن؟ ئەگەر وایە، ئایا ئەمە دەچێتە خانەی لەشفرۆشییەوە؟ |
| ئەکتەرەکان | ئایا کارامەیی و بەهرەی نواندن پێویستن بۆ ئەکتەرەکانی ئەم بوارە؟ ئایا ئەکتەرەکان وەک پیشەیەکی درێژخایەن لەم بوارەدا کار دەکەن، یان تەنها وەک شتێکی کاتی و تێپەڕ؟ ئایا دوای ماوەیەک لە کارکردن بەشانازییەوە یان بە شەرم و نەنگییەوە ئاوڕ لە ڕابردوویان دەدەنەوە؟ |

| | |
|---|---|
| کاریگەرە زیانبەخشە مەزەندەکراوەکان | ئایا پۆرنۆگرافی چ جۆرە تێگەیشتنێک لەمەڕ خۆشەویستی، هاوسەرگیری و دەرگیربوونەوە سەررێ دەخات؟ ئایا وەک هەندێک دەڵێن، بە بەشەهوەتیکردنی منداڵان هەڵدەستێت؟ ئایا هەڵدەستێ بە سروشتیکردن و بڵاوکردنەوەی چەوساندنەوەی ژنان؟ ئایا وا لە پیاوان دەکات چیدی ژنان وەک مرۆڤ نەبینن و بەڵکوو وەک ئامراز بۆ لەزەتی خۆیان لێیان بڕوانن؟ ئایا بۆ وەرگرەکانی، کاریگەرییەکی دروستکەر یان ڕووخێنەری هەیە لە ڕووی بەها ئەخلاقییە بەرزەکانەوە؟ |
| **ڕۆڵی پۆرنۆگرافی لە گواستنەوەی نەخۆشییە-سێکس-هۆکارەکانەوە** | ئایا پۆرنۆگرافی ڕۆڵێکی ئەرێنی یاخود نەرێنی هەیە لەو هەوڵانەدا کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشییە-سێکس-هۆکارەکانەوە دەدرێت، بۆ نموونە ئایدز؟ |
| ئازادیی ڕادەربڕین | ئایا پۆرنۆگرافی دەچێتە خانەی ئازادیی ڕادەربڕینەوە؟ |

## کەیسی یاریی بۆکسێن

کتێبی ڕیکۆردە جیهانییەکان، ناوی ٣٣٧ یاریزانی بۆکسێنی تۆمار کردووە کە لە یارییە کۆتاییەکاندا بە هۆی برینەکانیانەوە مردوون، تەنها لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە. لەم ژمارەیەشدا، ١٢٠ یاریزانیان ئەمەریکی بوون. لەگەڵ مردنی بۆکسێنی کۆری "دەک دوو کیم" بە هۆی بۆکسە یەک لەدوای یەکەکانی "ڕەی"یەوە کە ناسراوە بە "بووم بووم" بۆ جارێکی تر ڕای گشتی لەسەر کێشەکە جووڵا و ئەم پرسیارە قوت کرایەوە: *ئایا پێویستە بۆکسێن قەدەغە بکرێت؟* وەک زۆر کێشەی تر،

ئەم بابەتەش چەندان ڕەهەندی هەیە، لە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

| ڕەهەندەکان | پرسیارەکان |
| --- | --- |
| مافی پەیداکردنی قوتی ژیان | ئایا قەدەغەکردنی وەرزشەکە، یەکسانە بە زەوتکردنی مافی نانپەیداکردنی وەرزشەوانەکە؟ |
| بۆکسێن و تەندروستیی ئەقڵی | ئایا ئەو توندوتیژییەی لە یاریی بۆکسێنەوە دەبینرێت، دەربڕێکی دروستی ڕۆحی جەنگاندنە چ بۆ بینەرەکان چ بۆ وەرزشەوانەکان خۆیان؟ |
| بەناوبانگی بۆکسێن | تا چ ڕادەیەک ئەو ئارگۆمێنتە دروستە کە داوا دەکات بۆکسێن قەدەغە نەکرێت تەنها لەبەر ئەوەی کە بۆکسێن چ لە ڕابردوو چ لە ئێستادا وەرزشێکی پڕ هەوادار بوو؟ |
| پۆلێنکردنی بۆکسێن وەک وەرزش | ئایا ناونانی بۆکسێن وەک جۆرێک لە وەرزش، ناونانێکی دروستە؟ ئایا ئەو توندوتیژی و مردنەی لە بۆکسێندا هەیە، بەسە بۆ لە وەرزشخستنی بۆکسێن وەک جۆرێک لە وەرزش؟ |
| دوورخستنەوەی لایەنە مەترسیدارەکانی وەرزشەکە | ئایا ڕێی تێدەچێ بە دەستکاریکردن و گۆڕینی یاسا و ڕێنماییەکانی یارییەکە ڕێگری بکرێت لە ڕەهەندی ترسناکی یارییەکە، یان لانی کەم، کەم بکرێتەوە؟ |

کاریگەریی لێدانەکان

ئایا بە دیاریکراوی لێدانەکان چ کاریگەرییەکی لەسەر یاریزانەکان هەیە، بەتایبەتی لەسەر مێشکیان؟ کاریگەریی کۆی زەربەکان لە دە یان پازدە گێمدا لەسەر وەرزشەوانەکە چییە؟ ئەی بەدرێژاییی ژیانی وەرزشیی چ کاریگەرییەکی دەبێت؟

## کەیسی تاوانی نەوجەوانی

تاوانی نەوجەوانان لەم دواییانەدا لە دادگاکاندا بە شێوەیەکی تایبەت یەکلایی دەکرێتەوە. چونکە ئامانجی سەرەکیی دادگا بریتی نییە لە سزادان بەقەد ئەوەی چاکسازییە لە نەوجەوانە تاوانبارەکاندا. هەر بۆیە لەبری ئەوەی هەڵەکان بە تاوان وەسف کرێن، پێیان دەوترێت "لادانی نەوجەوانی"، وە پرۆسەی دادگاییکردنەکەش بە قسەکردن و گوێگرتن وەسف دەکرا نەوەک دادگاییکردن، بڕیاری دادگاکانیش وەک کەیسەکانی تر نەدەخرایە بەردەم ڕای گشتی، لەبری ئەشکەنجەدانیش، لادەرەکان وانەیان وەر دەگرت. بەڵام ئێستا خەڵکی ناڕازین بەم شێوازە نەرمونیانەی دادگاکان لەگەڵ نەوجەوانە کەتنکەرەکاندا. هەر بۆیە داوا دەکەن بەبێ لەبەرچاوگرتنی تەمەن، تاوانکار سزای قورسی خۆی وەر گرێت. جەوهەری کێشەکەش لە دەوری ئەم پرسیارە دەخولێتەوە: *ئایا نەوجەوانە کەتنکەرەکان دەبێت وەک تاوانبارە پێگەیشتووەکان سزا بدرێن؟* بە هەرحاڵ، وەک هەریەک لەو کەیسانەی تر کە لە پێشتردا ئاماژەمان پێ دان، ئەم کەیسەش فرەڕەهەندە و وا لە خوارەوە دەستوپەنجەیان لەگەڵدا نەرم دەکەین:

| ڕەهەندەکان | پرسیارەکان |
| --- | --- |
| **هۆکارەکانی تاوانی نەوجەوانەکان** | ئایا بەرپرسیاری یەکەم و کۆتاییی لادانەکانی نەوجەوانەکان تەنها هەر خۆیانن؟ ئایا باوان و توێژەکانی تری کۆمەڵگە (بۆ نموونە بەرهەمهێنەرەکانی فیلمی توندوتیژی) بەرپرسیار نین؟ ئەگەر بەرپرسیارن، ئایا دەبێت یاسا توندتر بێت لەگەڵیان؟ بە چ شێوازێک؟ |
| **تەمەنی چوونە ژێر باری بەرپرسیارێتییەوە** | ئایا دادپەروەرانەیە کەسێک کە هێشتا ئەوەندە تەمەنی نییە تا لە دەرئەنجامی ئەخلاقی و یاساییی ڕەفتارەکانی خۆی بگات و کەچی بەرپرسیار بکرێت؟ ئایا لە چ تەمەنێکدا کەسێک دەگاتە ئەو ڕادەیە لە هۆشیاری؟ |
| **بڵاوکردنەوەی تاوانەکانی نەوجەوانی و کاریگەرییەکانی** | ئایا ئەگەر تاوانەکان بخرێنە بەردەم ڕای گشتی، کەمتر دەبنەوە؟ ئایا ئەمە دەبێتە هۆی خێراکردن و باشترکردنی پرۆسەی چاکسازی؟ |
| **کاریگەرییەکانی زیندانیکردنی نەوجەوانان** | ئایا زیندانیکردن چ کاریگەرییەک لەسەر نەوجەوانان جێ دەهێڵێت؟ ئەی چ کاریگەرییەکی لەسەر مێردمنداڵان دەبێت؟ |

| | |
|---|---|
| جۆری تاوانەکان | ئایا دەبێت هەموو تاوانە نەوجەوانییەکان وەک یەک مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت؟ ئەی ئایا پەیوەندیی تەمەن و جۆری تاوانەکە دەبێت لەبەرچاو بگیرێت؟ بۆ نموونە، لە دزین و ماڵبڕیندا تەمەن دەبێت لەبەرچاو بگیرێت، بەڵام لە تاوانەکانی وەکوو کوشتن و لاقەکردندا تەمەن لەبەرچاو نەگیرێت و وەک کەسی پێگەیشتوو سزا بدرێت. |
| دووبارەکردنەوەی تاوانەکان | ئایا ئەو نەوجەوانەی چەندین جار تاوانی ئەنجام داوە، ئەوەشی کە یەکەم جاریەتی دەبێت بە هەمان شێوە سزا بدرێن یان بە شێوەیەکی جیاواز؟ |
| گرتووخانە | ئەگەر هات و نەوجەوانێک لەسەر تاوانێک، بۆ نموونە، لەسەر ئەنجامدانی توندوتیژی نێردرا بۆ گرتووخانە، ئایا دەبێت ببرێت بۆ هەمان ئەو گرتووخانانەی کە تاوانبارە پێگەیشتووەکانی تێدا بەند کراوە، یان بۆ شوێنێکی تایبەت؟ |

لە کاتێکدا ئەگەر پەیڕەویت لەو شێوازەی سەرەوە کرد و هەستت کرد ئاواش ناتوانیت حەقی خۆی بدەیت بە یەکە بە یەکەی ڕەهەندەکان لە چوارچێوەی ئەو کات و توانایەی کە هەتە، ئەوا دەتوانیت خودی ڕەهەندەکانیش دابەش بکەیت بەسەر وردە لایەنەکانی خۆیدا (ئەم دووبارە دابەشکردنەوەیە بەسەر زۆربەی ڕەهەندەکاندا دەچەسپێت) با هەندێک نموونە لەسەر کەیسی پۆرنۆگرافی وەر بگرین، کە پێشتر باسمان کرد.

| ڕەهەندەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| بابەتەکان-جۆرەکان | ئایا کام جۆر لە سێکس لە کتێب و گۆڤار و فیلمە پۆرنۆگرافییەکاندا دەخرێتە ڕوو؟ سێکسی کەسانی سەڵتن یان ئەوانەی هاوسەرگیرییان کردووە؟ ئایا دوو ڕەگەزییە یان هاوڕەگەزی؟ ئایا سێکسی ئارەزوومەندانەیە یان بەزۆر؟ کەسی گەورە بۆ گەورە؟ یان گەورە بۆ منداڵ؟ یان سێکسی مرۆڤ و ئاژەڵە؟ ئایا ئەو پەیام و مانایە چییە کە ئەو جۆرە سێکسە دەیەوێت بیگەیەنێت؟ |

## شێوازی دابەشکردنەوەی ڕەهەندەکان :

یەکێک لە ڕێگەکانی بچووککردنەوەی بازنەی لێکۆڵینەوەکەت بریتییە لە وەرگرتنی سێکسی بەزۆری کەسانی گەورە، لە گۆڤارە قەبارە مامناوەندەکاندا. یان دەتوانیت زیاتر بازنەکە بچووکتر بکەیتەوە بە وەرگرتنی تەنها یەک گۆڤار.

| ڕەهەندەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| کاریگەرە زیانبەخشە مەزەندەکراوەکان | ئایا پۆرنۆگرافی چ جۆرە تێگەیشتنێک لەمەڕ خۆشەویستی، هاوسەرگیری و دەرگیربوونەوە سەرڕێ دەخات؟ ئایا وەک هەندێک دەڵێن، بە بەشەهوەتیکردنی منداڵان هەڵدەسێت؟ یان ئایا هەڵدەستێ بە سروشتیکردن و بڵاوکردنەوەی چەوساندنەوەی ژنان؟ ئایا وا لە پیاوان دەکات چیدی ژنان وەک مرۆڤ نەبینن، بەڵکوو وەک ئامراز بۆ لەزەتی خۆیان لێیان بڕوانن؟ ئایا بۆ وەرگرەکانی کاریگەرییەکی دروستکەر یان ڕووخێنەری هەیە لە ڕووی بەها ئەخلاقییە بەرزەکانەوە؟ |

## شێوازی دابەشکردنەوەی ڕەهەندەکان :

بۆ نموونـە دەتوانیت تەنهـا یەکێک لـە پرسـیارەکان وەر بگریـت لـە کۆی چـوار پرسـیارەکە. بـۆ نموونـە ئەگـەر پرسـیاری یەکەمـت هەڵبـژارد، ئـەوا دەتوانیـت قسـە لەسـەر کاریگەریـی پۆرنۆگرافـی بکەیـت تەنهـا لەسـەر هاوسـەرگیری یـان خۆشەویسـتی یـان پابەندبـوون لەبـری ئـەوەی قسـە لەسـەر هەرسـێکیان بکەیـت. بـە هەمـان شـێوە، ئەگـەر پرسـیاری دووەمـت هەڵبـژارد، ئـەوا دەتوانیـت لەبـری هەرسـێ ڕەهەندەکـە، تەنهـا دانەیەکیـان بخەیتـە ژێـر لێکۆڵینـەوەوە.

سـوودەکانی بچووککردنـەوەی بازنـەی لێکۆڵینـەوە زۆرن، چونکـە جگـە لـەوەی وات لێدەکات بابەتێک هەڵبژێریت کە لـە سنووری توانـای خۆتدایە، واش دەکات کـە ئاسانتر کارەکـە خـۆی بدات بـە دەستەوە. هـەر بۆیـە هەتـا گۆشـەی تێڕوانینەکانت تیژتـر بکەیتـەوە، ئـەوا ئەگـەری سـەرلێشـێوان و لادان لـە بابەتەکـە کەمتـر دەبێتـەوە. تەنانـەت لـەو بابەتـە زۆر کەمانەشـدا کـە تـۆ دەتوانیت زیـاد لـە جەوهەرێک بەسـەر بکەیتـەوە، دیاریکردنـی چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکـەت، خزمەتێکـی زۆر دەکات بـە ڕێکخسـتن و ماناداربوونـی کارەکـەت. سـەرەڕای هەمـوو ئەمانـەش، بـە دیاریکردنـی بابەتـی کارەکـەت، لـە هەڵەیەکـی گـەورە دوور دەکەویتـەوە کـە ئەویـش کەمنرخاندنـی بابەتـە ئاڵۆزەکانـە.

# ڕاهێنانەکان

١. ئەو شێواز و تەکنیکەی لەم چاپتەرەدا باس کرا، بەسەر دوو لەم بابەتانەی خوارەوەدا جێبەجێ بکە، دڵنیا بە دووان لەوانە هەڵدەبژێریت کە بەلاتەوە گرنگن، چونکە ڕاهێنانەکانی چاپتەرەکانی داهاتوو درێژکراوەی ئەم ڕاهێنانەن.

a. ئایا سیستەمی باجوەرگرتنی حکومەتی فیدراڵی ئەمریکی، پێویستی بە ریفۆرمە؟

b. ئایا باسکردنی سێکس وەک وانەیەک لە قۆناغی بنەڕەتیدا، بابەتێکی سەرنجراکێشە بۆ قوتابییەکان؟

c. ئایا لەبەر خاتری کەمکردنەوەی ڕێژەی تەلاق، پێویست دەکات یاسای جیابوونەوە قورستر بکرێت؟

d. ئایا ڕێی تێدەچێت کەسێکی ساغ لە ڕووی ئەقڵییەوە خۆی بکوژێت؟

e. ئایا توانای تەرکیزکردنی قوتابییان لە کەمبوونەوەدایە؟

f. ئایا پێویست دەکات لەشفرۆشی بە یاسایی بکرێت و ڕێی پێ بدرێت؟

g. ئایا پێویست دەکات، ئەو جۆرە لە لۆبی قەدەغە بکریت، کە داوای بەیاساییکردنی بەرژەوەندیی گروپێکی دیاریکراو دەکەن؟

h. ئایا دەبێت هەموو جۆرە ڕیکلامێک لە تەلەفیزیۆنی تایبەت بە

منـدالآن قەدەغـە بکرێـت؟

i. ئایا ئەوانەی شەیتان دەپەرستن، هەڕەشەن بۆ سەر کۆمەڵگە؟

j. ئایا ئاقلانەیە بڕوا بکەین هەندێک لـە سـەحنە فریوەکان، لە ڕاستیدا لـە دەرەوەی گۆی زەوییـەوە هاتوون؟

k. ئایـا وەرزشــەوانە نێـرەکان، لەپێشــترن وەک لــە وەرزشــەوانە مێیــەکان؟

l. ئایا "چاکـەی سیاسـی" {واتـە، مامەڵەکـردن بـە شـێوەیەکی مەدەنـی و کـراوە لەگـەڵ ئەوانـی تـردا} بابەتێکـە بـۆ گفتوگۆ لەنـاو هاوڕێکانتـدا لـە زانکۆ؟

٢. ئـەم پرسیارانەی خوارەوە لـە چاپتەرەکانی پێشـوودا ئاماژەمـان پێ داون، بـەڵام وەڵامەکانـی پێشـووت لەیـاد بکـە و لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەوەی لـەم چاپتـەرەوە فێری بوویت، تەنهـا وەڵامـی یـەک دانەیان بدەرەوە.

a. ئایا پێویسـت دەکات هـەر قوتابییـەک ناچـار بکرێـت لانـی کـەم لـە مـاوەی کۆرسـێکدا لێکۆڵینەوەیـەک بنووسـێت؟

b. ئایا گونجـاوە قوتابییانـی قۆناغـی ئامادەیـی لـە وانـەی زیندەوەرزانیدا بابەتـی دروسـتکەرایی creationism {ئـەو تیۆرییـە دینییـەی کـە دەڵێـت، خـودا دروسـتکەری مـرۆڤ و گەردوونـە} بخوێنـن؟

c. ئایا دەبێت فرەژنی بە یاسایی بکرێت، واتە ڕێی پێ بدرێت؟

d. ئایا گونجاوە تەمەنی دەنگدان کەم بکرێتەوە بۆ شازدە ساڵی؟

e. ئایـا گروپـە توندڕەوەکانـی وەکـوو Ku Klux Klan {ڕێکخراوێکـی نهێنیـی ئەمریکیـی سـپیپێسـتی پرۆتستانتییە، بۆ دژایەتـی ئاییـن و نەتەوەکانی تـر} دەبێت ڕێیـان پێ بدرێـت لـە شـوێنە گشـتییەکاندا چالاکـی و کۆبوونـەوە ئەنجـام بدەن؟

f. ئایـا پێویسـتە گرتووخانـەکان لەبـری چاکسـازی لـە بیرکردنـەوەدا، زیاتـر گرنگـی بـە سـزادانی گرتووەکانیـان بـدەن؟

g. ئایا بڕوانامەی کۆلێج، پێشمەرجێکی مانادارە بۆ بردنەوەی هەلی کارکردن؟

h. ئایا پێویستە پزیشکەکان ناچار بکرێن بە ئاگادارکرنەوەی دایک و باوکی ئەو نەوجەوانانەی کە کەلوپەلی ڕێگری لە سکپڕییان پێ دەدەن؟

٣. کێشەیەک دیاری بکە کە ئێستا لەسەر ئاستی ناوخۆ یان نێودەوڵەتیدا مشتومڕی لەسەر دەکرێت. پاشان لە شێوازی پرسیاردا دای بڕێژەرەوە و ئەو ڕێگەیەی بەسەردا تاقی بکەرەوە کە لەم چاپتەرەوە فێری بوویت.

# چاپتەری حەڤدەیەم

# بەئەنجامگەیاندنی لێکۆڵینەوە

بەئەنجامگەیاندنی لێکۆڵینەوە، واتە گەڕان بەدوای وەڵامی پرسیارەکاندا، واتە لێوردبوونەوە لە کێشەکان، واتە کۆکردنەوەی زانیارییەکان، هەموو ئەمانەش لەپێناو گەیشتنە بە دەرئەنجام و حکومدان لەسەر کێشەکان. بەئەنجامگەیاندنی لێکۆڵینەوە، هاوکاریمان دەکات تا تێگەیشتنە سەرەتاییەکانمان، هەستەکانمان، ئایدیا مەقبولەکانی پێشوو و لایەنگیرییە شەخسییەکانمان، هەموو ئەمانە تێپەڕێنین و بچینە ڕووبەرێکی ئەقڵانی بەرزترەوە بۆ تێگەیشتن لە کێشەکان.

بە شێوەیەکی گشتی، لێکۆڵینەوە دابەش دەبێت بەسەر دوو جۆری سەرەکیدا: لێکۆڵینەوە لە فاکتەکان و لێکۆڵینەوە لە ڕاکان. بۆ یادهێنانەوەش، ڕایش دەشێت هەم بەئاگا و هەم بێئاگا بێت informed and uninformed . جگە لەو لێکۆڵینەوانەی کە مەبەست لە ڕا بێئاگاکان وەر دەگرێت، هەمیشە وا باشترە لە لێکۆڵینەوەکاندا ڕا بەئاگاکان وەر بگیرێن.

هەمیشە لە لێکۆڵینەوەکاندا هەم فاکتەکان و هەم ڕاکان بەسەر دەکرێنەوە. کام لەو دووانەش گرنگیی زیاتری پێ دەدرێت، بەدڵنیاییەوە دەکەوێتە سەر حاڵەتە جۆربەجۆرەکان. بۆ نموونە، ئەگەر لێکۆڵینەوە لەسەر یاساکانی باجوەرگرتن و نادادپەروەری بکەین لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا، ئەوا دەبێت بچینەوە سەر یاساکانی باجوەرگرتن (کە ئەمە

*فاکته*)، پاشان پرسیار لە پسپۆڕانی بوارەکە بکەین لەسەر شیکردنەوەی ئەو یاسایانە (*کە ئەمەش ڕای بەئاگایە*). بەڵام بۆ دەسنیشانکردنی ڕادەی نادادییەکە، دەبێت بزانین ئەو بڕە داهاتە چەندە کە پێویستە هاووڵاتی هەیبێت تا بتوانێت پێداویستییە سەرەکییەکانی ژیانی دابین بکات، لەوانە خواردن، پەناگە و جلوبەرگ. جگە لەمە، دەبێت ئاشنا بین بە ئامارەکانی خەرجییەکانی ژیانی ڕۆژانە (*کە ئەمە فاکتە*)، هەروەها بۆچوونی ئابوریناسان وەر بگرین دەربارەی هۆکارە پەنهانەکانی جیاوازیی داهاتی توێژە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە (*کە ئەمەش ڕای بەئاگایە*).

## مامەڵەکردن لەگەڵ دەرئەنجامە کراوەکان

لەبەر ئەوەی هۆشیاریی مرۆیی هۆشیارییەکی ناکامڵە، بۆیە هەموو پرسیارەکان وەڵام نەدراونەتەوە. هەندێک کێشە بۆ چەندان دەیە بگرە بۆ چەندان سەدەش بەکراوەیی دەمێننەوە. پێش گەشتکردنی مرۆڤەکان بۆ بۆشاییی ئاسمان، هیچ کەس بەدیاریکراوی کاریگەریی نەمانی هێزی کێشکردنی لەسەر ئەندامانی جەستەی مرۆڤ نەدەزانی. زۆر لە پزیشکە بەناوبانگەکان دەیانوت، ساتی دەرپەڕاندنی کەشتییە ئاسمانییەکان، لێدانی دڵی هەسارەناسەکان بە ئەندازەیەکی ترسناک خێرا دەبێت. (دیارە ئەوکات بە چەندان بەڵگەی پزیشکیی بەهێز ئەم ڕایەیان پشتڕاست دەکردەوە). هەندێکی تر دەیانوت، نەمانی کێش، دەبێتە هۆی لەکارکەوتن و پووکانەوەی چەندان ئۆرگانی گرنگی جەستەی مرۆڤ. بەڵام لەگەڵ یەکەم گەشتی سەرکەوتوو بۆ بۆشاییی ئاسمان، هەردوو بۆچوونە پزیشکییە زانستییەکە دەر کەوت کە بە هەڵەدا چوون و هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی تا ئەو کاتە کرابوون، ناتەواوبوونیان سەلمێنرا.

ئەو شاخەی پەیامبەر موسا پێیدا سەر کەوت لە بیابانی سینا، ناوی چی بوو؟ لە ئینجیلدا دوو ناو هاتووە، لێکۆڵەرانیش لەسەر شوێنە

جوگرافییەکەی لە مشتومڕ و ناکۆکیدان. بەڵگەی بەهێز دەخرێتە ڕوو نەک تەنها بۆ شاخێک، بەڵکوو بۆ سێ شاخی جیاواز لە سێ وڵاتی جیاوازدا. سەرەڕای سێ هەزار ساڵ لە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون، تا ئێستاش وەڵامێکی یەکلاییکەرەوە لە بەردەستدا نییە.

هەندێک پرسیار هەن، تەنانەت خۆیان نادەن بە دەستەوە نەک بۆ وەڵامی کۆتایی بەڵکوو بۆ لێکۆڵینەوەش_بۆ نموونە، پرسیاری ئەوەی ئایا ژیانی تر هەیە لەسەر کۆمەڵەکەی خۆمان یاخود کۆمەڵەکانی تر؟ خۆرەکەی ئێمە هیچ نییە جگە لە ئەستێرەیەک لەناو ملیۆنان ئەستێرەی تردا. دوورترین دانەیان کە دۆزیبێتمانەوە، لەو بڕوایەداین کە ١٢ بۆ ١٢,٥ بلیۆن ساڵی ڕووناکی دوور بێت. ئایا لە ماوەی ملیۆنێک ساڵی داهاتوودا، لێکۆڵینەوەکان دەگەنە وەڵامێکی یەکلاییکەرەوە دەربارەی ئەو پرسانە؟ کێ دەزانێت! ڕەنگە ئەو پرسیارانە لەو کاتەشدا هەر بەکراوەیی بمێننەوە.

لێکۆڵینەوە سوودی خۆی هەیە، ئەگەرچی کێشەکە ئاڵۆز و نەکردە بێت. تەنانەت ئەگەر بەرهەمی لێکۆڵینەوەیەک هیچ نەبێت، جگە لە ڕای *نەسەلمێنراوی* کۆمەڵێ پسپۆڕ، ئەوا بەدڵنیاییەوە باشترە لە ڕا بێئاگاکانی عامەی خەڵکی. نابێت زەحمەتیی بابەتێک بمانترسێنێت لەوەی کە ناکرێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. بەڵکوو دەبێت لێکۆڵینەوەی خۆمان ئەنجام بدەین، بەڵام واقیعییانە، بێ زیادەڕۆیی مامەڵە لەگەڵ وەڵام و دۆزینەوە ناتەواوەکانی خۆماندا بکەین.

## لەکوێدا بەدوای زانیاریدا بگەڕێین؟

سەرەتا دەبێت بە ئەزموون و لێوردبوونەوەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆمان، دەست پێ بکەین و پشتگوێیان نەخەین. نابێت ئەوەی بەسەرماندا دێت، یان ئەوەی بەسەر ئەوانی تردا دێت و ئێمە دەیانبینین، پشتگوێ بخەین،

بەڵکوو دەبێت لە ئاستیان بەدیقەت بین. بەدیقەتبوونمان لە ئاست گوفتار و کرداری ئەوانی تردا، ئەو مەهارەتانەمان گەشە پێ دەدات، کە بۆ نموونە، هاوکاریمان دەکەن لە هەڵسەنگاندنی وتاری کاندیدێکی سیاسی یان لە هەڵسەنگاندنی بەرنامەی سیاسیی حیزبێک. تێگەیشتن لەو گونجان و هەڵکردنەی کە ئێمە لەگەڵ خۆماندا و لەگەڵ ئەوانی تردا ئەزموونی دەکەین، بۆ نموونە، هۆکارێکە بۆ تێگەیشتن لەو کاریگەرییەی کە تەلەڤیزیۆن لەسەر خەڵکی دای دەنێت. ئەزموونکردنی ئەو کێشانەی کە لێیان دەکۆڵینەوە، جگە لەوەی بەرچاوڕوونییەکی باشمان دەداتێ، چەندان پرسیاری دیشمان لێ قوت دەکاتەوە کە دەبێت وەڵام بدرێنەوە. هەر بۆیە بەدیقەتبوون لە ئاست ژیانی ڕۆژانەدا، هۆکارێکە بۆ دەوڵەمەندکردنی لێکۆڵینەوەکانمان.

بەڵام بەدڵنیاییەوە دەبێت ئەوەمان لەیاد بێت لە ئەزموون و لێوردبوونەوەکانی ژیانی ڕۆژانەمان، زۆر بەدەگمەن نەبێت، هیچ کات بەس نییە، بەتایبەت لە ئاست کێشە ئاڵۆز و فرەڕەهەندەکاندا. هەر بۆیە دەبێت بچینە سەر سەرچاوەکانی تر، هەر لێرەشەوە ئەوەی لێرە بەدواوە لەم چاپتەرەدا ئاماژەی پێ دەدەین، هەوڵێکە بۆ ناساندنی ئەو سەرچاوانەی کە دەتوانن سەرچاوەی بەسوودی زانیارییەکانمان بن.

## باکگراوندی کێشەکان

سەرەتا، ڕاستەوخۆ مەچۆرە سەر بابەتەکە بە شێوەی ڕاستەوخۆ، بەڵکوو لەسەر باکگراوندی کێشەکە بخوێنەرەوە، بۆ نموونە، ئەگەر بابەتەکە لێکۆڵینەوەیەک بێت لە تاوانێک، ئەوا تۆ لەسەر چەمکەکانی وەکوو "تاواناسی،" "تاواناسی،" پۆلیس" بخوێنەرەوە. ئەمەش لە ڕێی ئینسایکلۆپیدیاوە، بۆ نموونە، ئینسایکلۆپیدیای ئەمەریکی و ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی. بابەتەکانی ناو ئەم ئینسایکلۆپیدیایانە لەلایەن کەسانی پسپۆڕ

و شـارەزاوە نووسـراون، هەروەهـا لـە کۆتایـی هـەر نووسراوێکیشـدا چەنـدان کتێب و وتـاری تر ڕیز کراون کە دەتوانیـت لە قۆناغەکانـی تـری خوێندنـەوەدا، کە خوێندنەوەیە لەسـەر کێشـەکە، بە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و دیاریکـراو لێیـان سـوودمەند بیـت.

## فاکت و داتاکان

ئەڵمەنایـک کـە بڵاوکراوەیەکـی سـاڵانەیە، گرنگـی دەدات بـە کۆکردنـەوە و بڵاوکردنـەوەی فاکتـەکان لـە بـوارە جۆربەجۆرەکانـدا. ئـەم بڵاوکراوەیـە مێژوویەکی کۆنـی هەیە و یەکەم بڵاوکـراوەی بە نـاوی جیهانـی ئەڵمەنایک لـە ١٨٦٨دا چـاپ کـرا. بـەڵام بڵاوکراوەکانـی تـری وەکـوو زانیارییەکانـی ئەڵمەنایـک، ئەڵمەنایکی نیـو یۆرک تایمـز، هەروەهـا تێگەیشـتنی خوێنـەر لـە ئەڵمەنایـک، ئەمانـە مێژوویەکی تازەتریـان هەیـە و بـەم دواییانـە چاپ و بڵاو دەکرێنـەوە. بـۆ ئـەوەی سـوودی تـەواو لـە هـەر بەرگێکـی ئەڵمەنایـک وەر بگیرێـت، پێویسـتە پێش بەکارهێنانیـان چاوێک بـە پێرسـتەکاندا بخشـێنرێت.

## زانیاری دەربارەی خەڵك

ژمارەیـەک لـە فەرهەنگـی بایۆگرافـی و ئینسـایکلۆپیدیا هـەن دەربـارەی ئـەم بـوارە. دووان لـە پرسـوودەکان بریتیـن لـە *بایۆگرافیی هاوچەرخ: کێ تازەیە و بۆچی*، لەگەڵ *فەرهەنگی بایۆگرافیی وێبستەر*.

## زانیاری دەربارەی زمانی ئینگلیزی

زۆر سـەرچاوەی دەوڵەمەنـد لـە بەردەسـتان دەربـارەی زمانـی ئینگلیـزی، لەوانـە *فەرهەنگـی ئینگلیزیـی ئۆکسـفۆرد، فەرهەنگـی نوێـی وێبسـتەر بـۆ هاوواتاکان. هەروەها فەرهەنگی ئیریک پاتریج بۆ جنێو و ئینگلیزیی ناباو.*

*بابەتەکانی ڕۆژنامە، گۆڤار و وەرزەگۆڤارەکان*

*ڕێبەری خوێنەر بۆ بڵاوکراوە ڕۆژنامەوانییەکان*، بە شێوەیەکی زۆر باش پێرستی بڵاوکراوە ڕۆژنامەوانییەکانی کردووە. لەم ڕێبەرەدا، لیستی زیاتر لە ١٠٠ گۆڤاری تێدایە کە بە ناوی بابەت و بە ناوی نووسەرەوە پێرست کراون. شێوازی گەڕان لەم ڕێبەرەدا هەر وەکوو گەڕانە بۆ زانیاری لە ئینسایکلۆپیدیادا. لە ناونیشانە گەورەکانەوە دەست دەکەیت بە گەڕان کە لەژێر هەریەکە لەواندا دەیان بابەتی جۆربەجۆر ڕیز کراون. پاشان دەچیتە سەر ئەو ساڵەی کە مەبەستتە، چونکە بابەتی چەندان ساڵ کۆ کراونەتەوە. پاشان ناونیشانی بابەتەکان دەخوێنیتەوە، بۆ دۆزینەوەی ئەو بابەتەی کە مەبەستتە. لەناو بابەتەکەشدا هەر وەک ئاشکرایە، ناوی نووسەر و ژمارەی گۆڤار و ساڵی بڵاوکردنەوە ئاماژەیان پێ دراوە.

زۆر سەرچاوەی تایبەت لەسەر پێرستی بابەتەکان دەست دەکەون، تەنانەت لە کتێبخانە مامناوەندییەکانیشدا. ئەمەی خوارەوە، خستنەڕووی لیستێکی بچووکە. (بۆ دەستکەوتنی لیستی تێروپڕی سەرچاوەکان، دەتوانیت بچیتەوە سەر کتێبی *لیستی کتێبەکان*، کە لەلایەن ئیوجینی ئۆ. شیسەوە نووسراوە).

پێرستی زانستە کۆمەلایەتییەکان

پێرستی زانستە مرۆڤایەتییەکان

پێرستی نیو یۆرک تایمز

پێرستی وتار و بابەتی گشتی

پێرستی زانست بەگشتی

پێرستی پەروەردەیی

بڵاوکراوەی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا: کەتەلۆگی مانگانە

پێرستی بڵاوکراوە یاساییەکان
بیبلیۆگرافیی نێودەڵەتی MLA
پێرستی گۆڤار
پێرستی زانست و تەکنەلۆجیا
پێرستی هونەر
پێرستی بایۆگرافی
پێرستی بزنس
پێرستی بایۆلۆجی و کشتوکاڵ
پێرستی ئەو کتێبانەی کە خوێندنەوەیان بۆ کراوە
پێرستی ئەندازیاری
پێرستی میوزیک
پێرستی فەیلەسوفان
پێرستی ئایین

دوای هەڵبژاردنی بابەتێک و خوێندنەوەی، بزانە خوێنەرانی تر چییان لەسەر بابەتەکە وتووە، ئەویش بە خوێندنەوەی بەشی کۆمێنتەکان. زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئەو نامە ڕەخنەییانە بڵاو دەکەنەوە کە لە خوێنەرە شارەزاکانەوە پێیان دەگات. لەو گۆڤارانەی کە هەفتانە دەر دەچن، نامەکان دوو ژمارە دواتر بڵاو دەبنەوە، بەڵام لە بڵاوکراوە مانگانەکاندا، ژمارەیەک دواتر نامەکان بڵاو دەکرێنەوە.

## کتێبەکان

بۆ ئاشنابوون و ئاگاداربوون بەو کتێبانەی کە لە بەردەستتان، زیاد لە ڕێگەیەک هەیە. جگە لەو کتێبانەی کە وەک مەنهەج دەیانخوێنیت و ئەوانەشی کە لە شێوەی ئینسایکلۆپیدیادان، دەتوانیت پرس و ڕاوێژ بە

کارمەندانی کتێبخانە بکەیت بۆ هەر کتێبێک کە دەتەوێت، چونکە ئەوان لە هەمووان باشتر ئاگاداری ئەو کتێبانەن کە لە کتێبخانەکاندا هەن.

## داتابەیسی کەمپیوتەر و کتێبخانەی ئەلیکترۆنی

بە هۆی تەکنەلۆجیای هاوچەرخەوە، ئێستا لە هەموو کاتێکی تر ئاسانتر دەتوانین زانیاریمان چنگ بکەوێت. تەکنەلۆجیا لە گەشەکردنێکی بەردەوامدایە، بەڵام مەرج نییە هەرشوێنێک دەستی تەکنەلۆجیای پێ گەیشت، ئیتر بتوانین زانیاریی مانادارمان دەست بکەوێت. باشترین شوێن بریتییە لە کتێبخانەکان، چونکە لەوێدا زانیارییەکی زۆر لە ڕێی ئینتەرنێت و داتابەیسەوە فەراهەم کراوە. جگە لەوە، بە هۆی کارمەندەکانی کتێبخانەوە کارئاسانیی باش کراوە بۆ ئەوەی زانیاریی باوەڕپێکراومان بە شێوەیەکی خێرا دەست بکەوێت.

گۆڕانکاریی بنەڕەتی کە تەکنەلۆجیا بەسەر کتێبخانەکاندا هێناویەتی، بریتییە لە گۆڕانی پێرست لە نووسراوەوە بۆ پێرستی ئەلکترۆنی. ئەو زانیارییەی کە پێشتر بۆ نموونە، لە ڕێبەری خوێنەر بۆ بڵاوکراوەکانەوە دەست دەکەوت، ئێستا بۆ نموونە، لە ئینفۆتراکدا، کە لە کتێبخانە گشتییەکان و بەشێک لە کتێبخانە بچووکە ئەکادیمییەکاندا هەیە، دەست دەکەوێت. ئەویش بە دوو شێواز لیستی سەرچاوەکان و بەشێک لە تێکستەکانیان لەسەر CD، هەروەها لیستی سەرچاوەکان و هەموو تێکستەکان بەتەواوەتی. لەگەڵ ئەوەشدا کە شێوەی یەکەم و دووەم بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکار دەهێندرێن، بەڵام لێکۆڵەرەوەکان ئێستاشی پێوە بێت، گرنگییەکی زۆر دەدەن بە سەرچاوە چاپکراوەکان.

بە هۆی ئەو پێرستانەوە کە لە کتێبخانە ئەکادیمییەکاندا هەیە، زۆر سەرچاوەی ئەکادیمی بەردەست دەکەون. یەکێک لەو پێرستە بەناوبانگانە بریتییە لە *پێرستی ئەکادیمیی گشتی*. کە زیاتر لە ٩٦٠ سەرچاوە دەگرێتە

خۆ لە هونەرەوە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان و زانستی سروشتی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان. هەندێک سەرچاوەی هاوبەش هەن لەنێوان ئەکادیمیی گشتی و *info trak ئینفۆتراکدا*، بەڵام ئەمیان لە ڕووی ژمارەوە دەوڵەمەندترە. دووان لە پێرستە بەناوبانگەکانی بواری یاسایی بریتین لە Lwxis-Nexis و westlaw. زۆر پێرستی تر هەن کە سەرچاوەی بابەتە زانستی و تەکنیکییەکانیان تێدا دەست دەکەوێت، لەوانە health،psycinfo and psychosocial instrument هەروەها pudmed و intrenet grateful med. دەیان سەرچاوەی تریش کە بەهۆی تۆڕەکانی ئینتەرنێتەوە دەتوانیت سوودیان لێ وەر بگریت.

پرسیارکردن لە کارمەندانی کتێبخانە، هەمیشە کارێکی باشە. لە ڕێی ئەوانەوە دەتوانیت بزانیت کتێبخانەکە کام لەو پێرستانەی بەردەست خستووە. چونکە ئەو پێرستانەی باس کران، هەموویان لە کتێبخانە گشتییەکاندا بەردەست نین. هەروەها زۆر سایتەکان تەنها کورتە و پووختەی بابەتەکان دەخاتە ڕوو، لەوانە پووختەی سایکۆلۆجی، کورتەی سۆسیۆلۆجی، ژیان و مێژووی ئەمەریکا، پووختەی بابەتە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.

## ئینتەرنێت

لە ١٩٧٠کاندا وەزارەتی بەرگریی ئەمەریکی سەرقاڵی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی تۆڕی پەیوەندی بوو. پاشان لە ١٩٨٠کاندا کەمپیوتەری کەسی، ناوبانگی پەیداکرد و تۆڕی پەیوەندیش گۆڕا بۆ ئینتەرنێت، کە ئەودەم پێشی دەوترا تۆڕی بەرفراوانی جیهانی (www). ئیدی لە ساڵانی دواییدا بوو بە گەورەترین سەرچاوەی پەیوەندیکردن و فێربوون. ئێستا تەنها پێویستت بە کەمپیوتەرێک و مۆدیۆمێک و هێڵێکی ئینتەرنێتە، بۆ ئەوەی جیهان بپشکنیت.

ملیۆنان سایتی ئینتەرنێت هەن، بەڵام بۆ ئەوەی داخڵی تەنها یەک دانەشیان بیت، دەبێت ناوی سایتەکە رێک وەک خۆی داخڵ بکەیت بێ زیاد و کەم (چونکە تەنها یەک پیت، یان هێمایەک، یان سپەیسێک بەسە بۆ ئەوەی نەتوانی داخڵ بیت). زۆربەی وێبسایتەکان بەم شێوەیە دەست پێ دەکەن http:/www. ئەگەر ناوی سایتێکت لەیاد کردبوو، یان بۆ سایتێکی دیاریکراو بگەڕێیت، ئەوا دەتوانیت لە رێی یەکێک لە ماشینەکانی گەڕانەوە، سایتەکەت بدۆزیتەوە، بۆ نموونە، www. askjeeves. com.

کۆتاییی سایتەکان، جۆری سایتەکان دیاری دەکەن، بۆ نموونە، gov. واتە سایتی حکومی، edu. واتە سایتی پەروەردەیی، com واتە سایتی بازرگانی. وێبسایتەکان رەنگدانەوەی یان ئاوێنەی بەرنامە و کاری ئەوانەن کە دروستیان دەکەن. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین سایتە حکومی و پەروەردەییەکان دانراون تا زانیاریی سوودبەخش بدەن بە وەرگرەکانیان، بەڵام سایتی بازرگانی ئامانجەکەی ئەوەیە کە زۆرترین وەرگر قایل بکات بە کڕینی کەلوپەلەکانیان. هەبوونی زانیاری لەسەر ئەو سایتەی کە بەکاری دەهێنیت، هاوکاریت دەکات لە زانینی جێمتمنانەبوونی زانیارییەکانیان. هەڵسەنگاندنی ئەو زانیارییانەی کە لە کتێب و کەناڵە میدیاییەکانی ترەوە وەریان دەگرین، زۆر پێویستە، بەڵام پێویستترە، کاتێک سەرچاوەی زانیارییەکەمان ئینتەرنێت بێت.

لە خوارەوە چەند ستراتیژێکی گرنگ بەڵام ئاسان بۆ بەکارهێنان دەخەینە روو، دەربارەی گەڕان، {لێکۆڵینەوە} لە ئینتەرنێتدا.

١. بەکارهێنانی ئامرازی گەڕان: ئامرازی گەڕان {گوگڵ بۆ نموونە} هۆکارێکە تا بە شێوەیەکی بەرهەمدار ئینتەرنێت بەکار بهێنرێت. ئەوەی لەسەرتە، تەنها بابەتێک بنووسە کە خوازیاریت لێکۆڵینەوەی دەربارە بکەیت و چاوەڕێ بکە تا کاتی گەڕانەکە کۆتایی دێت. هەتا بابەتەکە گشتگیرتر بێت، ئەوەندە زیاتر ئەنجامی گەڕانەکە فراوانتر دەبێت. بۆ

نموونە، ئەنجامی گەڕان بۆ بابەتێک وەک "پەروەردە"، ڕەنگە ٦٠ ملیۆن سەرچاوە هەبێت، بەڵام بۆ "پەروەردەی ئەمریکی" کەمتر بێت لە ٦ ملیۆن، وە بۆ "سزای جەستەیی وەک جۆرێک لە پەروەردە لە ئەمەریکادا" ڕەنگە کەمتر لە ٥٠ هەزار سەرچاوە بێت. واتە، بەکورتی، هەتا ئەو بابەتەی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەیت، سنووردارتر، دیاریکراوتر بێت، ئەوا ئەنجامی گەڕانەکە سەرچاوەی کەمتر دەدات بە دەستەوە.

جگە لە ئامرازی گەڕان، شتێکی تر هەیە کە پێی دەڵێن، ئامرازی گەڕانی گەورە، کە دەتوانێت ئامرازی گەڕانەکانی تریش بگەڕێت. ئەم ویبسایتەی خوارەوە کە لەلایەن زانکۆی کالیفۆرنیاوە لە بێرکلی فەراهەم کراوە، بە شێوەیەکی ڕوون بەڵام بەسوود، ئەو سایتە بەسوودانە دەخاتە ڕوو، کە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئینتەرنێتدا زۆر بەسوودن.

http://www. lib. berkeley. edu/TeachingLib/Guides/Internet/ MetaSearch. html

ئەم ویبسایتە، هەندێک سایتی تر پێشنیار دەکات، کە دەتوانرێت سوودی لێ ببینرێت:

www. google. com, www. alltheweb. com, www. altavista. com

کە دەچیتە ناو گۆگڵەوە، یەکەم شت کە دەبێت بیکەیت، ئەوەیە خۆت ئاشنا بکەیت بە تایبەتمەندییەکانی سایتەکە، هەر بۆیە کرتە لەسەر هەر تێرمێک بکە کە بە ڕەنگی شین نووسراوە، پاشان زانیارییەکان بخوێنەوە. بۆ نموونە، لە برگەی هەواڵدا، سەرنجی ئەوە بدە کە دەتوانێت بۆ زیاتر لە ٤٠٠٠ هەواڵی ڕۆژ، گەڕان ئەنجام بدەیت. دواتر بگەڕێوە بۆ پەڕەی یەکەم و ئەم دەستەواژانە بنووسە بێ بەکارهێنانی نیشانەی پرسیار: "google Glossary" و "Google Sets". هەردووکیان بخوێنەرەوە، پاشان

بگەڕێوە بۆ پەڕەی سەرەکی.

پاشان لە بۆکسی گەڕاندا بنووسە "سزادانی جەستەیی لە پەروەردەی ئەمەریکیدا،" پاشان کرتە لەسەر گەڕان بکە. لەبەر ئەوەی بەردەوام زانیاریی نوێ داخڵ دەکرێن و کۆنەکان لا دەبرێن، هەر بۆیە هیچ دوو گەڕانێک ڕێک وەک یەک نابن لە ڕووی ئەو سەرچاوانەوە کە لە ئەنجامی گەڕانەکەوە بەردەستمان دەکەوێت.

پاشان چاوێک بە لیستی ئەو سەرچاوانەدا بخشێنە کە دەر دەکەون. لە ڕێی کرتەکردن لەسەر وشەی next، ئەتوانی سەرچاوەکانی تر لەسەر هەمان بابەت ببینیت. لە کاتێکیشدا ئەگەر ویستت دووبارە بۆ بابەتێکی نوێ، گەڕان ئەنجام بدەیت، بگەڕێوە بۆ لاپەڕەی سەرەکی و کردارەکە دووبارە بکەرەوە.

تێبینییەکی گرنگ، هەرکاتێک سەرچاوەیەکت خوێندەوە و سەرنجی ڕاکێشایت، پێش داخستنەوەی، ناونیشانی تەواوی بابەتەکە کۆپی بکە کە لە شریتی ناونیشاندا نووسراوە، چونکە ڕەنگە جارێکی تر ئیشت بە بابەتەکە ببێتەوە، یان لە کاتی بەکارهێنانیدا لە لێکۆڵینەوەکانتدا، ئاماژەی پێ بکەیت لە لیستی سەرچاوەکاندا.

٢. پووختەکردنی لیستی سەرچاوەکان:

بۆ گەڕان، بە شێوەیەکی گشتی گۆگڵ زۆر بەسوودە. بەڵام لەو کاتانەدا کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەت سنووردارتر و بەرتەسکتر دەکەیتەوە، پێویستت بە زانیاریی ورد و بەدیقەتتر دەبێت، ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو سایتانەی کە لەم حاڵەتەدا سوودبەخش و بەکەڵکن:

بۆ دەستکەوتنی خوێندنەوەی جیاواز لەسەر بابەتە ئاڵۆز و فرەڕەهەندەکان:

http://www. townhall. com/columinast/

http://www. nytimes. com/pages/opinion/columns

http://www. washingtonpost. com/w-dyn/opinion/columns

http://www. jesidhworldreview. com

http://blueagle. com

http://nyobserver. com

بۆ بەكارهێنانی فەرهەنگ، ئینسایكلۆپیدیا، سایتەكانی حكومەتی ئەمەریكی، لێكۆڵینەوە لەسەر بایبل و بابەتی تریش:

http://webster.directhit.com/webster/search.php?qry+concrodance

بۆ دەستكەوتنی بابەتی مێژوویی:

http://ethersource. com/histroyline

بۆ دەستكەوتنی بابەتی یاسایی:

http://www. law. com

http://www. nolo. com/encyclopedia

http://www. legalengine. com

بۆ بابەتی پزیشكی:

http://www. merckhomeedition. com

http://webmd. com

http://www. cdc. com

http://www., medlineplus. com

بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر قسەی هەڵبەستراو، دیعایە:

http://www. hoaxbusters. ciaac. otg/HBOtherHoaxPages. Html

http://www. urbanlegends. minigco. com/cultuer/urbanlegends/ liberary/blhoaz. html?pid+٢٧٢٣&cob=home

هەركاتێكیش كە وێبسایتێكی بەسوودت بەرچاو كەوت، دەتوانی

ئیزافەی بکەیت بۆ ئەم لیستە.

٣. **هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان:** نابێت هیچ سەرچاوەیەک هەر لە سەرەتاوە وەک شتێکی بێخەوش و بێهەڵە وەر بگیرێت. چونکە رۆژنامە چاپکراو و ئەلیکترۆنییەکان، رەنگە بکەونە هەڵەی بێمەبەستەوە، شیکەرەوەی هەواڵەکان رەنگە لایەنگیرییە زاتییەکانی خۆیان تێکەڵی تەحلیلەکانیان بکەن، تاکەکان دەتوانن بە ئەجێندای تایبەتیی خۆیان وەرگرەکانیان بە لایەکی تایبەتدا ئاراستە بکەن. ئەوە دەکەوێتە سەر وەرگرەکان کە زانیارییەکان هەڵبسەنگێنن و بەدیقەتەوە کەموکوورییەکان دیاری بکەن. کاتێک کە سەرچاوەی زانیارییەکان ئینتەرنێت بێت، ئەوا ئەم ئەرکەی وەرگر لە هەڵسەنگاندنی زانیاییەکاندا زۆر پێویستترە، چونکە هەرکەسە دەتوانێت وێبسایتێک دروست بکات، چی دڵی خواستی، بڵاوی بکاتەوە.

ئەگەر جاروبار ئیمەیڵی سەیرت پێ بگات، چاک تێدەگەیت ئەو رستانەی سەرەوە واتایان چییە. زۆر کات ئەو نامە سەیرانە سەرنجراکێش دەر دەکەون وەک ئەوەی لە سەرچاوەیەکی باوەرپێکراوەوە هاتبن. یەکێک لەو نامانە دەیوت کە گوایە "بیل گەیتس" برێک پارەی باشی داناوە بۆ بەخشین و رێگەی وەرگرتنەکەشی دیاری کردووە. یەکێکی تر لەم نامە سەیرانە کە گوایە لە کۆستەریکاوە هاتووە دەڵێت کە مۆز جۆرێک لە ڤایرۆسی تێدایە کە لە گۆشتدا هەیە. هەروەها لەمانە سەیرتر ئەو نامەیە بوو کە دەیوت، نۆمسرداموس لە سەدەی شازدەوە پێشبینیی ئەم هەڵبژاردنەی دواییی کردووە {مەبەست هەڵبژاردنی وڵاتی ئەمەریکایە}. دانەیەکی تر دەڵێت، هەموو ئەو فایلانە بسرنەوە کە ئایکۆنەکەی ورچێکی پەرۆیینی منالانەیە، چونکە ڤایرۆسێکە کە کەمپیوتەرەکان وێران دەکات. بە هۆی ئەم درۆیەشەوە، زۆر کەس زۆر فایلی گرنگیان سڕیبووەوە. هەموو

ئەمانە ئەچنە خانەی قسەی بێبنەما و هەڵبەستراو و درۆودەلەسەوە. بۆ خوێندنەوەی شتی لەم بابەتە، سەردانی سایتەکانی سەرەوە بکە.

هەردوو نووسەر، جەین ئەلێکساندەر و مارشا ئان، لێکۆڵینەوەیەکی جوانیان نووسیوە دەربارەی چۆنێتیی هەڵسەنگاندنی ویبسایتەکان. لەم سایتەوە دەتوانیت دەستت پێی بگات:

http://www2. widener. edu/wolfgram-memorial liberary/webval/ eval1198/index. html.

## چاوت لەسەر ئامانجەکە لا مەدە

ڕەنگە هەموو ئەوانەی باس کران لەسەر چۆنێتیی گەڕان بە دوای سەرچاوەکاندا، وەک شتی دووبارە و کاتبەفیڕۆدەر و ماندووکەر بێتە بەرچاو، وەک ئەو ڕێسا ئەکادیمییانەی کە لە نووسینی نامەی دکتۆرادا پێویستە ڕەچاو بکرێن، بەڵام ئەم گەڕانە مەرج نییە ئاوا زەحمەت و بێزارکەر بێت. بە کەمێک ئەزموون و ڕاهاتنەوە دەتوانیت بەخێرایی ئاشنا بیت بەو سەرچاوانەی بەکار هاتوون لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانی تردا. نەک تەنها بۆ سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان، بگرە کتێبەکانیش پێویست ناکات لاپەڕە بە لاپەڕەی بخوێنیتەوە تا بگەیتە ئەو زانیارییە بەسوودەی کە خۆت دەتەوێت. لەو کتێبانەدا کە ئیندێکسیان هەیە، دەتوانیت بەخێرایی چاوی پێدا بخشێنیت و لاپەڕە و ئەو بابەتە بدۆزیتەوە کە مەبەستتە، لەو کتێبانەشدا کە ئیندێکسیان نییە، دەتوانیت پێرست بەکار بهێنیت بۆ ئەم مەبەستە.

بەدیقەتبوون لە پرۆسەی گەڕان بەدوای سەرچاوەکاندا لە ئینتەرنێتدا، قورسترە وەک لە سەرچاوەکانی تر. کەواتە هەوڵی خۆت بدە کە سەرنجت بە چڕکراوی بهێڵیتەوە لەسەر ئەو بابەتەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام دەدەیت.

## پێویستی بۆ لێکۆڵینەوە لەکوێدا کۆتایی دێت؟

ڕەنگە وا دەر بکەوێت کە بڕیاردان لەسەر تەواوبوونی پرۆسەی لێکۆڵینەوە، کارێکی ئاسان بێت. بەڵام تەواو بەپێچەوانەوە، ئەم بڕیارە زۆر دژوارە. چونکە تەنها یەک بەڵگەی تۆکمە بەسە بۆ ئەوەی شاخێک لە بەڵگەی تر بخاتە ژێر پرسیارەوە. بۆ نموونە، لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، زۆربەی سایکۆلۆجیستە کۆمەڵایەتییەکان لەو بڕوایەدا بوون، ژیان بە شێوەی قەرەباڵغ و جەنجاڵ، ژینگەیەکی لەبارە بۆ هەندێک نەخۆشیی زیانبەخش. زۆر لێکۆڵینەوە ئەوکات ئەم بانگەشەیەیان پشتڕاست دەکردەوە. مرۆڤناس، پاتریکا دارپەر، هەڵسا بە لێکۆڵینەوەکردن لەسەر خێڵێکی ڕاوکەر کە لە باشووری ئەفەریقادا دەژیان، ئەویش خێڵی "کونگ بوشموێن" بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم خێڵە ڕووبەرێکی زۆر فراوانیان لە بەردەستا بوو بۆ ئەنجامدانی ڕاو و دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوون، بەڵام دەوارەکانیان لە نزیک یەکتر دروست دەکرد و هاتوچۆی یەکیان دەکرد. لەگەڵ ئەم تێکەڵییەشدا هیچکام لەو نەخۆشییانەیان نەبوو کە هۆکارەکەی قەرەباڵغییە، بۆ نموونە، نەخۆشیی بەرزی پەستانی خوێن. ئەم لێکۆڵینەوەیە وای کرد هەموو ئەو بەڵگانە دووبارە بخرێنە ژێر پرسیارەوە کە وەکوو حەقیقەتی گومانهەڵنەگر وەر گیرابوون.

لەبەر ئەوەی ئامانجی سەرەکیی هەر لێکۆڵینەوەیەک بریتییە لە بەرهەمهێنان و دەرخستنی بەڵگە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بانگەشەکانی لێکۆڵینەوەکە، کەواتە باش وایە ئەو خاڵانەی چاپتەری شەش ئاماژە پێ بدەینەوە کە پێمان دەڵێن چ کاتێک بەڵگەکان کافی و یەکلاییکەرەوەن:

*١. بەڵگەیەک کافییە کاتێک بە هۆیەوە دەتوانین دڵنیا بین لەو*

*بڕیارەی کە دەیدەین*، خۆزگەخواستن، گریمانەکردن، واپیشاندان، هیچ کام لەمانە ناتوانن دڵنیایی بە ڕاستیی حوکمێک ببەخشن. دڵنیایی کاتێک هەیە، کە هۆیەکی باش نییە بۆ گومان، بنەمایەک نییە بۆ ناڕازیبوون. بۆ نموونە، لە حاڵەتی بڕیاردان لەسەر تاوانباریی کەسێک لە دادگادا، "کەسێک تاوانبارە، چونکە هۆیەکی مەعقول نییە بۆ بێتاوانیی ئەو کەسە." بەدەستهێنانی دڵنیایی بە شێوەکی گشتی زۆر قورسە، بەتایبەتی لە کێشە ئاڵۆزەکاندا، هەر بۆیە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ناچاریت قبوڵی حوکمێکی متەوازعانەتر بکەیت.

٢. *بەڵگەیەک کافی دەبێت، کاتێک توانیی بیسەلمێنێت کە دڵنیایی ناتوانرێت بەدەست بهێنرێت، چونکە دەتوانێت چەندان گریمانەی بەهێز بخاتە ڕوو*. لێرەدا ئەو دیدەی کە قسەی لەسەر دەکرێت بە شێوەیەکی دیار، مەعقولترە لە هەموو ئەو دیدانەی کە منافەسەی دەکەن. لە دادگا مەدەنییەکاندا، ئەم حاڵەتە بە "سەلماندنی بێگومان" ناو دەبرێت. *پیشاندانی* مەعقولیەت، دیارە زۆر جیاوازە لە جەختکردنەوەی پەتی، هەر بۆیە هەموو دیدە بەشداربووەکان دەبێت لە بەرچاو بگیرێن و هەڵبسەنگێنرێن پێش ئەوەی بڕیار لەسەر مەعقولترینی ناویان بدرێت.

٣. *لە هەموو کەیسەکانی تردا، پێویستە بەڵگەکان و بەڵگەی ناتەواو بێنە ئەژماردن*. بە مانایەکی تر، ئەگەر هیچکام لە بەڵگەکان نەیانتوانی مەعقولیەتی ڕایەک بەسەر ڕاکانی تردا بسەلمێنن، ئەوا تەنها بڕیاری دروست کە بدرێت، بریتی دەبێت لە حکومنەدان هەتا ئەو کاتەی بەڵگەی یەکلاییکەرەوە لە بەردەستا دەبن. ئەم پەلەنەکردن و دانبەخۆداگرتنە، دیارە زەحمەتە، بەڵام خودی ئەم پەلەنەکردنە، سیفەتێکی جەوهەریی بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکانە.

لەکوێدا پرۆسەی لێکۆڵینەوە کۆتایی پێ دێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، بەتەواوەتی بەستراوەتەوە بە بابەتەکەوە. لە هەندێک بابەت و حاڵەتدا

لێکۆڵینەوەیەکی کەم کافییە. وەلێ لە هەندێک بابەتی تردا، تەنانەت لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ و ماندووکەریش کافی نییە. هەرچەندە بەگشتی ناتوانرێت بوترێت کە چ کاتێک لێکۆڵینەوەکان کافی و تەواون، بەڵام تۆ دەتوانیت لافی باشبوون و تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکەت لێبدەیت لە کاتێکدا کە هەوڵی جیدیی خۆت دابێت بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە لە لایەنە پەیوەندیدارەکان، هەروەها ڕای بەئاگا و دیراسەکراو وەربگریت لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی لێکۆڵینەوەکەت. دیارە ژمارەی ڕەهەندە پەیوەندیدارەکان دەکەوێتە سەر سروشتی بابەتەکە. ئەمەی خوارەوە بۆ نموونە، لیستی سێ بابەتن کە هەریەکەیان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان هەیە بە چەندان کێڵگەی زانستییەوە، بۆ بیر هێنانەوە، ئەم بابەتانە لە چاپتەری شازدە باس کراوە:

## بابەتی کاریگەرییەکانی پۆرنۆگرافی

**پرسیارەکان:**

ئایا پۆرنۆگرافی چ جۆرە تێکەیشتنێک لەمەڕ خۆشەویستی، هاوسەرگیری و دەرگیربوونەوە سەررێ دەخات؟ ئایا وەک هەندێک دەڵێن، بە بەشەهوەتیکردنی منداڵان هەڵدەستێت؟ ئایا هەڵدەستێ بە سروشتیکردن و بڵاوکردنەوەی چەوساندنەوەی ژنان؟ ئایا وا لە پیاوان دەکات چیدی ژنان وەک مرۆڤ نەبینن و بەڵکوو وەک ئامراز بۆ لەزەتی خۆیان لێیان بڕوانن؟ ئایا بۆ وەرگرەکانی کاریگەرییەکی دروستکەر یان ڕووخێنەری هەیە لە ڕووی بەها ئەخلاقییە بەرزەکانەوە؟

ئەو کێڵگە زانستییانەی کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە بە بابەتەکەوە:

کۆمەڵناسی، دەروونناسی، ئەدەبی ڕەخنەیی، ئەخلاقناسی، دین.

## بابەتی کاریگەرییەکانی یاریی بۆکسێن:

**پرسیارەکان:**

ئایا بە دیاریکراوی لێدانەکان چ کاریگەرییەکی لەسەر یاریزانەکان هەیە، بەتایبەتی لەسەر مێشکیان؟ کاریگەریی کۆی زەربەکان لە دە یان پازدە گێمدا، لەسەر وەرزشەوانەکە چییە؟ ئەی بەدرێژاییی ژیانی وەرزشی، چ کاریگەرییەکی دەبێت؟

ئەو کێڵگە زانستییانەی کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە بە بابەتەکەوە:

ئەناتۆمی، سایکۆلۆجی، مێدیسن و ڤیزۆلۆجی.

## تەمەنی چوونە ژێر بەرپرسیارێتییەوە:

**پرسیارەکان:**

ئایا دادپەروەرانەیە کەسێک کە هێشتا ئەوەندە تەمەنی نییە تا لە دەرئەنجامی ئەخلاقی و یاسایی ڕەفتارەکانی خۆی بگات، کەچی بەرپرسیار بکرێت؟ ئایا لە چ تەمەنێکدا کەسێک دەگاتە ئەو ڕادەیە لە هۆشیاری؟

ئەو کێڵگە زانستییانەی کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە بە بابەتەکەوە:

پەروەدەکردن، دەروونناسی، مێدیسن، ئەخلاق و یاسا.

یەکێک لە تەحەدییە گەورەکانی بەردەم بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکان، ئەو فریوخواردنەیە کە گوایە ئیدی پرۆسەی گەڕان کۆتاییی پێ هاتووە، تەنها لەبەر ئەوەی کەسێکی خاوەن مەعریفە پشتگیری لە دەرئەنجامەکانیان دەکات. کاتێک کەسێکی خاوەن ناو، پشتگیری ڕاکانت دەکات، ئیدی تۆ

بە خۆت دەڵێیت ئا ئەمە وەلامێکی "یەکلاییکەرەوەی گومان-هەڵنەگرە." ئەگەر تۆ بکەویتە داوی ئەم مەیلەوە، ئەوا خۆت لە تێگەیشتنی قووڵ و مانادار ئەشاریتەوە و لە گرنگیی بابەتەکان کەم دەکەیتەوە. کاتێک بە بابەتێک دەوترێت کێشەیەکە شیاوی بیرلێکردنەوە، ئەوا مانای ئەوەیە کە کەسە خاوەن بیر و تێگەیشتنەکان، لێکدانەوەی جیاوازیان بۆ کردووە و دەیکەن. هەر لێرەشەوەیە پەلەنەکردن لەسەر بڕیاردان لەسەر ئەم کێشانە، زۆر زەرورن. کەواتە پەلەنەکردن و بینینی کێشەکە لە گۆشەنیگا جیاوازەکانەوە گرنگیی خۆی هەیە. بەلام دەبێت ئەوەشمان لەیاد بێت، کە دواجار هەر دەبێت بڕیارێکیش لەسەر کێشەکە بدەین، هەرچەندە خوێندنەوە جیاوازەکان هەریەکەیان بە شێوەی خۆیان مەعقولێتییان تێدا بێت.

## مامەڵەکردن لەگەڵ تێکستە درێژەکاندا

هەندێک کات جگە لە بەکارهێنانی وتار و لێکۆڵینەوە کورتەکان، ناچار دەبێت سوود لە کتێبە گەورەکانیش ببینیت بۆ بەئەنجامگەیاندنی لێکۆڵینەوە و نووسینەکانت. هەڵسەنگاندن و تێگەیشتن لە کتێبەکان، قورسترە، چونکە ئارگۆمێنتە سەرەکییەکان کورت و پووخت نەکراونەتەوە لە شوێنێکی دیاریکراودا وەک لە نووسینە کورتەکاندا هەیە، بەڵکوو پەرشوبلاو بۆتەوە بەناو لاپەڕەکانی کتێبەکەدا. ئەم حاڵەتەش، شتێک نییە بە ئارەزوو نووسەرەکان حەز بکەن خوێنەرەکان ماندوو بکەن، بەڵکوو ئەمە خۆی سروشتی نووسینی بەرهەمە درێژەکانە. نووسەرە جیدی و بەرپرسیارەکان تەنها کۆمەڵێ حوکمی ڕەقوتەق ڕیز ناکەن لە بەرهەمەکانیاندا، بەڵکوو ڕاکانیان پشتڕاست دەکەنەوە بە بەڵگەکان. ئەوان لێکدانەوە و شیکردنەوەی تێر و پڕ دەخەنە ڕوو، هەروەها باس لەو میتۆدانەش دەکەن کە نەخشەڕێگەی نووسینەکانیانە. هەندێک کات ئەو

میتۆدانەش زیاد لە شێواز و جۆرێکە، هەر بۆیە نووسەرەکان ناچار دەبن زیاد لە جارێک حوکم و دەرئەنجامەکانیان بسەلمێنن. بۆ نموونە، دەشێت نووسەر میتۆدەکانی چاوپێکەوتن، کۆکردنەوەی داتاکان، ڕاپرسی و هی تریش بەکار بهێنێت، لەم کاتەشدا، پێشمەرجەکان premise دابەش دەبن بەسەر چەندان لاپەڕەدا. هەر بۆیە پێش ئەوەی بڕیار لەسەر باش و خراپیی دەرئەنجامەکان بدەیت، دەبێت هەموو ئەو پێشمەرجانە بدۆزیتەوە و لەبەرچاویان بگریت، چونکە دەرئەنجامەکان لەسەر پێشمەرجەکان دادەمەزرێنرێن. لە خوارەوەدا ستراتیژییەکی یارمەتیدەر دەخەینە ڕوو لەسەر ئەم بابەتە:

١. پاش خوێندنەوەی سەرچاوەیەک، ڕستە سەرەکییەکان دەستنیشان بکە: هەر پەرەگرافێک ڕستەیەک یان دوو ڕستەی سەرەکیی تێدایە. گرنگی بەم ڕستانە بدە، چونکە گوزارشتە لە پووختە و جەوهەری پەرەگرافەکە. جگە لە ڕستەی سەرەکی، دەتوانیت بە ڕێگەی تریش بەشە گرنگەکانی پەرەگرافێک دەستنیشان بکەیت، بۆ نموونە، ناونیشانە ناوەندییەکان، ئەو پیت و وشانەی کە بۆڵد یان ئیتالیک یان ئەندەلاین کراون. هەروەها هەندێک وشەی تریش هەن کە بۆ دەستنیشانکردنی مانا سەرەکییەکانی پەرەگرافەکان گرنگیی خۆیان هەیە، لەوانە: *هەروەها، لە ڕاستیدا، لەمەش گرنگتر، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر.*

١. دەرئەنجامەکانی نووسەر دەستنیشان بکە: دەرئەنجام دەشێ لە هەر شوێنێکی پەرەگرافەکەدا بێت، بەلام بەگشتی بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت: لە وتارەکاندا، لە پەرەگرافی یەکەمدا، یاخود لە کۆتا پەرەگرافدا. لە کتێبدا، یان لە چاپتەری یەکەم یان لە چاپتەری دووەم، یاخود لە هەردووکیاندا. چەند گوزارەیەک هەن کە بە هۆیانەوە دەتوانین دەرئەنجامەکان بناسینەوە، لەوانە: *لەبەر ئەم هۆیانە کەواتە، هەر بۆیە، کەواتە، لە دەرئەنجامدا، لەبەر ئەمە.*

١. سەرنجی ئاوەڵناوە ژمارەییەکان بدە لە ڕستە سەرەکییەکان و دەرئەنجامەکاندا: ئایا نووسەر وشەی *هەموو* بەکاردێنێت کاتێک باسی کەس و شتە دیارەکان دەکات؟ یاخود دەڵێت، زۆربەی هەرەزۆری، بەشێکی زۆری، هەندێکی، کەمێکی، تەنها بەشێکی دیاریکراو؟ ئایا ئەو دەڵێت، گشت کات، عادەتەن، هەندێک کات، جاروبار، بەدەگمەن، هەرگیز؟ زۆر کات نووسەرەکان لە شوێنێکدا جەخت لەسەر شتێک دەکەنەوە، بەلام لە ڕستەی دواتردا پارسەنگی ئەم جەختکردنەوەیە دەدەنەوە. لەم کاتانەشدا ئەم چەشنە وشانە بەکار دەهێنن: *بەلام، هەرچەندە، لەگەل ئەمەشدا، لە گۆشەنیگایەکی ترەوە، هێشتا، بەلام لەگەل ئەمەشدا.*

٢. سەرنج بدە لە جۆر و بڕ و سەرچاوەی بەڵگەکان کە بەکار هاتوون بۆ پشتڕاستکردنەوەی بانگەشەکان: ئەگەر بە پێویستی دەزانیت، بۆ تێگەیشتن لەم خاڵە بگەڕێرەوە بۆ چاپتەری شەش کە بە درێژی باسی بەڵگە و جۆرەکانی کراوە.

١. سەرنج لەو مەرجانە بدە کە نووسەر ئاماژەیان پێ دەدات: بۆ نموونە، "بازرگانی ماددە هۆشبەرەکان دەبێت سزای زیندانیی دووروودرێژیان بەسەردا بسەپێنرێت، ئەگەر خۆیان ماددەکە بەکار نەهێنن و لە پێشتریشدا تاوانبار کرابن بە بازرگانیکردن بەو ماددانەوە." لەدوای ڕستەی "بازرگانی ماددە هۆشبەرەکان دەبێت سزای زیندانیی دووروودرێژیان بەسەردا بسەپێنرێت،" ئاماژە بە "ئەگەر" کراوە تا مەرجەکانی سزادانەکە دەستنیشان بکات. یان بۆ نموونە کە دەڵێن، "ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، هەرگیز نابێت بە بۆمبی ئەتۆم هێرش بکاتە سەر هیچ وڵاتێک، ئەگەر هات و بەم بۆمبە هێرش نەکرابێتە سەری." ئەم ڕستەیە زۆر جیاواز دەبێت ئەگەر ئاماژە بە وشەی "ئەگەر" نەدەین و بڵێین: ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، هەرگیز نابێت بە بۆمبی ئەتۆم هێرش بکاتە سەر هیچ وڵاتێک. هەر بۆیە دەبێت سەرنجی

تایبەت بخەینە سەر وشە مەرجییەکان، وەکوو: *ئەگەر، تاوەکوو، تا ئەوکاتەی، پێش ئەوەی، دوای ئەوەی.*

٢. پووختەیەک بۆ ئەو کتێب و وتارانە بنووسە کە دەیانخوێنیتەوە، بە سوودوەرگرتن لە پێنج خاڵەکەی پێشوو: نووسینی ئەم پووختەیە هاوکاریت دەکات کە ئارگۆمێنتە سەرەکییەکان بناسیتەوە و شییان بکەیتەوە. ئەم پووختەیە، مەرج نییە درێژ بێت، لە زۆر حاڵەتدا پەرەگرافێک یان دووان بەسە. بەڵام مەرجە لە کاتی نووسیندا ڕێکاوڕێک لە نووسینە ئەسڵییەکەوە سەرچاوە بگرێت. (بۆ نموونە کە دەقە ئەسڵییەکە دەڵێت، شتێک ڕەنگە وا بێت، جیاوازە لەوەی کە تۆ بڵێیت ئەو شتە وایە، یان کە دەقەکە دەڵێت پێویستە فڵان شت بکرێت، جیاوازە لەوەی کە بڵێت باشترە بکرێت). ئەمەی خوارەوە پووختەی بابەتێکە کە زیاد لە دە پەڕە دەبێت لەسەر پشتگیریکردن لە لابردنی سیستەمی هەڵسەنگاندنی قوتابی بە نمرە، بەبێ ئەوەی لە ئەسڵی نووسینەکەش لا بدات:

یەکێک لە گەورەترین لەمپەرەکانی بەردەم فێربوون لە قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییدا بریتییە لە سیستەمی هەڵسەنگاندنی قوتابی بە نمرە. ترسی بەدەستهێنانی نمرەی کەم، خەیاڵ و ئەقڵی قوتابی داگیر دەکات هەر لە تەمەنی شەش ساڵییەوە تا بیست یان بیست و دوو ساڵی. ئەوان ئەوەندە لە قەلەقی ئەوەدان کە بە هۆی نمرەی بەرزەوە دڵی دایک و باوکیان خۆش بکەن، هەرچی چێژ و لەزەتی فێربوون هەیە، لەدەستی دەدەن. لە دەرئەنجامدا، قوتابییە بەتواناکان خەیاڵیان تەنها گیرۆدەی نمرەی بەرز دەبێت، قوتابییەکانی تریش لەپێناو نمرەدا، ناچارن پەنا بەرنە بەر غەش و قۆپیە. لەبەر ئەم هۆیانەی باس کران، من دەڵێم، پێویستە ئەم سیستەمە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا لا ببرێت.

# ڕاهێنانەکان

١. لە ڕاهێنانی چاپتەری شازدەدا، کۆمەڵێک کێشە باس کراون، تۆ کێشەی یەکەم یان دووەم هەڵبژێرە، ئەو هەنگاوانەی بەسەردا جێبەجێ بکە، کە لەم چاپتەرەوە فێری بوویت.

٢. لەنێوان بابەتەکانی لەشفرۆشی، یاریی بۆکسێن، تاوانی نەوجەوانی، کە لە چاپتەری شازدەدا باس کران، یەکێکیان هەڵبژێرە و لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەنجام بدە لەبەر ڕۆشنایی ئەم چاپتەرەدا.

٣. بابەتێک هەڵبژێرە کە جێی مشتومڕ بێت لە زانکۆ، یان لەناو کۆمەڵگەدا. بۆ نموونە، یاسایەکی نوێ کە جێی مشتومڕ و ناکۆکیی لایەنە جیاوازەکانە، پاشان لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ئەنجام بدە، بەم شێوازەی خوارەوە.

a. سەردانی سایتی www.google.com بکە و بە شێوەیەکی گشتی و لە بەشی هەواڵەکاندا بەدوای سەرچاوەدا بگەڕێ لەسەر بابەتەکە.

b. سەردانی ئەم وێبسایتانەی خوارەوە بکە، بە لایەنی کەمەوە دوو ستون بخوێنەرەوە کە پشتگیری پڕۆژە یاساییەکە دەکات و دوو ستونیش کە ڕەخنەی پڕۆژەیاساکە دەکات. {یاسای خۆپیشاندان، لە هەرێمی کوردستان، نموونەیەکی باشە، بەلام ڕەنگە باشتر وا بێت لە وێبسایتە خۆماڵییەکاندا گەڕان ئەنجام بدرێت، نەک ئەمانەی خوارەوە}.

http://www. townhall. com/columinist

http://www. nytimes. com/pages/opinion/colummus

http://www. washingtonpost. com/wp-dyn/opinion/columns

http://www. jewshwoldveiw. com

http://www. blueagle. com

http://www. nyobserver. com

c. تێبینیی خۆت لەسەر هەموو ئەو شتانەی دەیانخوێنیتەوە، تۆمار بکە.

.................................................................................................................

# چاپتەری هەژدەیەم

## دارِشتنی حوکمدان Forming a judgment

حوکمــدان، {بریــاردان یــان دادوەری} ئــەو دەرئەنجامانــەن کــە بەدەســت دەهێنرێـن بـە هـۆی لێوردبوونـەوەی بەڵگـەکان و بیرکردنـەوەی وردەوە. حوکمدانــەکان بەرهەمــی بیرکردنــەوەن. بــە پێچەوانــەی هەســتکردنەوە، حوکمەدانــەکان لەپڕ و بــێ بیرکردنــەوە نیــن. بەدڵنیاییــەوە حوکمدانــەکان ڕێـی تێدەچـێ هەندێ بنەمـای لەپڕ لەخۆ بگرن وەکوو "ئینتوشـن،" بـەڵام وەکـوو هــەر داتایەکـی تـر، ئەوانیـش لەپێشـدا دەبێت شـی بکرێنـەوە و هەڵبســەنگێنرێن.

ئەو ڕاستییە کە حوکمدانەکان دەرئەنجامی هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوەن، گەرەنتـی نرخـی هەمـوو حوکمدانێک نـاکات. لەنـاو حوکمدانەکانـدا، حوکمـی گەمژانـە هەیـە، هــەر وەکـوو چـۆن حوکمـی ژیرانـەش هەیـە، حوکمـی سـەرپێی هەیـە هـەر وەکـوو چـۆن حوکمدانـی قووڵیـش هەیـە. حوکمدانێک دەشـێت بنیـات بنرێـت لەســەر هەڵەتێگەشـتنی ڕاسـتی، مەعریفـە، هەروەهـا بۆچوونـەکان. جگـە لـەوەش، ڕێـی تێدەچێـت زیـاد لـە هەڵەیـەک لەنـاو بیرکردنـەوەی ئـەو حوکمـەدا هەبێـت.

ئــەو ســتراتیجییانەی کــە ئێمــە گرتوومانەتــە بــەر بــۆ قســەکردن لەســەر

بیرکردنەوەیەکی ڕەخنەییانە لەسەر کێشەکان، بۆ ئەوە بووە تا ئەو حوکمانەی دەیدەین، هۆشمەندانە بن. ئێمە بە ناسینی خۆمان و بوونمان بە چاودێر، دیدگەمان گەشە پێ دەدەین و خۆ دەپارێزین لە هەڵەکان. بە شیکردنەوەی کێشەکان بە شێوەیەکی سیستەماتیکی و بە ئاراستەکردنی وردبوونەوەمان، بیرکردنەوەکانمان دەپارێزین لە ئایدیا کرچوکاڵەکان و لە بەرکەوتنە سەرەتاییەکان. first impressions بە هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگانەی کە لە بەردەستماندایە، تێدەگەین کە ئەو بەڵگانە چ مانایەکیان هەیە و تا چ ڕادەیەکیش گرنگن. یەکێک لە ڕەهەندە گرنگەکانی ئەم هەڵسەنگاندنە، بریتییە لە هێورکردنەوەی ئەو گرژییانەی کە لەبنی بەڵگەکاندا هەیە. هەر وەکوو بینیمان لە چاپتەرەکانی پێشووتردا، پسپۆڕەکان هەموو کات کۆک نین. چونکە خەڵک زۆر جار سەیری یەک ڕووداو دەکەن بەلام لە دیدی جیاوازەوە، تەنانەت جیاوازی لەنێوان گێڕانەوەی شایەتحاڵە ڕاستگۆکانیشدا ڕوو دەدات.

دیدێکی باو هەیە کە دەڵێت، هەتا پرۆسیجەرەکە {ڕێبازەکە} زانستیتر بێت، کەمتر پێویست بە هەڵسەنگاندن دەکات. بەلام ئەم دیدە بە هەڵەدا چووە. پرۆسیجەری زانستی، زانیاری ڕاست بەرهەم دەهێنێت یان دەدۆزێتەوە کە دەبێت پۆلێن بکرێن و شی بکرێنەوە تا مانادار بن. با ئەم کەیسە سەیرە لە بەرچاو بگرین. لە ناوەڕاستی چیندا ژێرزەمینێکی کۆن دۆزرایەوە کە تەرمی ژنێکی تێدا بوو کە نزیکەی بەر لە ٢١٠٠ ساڵ لەمەوپێش مردبوو. زۆر شت لە بەرچاو گیرابوو لە بەخاکسپاردنەکەیدا. لە کفنێکی توندوتۆڵیان نابوو کە پڕ کرابوو لە شلەیەکی تایبەت. کفنەکە خرابووەوە ناو پێنج بۆکسی گەورەوە کە داپۆشرابوون بە پێنج تەن لە خەڵووز. گەورەترین سندوقیان بە قووڵیی شەست پێ لە چاڵ نرابوو و بە خۆڵێکی سپی دەورە درابوو.

لەبەر ئەوەی بەو شێوە سەرنجڕاکێشە لە گۆڕ نرابوو، کە لاشەی ژنەکە دۆزرایەوە، گۆشتەکەی هێشتا شێدار بوو، هێشتا قژ بە سەریەوە بوو، جوومگەکانی دەنوشتانەوە، زۆربەی ئەندامەکانی ناوەوەی هێشتا خراپ نەببوون. پسپۆڕەکان تەشریحێکی ورد و بەئاگایان کرد. شیکارێکی کیمیاییان بۆ هەموو ئەم ئەندامانەی ژنەکە کرد: قژ و گەدە و ماسولکەکان و ئێسکەکان و سییەکان و زراو، هەروەها ڕیخۆڵەبچکۆلە. تیشکی ئێکسیان لە ئێسکەکانی دا. بەڵام دەبوو هەموو ئەو فاکتانەی بەدەستیان هێناوە، *ڕاڤە* بکرێن تا سوودیان لێ ببینرێت. تەنها لە ڕێگەی شیکارکردنی داتاکان و پرسیارکردن لەسەر ئەو داتایانە و بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە کام حوکمدان ژیرانەترینیانە، دەیانتوانی بڕیار لەسەر ئەوە بدەن، کە بۆ نموونە ژنەکە منداڵی بووە، لیمۆی خواردووە ماوەیەکی کەم پێش مردنەکەی و ڕەنگە مردنە کتوپڕەکەشی بەهۆی جەڵدەی دڵەوە بووبێت.

هەڵسەنگاندن evaluation ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگی هەیە نەک تەنها لە زانستدا، بەڵکوو لە بوارەکانی تریشدا. لە ڕاستیدا زانیارییەکان لە بوارەکانی تردا بەراورد بە زانست دەشێت زیاتر ناڕوون یان ناتەواوتر بن، وە ڕاکانیش لەم بوارانەدا توندتر بەر یەک دەکەون، هەر بۆیە نۆعییەتی حوکمدان لەم بوارانەدا، بەتوندی پشت بە هەڵسەنگاندن دەبەستێت.

## هەڵسەنگاندنی بەڵگە Evaluating evidence

هەڵسەنگاندنی بەڵگەکان پێک دێت لە کردن و وەڵامدانەوەی پرسیارە دروستەکان. لە چاپتەری شەشدا قسەمان لەسەر حەوت جۆر بەڵگە کرد، و هەروەها ئەو پرسیارانەی کە دەبێت بکرێن بۆ هەڵسەنگاندنی هەریەکەیان. لێرەدا پووختەیەکی ئەو باسە دەخەینە ڕوو.

| جۆری بەڵگەکان | پرسیارەکان |
|---|---|
| ئەزموونی شەخسی (هی خۆت و ئەوانی تریش) | ئایا ئەزموونەکان ئاسایین یان شازن؟ ئایا لە ڕووی چۆنیتی و چەندێتییەوە بەشی پشتڕاستکردنەوەی دەرئەنجامەکە دەکەن؟ |
| ڕاپۆرتێک کە بڵاو نەکرابێتەوە | لە کوێ چیرۆکەکە وەر گیراوە؟ چۆن دڵنیا بم لە ڕاستیی ئەو گێڕانەوەیەی کە من بیستوومە؟ |
| ڕاپۆرتێک کە بڵاو کرابێتەوە | ئایا ئەو سەرچاوانەی کە زانیارییە گرنگەکانی لێ وەر گیراوە، خراوەتە ڕوو؟ ئایا نووسەرەکە خاوەن ناوبانگێکی باشی هەیە لە نووسینی ڕاپۆرتدا؟ ئایا ئەو چاپخانەیەی کە بڵاوی کردۆتەوە، متمانەپێکراوە؟ کام برگەی ڕاپۆرتەکە لای کەسێکی ژێر جێی گومانە؟ ئایا نووسەرەکە تا چ ئەندازەیەک وەڵامی ئەو گومانانە دەداتەوە؟ |
| گەواهیدانی شایەتحاڵ( شهود للعیان) | ئەم حاڵەتانە چین کە ڕەنگە بینینی شایەتحاڵەتەکەیان شێواندبێت؟ هیچ شتێک لە ماوەی نێوان ڕوودانی ڕووداوەکە و کاتی گێڕانەوەکەیدا ڕووی داوە، کە کاریگەری لەسەر چۆنێتیی گێڕانەوەکە هەبێت. |

| | |
|---|---|
| گەواهیدانی کەسێکی بەناوبانگ | ئایا لە ڕیکلامەکاندا ئەوە کەسە بەناوبانگەکان نین کە بە پارە ڕیکلام دەکەن؟ لە بەرنامە گفتوگۆییەکاندا کەسە بەناوبانگەکە هیچ پاڵپشتییەک دەخاتە ڕوو بۆ سەرنجەکانی، بۆ نموونە ئاماژەدان بەو لێکۆڵینەوانەی کە لەلایەن کەسە شارەزاکانەوە ئەنجام دراون؟ ئایا پێشکەشکاری بەرنامەکە داوای وەها پاڵپشتییەک لە گەواهیدەرەکە دەکات؟ |
| بۆچونی پسپۆڕەکان | ئایا ئەو کەسە خاوەن پسپۆڕییەکی *تایبەتە* سەبارەت بە بابەتی قسەلەسەرکراو؟ ئایا پسۆڕەکە بۆچوونەکانی بە لێکۆڵینەوە تازەکان پشتڕاست دەکاتەوە؟ ئایا پسپۆڕانی دی کۆکن یان ناکۆکن لەسەر بۆچوونەکانی ؟ |
| تاقیکردنەوە | لە تاقیکردنەوەکانی تاقیگەدا، ئایا لێکۆڵەرەوەکانی تریش گەیشتوونەتە هەمان دەرئەنجام؟ لە تاقیکردنەوەکانی دەرەوەی تاقیگەدا، ئایا هەموو لێکۆڵەرەوەکان گەیشتوونەتە هەمان دەرئەنجام؟ |
| statistics ستاتیستیکەکان | ئایا سەرچاوەی ستاتیستیکەکان جێی متمانەیە؟ |

**راپرسی**

ئایا سامپڵەکان گوزارشتکەر بوون بە شێوەیەکی دروست؟ واتە ئایا هەموو دانیشتووان هەمان چانسی بەشداریکردنیان هەبووە؟ ئایا پرسیارەکان روون و نائاڵۆز و بابەتییانە دارێژرابوون؟ لە راپرسیی پۆستدا، ئایا ژمارەیەکی بەرچاو بێ وەلام بوون؟ هەروەها، ئایا راپرسییەکانی تر هەماهەنگی لەگەڵ دەرئەنجامەکانی راپرسییەکەدا دەکەن؟

**لێکۆڵینەوەی فەرمی**

ئایا ئەوەی کە بەراستی رووی داوە، نەشێوێندراوە لەلایەن چاودێرەکانەوە؟ ئایا ماوەی لێکۆڵینەوەکە ئەوەندە درێژ بووە کە گونجاو بێت بۆ گەیشتنە ئەو دەرئەنجامانەی کە بەدەست هاتوون؟ ئایا دەرئەنجامەکان نەگشتێنراون؟

**هەڵسەنگاندن**

ئایا دەرئەنجامەکانی هەڵسەنگادنەکە ناکۆک نین لەگەڵ ئەوەی ناو لێکۆڵینەوەکە خۆی؟ ئایا رەخنەگرەکان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی پەیوەندیداریان بە بابەتەکەوە فەرامۆش نەکردووە؟

یەک پرسیاری تر کە بەسەر هەموو جۆرەکانی بەڵگەدا دەچەسپێت: ئایا بەڵگەکە *پەیوەندیدار*ە بەو بابەتەی لەژێر لێکۆڵینەوەدایە؟ ئەگەر پەیوەندیدار نەبوو، شیاوی هیچ نرخپێدانێک نییە، با زۆر نایابیش بێت لە رەهەندەکانی ترەوە.

## هەڵسەنگاندنی سەرچاوەی ئارگۆمێنتەکانت

جگە لە هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگانەی کە بەدەستت هێناوە، تۆ دەبێت ئەو ئارگۆمێنتانەش هەڵبسەنگێنی کە ئەوانی تر دایان هێناوە. لە چاپتەری حەوتدا، ڕێگەیەک خراوەتە ڕوو کە هاوکاریکەرە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو ئارگۆمێنتانەی کە لە پەرەگرافێک زیاترن، ئەویش بە *کورتکردنەوەیان* تا ئاسان کۆنترۆڵ بکرێن. وە لە چاپتەری حەڤدەدا بە دووروودرێژی چۆنێتیی کردنی ئەم کارە بە شێوەیەکی کاریگەر خراوەتە ڕوو. با ئێستا ببینین کە چۆن کورتکردنەوە بەکار دێت بۆ *هەڵسەنگاندنی* ئارگۆمێنت. یەکەم کورتکردنەوەیەک کە لێی دەکۆڵینەوە لە چاپتەری حەڤدەدا خراوەتە ڕوو. بۆ ئاسانکردنی شێوازی ئاماژەپێدان، هەمان ژمارە دانراوە بۆ کورتکردنەوەکە و ئەوپرسیارەی کە ئاراستەی دەکرێن.

## کورتکردنەوەکان The summary

١. یەکێک لە گەورەترین ڕێگرەکان لە بەردەم فێربووندا_لە قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و زانکۆدا، بریتییە لە نمرە.

٢. ترسی نمرە-کەمهێنان هەر لە شەش ساڵییەوە تا تەمەنی ٢٠ یان ٢٢ ساڵی لە مێشکی قوتابییەکاندا دەچێنرێت.

٣. دڵەڕاوکێیان بۆ باشبوون، سەرکەوتن و ڕازیکردنی دایک و باوکیان، بە شێوەک ئەخرێتە مێشکیانەوە، کە هەموو چێژە خۆڕسکەکانی فێربوون لەدەست دەدەن.

٤. لە ئەنجامدا قوتابییە جیدییەکان وایان لێ دەکرێت، ئەرکەکانی ماڵەوەیان تاقەتپڕووکێن ببینن کە بەزۆر سەپێنراوە بەسەریاندا، قوتابییە لاوازەکانیش هەوڵ ئەدەن غەش بکەن و بە فڕوفێڵ نمرەیان دەست بکەوێت.

٥. لەبەر ئەم هۆیانە، من لەو باوەڕەدام کە باشترە نمرە لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا لا ببرێت.

## پرسیارەکان

١. ئایا نمرە ڕێگرە لە بەردەم فێربووندا؟ ئەگەر وایە، ئایا لە هەموو قۆناغەکاندایە؟

٢. ئایا هیچ قوتابییەک هەیە لە بەینی ئەم تەمەنانەدا {٦ تا ٢٢} لە بەدەستهێنانی نمرەی کەم بترسێت؟ ئایا هەر هەموویان دەترسن؟ ئایا ئەم ترسە ئەبێتە مۆتەکە بۆ گیانی قوتابییان (واتە ئەو ترسە بەدرێژاییی هەموو پرۆسەی فێربوون لەگەڵیاندایە؟)

٣. ئایا چوونە ناو پرۆسەی فێربوونەوە، هاوڕێیە لەگەڵ چێژێکی خۆڕسک؟ ئایا ئەم چێژە لە فێربوونی هەموو بابەتەکاندا هەیە؟ ئایا نمرە دەبێتە هۆی دڵەڕاوکێ؟ ئەگەر وایە، ئایا ئەم دڵەڕاوکێیە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو چێژە خۆڕسکە؟ ئایا ئەم حاڵەتە بۆ هەموو قوتابییەکان ڕاستە؟

٤. ئایا هیچ قوتابییەکی جیدی هەیە کە وا هەست بکات ئەرکەکانی قوتابخانە تاقەتپڕووکێنە و بەزۆر سەپێنراوە بەسەریدا؟ ئایا زۆربەیان لە هەموو کاتێکدا وای دەبینن یان تەنها لە هەندێک بارودۆخدا؟ ئەگەر ئەرکەکانیماڵەوەیان بەو شێوەیە ببینن، ئایا ئەمە بە هۆی نمرەوەیە؟ ئایا هیچ قوتابییەکی لاواز هەیە کە هەوڵ بدات بە فێڵ و تەڵەکەبازی نمرە بەدەست بهێنێت؟ ئایا هەموویان ئەو هەوڵە دەدەن؟ ئەگەر هەندێکیان ئەو هەوڵە بدەن، ئایا نمرە هۆکارەکەیەتی؟

٥. ئایا نەمانی نمرە، ئەم کێشانە چارەسەر دەکات؟ ئایا هەندێکیان چارەسەر دەکات؟ ئایا تەنانەت کێشەکانیش زیاتر ناکات؟ ئەگەر وا بێت، ئایا دەرئەنجام باشتر دەبێت یان خراپتر؟ ئایا کاریگەرییەکانی جیاواز

دەبێت بەپێی قوناغەکانی خوێندن؟

ئەمەش نموونەیەکی ترە: وەڵامی ساکۆلیتجیست و نووسەری ناسراو "جۆیس برازەر" بۆ پرسیاری یەکێک لە خوێنەرەکانی. لە بەر کورتیی وەڵامەکە، پێویست بە کورتکردنەوە ناکات. هەر وەک نموونەکەی پێشوو، وەڵامەکانی دکتۆر و شیکردنەوەی وەڵامەکان بە ژمارە پۆلێن کراون.

## کورتەی بابەتەکە

*خوێنەرەکە (کە ژنێکە) لە نامەکەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە:*

لەگەڵ پیاوێکی هاوڕەگەزبازدا کار دەکات و پەیوەندییەکی ئەفلاتونیی لەگەڵدا دروست کردووە. بەڵام پیاوی ژنەکە بەم پەیوەندییە ڕازی نییە و بە پیاوە هاوڕەگەزبازەکە دەڵێت، "نەخۆش،" وە بە قسەکردنی ژنەکەی لەگەڵ پیاوە هاوڕەگەزبازەکەدا بە تەلەفون، تووڕە دەبێت. (ئەمە هەموو ئەو زانیارییانە بوون کە لە نامەکەدا بڵاو کرابۆوە.)

*لە وەڵامەکەیدا، دکتۆر نووسیویەتی کە:*

١. لە تێگەیشتنی دکتۆردا، مێردی ژنەکە دەترسێت لە "هاوڕەگەزبازێتی" homosexuality.

٢. وەک هەموو ئەو کەسانەی کە فۆبیایان هەیە بەرامبەر هاوڕەگەزبازێتی، هۆکاری سەرەکیی ترسی مێردی ژنەکە ئەوە نییە کە پیاوە هۆمۆکە پێشنیاری پەیوەندیبەستنی بۆ بکات، بەڵکوو ترسی گەورەکەی پەیوەندیی بەو ئیگۆیەوە هەیە، ترسی ئەوەی کە ئەمیش تا ئاستێک هەندێک سیفەتی "مێیینانەی" هەبێت و ئەو سیفەتانەی ئاشکرا بێت.

٣. ترس لە هاوڕەگەزبازی دەشێت دەرئەنجامی ترسناکی هەبێت. بۆ نموونە، لەم کەیسەدا کە ڕەنگە ببێتە هۆی لاوازکردنی ژیانی هاوسەرگیرییان.

٤.	باش وایە ژنەکە بە شێوەیەکی تێروتەسەل کێشەکە لەگەڵ مێردەکەیدا باس بکات، وە هانی بدات کە بە شێوەیەکی ئاقڵانە لە هەستەکانی بکۆڵێتەوە.

٥.	ئەم ڕێگەیە ڕەنگە هاوکارییەکی باشی مێردی ژنەکە بکات تا تێگەیشتنێکی زیاتر لەسەر کێشەکە بەدەست بهێنێت.

٦.	ئەگەر بە هۆی هەندێک هۆکارەوە ئەم شێوازە دەرئەنجامی خوازراوی لێ نەکەوتەوە بۆ ژنەکە، پێویستە ژنەکە هانی مێردەکەی بدات تا سەردانی ڕاوێژکارێک بکات، وەک هەڵێک تا مێردەکەی شێوازی بیرکردنەوەی بگۆڕێت.

٧.	دەرئەنجامی ڕاوێژکردنەکە هەرچییەک بوو، پیاوەکە بێتە سەر هەمان ڕێگەی بیرکردنەوەی هاوسەرەکەی یان نا، ژنەکە باش وایە پەیوەندییەکەی لەگەڵ پیاوە هاوڕەگەزبازەکەدا درێژە پێ بدات.

## پرسیارەکان

١. ئایا پیاوی ژنەکە لە هۆمۆسێکسوالیتی دەترسێت، تا قەلەقی دەرکەوتنی سیفەتە هۆمۆکانی خۆی بێت؟ ڕەنگە، بەلام نامەکە لێکدانەوەیەی تریش هەلدەگرێت. ئاشکراترینیان ئەوەیە کە ئەو تووڕەیە، بگرە غیرەش دەکات، کە دەبینێ هاوسەرەکەی زیاتر کات بۆ پیاوکی تر تەرخان دەکات وەک لەم.

دکتۆر بروزەر ئاماژە بۆ ترس لە هۆمۆسێکسوالیتی دەکات بە شێوەیەکی گشتی، بە شێوەیەک، کە ئاراستەی گفتوگۆکە دەباتە ئاستێکی زوور تاکەکەسییەوە {شەخسییەوە} individual. ئەو ئەگەرە لە بەرچاو ناگرێت کە ڕەنگە کەسێک ترسی لە هۆمۆسێکسوالیتی بگەڕێتەوە بۆ کات;کی دوور {واتە بۆ سەردەمی مندالی}. بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە دەستدرێژییان کراوەتە سەر لەلایەن هۆمۆسێکسوالەکانەوە کاتێک کە مندال بوون؟ ئایا ئاسایی نابێت کە بترسن لە دووبارەبوونەوەی ئەزموونە تالەکانیان، هەر وەک چۆن ئەوانەی کە لەلایەن ڕەگەزی بەرامبەریشەوە دەستدرێژییان کراوەتە سەر، لە دووبارەبوونەوەی ئەزموونەکەیان بترسن؟ ڕێی تێدەچێ کە ترسی لە ئیگۆی {پیاوەتی} خۆی هەبێت بە هۆی ئەگەری هەبوون و دەرکەوتنی سیفەتە مێیینەکانیەوە، بەلام کەمی ئەو زانیارییانەی لە نامەکەدا نووسراون، *دلنیامان ناکاتەوە* کە حالەتەکە ئەوە بێت.

٣. هیچ کەسێکی ئەقڵکار ئەو ئەگەرەی سەرەوە ڕەت ناکاتەوە.

٤. ژنەکە بۆ چ مەبەستێک کێشەکە لەگەڵ پیاوەکەیدا باس بکات: ئایا تا داوا لە مێردەکەی بکات هەست و تێگەیشتنەکانی خۆی لەسەر کێشەکە بخاتە ڕوو، ئەمەش بەو نیازەی کە ژنەکە شتێک فێر بێت، یان هەر لە سەرەتاوە ژنەکە بڕیاری پێشوەختەی خۆی لەسەر بۆچوون و هەستەکانی مێردەکەی خۆی داوە؟

٥. ئایا باش وا نییە کە ژنەکەش زۆر ڕاستگۆیانە وەک چۆن لە مێردەکەی چاوەڕێ دەکات کە هەستەکانی خۆی بپشکنێ، ئاواش ئەمیش هەستەکانی خۆی بپشکنێ؟ ئایا باش نییە ئەویش وەک مێردەکەی هەوڵ بدات تا تێگەیشتنێکی نوێ و قووڵتر بەدەست بهێنێ وەک لەو تێگەیشتنەی کە ئێستا هەیەتی؟

٦. ئایا ڕاوێژکردن دەرئەنجامی باشی دەبێت ئەگەر یەکێک لە دووانەکە {ژن یان پیاوەکە} گەیشتبێتە ئەو بڕوایەی کە ئەم بەتەواوەتی ڕاستە و ئەوی تریش بەتەواوەتی هەڵەیە؟

٧. ئایا درێژەپێدانی پەیوەندییەکی هاوڕێیانە گرنگترە یان پاراستنی پەیوەندیی هاوسەرگیری؟ ئایا بۆ ئەوەی بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە پەیوەندییە هاوڕێیەتییەکە بەنرخترە لە هاوسەرگیرییەکە، پێویستمان بە زانیاریی زیاتر دەبێت لەوەی کە لە نامەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە؟ ئایا یارمەتیدەر نابێت کە بزانین بۆ ماوەی چەندێکە ئەو دووانە لە پەیوەندیی هاوسەرگیریدان؛ ئایا منداڵیان هەیە، ئەگەر هەیانە، لە چ تەمەنێکدان و ئایا پەیوەندییەکەیان هارمۆنی و بێکێشە بووە پێش ئەوەی ئەم حاڵەتە سەر هەڵبدات؟ (ئەگەر پیاوەکە بەتەنگ پەیوەندییەکەیانەوە بێت و ژنەکەی خۆشی بوێت، ئایا ڕێی تێناچێت کە ئەو زیاتر بە هۆی هەستکردن بە پەراوێزخستن و لەدەستدانی ژنەکەیەوە هان دراوە وەک لە ترس لە

هاوڕەگەزبازی؟) ئایا ئاقڵانەیە دکتۆر بڕۆزەر *بڕوا* بهێنێت کە ژنەکە لەگەڵ مێردەکەیدا لەسەر حەق بووە و مێردەکەی لەسەر حەق نەبووە، بێ ئەوەی دکتۆر بزانێت کە چەند جار و لە چ کاتێکی ڕۆژدا و بۆ ماوەی چەندێک ژنەکە بە تەلەفون قسەی لەگەڵ هاوڕێ نێربازەکەیدا کردووە؟ باشە ئەی ئەگەر ژن و پاوەکە هەردوو ئیش بکەن و هەردووکیان بەرپرسیار بن لە کارەکانی ماڵەوە و باوانیدا {واتە ئەو ئەرکانەی کە چ دایک و چ باوک بەرامبەر منداڵەکنیان هەیە}، بەڵام ژنەکە هەموو ئێوارەیەک بە کاژێر قسە لەگەڵ پیاوە نێربازەکەدا بکات؟ ئایا باشترین ئامۆژگارییەک بۆ ژنەکە ئەوە نابێت کە بچێتە لای ڕاوێژکار تا بزانێت هەڵەکانی خۆی چین؟

هەر وەک نموونەکە پیشانی دەدات، کات-تەرخانکردن بۆ کردنی پرسیاری گونجاو، کۆمەڵێک سوودی هەیە. یەکەم، نایەڵێت بە هۆی یەکەم بەرکەوتنت first impression لەگەڵ کێشەکە، حوکمی کرچوکاڵی لەسەر بدەیت. دووەم، ڕێگەت دەدات هەر بەشێکی ئارگومێنتەکە بەجیا هەڵبسەنگێنیت (نەک ڕازی بیت بەوەی کە هەڵسەنگاندنێکی سەرپێیی ئەنجام بدەیت) بۆ ئەوەی هەم خاڵە لاوازەکان و هەم بەهێزەکانیش دیاری بکەیت. لە کۆتاییدا کات-تەرخانکردن بۆ کردنی پرسیاری گونجاو، ستراکچەرێک فەراهەم دەکات کە دەتوانی لە ڕێیەوە بیرکردنەوەکانی خۆتی تێدا ڕێک بخەیت.

ئەو وەڵامانەی کە بۆ پرسیارەکانی بەرهەم دەهێنیت، ئەو وەڵامانەش لەخۆ دەگرێت کە بۆ ئارگومێنتەکە هەتە {واتە ئەو وەڵامانەی کە بۆ پرسیارەکانی بەرهەم دەهێنیت، ڕەنگدانەوەی تێگەیشتنی تۆیە بۆ ئارگومێنتەکە}. ئەگەر تۆ وەڵامەکانت بنووسیتەوە، ئەوا دەتوانیت دوای شێوەی پرسیارەکانت بکەویت، یان خۆت شێوە ڕێکخستنێکی تر

هەڵبژێریت. بڕیارەکە ئەکەوێتە سەر ئەوەی کە کام ڕێکخستن دەتوانێ هەم لۆجیکانە بێت و هەم ئەو پۆینتانە زەق بکاتەوە کە تۆ دەتەوێت.

## چەند جیاکردنەوەیەکی گرنگ

یەکێکی تر لەو ڕێگە گرنگانەی کە دەبێت لەبەرچاو بگیرێت لە هەڵسەنگاندنی بەڵگە و ئارگۆمێنتەکان، بریتییە لە ئەنجامدانی چەند جیاکارییەکی گرنگ. جۆری ئەو جیاکارییەی کە پێویستە بکرێت، دەکەوێتە سەر حاڵەتەکە. بە هەرحاڵ، ئەمانەی خوارەوە شەش جۆرن لەو جیاکارییە گرنگانەی کە زۆر گرنگن ئەنجام بدرێن بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵسەنگاندنی هەڵە.

١. *لەنێوان خاوەن ئایدیاکە و و ئایدیاکەدا*: تێکەڵکردنی خاوەن ئایدیاکە بە خودی ئایدیاکە زۆر ئاسانە. بۆ نموونە، ئێمە حەز دەکەین هەڵەکانی هاوڕێکانمان لەبەرچاو نەگرین بەڵام لە هەڵەکانی لایەنی بەرامبەردا زیادەڕۆیی بکەین، هەر بۆیە ئێمە ئارەزوو دەکەین ئەو ئایدیایانەمان پێ باش بێت کە خاوەنەکانیمان خۆشەوێن و پەسەندیان دەکەین و ئەو کەسانەشی خۆشمان ناوێن، بەپێچەوانەوە. بە هەمان شێوە مەیلی ئەوە دەکەین کە ئایدیای ئەو کەسانە فەرامۆش بکەین کە پێمان وایە زەرور نییە خاوەن ئایدیا بن لەسەر هەندێ بابەتی دیاریکراو_بۆ نموونە، ئەکادیمییەکی سپییێست لەسەر مێژووی ئەمەریکییە ئەفەریقییەکان ئایدیای هەبێت یان پیاو لەسەر کێشەکانی "ژنان" ئایدیای هەبێت، ئەم جۆرە کاردانەوانە نائەقڵانین، چونکە ئایدیاکان هاومانا نین بە خاوەنەکانیان{هاوبەها نین}؛ خەڵکە پەسەندکراوەکان ڕەنگە هەڵە بن، وە کەسە نەخوازراوەکان ڕەنگە لەسەر هەق بن. وە هەروەها، ڕەگەز، ڕەنگی پێست، نەتەوە، یان ئایینی کەسەکە، ئەمانە هەموو بنەمای دروست نین تا بە هۆیانەوە ئایدیاکانی قبوڵ یان ڕەت بکرێتەوە. ئەشێ پیاوێک پسپۆڕی فێمینیزم بێت (یان

لەو بوارەدا ببێتە *فیمەنیست*)، یان ئەکادیمییەکی سپیپێست شارەزا بێت لە مێژووی ئەمەریکاییە ئەفەریقییەکان (وە بەپێچەوانەشەوە). هەروەها بودیستێکی چینی دەتوانێت بەشدارییەکی دەوڵەمەندکەری لە پرۆتستانیزمی ئەمەریکیدا هەبێت. هەر بۆیە باش وایە هەوڵی جیدی بدەین و نەیەڵین شیکاری ئایدیاکان تێکەڵ بکەین بەو هەستەی لەسەر خاوەن ئایدیاکان هەمانە.

٢. *لەنێوان ئەوەی کە چی وتراوە و چۆن وتراوە:* رووکار و ناوەرۆک دوو شتی زۆر جیاوازن. بەداخەوە، ئەو کەسەی کە زۆر بەڕوونی و زۆر بەشیرینی دەدوێت، هەموو کات ئایدیاکانی مەعقولترین ئایدیا نین. کەواتە، هەرچەندە ئاساییە کە بکەوینە ژێر کاریگەریی نووسەر یان قسەکەرە زمانپاراوەکانەوە، بەلام گەمژەییە ئەگەر وای دانێین کە هەموو کات ئایدیاکانیان راستن. هەر وەکوو قەشە ئۆگیستین جارێک وتی، "ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لە مرۆڤدا ئەوە نییە کە چەند زمانپاراوانە دەدوێت، بەڵکوو ئەوەیە کە بە چ بەڵگەیەکەوە قسە دەکات."

٣. *لەنێوان ئەوەی کە خەڵکی بۆچی وا بیر دەکەنەوە و ئایا بیرکردنەوەیان راستە*

شتێکی باوە کە حوکم بەسەر مەبەستەکانی خەڵکدا بدەین لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و کردارنواندیان لەو کاتەدا کە بە چالاکییەکان هەڵدەستن. هەرچەندە ئەم حوکمدانە هەندێک جار بەپەلە دەدرێت، بەلام لە هەندێک کاتی تردا زۆر سوودبەخشە. بۆ نموونە، دەرکەوتنی ئەوەی کە سیناتۆر پەیوەندیی هەیە بە پیشەسازیی بەرهەمهێنانی دەمانچەوە، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کومەڵێک پرسیاری گرنگ دەربارەی ئۆپەزیسیۆن بوونی سیناتۆر لەسەر یاسای کۆنترۆڵکردنی چەک. بەلام گرنگە ئەوەمان

لەیاد بێت، کە مەبەستی ناڕەوا، بەناچاری پۆستەکە پیس ناکات. دروستیی ئایدیایەک ناکەوێتە سەر مەبەستەکانی ئەوانەی کە پشتگیریی لێ دەکەن. بەڵکوو دەکەوێتە سەر ئەوەی کە تا چ ڕادەیەک ئایدیاکە گونجاوە لەگەڵ واقیعی حاڵدا. {ڕەنگە مەبەست لەوە بێت، کە ئایدیایەک دەشێت دروست بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە مەبەستەکانی ئەو کەسانەی کە هەڵگری ئایدیاکەن، لەسەر ئایدیاکە ناشایستە بێت}.

٤. *لەنێوان تاک و گروپ یان پۆلدا*، تاکەکەسێک یان تاکەشتێک دەشێت لە ڕەهەندێک یان زیاتر جیاواز بێت لە گروپێک یان پۆلێک. لەبەر ئەوە، تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی تاک نابێت سەرپێییانە بگەڕێنرێتەوە بۆ گروپ، یان بەپێچەوانەشەوە.

٥. *لەنێوانی بابەتەکانی پەسەندکردن و بابەتەکانی حوکمداندا.* بابەتەکانی پەسەندکردن گرنگی بە حەز دەدەن، کە بێئەنجامە دیبەیتی لەسەر بکرێت. بەڵام بابەتەکانی حوکمدان گرنگی دەدەن بە لێکدانەوەکانی فاکت و تیۆرییەکان، کە ئەمانە دیبەیت هەڵدەگرن. هەر بۆیە گونجاوە پرسیار دەرهەق بە بابەتەکانی حوکمدان بکرێت. {واتە حەزەکان جێگەی ناکۆکی نین، بەڵام حوکمەکان با، بۆ نموونە، دوو کەس لەناو کۆمەڵێ شتدا هەریەکە بۆ خۆی شتێک پەسەند دەکات، یان حەز لە شتێک دەکات، ناکۆکییەکیش دروست نابێت لەسەر ئەوەی کە حەز لەو شتە بکات کە بە پەسەندی دەزانێت. بەڵام ئەگەر بڕیار بوو لەسەر ئەوە بدوێین کە کام شت باشترین شتی ناو شتەکانە، ئەوا لێرەدا بەدڵنیاییەوە قسەکردن لەسەر فاکت و ڕاستییەکان پێویستە. واتە بە مانایەکی تر، ڕەنگە مەبەستی نووسەر ئەوە بێت کە پەسەندکردن پشت بە حەزکردن دەبەستێت نەک ئارگومێنتی ئەقڵی، بەڵام حوکمدان بەپێچەوانەوە، هەر بۆیە یەکەمیان دیبەیت هەڵناگرێت و دووەمیان با}.

٦. *لەنێوان ئاشنایەتی و ڕاستیدا*. کەم حرسکردن لە قبوڵکردن و وەلامدانەوەی ئەوەی کە پێی ئاشناین وەک لەوەی کە پێی ئاشنا نین، شتێکی سروشتییە. لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە ئایدیا ئاشناکان بەناچاری ڕاست بن. بەم پێیە کاتێک حوکم لەسەر دروست بوون، ڕاست بوون دەدەین، باشترە ئاشنایەتی یان نامۆبوون بە ئایدیاکە لەبەرچاو بگرین. ئینجا ئێمە کراوە دەبین بە ڕووی تێگەیشتن لە هەردوو دیوی کێشەکان، نەک تەنیا ئەو دیوەی کە ئێمە پەسەندی دەکەین.

## دەربڕینی حوکمەکان

کرداری دەربڕینی حوکمەکە، دەتوانی خودی حوکمەکە بگۆڕێت. لەبەر ئەوە، چەندێکیش لە زەینتا حوکمەکەت لەسەر کێشەکە ڕوون بێت، باشترین شت ئەوەیە کە تا ئەو کاتەی لە ڕێی وشەکانەوە گوزارشتی لێ دەکەیت، شێوەی دەربڕینی حوکمەکە لەبەرچاو بگریت. ئەم شێوازانەی خوارەوە یارمەتیت دەدەن تا حوکمەکانت بە شێوەیەکی کاریگەر بخەیتە ڕوو:

١. مەشقکردن لەپێناو بەدەستهێنانی دیدێکی هاوسەنگ {بابەتی}.
٢. مامەڵە لەگەڵ ئەگەرەکاندا {لەبەرچاوگرتنی ئیحیتمالەکان}.
٣. لەوە دڵنیا بە کە بابەتەکەت تەواو دیاریکراوە specific.
٤. پێشبینییەکانت بەوردی دەستنیشان بکە.
٥. گشت توانا شیاوەکان درک پێ بکە.
٦. خۆت بەدوور بگرە لە زیادەڕۆییکردن.
با لە نزیکەوە سەرنج لە هەریەک لەو ڕێنماییانەی سەرەوە بدەین.

## مەشقکردن لەپێناو بەدەستهێنانی دیدێکی هاوسەنگ

دیدی هاوسەنگ لەسەر کێشەیەک، ئەوەیە کە هەموو ڕەهەندە ورد و ئاڵۆزەکانی کێشەکە لەبەرچاو دەگرێت. تێڕوانینی زاڵ، کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بیرکردنەوەی زۆربەی خەڵک هەیە، بەتایبەتی کاتێک کێشەکە مشتومڕ- هەڵگرە و ختووکەی عاتیفە دەدات. بەبێ ئەوەی درکی پێ بکەین، خەڵک بە شێوەیەکی گشتی هەڵگری دیدە باوەکانن، هەر بۆیە ئارگۆمێنتە باوەکان و تەنانەت وشە باوەکانیش بەکار دەهێنن. ئەم حاڵەتە تەنانەت جاروبار لەگەڵ بیرکەرەوە ڕەخنەگرەکانیشدا ڕوو دەدات.

لە وەها کاتێکدا، گرووپی بیرکەرەوە لیبراڵەکان liberal thinkers لە گرووپی بیرکەرەوە نەریتخوازەکان conservative thinkers دەچن. بەڵام کاتێک کەسێک لە ڕێی مەشقە عەقڵییەکانەوە مۆدێلەکە تێدەپەڕێنێت {کە مۆدیلی باوە}، وە بە دیدێکی هاوسەنگەوە {بابەتییەوە} لە کێشەکە دەڕوانێت، دەرئەنجامەکەی جیاوازە و چێژبەخشە و زۆرجاریش تێگەیشتنێکی دەڵەمەندکەریشە.

نموونەی کتێبەکەی سەلمان ڕوشدی وەر بگرین *ئایاتە شەیتانییەکان*. زۆر مسوڵمان بەتوڕەییەوە وەڵامی کتێبەکەیان دایەوە، لەو بڕوایەدا بوون کتێبەکە سووکایەتیی کردووە بە دین و پێغەمبەرەکەیان. ئایەتوڵڵا خومەینی زۆر دوور ڕۆیشت و خوێنی نووسەرەکەی حەڵاڵ کرد و هەڕەشەی لە هەرکەسێک کرد کە دەستیان هەبووە لە چاپکردن یان بڵاوکردنەوەی کتێبەکەدا. ئەدیبان و ڕۆژنامەنووسان و ڕۆشنبیران لە وەڵامی ئەو وەڵامە توندەی ئیسلامییەکان، خۆپیشاندانیان ساز کرد و

بەئاشكرا پشتگیری ڕوشدی و بڵاوكەرەوەكەیان كرد. بابەت و مەبەستی ئەو خۆپیشاندان و دروشمانە ئەوە بوو كە ئازادیی ڕادەربڕین مافێكی ڕەهایە {بێ قەیدوشەرتە}.

گومانێک لەوەدا نییە كە ئازادیی ڕادەربڕین پرنسیپێكی بەنرخە، هەروەها وەڵامی خومەینی و شوێنكەوتووانی بۆ ڕۆمانەكەی ڕوشدی، بە هیچ شێوەیەک قابیلی پاساوهێنانەوە نییە. هەر لەبەر ئەوەش بوو كە پاڵنەرێكی گەورە بوو بۆ خەڵكە هەستیارەكان تا پشتگیری ڕوشدی بكەن و خومەینی تاوانبار بكەن بەبێ ڕەچاوكردنی بەرامبەر{فەرامۆشكردنی ئەو ئەگەرەی كە ڕۆمانەكەی ڕوشدی ڕەنگە لە ئازادیی بیروڕای مسوڵمانەكانی دابێت}. (هۆكارێكی تر كە خەڵكی زیاتر سوورتر كرد لەسەر هەڵوێستەكەیان، ئەوە بوو كە خومەینی پێشتر وەک دوژمنێكی ڕۆژئاوا سەیر دەكرا). لەگەڵ ئەوەشدا بەدەستهێنانی ڕۆشنبیرییەكی هاوسەنگ intellectual balance واتە هەوڵێكی ژیرانە، وریایانە بدەیت بۆ خاوكردنەوەی پەرچەكردارەكانمان تەنانەت لە كاتێكیشدا كە لە بەردەم پاڵنەرێكی زۆریشداین بۆ زیادەڕۆییكردن.

بە لایەنی كەمەوە چەند نووسەرێک لەمەڕ ئەم كێشەیەوە ڕۆشنبیرییەكی هاوسەنگیان پیشان دا بەوەدا كە بیریان خستینەوە كە پرنسیپەكانی لایەنی بەرامبەریش هەر وەها گرنگە_لە پێش هەموویانەوە پرنسیپی ڕێزگرتن لە بڕوا دینییەكانی ئەوانی تر. گۆشەنووس جۆن لیۆ نووسیی "لە ڕاستیدا پرنسیپەكەمان {پرنسیپی لێبووردەیی tolerance} ئەوە دەخوازێ كە لە كاتی قسەكردن لەسەر بڕوا دینییەكانی ئەوانی تر ڕێزێكی زۆر پیشان بدەین و پەرچەكردارمان كۆنترۆڵ بكەین." هەروەها پرۆفیسۆر جۆن ئێسپۆسیتۆ "مافی دەستەبەركراو بە هەمواری یەكەم (لە دەستووری ئەمەریكادا. و) مانای ئەوە نییە كە تۆ

چیت پێ خۆش بوو یەکسەر دەری ببڕیت.

*هاوسەنگیی ئەم دیدانە لەوەدایە کە نە نکوڵی لە گرنگیی ئازادیی ڕادەربڕین دەکەن و نە نکوڵی لە ناشرین و نادروستیی هەڕەشەکەی خومەینی دەکەن.*

با ئەم کێشەیەش لەبەرچاو بگرین_کێشەی بنیاتنانی باوەڕبەخۆبوون self esteem {باوەڕبوون بە توانا و بەهای خود}. بۆ زیاتر لە ٢٠ ساڵ، نووسەری کتێبەکانی گەشەکردنی خود self improvement books جەختیان لەسەر گرنگیی باوەڕبەخۆبوون کردۆتەوە، بەتایبەتی لە قۆناغەکانی مێردمنداڵیدا. ئەم جەختکردنەوەیە بە ئەندازەیەک گەورە بوو، کە زۆر کەس لەو بڕوایەدان سەرکەوتن و کەوتن لە قوتابخانە و دواتریش لە ژیاندا، ڕەنگدانەوەی ئەم هۆکارەیە، سیفەتەیە. بە شێوەیەک، کە هەرشتێک وا لە خەڵک بکات مورتاح بن، ئەوا چەپڵەبۆلێدراوە و پەسەندکراوە.

بەڵام باربارا لێرنەر، سایکۆلیجیست و مافناس، توانیی بەرەنگاری توانای ئەم دیدە باوە ببێتەوە و بە شێوەیەکی ڕەخنەیی شیکاری باوەڕبەخۆبوون بکات. دەستکەوتەکەی بریتی بوو لە تێگەیشتنێک، کە پیشانی دەدات باوەڕبەخۆبوونی بەردەوام باش نییە، تەنانەت لە هەندێک کاتدا ڕێگریشە لە بەردەم سەرکەوتندا. جیاوازییەک هەیە کە ئەو درکی پێ کرد لەنێوان باوەڕبەخۆبوونی "بەدەستهاتوو" و باوەڕبەخۆبوونی "هەستکردن-بە باشبوون-لە ئێستادا". ئەوەی یەکەمیان دەتوانێت ببێتە هۆی سەرکەوتن بگرە زۆرباشبوونیش excellence، ئەمە لە کاتێکدا ئەوەی دووەمیان سەر دەکێشێ بۆ قانعبوون و لە دواجاریشدا بۆ کڕکەوتن و وازهێنان لە کێبەرکێ کردن.

بۆ ئەوەی دیدێکی هاوسەنگ بەدەست بێنیت لە کێشەکاندا کە ڕووبەڕووی دەبیتەوە، پێویستە ئارەزووی ئەوە بکەیت کە سەرنج لە دیوە *فەرامۆشکراوەکانی* کێشەکە بدەیت، کاتێکیش کە هۆی عەقڵانی لە بەردەستدایە بۆ *ڕووبەڕووبوونەوەی* دیدە باوەکان، ئەوا ڕووبەڕووی ببەرەوە.

## مامەڵەکردن لەگەڵ ئەگەرەکان Probability

سەرەڕای ئەو هەوڵە زۆرەش کە دەیدەیت لە لێکۆڵینەوەی کێشەکاندا، هەندێک کات ناتوانین بەڵگەی تەواو بەدەست بێنین تا بمانگەیەنێتە حوکمدانێک، کە بەتەواوەتی لێی دڵنیا بین. ئەمە بەتایبەتی ڕاستە بۆ کێشە مشتومڕ-هەڵگرەکان controversial issues. لە وەها کاتێکدا، هەمیشە کەسە نابەرپرسیارەکان دەنگیان بەرز دەکەنەوە و وشەی بەهێزتر هەڵدەبژێرن و *وا پیشان دەدەن* کە گەیشتوونەتە دڵنیایی certainty. ئەمە هەڵەیەکی ترسناکە، یەکەم لەبەر ئەوەی کە خۆنواندن، تەمسیلکردن بەدەگمەن نەبێت، بیرکەرەوە باشەکان چەواشە ناکات. لەوەش گرنگتر، لەبەر ئەوەی لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە ڕاستگۆیەتیی تێدا نییە intellectually dishonest.

تا ئەو شوێنەی کە هەوڵی جیدیی ڕاستگۆیانەی خۆمان دەدەین بۆ بەدەستهێنانی دڵنیایی لە ڕێی بەڵگەکانەوە و درۆ لەگەڵ خۆماندا ناکەین، هیچ شەرمێک لەوەدا نابێت کە بڵێیت "ناتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم کە حوکمی دروست لەم حاڵەتەدا دەبێت چی بێت." نا، بەڵکوو فەزیلەتیشە کە ئەوە بڵێیت. لەوەها حاڵەتێکدا شتێکی تر نییە کە بکرێت، جگە لەوەی بە سیفەتی بوونمان وەکوو بیرکەرەوەی بەرپرسیار کۆک بین لەسەر ئەو دانپیانانە. لەگەڵ ئەمانەشدا، ئێمە ئەوە بڵێین کە کام

حکومـدان بـەراورد بەوانـی تـر ئەگـەری ڕاسـتبوونی لەوانـی تـر زیاتـرە، دیـارە ئەمـەش بەرمەبنـای ئـەو بەڵگانەیـە کـە دەیخەینـە ڕوو.

ڕەنگـە بەڵگـەکان کافـی نەبـن بـەو ڕادەیـەی کـە بەدڵنیاییـەوە حوکـم لەسـەر ئـەوە بدەین کـە جگەرەکێشـان دەبێتـە *هۆی* شـێرپەنجەی سـییەکان، یـان سـەیرکردنی توندوتیـژی لـە تەلەڤیزیۆنـەوە *بەدڵنیاییـەوە* زەرەر بـە بینـەران دەگەیەنێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا، لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا ئەوەنـدە بەڵگـە لـە بەردەسـتدان تـا بڕیـار لەسـەر ئەگـەری بوونـی پەیوەنـدی لـە نێوان هۆ_ ئەنجامدا بدەین{واتـە پەیوەندیی نێوان جگـەرە و شـێرپەنجەی سـییەکان، پەیوەندیـی نێـوان تەلەڤیزیـۆن، زەرەرگەیانـدن بـە بینـەران}.

هەرکاتێـک نەتتوانـی بگەیتـە دڵنیایـی، ئـەوا سـەرنج بخـە سـەر ئەگـەرەکان.

## لـەوە دڵنیـا بە کـە بابەتەکەت تەواو دیاریکراوە specific

ئـەو بابەتـەی کـە حوکمێکـی ورد و بەسـەلیقەی لەسـەر دراوە، تـەواو سـنووردار و دەسـتنیشـانکراوە. سـەرنج لـەم ڕسـتانەی خـوارەوە بـدە کـە تێیـدا بابەتـەکان بـە شـێوەی ئیتالیـک {خـوار} نووسـراون.

*خوێندکارانـی کۆلێج، ئێستا* کەمتر کارامـەن لـە ڕێزمـان و بەکارهێنانـی زمانـدا وەک لـە هاوەڵەکانیـان لـە دە سـاڵ لەمەوپێشـدا.

*خوێندکارانـی کۆلێجـە ئەمەریکییـەکان، ئێسـتا* کەمتـر کارامـەن لـە ڕێزمـان و بەکارهێنانـی زمانـدا وەک لـە هاوەڵەکانیـان لـە دە سـاڵ لەمەوپێشـدا.

*ئێستا خوێندکارانی کۆلێجە ئەمەریکییەکان کە دوو ساڵ دەخوێنن،* کەمتر کارامەن لە ڕێزمان و بەکارهێنانی زماندا وەک لە هاوەڵەکانیان لە دە ساڵ لەمەوپێشدا.

*قوتابییانی ئەم کۆلێجە لە ئێستادا* کەمتر کارامەن لە ڕێزمان و بەکارهێنانی زماندا وەک لە هاوەڵەکانیان لە دە ساڵ لەمەوپێشدا.

ئەگەر بەڵگەکان تەنها ئەو قوتابییانەی گرتەوە کە لە کۆلێجێکی دیاریکراون، تەنها کۆتا حوکمدان، حوکمدانێکی دروستە. سیانەکەی تر زۆر گشتگیرن. بۆ دوورکەوتنەوە لەم جۆرە هەڵانە لە نووسین و قسەکردنەکانتا، بەئاگاییەوە ئەو بابەتە هەڵبژێرە کە حوکمی لەسەر دەدەیت.

## پێشبینییەکانت بەوردی دەستنیشان بکە

پێشبینیکردن لە حوکمدانە وردەکاندا، جەخت لەسەر ئەو شتە دەکاتەوە کە دەتەوێت جەختی لێ بکەیتەوە {واتە پێشبینییەکە و جەختکردنەوەکەت بریتین لە هەمان شت}. ئەم ڕستانەی خوارەوە بەیەک بەراورد بکە، کە تێیاندا پێشبینییەکان ئیتالیک کراون {خوار نووسراون}:

ئاشتی بەرقەرار بووە.
ئاشتی *دەتوانرێت* بەرقەرار بکرێت.
ئاشتی *پێویستە* بەرقەرار بکرێت.
ئاشتی *باشترە* بەرقەرار بکرێت.
ئاشتی *دەتوانرا* بەدەست بهێنرێت.
ئاشتی *بەدەست دەهێنرێت.*

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ڕستانە لە ڕووی بونیادەوە لە یەک نزیکن، بەلام ماناکانیان زۆر لە یەک جیاوازن. مەگەر بە ئارەزوو پێشبینییەکانمان ناڕوون-تەمومژاوی بخەینە ڕوو (لەم کاتەشدا دەبێت چاوەڕێی ئەوە بین کە دەبینە مایەی ئاڵۆزی و سەرلێشێوان)، ئەگەر نا، دەبێت پێشبینییەکانمان هۆشمەندانە هەڵبژێرین.

نموونەیەکی باش بۆ ئەو ئاڵۆزی و سەرلێشێوانەی کە ڕستە ناڕوون و تەمومژاوییەکان دروستی دەکەن، ئەو ڕستەیە بوو کە لە شەستەکاندا بوو بە هۆی هەڵگیرساندنی دیبەیتێکی تیۆری: "خوا مرد." دروشمێکی جوان بوو، بەلام ئایا بەوردی واتای چی بوو؟ ئەگەر کەسێک لە مانای ڕاستەوخۆی ڕستەکەوە هەوڵی وەلامدانەوەی پرسیارەکە بداتەوە، ئەوا تووشی نارەحەتییەکی زۆر دەبێت. لەپاڵ مانا ئاشکراکەی ئەو ڕستەیەدا کە بریتییە لە "بوونێکی بالا بوونی نییە" لە خوارەوە حەوت ئەگەری تر خراوەتە ڕوو:

خەڵک چیدی *نایانەوێت* باوەڕ بە بوونی خودا بهێنن.

خەڵکی چیدی *ناتوانن* باوەڕ بە بوونی خودا بهێنن.

خەڵکی چیدی *دڵنیا* نین لە بوونی خودا.

خەڵکی چیدی *کردار نانوێنن* وەکوو ئەوەی خودا بوونی هەبێت.

خەڵکی چیدی *بەلایەنەوە گرنگ* نییە کە ئایا خودا بوونی هەیە یان نا.

خەڵکی چیدی هەندێک ئایدیای تایبەت بە خودا *قبوڵ ناکەن*.

خەڵکی چیدی بەو کۆت و بەندە تەقلیدە *ڕازی نین*، کە گومانکردن لە بوونی خودا قبوڵ ناکەن.

تاوەکوو نووسەری یەکەم یان قسەکەری یەکەم ئەوە ڕوون نەکاتەوە کە کام لەم مانایانەی سەرەوەی مەبەستە، ئەوا وەرگرەکان نە زانیارییان پێ دراوە نە قایلیش دەبن. هەم نابەرپرسیارانە و هەم زیان-بەخۆ-گەیاندنە ئەگەر لێ بگەڕێت وەرگرەکان مەزەندەی مانای نووسراو، وتراوەکانت بکەن {واتە نووسەر و قسەکەر زەرەر لە خۆیان ئەدەن، ئەگەر بێت و پەیامەکانیان بەوردی-ڕوونی نەخەنە ڕوو}.

## گشت توانا شیاوەکان درك پێ بکە

بڵێین شتێک هەمیشە ڕوو دەدات، جیاوازە لەوەی کە بڵێین شتێک زووزوو ڕوو دەدات یان ئەو شتە هەموو سێشەممانێک ڕوو دەدات {هەریەک لەم گوزارانە مانای جیاوازیان هەیە، وە دووەمیان لەوەی یەکەمیان وردترە، بەڵام ئەوەی سێیەمیان لە دووەم و سێیەمیش دیاریکراوترە}. هەرچەند زیاتر وردەکارتر بێت لە گوزارشتکردن لە ئایدیاکانت، ئەوا حوکمەکانت بەهێزتر و تۆکمەتر دەبن. جگە لە وردەکاری لە ئاماژەدانی کاتدا، لە ئاماژەدان بە شوێن و حاڵەتیش وردەکاری گرنگە. لەم حوکمەدا "ئەو پیاوە ئەمەریکییانەی کە تەمەنیان زیاترە لە ٤٠ ساڵە و هەگیز لە هیچ کۆلیژێک نەیانخوێندووە، بەرهەڵەستی ئەو فکرەیەی ئازادیی ژنان دەکەن کە لەلایەن ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی ژنانەوە پشتگیریی لێ دەکرێت" کە ڕەنگە وا بێت و ڕەنگە واش نەبێت {واتە دژایەتییەکی لەو جۆرە ڕەنگە هەبێت و ڕەنگە نەشبێت}، تا ڕادەیەکی زۆر هەموو وشەکان وردەکارانە بەکار هاتوون. چونکە ئاماژەی داوە بەوەی کە:

A. هەموو پیاوەکان نا، بەڵکوو تەنها پیاوە *ئەمەریکییەکان*.

B. هەموو ئەو پیاوە ئەمەریکییانە نا کە لە تەمەنی جیاواز و پلەی خوێندنی جیاوازیان هەیە. بەڵکوو تەنها ئەو پیاوانە دەگرێتەوە کە

تەمەنیان زیاتر *لە ٤٠ ساڵە و هەرگیز لە کۆلێژ نەیانخوێندووە.*

C. دژی هەموو جۆرە ئازادییەکیش نین بۆ ژنان، بەڵکوو تەنها دژی ئەو جۆرەن کە لەلایەن *رێکخراوی نێودەوڵەتیی ژنانەوە پشتگیریی لێ* دەکرێت.

## خۆت بەدوور بگرە لە زیادەڕۆییکردن

زۆربەمان کەسێک یان زیاتر دەناسین کە هەموو بۆنەیەک بە "لەبیرنەکراو" لەقەڵەم دەدەن، هەموو کێشەیەک وەک "قەیران" دەبینن، هەروەها پێیان وایە هەموو فیلمێکی خۆش، "شیاوی خەڵاتی ئەکادیمییە"، هەموو ئۆتۆمۆبیلێکی مۆدیل نوێ، هەموو جلوبەرگێکی نوێ بە "بێوێنە" وەسف دەکەن. بۆ ئەم جۆرە کەسانە، هیچ شتێک تەنها باش یان خراپ نییە، بەڵکوو یان ئەوەتا باشترینە یان خراپترین. گوزارەکانیان پڕە لە ئاوەڵناوی پلەی باڵا، کاتێک بڕیارە چاویان بە کەسێک بکەوێت و ئەو کەسە دوا دەکەوێت، وا هەست دەکەن لە "ئەزەلەوە" چاوەڕوانن. کاتێک دەچن بۆ لای دکتۆری ددان، ئازارەکەیان "تەحەمولنەکراوە." قەرزەکانیان وەک "کێو" دەبینن.

کاتێک کە ئەم جۆرە کەسانە هەواڵێکمان پێ ڕادەگەیەنن، ئێمە دەبێت وەری بگرین و بچووکی بکەینەوە بۆ قاڵبە ڕاستەقینەکەی خۆی. ئەگەر وتیان "ئەو گەورەترین پیاوێک بووە بینیبێتم، بە لایەنی کەمەوە ٢٠٠ کگم دەبوو. ئەوا ئێمە دەبێت بڵێین ١٥٠ کگم چۆنە! ئەگەر وتیان "باشترین بەرهەمێک سیدنی سکریچ پێشکەشی کردبێت، ئەم بەرهەمە تازەیەتی، هەر دەبێت گوێی لێ بگریت!" ئەوا دەبێت بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بەرهەمە تازەکەی کەمێک لەوانی تری باشترە.

ڕەنگە نابەدڵانە چاو لە ئەو زیادەڕۆییانەی کە هاوڕێکانمان لە قسەکردنیاندا دەیکەن، بپۆشین، بەڵام بەدەگمەن نەبێت، ئەم هەڵوێستە لەگەڵ کەسە نەناسراوەکاندا ناگرینە بەر، لەجیاتی ئەوە، ڕاپۆرتەکانیان بە ناهاوسەنگ دەدەینە قەڵەم و فەرامۆشیان دەکەین، وەک ئەوەی جێی متمانە نەبن. ئەوانی تریش {ئەوانەی کە ناماننناسن} بەدڵنیاییەوە، هەر بەو چاوەوە ئەوەی ئێمە دەخوێننەوە. بۆ ئەوەی حوکمەکانت بەرگەی خوێندنەوە ورد و تیژەکانی ئەوانی تر بگرێت، ئەوا لە هەموو جۆرە زیادەڕۆییەک دوور بکەوەرەوە. کاتێک کە تۆ ناتوانیت لە دروستیی حوکمدانەکانت دڵنیا بیت، باشترە چاوەڕێی هەڵە بکەیت لە حوکمەکەتدا نەک زیادەڕۆیی لە دروستییەکەیدا بکەیت. بە مانایەکی تر، باشتر وایە زیاتر لێکدانەوەیەکی موتەوازع و خاکییانە پێشکەش بکەیت، وەک لەوەی بڕیارێکی توند و زیادەڕۆ لەسەر کێشەکە بدەیت. هەر بۆیە ئەگەر هەڵەش بوویت (هەر وەک چۆن هەموو مرۆڤێکی تر کە هەندێک کات هەڵە دەکەن) لەبەر ئەوەی موتەوازعانە حوکمی خۆت داوە، ئەوا بە لایەنی کەمەوە بەشی ئەوەت تێدا هێشتوتەوە کە لە هەڵەکەت ببوورن.

ئەو ستراتیژە گرنگانەی بواری بیرکردنەوەی ڕەخنەیی کە لەم چاپتەرە و لە ٤ چاپتەرەکەی پێشوودا باس کران، دەشێت بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێنەوە:

١. خۆت بناسە و بەکراوەیی بمێنەرەوە بۆ زیاتر خۆهۆشیارکردن، تاوەکوو ئەو خووە ئەقلییانەی خۆت چارەسەر بکەیت کە لەمپەر لە بەردەم چالاکبوونی بیرکردنەوەتدا دادەنێت.

٢. ورد و بەدیقەت بە بۆ ئەو شتانەی کە دەیانبیست و دەیانبینی.

٣. لە کاتی لێکۆڵینەوە لە بابەتێک، بابەتەکە دابەش بکە بۆ ڕەهەندە جۆربەجۆرەکانی، پاشان پرسیاری دروست لەسەر هەریەکەیان بکە.

٤. لـه كاتـی لێكۆڵینـەوەدا، هەمـوو ئـەو فاكتانـە لەبەرچـاو بگـرە كـە دەسـتت پێیـان ڕادەگات، هەروەهـا ڕا بەئاگاكانیـش لەسـەر كێشـەكە فەرامـۆش مەكـە.

٥. پێش گوزارشتكردن لێیـان، لـە دەرئەنجامی لێكۆڵینەوەكانت ورد بـەرەوە، پاشـان ڕێكیـان بخـە و گوزارشتیان لێ بكـە.

ئـەم پووختەیـە، لیستێكی تێر و تەسـەلە. هـەركات بـە پێویستت زانـی، بگەڕێوە سـەریان.

# ڕاهێنانەکان

دووان لەم بابەتانەی خوارەوە کورت بکەرەوە، بەو شێوەیەی لەم چاپتەرەدا پیشان درا. دڵنیا بە لەوەی بەریەککەوتنە سەرەتاییەکان تێدەپەڕێنیت و ناکەویتە ئەو هەڵانەوە کە لە چاپتەری سیازدەدا باس کران. هەموو ئەو پرسیارانە وەڵام بدەرەوە، کە خۆت لەسەر کێشەکان دەتبێت، پاشان لە هەرکوێدا کۆکبوویت یاخود دژ بوویت، ئاماژە بە هۆکارەکانی ئەم هەڵوێستانە بدە.

a. هەستەکان و ئینتیوشن باشترن لە ئەقڵ، لە بەرچاوڕوونی و دەستگرتن مرۆڤ لە کار و کردەوەکانیدا. بۆ زۆربەی کێشەکانمان لەم ڕۆژگارەدا، ئێمە پێویستمان بە وەڵامی خێرا و حازربەدەست هەیە. لەبەر ئەوەی کە هەستەکان و ئینتیوشن زۆر خێرا بەتەنگمانەوە دێن و ئەقڵیش پێویستی بە کاتە تا وەڵامیان بداتەوە، کەواتە پشتبەستن بە هەستەکان، ڕێگەچارەیە. جگە لەمانەش، هەست و ئینتیوشن، سروشتین و لەکەدار نەکراون بە بەها دەستکرد و بەزۆرسەپێنراوەکانی ناو کۆمەڵگە. لە بەرامبەردا، بیرکردنەوە، ناسروشتییە و بەرمەبنای کۆمەڵی پەیڕەو و پرۆگرامی دیاریکراوە. هەر بۆیە ئەگەر ئێمە بمانەوێت ببینە خودی خۆمان و گوزارشت لە بوونی ڕاستەقینەی خۆمان بکەین، ئەوا دەبێت ئەقڵ وەلا بنێین و ڕوو بکەینە ئینتیوشن و هەستەکانمان.

b. بۆچوونێک هەیە کە بە شێوەیەکی بەربڵاو وەک بۆچوونێکی

دروست قبوڵ کراوە، دەربارەی باشکردنی بارودۆخی زەوی و گەرمترکردنی پەیوەندیی نێوان دانیشتووانی زەوی، ئەویش ئەوەیە کە دەبێت ئێمە بازنەی بەرژەوەندییە خودییەکانی خۆمان تێک بشکێنین و بەتەنگ بەرژەوەندیی ئەوانی ترەوە بچین. ئەم بەتەنگەوەهاتنە وەک پرنسیپی ئاڵتوونیی هەموو حکومڕانییەکی چاک لێک دەدرێتەوە، وە لە زۆربەی ئایینەکانیشدا جەختی لێ کراوەتەوە. بەڵام تا چەند ئەم بۆچوونە کردارەکییە، ئەوەیان بابەتێکی ترە. بە ڕای من، کێشەکە هەر لە ڕادەی کرداری بوونی بۆچوونەکەدا نییە، بەڵکوو لە خودی بۆچوونەکەشدایە، کە هەڵەیە. لە ڕاستیدا ئەوە خۆپەرستی نییە کە مرۆڤەکان دەکات بەگژ یەکتریدا، بەڵکوو ئەوە بەتەنگەوەهاتنی ئەوانی ترە. ئەگەر هەریەکە بەتەنگ کێشەی خۆیەوە بێت، لە ڕاستیدا نەک هەر ڕادەی دووڕوویی کەم دەبێتەوە، بەڵکوو باشتریش لە یەکتر دەگەین. بەم شێوەیەش، هەموو دەزانین سنووری پەیوەندییەکانمان تا کوێیە و هیچ کەسێکیش جگە لە خۆی، پشت بە هیچ کەسێکی تر نابەستێت.

C. پرۆسەی هاوسەرگیری چیدی ئەرزشێکی نەماوە. خەڵکی زیاتر و زیاتر، بەتایبەت گەنجەکان، تێدەگەن کە زۆر باشترە پەیوەندییەکی نافۆرماڵیان هەبێت وەک لە پەیوەندیی هاوسەرگیری. دوو کەس لە ڕاستیدا تا ئەو شوێنە دەبێت پێکەوە بژین، کە ئەم پێکەوەبوونە مایەی بەختەوەری بێت. هەر بۆیە کاتێک یەکێک گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەبێت کۆتایی بە پەیوەندییەکەی بهێنێ، ئەوا دەبێت بێ هیچ زەحمەتێکی یاسایی بتوانێت ئەوە بکات. دیارە ئەمەش کاتێک دەکرێت، کە پرۆسەی هاوسەگیری نەمێنێت. لەم کاتەشدا هەموولا سوودمەند دەبن. بە هۆی ئەمەوە تاکەکان دەتوانن ئازادیی خۆیان بەدەست بهێننەوە، هەروەها بەرمەبنای ئەو گۆڕانەی کە لە دونیابینیندا ڕووی داوە، دووبارە کەسایەتیی خۆیان دابڕێژنەوە و درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن.

d. کاتی ئەوە هاتووە، کە زانکۆ ئەو کۆتوبەندە پۆلیسانە هەڵگرێت لەسەر قوتابییان لەسەر بابەتی بەزۆرناچارکردنی قوتابییان بۆ ئەوەی ئامادەی وانەکان بن، چونکە قوتابییەکان مرۆڤی بەرپرسیارن و خۆیان دەزانن چی دەکەن. قوتابییان خۆیان باشتر لە هەرکەس خاڵە لاواز و بەهێزەکانی خۆیان دەبینن، هەر بۆیە ئەوان دەزانن کە کام وانە بۆ ئەوان سوودمەندە و کامەش هەر کاتبەفیڕۆدانە. هەندێک لە بابەتەکان تازە و سەرنجڕاکێشە بۆ قوتابییان، بەلام هەندێکی تریان لە ڕاستیدا هەر گەرمکردنەوەی بابەتە کۆنەکانە. هەندێک لە وانەبێژەکان بەردێکی تر دەخەنە سەر بینای هۆشمەندیی قوتابییان، بەلام هەندێکی تر هیچ ناکەن جگە لە خوێندنەوەی کتێبەکەی بەردەست قوتابییان بە دەنگی بەرز. کەواتە ئەگەر لێبگەڕێن، قوتابییان خۆیان دەزانن کە دەبێت ئامادەی کام وانە بن و لە کام وانەبێژیشەوە بەڕاستی فێر دەبن.

e. هەرکاتێک باوان بە ڕۆڵەکانیان بڵێن کە چۆن بیر لە کێشەکان بکەنەوە، لە ڕاستیدا بەمە گۆشەنیگای منداڵەکانیان بەرتەسک دەکەنەوە بۆ ئەو گۆشەنیگایەی کە دایک و باوک پێیان دروستە. هەرکاتێک باوان منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆ کەنیسە و مزگەوتەکان، لە ڕاستیدا ڕۆحی منداڵەکانیان لە قاڵب دەدەن بۆ تەنها یەک ئایینی دیاریکراو. هەر بۆیە بەم هەڵوێستەیان دایک و باوکان ڕێ لە تاکایەتیی منداڵەکانیان دەگرن و ئازادیی بیرکردنەوەیان سنووردار دەکەن. لەبەر ئەم هۆیانە، دایک و باوکی هۆشیار و پەرۆش، لێدەگەڕێن منداڵەکانیان بۆ خۆیان بیر و ڕا و قەناعەتەکانیان بەدەست بێنن.

f. یەکێک لەو هۆکارانەی کە بووەتە هۆی زیادبوونی تاوان لە کۆمەڵگەکەماندا {ئەمەریکا}، ئەوەیە کە تەنها گرنگی دەدرێت بەوەی کە بۆچی تاوانباران تاوان دەکەن و چۆنیش وا بکەین پۆلیسەکان بە زووترین کات تاوانباران دەستگیر بکەن. ڕاستە ئەم دوو خاڵە زۆر

گرنگن، بەڵام خاڵی گرنگیش هەیە کە فەرامۆش کراوە، وەکوو پاراستنی ئەو هاووڵاتییانەی کە ملکەچی یاسان و توندترکردنی سزای ئەوانەی کە لادەرن لە یاسا. ئێمە گاڵتە بە شێوازی سزادانی تاوانباران دەکەین لە کۆمەڵگە ناپێشکەوتووەکاندا، بۆ نموونە، وەکوو بڕینی دەستی دز و بڕینی زمانی درۆزن، بەڵام ئەمانە هیچ نەبێت ئەوە پیشان دەدات کە تاوان چەند قێزەون و خراپە و کۆمەڵگە ناکرێت بێدەنگ بێت لە ئاستیان. دیارە من ناڵێم با بگەڕێینەوە بۆ ئەو جۆرە لە کۆمەڵگە، بەڵکوو من دوو شت دەڵێم، یەکەم، قورسکردنی سزاکان، لەبری ئەو خۆشگوزەرانییەی کە ئێستا بۆ تاوانباران لە گرتووخانەکاندا فەراهەم کراوە، دووەم با چیدی ڕێگرە تەکنیکییەکان نەبنە لەمپەر لە بەردەم سزادانی کەسێکدا، کە بەئاشکرا دیارە تاوانبارە.

g. هەموو ساڵێک لانی کەم هەواڵێکی شەرمهێنەر بڵاو دەبێتەوە، کە چۆن لە پێشبڕکێ وەرزشییەکانی زانکۆ و قوتابخانەکاندا، قوتابییەک بەرتیل لەم و لەوەوە وەر دەگرێت تا بە شێوازێکی دیاریکراو بۆ بەرژەوەندیی لایەنێک یاری بکات. لەم ساڵانەی دواییدا، ئەم چەشنە ڕووداوانە لە زیادبووندان، باشترین ڕێگە بۆ چارەسەرکردنی ئەم بابەتە، ئەوەیە کە ئەو لەمپەرە لە بەردەم قوتابییان هەڵبگیرێت، کە قەدەغەی کردووە قوتابی تا ئەو کاتەی بڕوانامە بەدەست نەهێنێت، بۆی نییە بە پارە یاری بکات. بەڵام وەک چۆن وەرزشەوانە پرۆفیشناڵەکان موچەیان هەیە، با قوتابییانیش لە بەرامبەر وەرزشکردندا پارە وەر بگرن. ڕاهێنەرەکانی قوتابییان و زانکۆکانیش پارەی خۆیان وەر دەگرن، ئیدی بۆ تەنها قوتابی لەم بەینەدا بۆی نەبێت پارە وەر بگرێت.

٢. ئەو هۆشیاری و تەکنیکانەی لەم چاپتەرەوە فێری بوویت، بەسەر یەکێک لە ڕاهێنانەکانی چاپتەری حەڤدەدا تاقی بکەرەوە.

# چاپتەری نۆزدە

## قایلکردنی ئەوانی دی Persuading Others

دوای خوێندنەوەی چاپتەرەکانی پێشوو یەک لە دوای یەک، ڕەنگە ئەو هەستەت لا دروست بووبێت کە چاپتەری پێشوو کۆتاییی گەشتەکەیە. چونکە پرۆسەی بیرکردنەوە بە داڕشتن و دەربڕینی حوکمەکان، دەرئەنجامەکان تا ڕادەیەکی مەعقول کۆتایی دێت. کەواتە ئەم چاپتەرە بۆ لێرەدا قوت کراوەتەوە؟ وەڵامی سادەی ئەم پرسیارە ئەوەیە، کە بیرکردنەوە قووڵ و مانادارەکان شیاوی ئەوەن کە بگوازرێنەوە و ئەوانی تریش لێی سوودمەند بن، لەمەش گرنگتر، چۆنێتیی دەربڕینی بیرکردنەوەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لەو کاریگەرییەی کە لەسەر وەرگرەکانی دای دەنێت. هەر لێرەشەوەیە بەئاگابوون لە هونەرەکانی قایلکردنی ئەوانی تر، زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکان کە دەرئەنجامی بیرکردنەوەیەکی ڕەخنەیین، سنوردار و قەتیس نەکرێن لەناو سەری خۆتدا و ئەوانی تریش لێی سوودمەند بن.

*قایلکردن* واتە گوزارشتکردن لە بۆچوونەکانی خۆت بە شێوەیەکی ئەوەندە کاریگەر، کە مەیلی ئەوانە ڕابکێشێت کە هێشتا بڕیاری لایەنگیریی لایەکیان نەداوە، هانی ئەوانەش بدات کە پێچەوانەی تۆ بیر دەکەنەوە، تا دووبارە بە بۆچوونەکانیاندا بچنەوە. ئەم کارەش هەر وا ئاسان نییە. ئەوانەی کە هێشتا بێلایەنن، کراوەن بۆ بۆچوونەکانی تۆ و ئەوانەشی

کە دژی بۆچوونەکانی تۆن، کەواتە دەکەوێتە سەر ئەوەی تا چ رادەیەک دەتوانیت مەعقولیەتی ئایدیاکانی خۆت پیشان بدەیت. ئەوانەیش کە بە پێچەوانەی تۆ بیر دەکەنەوە، لەبەر یەک هۆی سادە دژت دەوەستنەوە، ئەویش ئەوەیە کە بیرکردنەوەت ناکۆکە لەگەڵ ئەوان. جگە لەمە، کەسانێک هەن دوای ململانێیەکی فکری گەیشتوون بە قەناعەتەکانیان، کە ئیدی بۆتە بەشێک لە ئیگۆیان، کەواتە تۆ بتەوێت هەر وا بەئاسانی قایلیان بکەیت بە ئایدیا جیاوازەکانی خۆت، ئەمە مەحاڵە.

بۆ تێگەیشتن لە دژواریی قایلکردنی ئەوانی دی، ئەوەندە بەسە بیر لە خۆت بکەیتەوە کاتێک کەسێک دەیەوێت بە شتێک قایلت بکات کە پێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆتە. ئەگەر تۆ کە هۆشیارییەکیشت هەیە لەسەر بیرکردنەوەی رەخنەیی بە هۆی ئەم کتێبەوە، نەیەیتە ژێر باری ئارگۆمێنتەکانی ئەوانی تر کە پێچەوانەی بیرکردنەوەتن، ئەوا دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگریت کە ئەوانی تریش رەنگە ئەم هۆشیارییەشیان نەبێت، نەیەنە ژێر باری ئارگۆمێنتەکانی تۆوە هەر وا بەئاسانی.

## نەخشەرێگەی قایلکردن

ئەمانەی لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەدەین بریتین لە یازدە خاڵی رێنماییکەر بۆ چۆنێتیی قایلکردنی ئەوانی تر. هەریەک لەو خاڵانە وا نووسراون کە بەرەنگاربوونەوە بێت لەگەڵ تەحەدییەکی دیاریکراودا. هەتا زیاتر پەیرەوی لەم نەخشەرێگەیە بکەیت، ئەوەندە سەرکەوتووتر دەبیت لە گەیاندن و پیشاندانی حیکمەتی بۆچوونەکانت.

**رێنمایی یەکەم: رێزگرتن لە بەرامبەرەکەت**

رەنگە ئەم رێنماییە ئایدیالیستیکانە دەر کەوێت، بەڵام بەپێچەوانەوە، زۆر کرداری و کاریگەرە. ئەگەر تۆ لەو بڕوایەدا بیت کە ئەوانەی لەگەڵیاندا

دەکەویتە گفتوگۆ و ئەوانەشی کە بۆیان دەنووسیت بەو هیوایەی قایلیان بکەیت بە ئایدیاکانت، گەمژە و درۆزنن، ئەوا بە ڕاستەوخۆ یان بە ناڕاستەوخۆ ئەم هەستەی خۆتیان بۆ دەر دەبڕیت، جا لە تۆنی دەنگتا بێت یان لە هەڵبژاردنی وشەکانتا. لەم حاڵەتەشدا ئەوان بۆچوونەکانی تۆ وەک گاڵتەپێکەر و بریندارکەر وەر دەگرن، دەرئەنجامی ئەمەش، ژینگەیەکی پڕ ڕق و کینەیە کە ئەگەرێک ناهێڵێتەوە بۆ یەکتر-قایلکردن.

بەڵام ئایا کەسانێک نین کە لە ڕاستیدا گەمژە و درۆزنیشن؟ بەدڵنیاییەوە هەیە. بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە کە وا بیر نەکەیتەوە بەرامبەریان بەبێ بوونی بەڵگەی یەکلاییکەرەوە. ئەگەر دڵنیاش بوویت یان دوودڵ بوویت لە هەبوونی ئەو بەڵگانە، نابێت ئاماژەیان پێ بدەیت، چونکە جگە لە ڕق و کینە هیچی لێ بەرهەم نایەت. لە خۆت بپرسە ئاخۆ دەبێت چ شتێک وا بکات ئەوان ناکۆک بن لەگەڵتا؟ هەموو ئەو هۆکارانە لەبەرچاو بگرە کە ڕەنگرێژیی بیرکردنەوەی کەسێک دەکەن، وەکوو، تەمەن، ڕەگەز، نەژاد، نەتەوە، باکگراوندی خێزانی، ئایین، ڕێژەی داهات، مەیلی سیاسی، ئاستی خوێندن و ئەزموونی کەسی. ئەگەر هۆکارێک یان زیاتر لەو هۆکارانە ببنە هۆی ناکۆکی و جیاوازی لە بیرکردنەوەدا لەنێوان تۆ و وەرگرەکان، کەواتە لەم حاڵەتەدا دەبێت لات ئاسایی بێت کە بە پێچەوانەی تۆوە بیر بکەنەوە و بە درۆزن و گەمژە لەقەڵەمیان نەدەیت.

لەسەر ئەم مەسەلەی ڕێزگرتنە لە وەرگرەکان، تێبینییەکی گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر بەئاشکرا ئەو ڕێزگرتنە پیشان بدەیت، ئەوا ڕەنگە قووڵای ڕاستگۆیی خۆی لەدەست بدات. کەواتە تۆ سەرەتا لە ناخی خۆتدا ڕێزیان لێ بگرە، ئەوکات خۆبەخۆ لە بۆچوونەکاتا ڕێز خۆی بەیان دەکات بۆ ئەوان.

**ڕێنمایی دووەم: تێگەیشتن لە گۆشەنیگای وەرگرەکانت:**

زۆر کەس دەکەونە ئەو هەڵەیەوە کە بۆ ئەوەی قایلکەرانە بنووسیت ئەوەندە بەسە ئاشنا بیت بە گۆشەنیگا و بۆچوونەکانی خۆت. ئەم جۆرە کەسانە بە خۆیان دەڵێن "وەرگرەکانم چۆن بیر لە نووسراوەکانم دەکەنەوە، پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە، بەڵکوو ئەوەی گرنگە ئەوەیە، کە سەرنجیان بۆ بابەتەکە ڕابکێشم تا بیری لێ بکەنەوە." جگە لە غرووریەت و خۆبەزلزانین، ئەم بۆچوونە ئاماژەیە بۆ لەبەرچاونەگرتنی دوو خاڵی زۆر گرنگ. یەکەم، کەسەکان بۆچوونەکانی خۆیان زۆر بەلاوە گرنگە، هەر بۆیە بریندارکەرە بۆ ئەوان کاتێک کەسێک گرنگیی بۆچوونەکانیان لەبەرچاو ناگرێت. دووەم، ئێمە سەرەتا دەبێت بزانین کەسێک چۆن بیر دەکاتەوە، پاشان هەوڵ بدەین ئەو بیرکردنەوەیەی بگۆڕین.

بەڵام تۆ چۆن بزانیت کە خوێنەرەکانت چۆن بیر لەو بابەتە دەکەنەوە کە تۆ لەسەری دەنووسیت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەپێی حاڵەتەکان دەگۆڕێت. لە خوارەوە سیان لە باوترین حاڵەتەکان دەخەینە ڕوو:

**حاڵەتی یەکەم: کاتێک نووسینەکەت وەڵامدانەوەی وتار یان کتێبی تەنها یەک کەسە:** بەو نووسینەکەدا بچۆرەوە، بۆ دەستنیشانکردنی نەک تەنها هەڵوێستی نووسەرەکە، بەڵکوو ئەو هۆ و بەڵگانەشی کە هەڵوێستەکەی خۆی پێ پشتڕاست کردۆتەوە. هەم لاوازییەکان و هەم خاڵە بەهێزەکانی نووسینەکەی دەستنیشان بکە.

**حاڵەتی دووەم: کاتێک بۆ کەسێکی دیاریکراو دەنووسیت، کە هێشتا** بۆ تۆ ڕوون نییە، ڕای لەسەر بابەتەکە چۆنە: بۆ نموونە وای دانێ، کە نامەیەک بۆ خاوەنی کۆمپانیایەک دەنووسیت، کە تێیدا تۆ دژایەتی لە بڕیاری کۆمپانیا دەکەیت دەربارەی سپۆنسەرشیپکردنی زنجیرەیەکی تەلەڤیزیۆنی کە جێی مشتومڕ و ڕای جیاوازە. لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ

دڵنیا نیت لەوەی کە خاوەن کۆمپانیاکە ڕای پێچەوانەی تۆ دەبێت، بەڵام تۆ دەبێت خۆت بۆ خراپترین حاڵەت ئامادە بکەیت، ئەویش ئەوەیە، کە ئەو بەڕێزە زۆر بەتوندی پشتگیری لە سپۆنسەرشیپکردنی زنجیرەکە بکات لەلایەن کۆمپانیاکەوە. بهێنە پێش چاوی خۆت، بەڕێوبەرەکە چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە: ئایا ئەو ڕای چۆن دەبێت دەربارەی ڕەخنەکانی کەسانی دەرەوەی کۆمپانیاکە؟ ئایا ئەو دەڵێت کە ئەوان هەر لە بنەڕەتدا مافی وەها ڕەخنەگرتنێکیان نییە؟ چونکە تەنها بەرپرسیارانی کۆمپانیا مافی ڕەخنەگرتنیان لە سیاسەتی کۆمپانیا هەیە؟ ئایا ئەو چۆن وەڵامی ئەو پرسیارگەلانە دەداتەوە کە دەربارەی پاڵەوانەکان، چیرۆک و سیناریۆی زنجیرەکە لەناو خەڵکیدا دەورووژێنێت؟ (هەتا وردتر و بەدیقەتتر لێکۆڵینەوە لەسەر زنجیرەکە ئەنجام بدەیت، ئەوەندە مەعقولانەتر وەڵامی پرسیارەکان دەدەیتەوە). ئایا بەڕێوەبەرەکە ئەو ڕەخنانە وەکوو جۆرێک لە سانسۆر لەقەڵەم ئەدات یان نا؟

**حاڵەتی سێیەم: کاتێک بۆ تاکێک نا، بەڵکوو بۆ هەموو ئەوانە دەنووسیت کە ڕایان پێچەوانەی تۆیە لەسەر بابەتەکە ئەم حاڵەتەیان** باوترین حاڵەتە. سەرەتا دەبێت خۆت ئاشنا بکەیت بە ڕای ئەوانەی کە ڕای پێچەوانەی تۆیان هەیە و تۆش بەنیازیت قایلیان بکەیت. لەناو ڕاکانیاندا ئەو ئارگۆمێنتانە دەستنیشان بکە کە زۆرترین کات دووبارەی دەکەنەوە. چونکە هەتا زیاتر ئارگۆمێنتێک زیاتر و زیاتر بوترێتەوە، ئەوەندە بەربڵاوتر دەبێت لەناو خەڵکیدا، هەر بۆیە لە پەیوەندیدا بە قایلکردنی ئەوانی ترەوە، شیاوی ئەوەیە کە گرنگیی زیاتر و زیاتری پێ بدرێت. کەواتە هەتا زیاتر ئەم ئارگۆمێنتە باوانە ئیشکالئامێز بن، ئەوەندە پرۆسەی قایلکردنی ئەوانی تر بە شتێکی جیاواز بەو ئارگۆمێنتانە قورستر و گرانتر دەکات.

**رێنماییی سێیەم: نووسینەکەت بەو خاڵانە دەست پێ بکە کە هاوڕا و تەبان لەسەری لەگەڵ خوێنەرەکانتا:**

دەستکردن بە نووسین بە خاڵی هاوبەشی نێوان تۆ و وەرگرەکانت، تەنها مەسەلەی ڕێزگرتن نییە لە بەرامبەر، بەڵکوو مەسەلەیەکی "ستراتیژیی سایکۆلۆجییە." ئەگەر تۆ هەر لە سەرەتای نووسینەکەتەوە، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆش نەبێت، بڵێیت "ئێوە هەڵەن و من لێرەم تا ڕاستتان بکەمەوە،" ئەوا هەر لە سەرەتاوە خوێنەر ناچار دەکەیت بچێتە خانەی بەرگریکردنەوە، ئەگەر نەشچێتە گۆشەی دوژمنکارانەوە، لەبری ئەوەی خوێنەر ڕابکێشیت بۆ دیالۆگ و لەوێشەوە بۆ قایلکردن، هەر بۆیە خوێنەر ناچار دەکەیت تەنها لایەنە بێهێزەکانی ئارگۆمێنتەکانت ببینێت و لەبری ئەوەی بکەوێتە دیالۆگەوە لەگەڵیاندا، ڕەتیان دەکاتەوە. لە ڕاستیدا لەم حاڵەتەدا ئەگەر ئەوان نامەعقول و ناعەقڵانیانە مامەڵە بکەن، ئەوا تۆ زیاتر بەرپرسیاریت وەک لەوان.

ئاسان نییە تۆ خاڵێکی هاوبەش بدۆزیتەوە لەگەڵ کەسێکدا کە تەواو پێچەوانەی تۆ بیر دەکاتەوە. با نموونەیەک لەسەر ئەم حاڵەتە بهێنینەوە، لەسەر قوتابییەکە، کە لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانیدا هەوڵ دەدات زانکۆ قایل بکات تا دووبارە چانسێکی تر بدات بەو قوتابییانەی کە لەبەر نالێهاتوویی و کەمتەرخەمی دەر کراون لە خوێندن. دیارە قوتابییەکە بۆ بەرپرسانی زانکۆ دەنووسێت، ئەوانیش ئاشکرایە کە پێچەوانەی ئەو بیر دەکەنەوە. ئەو ئاوا نووسینەکەی دەست پێ کردبوو:

من پێم وایە کە هەموو قوتابییە دوورخراوەکان دەبێت دووبارە چانسی وەرگرتنەوەیان لە زانکۆ پێ بدرێتەوە، چونکە هەموو کەس شیاوی ئەوەیە چانسی دووەمی پێ بدرێت. ئێوە دەڵێن کە ئەوان خوێندنیان بە فشە گرتووە و جیدی نین، بەلام من دەڵێم...

لـە دیدی ئـەم قوتابییـەوە ئـەو و خوێنەرەکانـی دەتوانـن لەسـەر ئـەوە ڕێـک بکـەون کـە وتوویەتـی. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا، بـەوەی کـە هـەر لـە سـەرەتاوە تونـد ڕووبـەڕووی ئـەوان بۆتـەوە، چانسـی قایلکردنـی ئەوانـی لەدەست داوە. لە ئەنجامیشدا خوێنـەرەکان بەئـاگا یـان بێئـاگا ئـاوا وەڵامـی نووسینەکەیان داوەتـەوە: "ئـەم قوتابییە تەنها یـەک لای کێشـەکە دەبینێت و نابابەتییانە بیر دەکاتـەوە، بەڵکوو ئـەو لـە ئاڵۆزیی بابەتەکە تێنـاگات، ئـەو، ئـەو پارە زۆرە نابینێت کـە حکومـەت لەپێنـاو خوێندندا خـەرجی دەکات، ئـەو وادەزانێت خوێنـدن مافێکی هەمیشـەییە، هیـچ شتێک ناتوانێت ئـەو مافـە لـە قوتابی بسـەنێتەوە، دیارە ئـەو تێنـاگا کـە خوێندن مافێکە کـە قوتابی دەبێت پیشـانی بدات کـە شیاوی ئەوەیە مافەکـەی لێ نەسێنرێتەوە". ڕەنگـە ئەگـەر قوتابییەکـە تـەواو پێشـبینیی وەهـا وەڵامێکـی بکردایـە، ئـەوا قایلکەرانەتـر بۆچوونەکانی دەر ببڕییایە. لـە خـوارەوە پیشـانی دەدەیـن کـە چـۆن دەکرا قوتابییەکـە بـە شـێوەیەکی زۆر سـەرکەوتووترانە پەیامەکـەی بگەیەندایـە:

هیـچ کـەس سـودمەند نابێت، نـە مامۆسـتا و نـە قوتابـی لـە مانـەوەی قوتابییـەک لـە زانکـۆ، کـە خوێنـدن بـۆ ئـەو تەنهـا بریتییـە لـە هـاوڕێ-دروستکردن و کات-بە-فیڕۆدان. وەهـا قوتابییـەک کاتـە گرنگەکانی خوێندن لـە بەلاڕێدابردنی قوتابییە جیدییەکانی تردا بەسـەر دەبات. ئـەوان وادەزانـن کـە خوێندن مافێکـە بـە هیـچ شێوەیەک لەدەستی نادەن، هـەر بۆیـە تێناگـەن لـەوەی کـە خوێنـدن مافێکـە دەبێت تـۆ بـەردەوام بیسـەلمێنیت کـە شـیاوی ئەوەیت لێت زەوت نەکرێت. بەڵی من دان بەوەدا دەنێم کە بەداخـەوە ئـەم چەشـنە قوتابییانـە لـە زانکۆکـەی ئێمەشـدا هەیـە.

نووسـەر لێرەدا ناوەسـتێت، بەڵکوو لـە دوای وشـەی "بـەڵام"ەوە ئـەوەش دەڵێـت کـە بـڕوای پێیەتـی، بـەڵام ئـەو کاتێـک ئەمـە دەکات، کـە پیشـانی خوێنەرەکانـی دەدات کـە مـن ئاڵۆزیـی کێشـە وەک خـۆی دەبینـم و ڕاکانـم ڕای ئاقڵانـە و بابەتییانـەن

**ڕێنماییی چوارەم: گرتنەبەری شێوازی ئەرێنی، تا ئەو شوێنەی مومکینە:**

هەوڵ بدە نووسینەکەت ڕەتدانەوەی ڕاستەوخۆی بەرامبەر نەبێت، بەڵکوو سەرڕێگە-خستنی گۆشەنیگایەکی جیاواز بێت. ئەگەر بوترێت تۆ هەرگیز نابێت هێرش بکەیتە سەر خاڵە لاوازەکانی بەرامبەر، هەم گەمژەیییە و هەم سادە لەوحی. لە ڕاستیدا هەندێک کات تەنها ئامانجی ماناداری نووسین بریتییە لە دەستخستنە سەر خاڵە لاوازەکانی بەرامبەر. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت، کە ڕەخنە هەمیشە توندتر و ڕەقتر دەر دەکەوێت لە چاوی ڕەخنەلێگیراوەوە وەک لە ڕەخنەگر. هەر بۆیە زەربهێنان بە گۆشەنیگای بەرامبەردا، بەرامبەر دەخاتە حاڵەتی بەرگریکردنەوە نەک دیالۆگ. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، چارەسەر ئەوە نییە کە ئەوەندە خۆت بەدوور بگریت لە ڕەخنە، کە شتێکی مانادار نەڵێیت، بەڵکوو مەبەستەکە ئەوەیە کە چۆنێتیی وەڵامدانەوەی وەرگر بۆ ڕەخنەکانت لە بەرچاو بگریت {چونکە دەبێت لەیادمان بێت، ئێمە لێرەدا باس لە نووسین دەکەین لەپێناو قایلکردنی بەرامبەردا}.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر با نموونەیەک وەر بگرین، کەسێک وتارێک دەنووسێت کە تێیدا ڕەخنە لە یاسای کۆنترۆڵکردنی چەک دەگرێت، دەرئەنجامی ئەم وتارەش دوو کەس وەڵامی وتارەکە دەدەنەوە. با سەرنجی پووختەی وتارەکە و وەڵامەکان بدەین.

وتارەکە: یاسای کۆنترۆڵکردنی چەک، "١" ئەوەندەی سزای شوێنکەوتووانی یاسا دەدات، ئەوەندە سزای لەیاسالادەران نادات، "٢" ڕێگری دەکات لەوەی هاوولاتیان بە باشترین شێوە بەرگری لە سەروماڵیان بکەن، ئەمە لە کاتێکدا هێرش و مەترسی لەسەر هەردووکیان بە شێوەیەکی بەربڵاو هەیە، "٣" ئەم یاسایە لادانە لە دەستووری ئەمەریکا.

**وەڵامی یەکەم:** یاسای کۆنترۆڵکردنی چەک، سزای شوێنکەوتووانی یاسا نادات، زیاتر لەوانەی کە یاسا پێشێل دەکەن. ڕێگر نییە لەوەی هاووڵاتیان بە باشترین شێوە بەرگری لە سەروماڵیان بکەن. ئەم یاسایە بە هیچ شێوەیەک لادان نییە لە دەستووری ئەمەریکا.

**وەڵامی دووەم:** یاسای کۆنترۆڵکردنی چەک، ڕێژەی تاوانەکان کەم دەکاتەوە، چونکە هەر لە سەرەتادا خاوەندارێتیی چەک قەدەغە دەکات. ئەم یاسایە جەخت لەسەر ڕۆڵی هێزی پۆلیس دەکاتەوە وەک لە تاکەکان، لە پەیوەندیدا بە جێبەجێکردنی یاساوە. ئەم یاسایە لە لێکدانەوەی دەستووری ئەمەریکییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر ڕاستەوخۆش لە دەستووردا ئاماژەی پێ نەکرابێت.

هەردوو وەڵامەکە ناکۆکن لەگەڵ ئەو سێ خاڵەدا کە وتارەکە ئاماژەی پێ دەدات. بەڵام وەڵامی یەکەم ڕاستەوخۆ لە وتارەکە دەدات و دووەمیان گۆشەنیگایەکی تر سەرڕێ دەخات. لە دەرئەنجامدا، وەڵامی یەکەم بە نووسەر دەڵێت: "تۆ هەڵەیت، تۆ هەڵەیت، تۆ هەڵەیت." بەڵام دووەمیان دەڵێت، "دەتوانین لەم گۆشەنیگایەشەوە لە یاساکە بڕوانین." کەواتە تا دەتوانیت لە ڕەتدانەوەی دەستبەجێی بەرامبەر دوور بکەوەرەوە، واتە تا ئەو شوێنەی مومکینە بۆچوون و ڕەخنەکانی خۆت سەرڕێگا بخە بێ ئەوەی لە بەرامبەر بدەیت.

**ڕێنمایی پێنجەم: زیادەڕۆیی بە دەرئەنجامەکانتەوە مەکە:**

هەمیشە دەبێت بە ئاگاییەکی زیاترەوە مامەڵە بکەین لەگەڵ ئەو خاڵانەدا کە تێیدا ناکۆکیی ئێمە و وەرگرەکانمان لەوێدا توخ دەبنەوە. لە قەناعەتکردن بەوانی تردا، ئەم خاڵانە دژوارترین و گرانترین خاڵن. ئەگەر پێداگرییەکی توند لە گۆشەنیگای خۆت بکەیت، ئەوا بەرامبەریش توندتر بەرگری لە بۆچوونەکانی خۆیان دەکەن، لەبری ئەوەی *وایان لێ بکەیت*

پرسیار لە تێڕوانینی خۆیان بکەن. با نموونەی نووسینی قوتابییەک وەر بگرین بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر:

لە زۆربەی زانکۆکاندا ڕێ بە قوتابی دەدرێت کە لە چەند وانەیەکدا ئامادە نەبێت بێ لێپێچینەوە و سزادان. بەڵام لەم زانکۆیەی خۆماندا، ئامادەنەبوونی بێ مۆڵەت، بە هیچ شێوەیەک شیاوی قبوڵ نییە. توندی و نەگونجانی ئەم سیستەمەش لەگەڵ قوتابییەکاندا، هەستی خۆ-بەکەم-زانین لەناو قوتابییەکاندا گەشە پێ دەدات.

خوێنەر کە لێرەدا لەگەڵ سیستەمی زانکۆکەدایە، نەک گومان لە بۆچوونی خۆی ناکات، بەڵکوو پشتئەستووریش ئەبێت، بە گوزارەی زەقی "هەستی خۆ-بەکەم-زانین." ئەمەش ئەکاتە دەرفەتێک تا بەباشی بۆچوونی قوتابییەکە ڕەت بکاتەوە:

سیستەمی زانکۆکەمان بەوەی کە هیچ ئامادەنەبوونێکی بێ مۆڵەت قبوڵ ناکات، زەحمەتە بۆ قوتابی، ئێمەش ئەوە دەزانین. بەڵام ئەوەی کە گوایە ئەم سیستەمە "هەستی خۆ-بەکەم-زانین لە قوتابییەکاندا گەشە پێ دەدات" لە ڕاستیدا لە باشیی سیستەمەکە کەم ناکاتەوە. بەڵام با واشی دابنێین کە ئەمە وایە، بەڵام ئایا قوتابییەک ئەوەندە لە ڕووی دەروونییەوە لاواز بێت، پێویستی بە سیستەمێکی وەک ئەوەی ئێمە بگرە توندتریش نییە، تا خۆی گورج بکاتەوە و هەستە دەروونییە لاوازەکانی لەناو بەرێت؟

قوتابییەکی تریش کە ئەم پەرەگرافەی خوارەوەی نووسییەوە، کەوتۆتە هەمان هەڵەوە:

ئەگەر ئەوانی تر بە ڕێز و پێزانینەوە مامەڵەمان بکەن، ئێمەش لە بەرامبەردا زیاتر ڕێزیان دەگرین و بە ماندووبوونیان دەزانین.

ئەم قوتابییە زیاد لە پێویست دەرئەنجامەکەی زەق کردۆتەوە. ڕێز و پێزانینی ئەوانی تر بەرامبەرمان ڕەنگە هۆکارێک بن بۆ ئەوەی ئێمەش

وا بین، بەلام بەدڵنیاییەوە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەو گۆڕانە بەسەر ئێمەدا ناهێنێت. کەواتە ئەو زەقکردنەوە زیاد لە پێویستەی نووسەر بەدڵنیاییەوە هۆکارێک نابێت بۆ قەناعەتهێنان بە خوێنەر.

سەرنجی ئەو پەرەگرافانەی خوارەوە بدە بەتایبەت وشە ئیتالیککراوەکان. لە یەکەمیاندا، نووسەر بە شێوەیەکی بەهێز و زەق پێداگری لە حوکمەکانی دەکات بە شێوەیەکی بەهێز و زەق. بەلام لە دووەمیاندا، نووسەر میانڕۆیانەتر ئارگۆمێنتەکەی خۆی سەرڕێ دەخات. سەرنجی ئەوە بدە کە دووەمیان پشت لە بۆچوونەکانی خۆی ناکات، بەڵکوو بە شێوەیەکی وا دەریان دەبڕێت، کە کاریگەریی زیاتر لەسەر خوێنەر جێ دەهێڵێت.

ئەگەر قوتابییانی زانکۆ ئەو *دەرفەتەیان* پێ نەدرێت تا ئازادانە بەرپرسیارێتیی خۆیان لە هەڵبژاردنەکانیاندا تاقی بکەنەوە لەو کاتەدا کە لە زانکۆن، ئەوا ناچار دەبن لەگەڵ چوونەدەرەوە لە زانکۆ، *دەستبەجێ* خۆیان لەگەڵ کەشە نوێکەدا بگونجێنن. ئەم خۆگونجاندنە لە ڕاستیدا *زۆر قورس* دەبێت.

ئەگەر قوتابییانی زانکۆ *هەندێک دەرفەتیان* پێ نەدرێت، تا ئازادانە بەرپرسیارێتیی خۆیان لە هەڵبژاردنەکانیاندا تاقی بکەنەوە لەو کاتەدا کە لە زانکۆن، ئەوا دەبێت *تۆزێک خێراتر* خۆیان بگونجێنن لەگەڵ کەشی دەرەوەی زانکۆدا. لەم حاڵەتەشدا کەمێک بۆ قوتابی زەحمەتتر دەبێت لە خۆگونجاندنی ژیانی ناو زانکۆ و دەرەوەی زانکۆ.

**هەرکاتێک بەرامبەر ئاماژەی بە خاڵێکی مانادار دا، وەری بگرە**

هەمووان بە سروشت مەیلی ئەوە دەکەن کە بۆچوونەکانی خۆیان ئەوەندە مانادار و گرنگ لە قەڵەم بدەن، کە ئاسان نییە دان بەوەدا بنێن کە بەرامبەر با تێڕوانینی جیاوازی هەبێت، بەلام هێشتا بڕێک لە فەزیلەت

لە بۆچوونەکانیاندا هەیە. بە ڕێگەیەک دەتوانین بەسەر ئەم مەیلەدا زاڵ بین، ئەوەش ئەوەیە کە بەردەوام لەیادمان بێت کە لە کێشە و بابەتە ئاڵۆز و فرەڕەهەندەکاندا *هیچ لایەک بەتەنها ڕاستیی تەواوی کێشەکەی* لا نییە. ئەگەر بەم نییەتەوە ڕووبەڕووی کێشە ئاڵۆزەکان ببیتەوە، ئەوە دەرئەنجام بە بڕێکی زیاتر لە حەقیقەتی کێشەکەوە دەگەڕێتەوە، بەمەش بڕێکی زیاتر لە وەرگر مەیلکێش دەکەیت بۆ تێڕوانینەکانی خۆت.

ئیلتیزاممان بۆ حەقیقەت دەبێت ئەو چاکەیەمان تێدا سەوز بکات کە نەک ناچاری و نابەدڵی، بەڵکوو بەخۆشحاڵییەوە دانپیانانی خۆمان لە ئاست باشیی بۆچوونەکانی بەرامبەرەکانمان ڕابگەیەنین. بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە لە سەرەتای هەر نووسینێکماندا بە ڕستەگەلی وا دەست پێ بکەین "هەموو کەس بڕێک لە حەقیقەتی لایە بە تۆشەوە،" هەر دوای ئەمەش، بۆچوونەکانی خۆت دەر ببڕیت. بەڵام ئیلتیزاممان بۆ حەقیقەت داوای ئەوەمان لێ دەکات، کە ڕوونی بکەینەوە لەکوێ و چۆن و لەبەر چی بەرامبەرەکەت توانیویەتی مشتێک لە حەقیقەتی مەسەلەکە بۆ خۆی بچڕێت.

با وای دابنێین، ئەو بابەتەی لەژێر نەشتەری بیرکردنەوەدایە، بریتییە لەوەی ئایا دەبێت منداڵ هەر لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە تا شەشی ئامادەیی بخرێنە بەر پرۆسەیەکی پەروەردەیی چڕوپڕ لەمەڕ سێکسەوە یان نا. تۆش ئارگۆمێنتی ئەوە سەرڕێ دەخەیت کە بەڵێ دەبێت وا بێت، هەڵوێستەکەشت پشتڕاست دەکەیتەوە بە کۆمەڵێ هۆ. مادامێک چۆنێتیی تێگەیشتنی کەسێک لە سێکس کاریگەری لەسەر کۆی ژیانی جێ دەهێڵێت، کەواتە بابەتێکە دەبێت هەر لە سەرەتاوە منداڵی پێ ئاشنا بکرێت، وە مادامێک زۆربەی باوان خۆیان بەدوور دەگرن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان لە ڕووی سێکسییەوە، کەواتە دەبێت دامەزراوە پەروەردەییەکانی حکومەت بەم بەرپرسیاریەتییە هەڵبستن. لە

بەرامبەریشدا ئەوانەی پێچەوانەی تۆ بیر دەکەنەوە، ئارگۆمێنتی ئەوە سەررێ دەخەن کە پەروەردەی سێکسی لەو تەمەنە کەمەوە ڕووبەڕووی دوو کێشە و تەحەدیی سەرەکی دەبێتەوە: دانەبەزینی مامۆستا بۆ ئاستە جیاواز جیاوازەکانی هۆشیاریی قوتابی لەمەڕ بابەتە سێکسییەکانەوە، هەروەها نەبوونی ژینگەیەکی ئەخلاقی-دینیی گونجاو بۆ ئەم جۆرە بابەتە.

هەرکەسێکی ژیر دەتوانێت ئەوە ببینێت کە خاڵەکانی ئەوانیش مەعقولن و دەبێت لەبەرچاو بگیرێن. کەواتە تۆ دەبێت وەڵامێکت هەبێت بۆ ئەو قوتابییانەی کە ئاستی هۆشیارییان لە کۆی پۆلەکە کەمترە، چونکە باسکردنی بابەتی سێکسی بۆ هەموو پۆلەکە وەک یەک، ڕەنگە زیاتر ئەم قوتابییانەی گومڕاتر بکات. جگە لەمە، تۆ دەبێت ڕەخنەی دووەمیشیان لەبەرچاو بگریت، کە ماڵ باشترین شوێنە بۆ پەروەردەی سێسکی نەک قوتابخانە، چونکە لە ماڵدا چوارچێوەیەکی ئەخلاقی-دینی لە بەرچاو دەگیرێت کە لە قوتابخانەدا ئەمە نییە. ئەم دانپیانان و لەبەرچاوگرتنانە هەڵوێستی تۆ لاواز ناکات، لەگەڵ ئەمانەشدا، تۆ دەتوانیت هێشتا ئارگۆمێنت بۆ گرنگیی وەها پرۆگرامێک سەررێ بخەیت، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەبێت توانات هەبێت بەرگری لەم پێداگرییەی خۆت بکەیت، بۆ نموونە، تۆ دەتوانیت بڵێیت، تەفاسیلی پرۆگرامەکە بخرێتە ڕوو تا باوان گومانیان نەمێنێت و مامۆستای زۆر تایبەت و ڕاهێنراو بۆ ئەم ئەرکە ڕابسپێردرێن تا بەسەر لەمپەرەکانی پرۆسەکەدا زاڵ ببین. کەواتە لەبەرچاوگرتنی خاڵە بەهێزەکانی ئەوانی تر و دارشتنەوەی ڕاکانت بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە، ئارگۆمێنت و هەڵوێستی تۆ بەهێز دەکات نەک لاواز، چونکە ئەمە ئەوە پیشان دەدات کە تۆ تەنها لە یەک گۆشەنیگای بەرتەسکەوە بیر ناکەیتەوە، بەڵکوو توانای بینینی لایەنە جیاوازەکانی کێشەکەت هەیە.

لەیادت بێت کە خوێنەرەکانت دەتوانن زیاتر لەوەی کە تۆ کراوەیت

لە ئاست بۆچوونەکانیان، ئەوان کراوەتر بن لە ئاست ئەوانەی تۆدا. بەڵام ئەمە تەنها ئەو کاتە ڕوو دەدات کە تۆ ڕاستگۆیانە دان بنێیت بە خاڵە بەهێزەکانی بیرکردنەوەیان و لەبەرچاویان بگریت.

## ڕێنماییی حەوتەم: هیچ فاکتێکی پەیوەندیدار فەرامۆش مەکە

لە کاتی پرۆسەی لێکۆڵینەوەدا دەشێت فاکتێک ببینیتەوە کە پشتگیری لە ڕای پێچەوانەی تۆ بکات، نەک ڕای خۆت. مەیل و حەزی خۆدزینەوە لەم جۆرە فاکتانە، زۆر بەهێزتر دەبێت ئەگەر لای بەرامبەر هێشتا ئاگاداری ئەم فاکتە نەبێت. سەرەتا وا دەر دەکەوێت کە هەر جۆرە ئاماژەدانێک بەم چەشنە فاکتانە، لە زەرەری تۆ و قازانجی بەرامبەردا بێت.

بەڵام ئامانج لە بیرکردنەوە و ئارگۆمێنت-سەرڕێخستن بریتی نییە لە لێدان و تێکشکاندنی بەرامبەر، بەقەد ئەوەی هەوڵێکە بۆ گەیشتن بە وێنەیەکی کامڵتری حەقیقەت بە هەموو ئاڵۆزییەکانی خۆیەوە. ئەگەر ئەمەش ڕوو بدات، دیارە هەمووان براوەن. بەڵام ئەگەر بەشێک لە حەقیقەت لەبەر هەر هۆیەک بێت، بشاردرێتەوە، ئەوا کەس براوە نابێت، هەرچەندە وا هەست دەکرێت هەندێک لێی سوودمەند دەبن. بە خستنەڕووی هەموو ئەو فاکتانەی دەستت پێیان ڕادەگات، تەنانەت ئەوانەشی کە ناچارت دەکەن هەڵوێستی سەرەتاییی خۆت لەمەڕ کێشەکەوە بگۆڕیت، تۆ خوێنەرەکان سەرسام دەکەیت بەو ڕادە بەرزەی لە ڕاستگۆیی و بابەتیبوونەی کە پیشانت داوە، ئەوانیش بانگهێشت دەکەیت تا بەرز ببنەوە بۆ ئەو ئاستە.

با ئەم نموونەیەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین. تۆ لەو بڕوایەدایت بەرنامەی دژەهەژاری ئەگەر لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە سەرپەرشتی

بکرێت، زۆر سوودمەندتر دەبێت بۆ هەژاران وەک لەوەی کە حکومەتە هەرێمییەکان جێبەجێی بکەن. لەسەر ئەم بابەتە، تۆ هەڵدەستیت بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەوەی کە کامیان باشتر پرۆگرامەکە جێبەجێ دەکەن. وەکوو ئاماژەشی پێ درا، تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە حکومەتی ناوەندی بەرنامەکە جێبەجێ بکات. لە پرۆسەی لێکۆڵینەوەکەتدا، ڕاپۆرتێک دەخوێنیتەوە کە ئاماژە بەوە دەدات ئەگەر حکومەتی ناوەندی بەرنامەکە جێبەجێ بکات، ئەوا کەموکووڕی جیدی دەکەوێتە پرۆگرامەکەوە ئەم ڕاپۆرتەش تا ئەندازەیەکی زۆر پشتگوێ خراوە و باس نەکراوە. لە هەمان کاتدا ئەم ڕاپۆرتە ئاماژە بەو کەموکووڕییانە نادات لە حاڵەتێکدا کە حکومەتی هەرێمەکان پرۆگرامەکە جێبەجێ بکەن. تۆ لەو بڕوایەدایت کە خوێنەرەکانت ئاگاداری ئەم ڕاپۆرتە نین، بۆیە ئەگەر ئاماژەی پێ بدەیت لە وتارەکەتدا، ئەوا هەڵوێستی خۆت لاواز دەکەیت. کەواتە ئایا تۆ دەبێت چی بکەیت؟ لە کاتێکدا کە ڕاپۆرتەکە پەیوەندییەکی بە کێشەکەوە نەبووایە، ئەوا گەمژانە دەبوو لە وتارەکەتدا ئاماژەی پێ بدەیت. بەڵام کە تۆ دڵنیا بوویت لەوەی کە پەیوەندیی هەیە (نەک هەر ئەوەندەش، بگرە واشت لێ دەکات کە بە هەڵوێستی خۆتدا بچیتەوە) ئەوا ڕاستگۆیی لەگەڵ خوێنەرەکانت هەڵبژێرە و ئاماژەی پێ بدە و دەرئەنجامەکەشی قبوڵ بکە.

**ڕێنماییی هەشتەم: با نووسینەکەت بریتی نەبێت لە ڕیزکردنی زیاد لە پێویستی بەڵگە و ئارگۆمێنتەکان:**

وتاری کورت (هەر وتارێک کەمتر بێت لە ٣ هەزار وشە، ئەوا بە وتاری کورت دەدرێتە قەڵەم) هەرگیز ناتوانێت یەکلاییکەرەوە بێت. هیچ نووسەرێکی وریاش ناکەوێتە ئەم هەڵەیەوە. لە ڕووکەشدا ڕەنگە وا لێک بدرێتەوە کە مادەم نووسینەکە کورتە، کەواتە با پڕ بێت لەو بەڵگانەی کە تەنها پاڵپشتی تێگەیشتنێک لە تێگەیشتنەکان دەکەن لەسەر کێشەکە،

بەو هیوایەی کە ئەمە ئیتر وەک نووسینێکی یەکلاییکەرەوەی بێکەموکووڕ بخوێنرێتەوە. بەڵام دەبێت کاردانەوەی خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەم جۆرە نووسینانەدا لەبەرچاو بگیرێت. ئایا خوێنەر چ کاردانەوەیەکی دەبێت لە ئاست نووسینێک کە بەڵگە دوای بەڵگە، لێکدانەوە دوای لێکدانەوە ڕیز کراوە، هەمووشی لە خزمەت تەنها یەک بۆچووندایە، هەموو خوێندنەوە جیاوازەکانی تری بۆ کێشەکە فەرامۆش کردووە؟ هیچ گومانی تێدا نییە کە خوێنەر بەم چەشنە نووسینە دەڵێت، *نابابەتی* و *تەرەفگیر*! ڕێگەی دەربازبوون لەم کاردانەوە زۆر خراپەی خوێنەر بەوە دەبێت، کە تەنها ئەو بەڵگە و ئارگۆمێنتانە پیشان بدەیت، کە زۆر بەهێز و جەوهەرین، نەکوو ڕیزکردنی یەک لەداوی یەکی ئارگۆمێنت و بەڵگە بێپێز و لاوازەکان.

تێبینییەکی تریش هەیە کە پەیوەندیی بە هەمان خاڵەوە هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە تۆ خۆت لە خستنەڕووی بەڵگە و ئارگۆمێنتی تەرەفدار بەدوور بگریت، بەڵام ڕەنگە بە زمانێکی وا توند و پێداگر بنووسیت، کە خوێنەرەکانت بگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە تۆ بە شێوەیەک لە شێوەکان دەتەوێت شتێک لەم شتانەی خوارەوە بە خوێنەر بڵێیت:

من لەم وتارەدا *سەلماندم* کە جگە لە پێشنیارەکەی دکتۆر فلان، هیچ بەدیلێکی ئەقڵانیی تر لە بەردەستتا نییە.

ئەو بەڵگانەی من ئاماژەم پێ دان، ناتوانرێت ڕەت بکرێتەوە، هیچ *گومانێک* لەئارادا نییە کە پێشنیارەکەی فلان زۆر زیانبەخشە.

هیچ کەسێکی *ئاقڵ* دوودڵ نابێت لە قبوڵکردنی ئەم پێشنیارە.

تۆ ناتوانیت لە نووسینێکی کورتدا *هیچ بسەلمێنیت*، تەنانەت ئەگەر بەڵگەکانت وەک بەڵگەی *بێخەوش* لە قەڵەم بدەیت و دەرئەنجامەکانیشت *کامڵ* بێنە بەرچاو، لەیادت بێت هەمیشە باش وایە لێگەڕێیت خوێنەرەکانت خۆیان بڕیار لەسەر نووسینەکانت بدەن. هیچ خوێنەرێکیش وا بیر ناکاتەوە کە بۆ ئەوەی پێی بڵێن خوێنەری باش، ئەوا دەبێت لەگەڵ

نووسەردا کۆک و هاوڕا بێت.

**ڕێنمایی نۆیەم: جەخت لەو ئارگۆمێنتانە بکەرەوە کە زۆرترین هێزی قایلکەری خوێنەر لەخۆ دەگرن:**

ئارگۆمێنتی جیاوان، کاریگەریی جیاواز دادەنێت لەسەر خوێنەری جیاواز. وەک چۆن گرنگە دونیابینیی خوێنەر لەبەرچاو بگیرێت، ئاواش گرنگە بزانرێت چ جۆرە ئارگۆمێنتێک زۆرترین کاریگەریی قایلکەر لەسەر خوێنەر دادەنێت. لەبەرچاونەگرتنی ئەم خاڵە و خود کردنە سەنتەر، دەبێتە لەمپەر لە بەردەم نووسیندا وەک هێزێک بۆ قایلکردنی خوێنەر.

با لەم باسە بکۆڵینەوە، کە ئایا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێت یاخود نابێت خۆ هەڵقورتێنێت لە کاروباری ناوخۆی وڵاتانی تر. لە خوارەوە ئارگۆمێنتە جۆربەجۆرەکان لەسەر ئەم باسە دەخەینە ڕوو:

**ئارگۆمێنتی ئەخلاقی-دینی**

ئارگۆمێنتە ئەرێنییەکان: ١. بەرپرسیارێتییەکی ئەخلاقی هەیە لەسەر شانی بەهێز، کە بەرگری لە مافی لاواز بکات. ٢. هەڵبژاردنی هەڵوێستی بێدەنگی و هیچ نەکردن لە کاتێکدا کارەساتەکان ڕوو دەدەن، هەڵوێستێکی نائەخلاقییە.

ئارگۆمێنتە نەرێنییەکان: ١. لە میراتی ئایینی جۆدیۆ-کریشچندا {ئایینێکی لێکدراوی مەسیحییەت و یەهودیەتە} هاتووە کە خراپە بە چاکە، ڕق بە خۆشەویستی وەڵام بدەرەوە. ٢. جەنگی مۆدێرن ئەوەندە کاولکارە، جیاوازییەک ناکات لەنێوان قوربانی و جەلاددا.

**ئارگۆمێنتی سیاسی-پراکتیکی**

ئارگۆمێنته ئەرێنییەکان:١. مادامێک تەکنەلۆجیا جیهانی بە شێوەیەکی بەرچاو بچووک کردۆتەوە، کەواتە هیچ شوێنێک لەم جیهانەدا نییە بکەوێتە دەرەوەی بازنەی بەرژەوەندیی نەتەوەی ئێمەوە. ٢. ڕەتکردنەوەی دەستتێوەردانی پراکتیکی بۆ وەستاندنی ستەمکاری، ڕێک دەچێتە بابی هاندانی ستەمکارییەوە.

ئارگۆمێنته نەرێنییەکان:١. ڕێک لەبەر ئەوەی کە جیهان ئاوا بچووک و بچووکتر دەبێتەوە، ئێمە دەبێت خۆ بەدوور بگرین لە شەڕی نەتەوەکانی تر. ٢. کاتێک ئێمە سامانی نەتەوەییمان تەخشان و پەخشان دەکەین لە جەنگەکانی دەرەوەی وڵاتدا، لاوازی و موعەرەزبوونمان لە ئاست هێرشە دەرەکییەکاندا زیاد دەکات.

ئارگۆمێنتی فەلسەفی:

ئارگۆمێنته ئەرێنییەکان: ١. نەتەوەی ئازاد، بەرپرسیارە لە بەرگریکردنی ئازادی لە گشت شوێنێکی تری ئەم جیهانە.

ئارگۆمێنته نەرێنییەکان:١. ئەوەی بە جەنگدا تێپەڕ بێت، لەودیوەوە بە گەندەڵی و شێواوی دێتە دەرەوە.

با وای دانێین تۆ ڕاپۆرتێکی ئەرێنی {واتە لەگەڵ دەستتێوەردانی حکومەتی ئەمەریکیدایت} لەسەر ئەم مەسەلەیە دەنووسیت بە جەختکردنە سەر ئارگۆمێنتی ئەخلاقی-دینی، بەڵام تۆ وای بۆ دەچیت کە خوێنەرەکانت زیاتر بە دوو ئارگۆمێنتەکەی تر قایل دەبن. لەم دۆخەدا ئاقڵانە نییە جەخت لە ئارگۆمێنتی ئەخلاقی بکەیتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی لای خۆت بەهێزترینی ناویانە، بەڵکوو دەبێت جەخت لە دووانەکەی تر بکەیتەوە، ئەگەر وا نەکەیت، نووسینەکەت لە قایلکردنی ئەوانی تردا بە بۆچوونەکانی خۆت {کە حکومەتی ئەمەریکی دەبێت تەداخول لە کاروباری وڵاتانی تردا بکات} سەرکەوتوو نابێت.

**ڕێنمایی دەیەم: هەرگیز ئارگومێنتێک بەکار مەهێنە کە دڵنیا نیت لەوەی کە هەم ئاقڵانەیە و هەم پەیوەندیدارە بە بابەتەکەوە:**

ئەم ڕێنماییە دەبێت وەکوو جۆرێک لە بڕوانامەپێدان بە ڕێنماییەکانی تر سەیر بکرێت. ڕاستگۆیی و بەتەنگەوەهاتنی حەقیقەت بریتین لە دوو گرنگترین تایبەتمەندییەکانی نووسەری سەرکەوتوو. هەر بۆیە بەبێ ئەم دوو سیفەتە، شتێک نامێنێتەوە بە ناوی قایلکردنی ئەوانی تر. کەواتە ئەگەر لەناو ئارگومێنتەکانا گەیشتیتە ئەو بڕوایەی کە تەنیا یەک ئارگومێنت شیاوی بەکارهێنانە، ئەوا بێ دوودڵی بەکاری بهێنە. دیارە ئەم حاڵەتەش، بەوەی ناچار بیت تەنها یەک ئارگومێنت هەڵبژێریت، زۆر ڕوو نادات، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەتوانیت زیاد لە ئارگومێنتێک بەکار بهێنیت، بەبێ ئەوەی دژی ڕاستگۆیی خۆت بوەستیتەوە.

**ڕێنمایی یانزەیەم: بۆچوونەکانت پێوستیان بە کاتە تا جێی خۆیان بکەنەوە:**

چاوەڕوانییەکی ناواقیعییە، ئەگەر هەر لە دوای بڵاوکردنەوەی ڕاکانمان، ئیدی پێمان وا بێت ئەوانی تر بۆچوونەکانمان تەبەنی دەکەن. جگە لە حاڵەتی زۆر ناوازە نەبێت، ئەوا لە باشترین حاڵەتدا تۆ دەبێت هیواخواز بیت کە خوێنەرەکانت لەبەر ڕۆشنایی نووسینەکانت دووبارە بە تێگەشتنەکانیاندا بچنەوە بۆ بابەتەکە، پاشان *سەرئەنجام* بۆچوونەکانیان بگۆڕن. ئەم "سەرئەنجام"ەش ئامازە نییە بۆ پێنج خولەک، بەڵکوو ئامازەیە بۆ مانگێک، بگرە بۆ ساڵێکیش. ئەم دواکەوتنە پرسیار لەسەر توانای قایلکردنی تۆ دانانێت، چونکە گۆڕینی ئایدیای ئەوانی تر واتە تێکشکاندنی ئەو بەڵێن و پەیمانانەی کە کەسەکان لەگەڵ بیروڕاکانی

خۆیاندا دەیبەستن و تێکشکاندنیشی هەر وا ئاسان نییە و کاتی دەوێت.

ئەمەی خوارەوە پوختەی لیستی ئەو ڕێنماییانەیە کە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی قایلکەرانە بنووسیت، دەتوانیت یەک لەدوای یەک لێیان سوودمەند بیت:

١. ڕێزگرتن لە وەرگرەکانت

٢. تێگەیشتن لە گۆشەنیگای وەرگرەکانت

٣. نووسینەکەت بەو خاڵانە دەست پێ بکە کە هاوڕا و تەبان لەسەری لەگەڵ خوێنەرەکانتدا

٤. گرتنەبەری شێوازی ئەرێنی

٥. زیادەڕۆیی بە دەرئەنجامەکانتەوە مەکە

٦. کاتێک کە بەرامبەر خاڵێکی مانادار و گرنگ دەڵێت، ڕەتی مەکەرەوە

٧. هیچ فاکتێکی پەیوەندیدار فەرامۆش مەکە

٨. با نووسینەکەت بریتی نەبێت لە ڕیزکردنی زیاد لە پێویستی بەڵگە و ئارگۆمێنتەکان

٩. جەخت لەو ئارگۆمێنتانە بکەرەوە کە زۆرترین هێزی قایلکەری خوێنەر لەخۆ دەگرن

١٠. هەرگیز ئارگۆمێنتێک بەکار مەهێنە کە دڵنیا نیت لەوەی کە هەم ئەقڵانییە و هەم پەیوەندیدارە بە بابەتەکەوە

١١. بۆچوونەکانت پێویستیان بە کاتە تا جێی خۆیان بکەنەوە.

با ئێستا نووسینێکی ناقایلکەر بەراورد بکەین بە نووسینێکی قایلکەر تا بۆمان ڕوون ببێتەوە کە چۆن ئەم ڕێنماییانە جێبەجێ دەکرێن.

## نموونە ناقایلکەرەکە

قوتابییەک نامەیەک لەسەر خراپی و کەموکورییەکانی کافتریای زانکۆکەیان دەنووسێت. خوێنەری قوتابییەکە بەرپرسی کافتریایە، ئامانجی

قوتابییەکەش ئەوەیە کە بەرپرسەکە قایل بکات تا بە خۆی و ستافی کافتریاکەدا بچێتەوە، لەبەر ڕۆشنایی ڕەخنەکانی ئەم.

**لەبەرچاونەگرتنی ڕێنمایی سێیەم: بە خاڵی هاوبەشی نێوان خۆی و وەرگرەکەی دەست پێ ناکات:** گلەییکردنێکی بەردەوام هەیە لەناو خوێندکاراندا لەسەر خراپیی خواردن و پیسیی قاپوقاچاخەکانی کافتریای زانکۆکەمان. وەک قوتابییەکی ئەم زانکۆیە، پێم خۆشە هۆکانی ئەم گلەییوگازندەیە بخەمە ڕوو.

**لەبەرچاونەگرتنی ڕێنمایی پێنجەم: زیادەڕۆیی دەکات لە حوکمەکانی:**

با سەرەتا لە کوالێتیی خواردنەکانەوە دەست پێ بکەین، گۆشتەکە یان ئەوەتا نەکوڵاوە، یان ئەوەندە کوڵاوە، لەزەتی نەماوە، ئەوەندە خراپە، کە مرۆڤ گومان دەکات هەرگیز شتێکی وا لە بازاڕەکاندا ساغ ببێتەوە. سەوزەواتەکان هێندە بێلەزەت و کۆنن، باس ناکرێت، بەلام ئەمە بە هەرحاڵ، چونکە زۆر لە قوتابییەکان دەستیان لێ هەڵگرتووە. هەندێک لە قوتابییانیش جارجار لە خواردنەکانیاندا دیارییان بۆ ڕەوانە دەکرێت وەکوو تاڵەموو لە شلەدا و مێش و مەگەزی مردوو لە پەتاتەدا. ئەمەی کە وتم، تەنها مشتێکە لە خەرمانێک.

کەموکووڕی لە خزمەتگوزاریدا، گلەییەکی تری قوتابییەکانە. خزمەتکردن ئەوەندە خاوە، زۆر جار قوتابییەکان خواردنی ساردبۆوە دەخۆن، هەندێکی تریشیان لەبەر نەبوونی ئەو کاتە زۆرە بۆ چاوەڕوانیکردن، ناچار دەبن لە دەرەوەی زانکۆ بە نرخێکی زیاتر نان بخۆن.

**لەبەرچاونەگرتنی ڕێنمایی یەکەم: ڕێز لە خوێنەر ناگرێت و وشەی بریندارکەر بەکار دەهێنێت:**

گەورەترین گلەیی قوتابییان لەسەر ئەو قاپوقاچاخە پیسەیە کە ناچارن بەکاری بهێنن. من ناڵێم کەلوپەلەکان ناخرێنە غەسالەوە، بەلام

بـە قودرەتـی قـادر تەنهـا چەنـد دانەیەکیـان بەپاکـی دێنـە دەرەوە. لەگـەڵ ئەمانەشـدا، کارمەنـدەکان چاویـان ئـەو هەمـوو پیسـییە نابینێت و ڕۆژانـە بەکاریـان دەهێنـن. هێلکـە وشـک بۆتـەوە بـە چەتاڵـەکان و گۆشـتیش بـە قاپەکانـەوە، لـە ڕاسـتیدا ئەمـە بۆخـۆی خەلاتێکە بۆ قوتابییەکان، چونکە بە پارەی ژەمێـک، دوو ژەم دەخـۆن!

پرسـیارە جەوهەرییەکـە ئەوەیـە کـە ئایـا چ بکرێـت بـۆ باشـترکردنی بارودۆخـی کافتریـا؟ قوتابییـەکان چەنـد جـار گلەیـی خۆیـان ئاڕاسـتەی بەرپرسـانی زانکـۆ کـردووە، بـەلام بێسـوود بـووە. ئـەم بەرپرسـانە گوێـی خۆیـان لـە ئاسـت کێشـەکە خەواندووە، لـە کاتێکدا ئاشـکرایە کـە پێویسـتە شـتێک لـە ئاسـت کێشـەکەدا بکرێـت. چاوخشـاندنەوەی بـەردەوام پێویسـتە بـۆ دۆخـی کافتریـا، بەلام ئایـا هیـچ دەکرێـت؟ تـۆ لـە مـن باشـتر دەزانیـت کـە وەلامەکـە نەخێـرە!

ئایـا دەبووایـە قوتابییەکـە چـۆن مامەڵـەی لەگەڵ کێشـەکە و خوێنەرەکەیدا بکردایە؟ سـەرەتا دەبـوو قوتابییەکە بیزانیبایە کە ئایا بەرپرسـی کافتریاکە کەسـێکی ناڕاسـت و بێدەربەسـتە لـە ئاسـت بـاش و خراپیـی کافتریاکـەی یـان ئەوەتـا کەسـێکە بەدەربەسـتە و بەتەنـگ باشـترکردنی کافتریاکەیـەوە دێـت، بـەلام کێشـەکە ئەوەیـە کـە نازانێـت چـۆن ئەمـە بـکات. ئەگـەر قوتابییەکـە بـۆی دەر کـەوت کـە بەرپرسـەکە بەتەنـگ باشـترکردنی ئیشـەکەیەوە نایـەت، کەواتـە *سـەرەتا هـەر نەدەبـوو نامەکـەی ئاڕاسـتەی ئـەو بکردبایـە*، بەڵکوو دەبـوو ئاڕاسـتەی بەڕێوەبەرانـی زانکـۆی بکردبایـە، چونکـە ئـەوان توانـای لێپێچینەوەیـان هەیـە لـە خـاوەن کافتریاکـە.

بـە دیوەکـەی تریشـدا، ئەگـەر قوتابییەکـە بیزانیبایـە کـە خـاوەن کافتریاکـە بەتەنـگ کافتریاکەیـەوە دێـت و ئـاگاداری کەموکـووڕی و باشـییەکانی شـوێنەکەیەتی، ئـەوا دەبووایـە درکـی بـە دوو شـت بکردبایـە

(١) بەرپرسی کافتریاکە باش هەست بەو زیادەڕۆیی و خستنەسەرەی قوتابییەکە دەکات، چونکە زیادەڕۆییکردن لە گلەییکردن بۆتە نەریتێکی ناو قوتابییەکانی زانکۆ. (٢) لەگەڵ هەوڵی جیدیی بەرپرسەکەدا بۆ دەستنیشانکردنی کەموکوورییەکانی کافتریاکە، بەڵام ڕێشی تێدەچێ ئاواش هەموو کەموکوورییەکان وەک خۆی نەبینێت. ئەگەر قوتابییەکە کەمێک بە ئاگاییەوە گلەییەکانی ڕیز بکردایە، بۆی دەر ئەکەوت کە ئەم سەرلەبەری کافتریاکەی زەربی سفر کردووە، چونکە ئەم هەر لە خراپیی کوالیتیی خواردن و پیسیی خواردن و خاوخلیچکیی کارمەندەکانەوە پیا هاتووە تا پیسوپەڵۆخیی قاپوقاچاخەکان. ڕیزکردنی ئەو هەموو گلەییە، ڕێک بە مانای ئەوە دێت کە کافتریاکە هیچ خاڵێکی باشی تێدا نییە، ئەم جۆرە لە هێرشکرنە گشتگیرییە پاڵ بە خوێنەرەوە دەنێت کە سەرلەبەری گلەییەکان ڕەت بکاتەوە. ئەو مەیلە سروشتییەی کە وەک هەر مرۆڤێکی تر، خاوەن کافتریاکەش خاوەنیەتی و حەز ناکات کەموکوورییەکانی خۆی ببینێت، بەم ڕەتکردنەوە سەراپاگیرەی قوتابییەکە کەم نابێتەوە بگرە بەهێز دەبێت. ئەو بە خۆی دەڵێت "مەگەر من کوێر بووم ئەو هەموو کەموکوورییە دیارانەم نەبینیبێت، ئەم قوتابییە هەر خۆی دەمبەهاوار و گلەییکەرە."

## نموونە قایلکەرەکە

قوتابییەکە کە پڕچەک کرابێت بەو ڕێنماییانەی باس کران، پێشبینیی ئەو کاردانەوەیەی دەکرد لەلایەن خوێنەرەکەیەوە، بۆیە بەم چەشنەی خوارەوە نامەکەی دەنووسی:

چ جۆرە قوتابییەک بەردەوام دەم بە بۆڵەبۆڵە لەسەر خواردنەکانی کافتریا؟ بێگومان کەسێک کە پەروەردە کراوە بۆ ئەوەی تا مردن لەگەڵ دایکیدا بمێنێتەوە و جگە لە خواردنیماڵەوە، ناتوانێت خۆی لەگەڵ هیچ

خواردنێکی تردا بگونجێنێت. یەکەم ساڵی زانکۆم لەگەڵ قوتابییەکی ئاوادا گوزەراند لە بەشە ناوخۆییەکان بە ناوی جۆن. دوای هەر ژەمێک لە بەشە ناوخۆییەکان، بۆ چەند سەعاتێک جۆن دەیبۆلاند و بۆ چەند ژەمێکیش مانی لە نانخواردن دەگرت. لە دیدی ئەودا لەفەی هەمبەرگر بۆ تەندروستی خراپ بوو، مریشکی کولاو لیق و ناشرین بوو، ئیتر بەم شێوەیە لەدوای خواردنی هەر ژەمێک، بەنابەدڵی بۆڵەبۆڵی لەم چەشنەی ڕیز دەکرد.

جۆن نزیکەی مانگێک لەگەڵم مایەوە. ئەو وانەکانی بەدڵ بوو، نمرەکانیشی باش بوون. هەروەها یەک-دوو هاوڕێی نوێیشی ناسی. جۆن سەری زمان و بنی زمانی پیاهەڵدانی خواردنەکانی دایکی بوو: سێ جار خواردنی ستیکی دوو ئینجی، لەزانیا، سپێگێتی بە گۆشتی بەرازەوە، کفتە و سۆسەجی گەرمی ئیتاڵی. ئیدی دوای مانگێک، زانکۆی جێ هێشت و گەڕایەوە بۆ بەهەشتی ماڵەوە. ئەوەندەی من ئاگادار بووم، جۆن تەنها قوتابی نەبوو کە بە هۆی پەروەردە پڕنازەکەی دایکیانەوە بەردەوام گلەییان لە خواردنی کافتریا دەکرد.

خزمەتگوزاری و کوالیتیی خواردنەکان لە کافتریای زانکۆکەماندا هەمیشە باشە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بەدڵنیاییەوە جاروبار گۆشتەکە زیاد لە پێویست دەکوڵێنرێت و سەوزەواتەکانیش کۆن و ناخۆشن، بەڵام ئەمە شتێکە کە تەنانەت لە ماڵیشدا ڕوو دەدات( لە کاتێکدا دایکم خواردنی بۆ پێنج کەس دروست دەکرد، نەک ٥٠٠ کەس). لە ڕاستیدا دوو شت هەیە کە من بە پێویستی دەزانم کە دەبێت باش بکرێت:

یەکەمیان، وەستانە لە ڕیزەکاندا. زۆربەی کات لەگەڵ ئەوەشدا کە زوو خۆم دەگەیەنمە کافتریا، بەڵام ئاواش دەبێت پازدە خولەک بۆستم تا نۆرەم دێت. من لە هاوڕێکانی ترمەوە لە زانکۆکانی تر، ئەوە دەزانم کە ئەوەی لە ڕیزدا نەوەستێ بۆ خواردن، حاڵی زۆربەی کافتریاکانە بەڵام

نەک هەموو. بەڵام ئەگەر کاربەدەستانی کافتریاکە ڕێگەیەک بدۆزنەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ خێراکردنی خزمەتکردن، ئەوا جێی دەستخۆشی و سوپاس دەبێت. دووەمیان، پەیوەندی بە پاکوتەمیزیی قاپوقاچاخەکانەوە هەیە. لە زۆربەی ژەمەکاندا، لە ڕاستیدا دەبێت پەڵەیەک یان، پیسییەک لەسەر کەوچکێک یان قاپێک پاک بکەمەوە. ڕەنگە لەبەر کەمیی کات نەتوانن دوو جار شتەکان بشۆن، یان لەبەر سەرقاڵیی زۆریان نەپرژێنە سەر بینینی ئەم شتانە. بەڵام لە ڕاستیدا قاپوقاچاخی پاک و بریسکاوە، ئیشتیها دەکاتەوە، چونکە وا لە خواردنەکان دەکات بەتام و چێژتر دەر بکەون.

بەرەوپێشبردنی کافتریا، نە جۆن و نە هیچ قوتابییەکی تر ڕازی دەکات کە پەروەردە کراون بۆ ئەوەی بەردەوام بۆڵەبۆڵ بکەن. بەڵام بەدڵنیاییەوە بەرەوپێشبردنی کافتریا وا دەکات ببێتە شوێنێک، کە باشترە بۆ خواردن.

جیاوازیی ئەم دوو نووسینە لە ڕاستیدا ئاشکرایە. تەنانەت بەئاگاترین و دڵسۆزترین بەڕێوبەر ناتوانێت نووسینی یەکەمیان وەک نووسینی کەسێک وەر نەگرێت کە بە هەموو شت ناڕازییە و گلەیی لە هەموو شت دەکات. یان وەکوو نووسینێک کە نووسەرەکەی دەیەوێت لە ڕێیەوە تووڕەیی خۆی خاڵی بکاتەوە نەک هەر لە ئاستی بەرپرسی کافتریاکە، بەڵکوو لە ئاست دەنکەکەی و مامۆستاکەی و باوانی و بگرە لە ئاست هەموو دنیاشدا. بە دیوەکەی تریشدا، هیچ بەڕێوەبەرێک کە لانی کەمی بەرپرسیارێتیی تێدا بێت، ناتوانێت نووسینی دووەم وەک بەرهەمی کەسێکی بەئاگا و کامڵ و پێگەیشتوو و دڵسۆز وەر نەگرێت. نووسینی دووەم وا لە خاوەن کافتریاکە دەکات شوێنەکەی باشتر بکات، بە مانایەکی تر، *قانعی* دەکات کە وا بکات.

# ڕاهێنانەکان

ڕاهێنانەکانی ئەم چاپتەرە، تا ڕادەیەک جیاوازە لە چاپتەرەکانی پێشوو. ژمارەیەکی زۆر لە کێشە هەنووکەییەکان بەسەر دەکاتەوە. هەریەک لەو کێشانە، بابەتی دیبەیتی گەرموگوڕ بوون. هەندێکیان مێژوویەکی دووروودرێژیان هەیە. لەسەر زۆربەی ئەم کێشانە، بڕێکی زۆر لە لێکۆڵینەوە نووسین دەست دەکەون.

بەوردی سەرنجی لیستی کێشەکان بدە، ئەوانە هەڵبژێرە کە سەرنجت ڕادەکێشن. پاشان ئەو هۆشیارییەی لەم کتێبەوە بەدەستت هێناوە، بەتایبەت لە بەشی سێیەمەوە "ستراتیژ،" بەسەر کێشەکاندا تاقی بکەرەوە. لە خەیاڵت بێت کە کێشەکان لێرەدا بە شێوەیەکی زۆر گشتی خراونەتە ڕوو. ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆت کە چۆن زانیارییە گرنگەکان دەناسیتەوە و لە چ گۆشەنیگایەکەوە دەیانخوێنیتەوە. واش باشترە لەبری ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە کێشەکان بەسەر بکەیتەوە، سەرپێییانە و بێ قووڵبوونەوە، تەنها چەند دانەیەکی کەمیان بەسەر بکەیتەوە بەڵام بەقووڵی.

لە کۆتاییدا، نووسینێکی قایلکەرانە بنووسە. (پێش ئەوەی نووسینەکەت بنووسیت، ئەو وەرگرە دیاری بکە کە بۆ نووسینەکەتی ئاڕاستە دەکەیت،

پاشـان لەبەر ڕۆشنایيی ئەم دیاریکردنەدا، نووسینەکەت بنووسـە).

١. لـە مانگی دووی ١٩٩٧دا دۆزینەوەیەکـی زانسـتیی گرنـگ ڕاگەیەنـرا. لـەم ڕاگەیاندنـەدا بـاس لـەوە کـراوە کـە بـۆ یەکـەم جـار لـە مێژوودا توانـرا کۆپیکـردن لـە ئاژەڵـی شـیردەردا بەسـەرکەوتوویی ئەنجـام بدرێت. زانایـان بـە وەرگرتنـی DNA لـە مەڕێکـەوە توانییـان مەڕێـک دروسـت بکەنـەوە کـە لـە ڕووی جیناتـەوە تـەواو هاوشـێوەی یەکتـرن. ئیـدی لـە دوای ئـەم دۆزینەوەیـەوە، زانایـان لـەو بڕوایـەدان ڕێگرییەکـی زانسـتیی ئەوتـۆ نەماوەتـەوە تـا بتوانـن مرۆڤیـش کۆپـی بکـەن، کەواتـە ئێسـتا ئەگـەری هێنانـەدی زۆر لـەو شـتانەی کـە نووسـەرانی بـواری ئەدەبـی خەیاڵـی-زانستی بیریـان لـێ کردۆتـەوە، ئەگەرێکی زۆر زیندووە، لـەو شتانە وەکـوو: a. دایـک و باوکێـک پـاش ئـەوەی کـە منداڵـە زیندە ئازیزەکەیـان لەدەسـت دەدەن، دەتوانـن منداڵێکی کتومـت وەک ئـەوەی پێشـوویان پێ بدرێتەوە. b. هەوادارانـی نـاوداران دەتوانـن ببنـە خاوەنـی DNAی ئـەو کەسـەی کـە شـەو و ڕۆژ خەونـی پێـوە دەبینـن. C. دیکتاتـۆرەکان، ئیـدی لەمـەودوا دەتوانـن دەسـەڵاتیان دووبـارە درێـژ بکەنـەوە بـۆ *خـودی خۆیـان*. d. دەوڵەمەنـدان دەتوانـن کۆپییـەک لـە خۆیـان دروسـت بکـەن، یـا هـەر کاتێـک بەشـێکیان پێویسـتی بـە گـۆڕان هەبـوو، پارچـەی یـەدەگ ئامـادە بێـت. کۆپیکردنـی مـرۆڤ، وەک ئـەو نموونانـەی سـەرەوە، پرسیارگەلی یاسـایی و ئەخلاقیـی قـورس و گـەورە قـوت دەکەنـەوە، ئەمـەش لەبـەر یـەک ڕاسـتیی سـادە: ئێمـە قسـە لەسـەر دروسـتکردنی مـرۆڤ دەکەیـن نـەک ڕۆبـۆت! ئایـا ژیرانەتریـن هەنگاو لەمـەڕ پرسـی کۆپیکردنـی مرۆڤـەوە کـە کۆمەڵگـە بیگرێتـە بـەر، چییە؟

٢. ڕێـژەی فرۆشـتنی دەمانچـە لـە بەرزبوونەوەدایـە. زۆر کـەس دەڵێـن ئەمـە بەڵگەیـە بـۆ ئـەوەی کـە هەبوونـی چـەک هەسـتی ئاسایشـی و ئارامیـی زیاتـر بـە خەڵکـی دەبەخشـێت. بـەڵام لـە بەرامبـەردا هەندێـک دەڵێـن، دەسـتکەوتنی چـەک هەروەهـا بەسـانایی *گەورەتریـن هـۆکاری زیادبوونـی*

ڕێژەی *توندوتیژی* نییە. هەر بۆیە دەڵێن کە ئەمەریکا پێویستە چاو لە ئەزموونی وڵاتانی تر ببڕێت و چەکهەڵگرتن لەلایەن هاووڵاتیی مەدەنییەوە قەدەغە بکات. ئایا کام بۆچوون ماقوڵترە؟

٣. بە شێوەیەکی گشتی، مامۆستا بۆ ماوەی ساڵێک یان چەند ساڵێک دادەمەزێن پاشان دوای ماوەیەکی دیاریکراو، مافی مانەوەی یەکجارەکیی پێ دەدرێت tenure {دیارە ئەمە زیاتر لە ڕۆژئاوا باوە}. هەرکاتێکیش کە مامۆستا ئەم مافەی وەر گرت، ئیدی بە هیچ شێوەیەک ئەو دامەزراوەیەی وانەی تێدا دەڵێتەوە، ناتوانێت لەسەر کار لای بدات، مەگەر هەڵەیەکی زۆر گەورە و قبوڵنەکراو ئەنجام بدات. ئەم مافە لە بنەڕەتا بۆ ئەوە دانرا، تا مامۆستا بپارێزێت لە هێرش و دەستدرێژیی شێونەکەوتووانی ئۆرسۆدۆکسی، لە کاتێکدا مامۆستا شتێکی وت، کە لەگەڵ تێگەیشتنی ئۆرسۆدۆسکەکاندا ناتەبا بوو. هەر بۆیە ئەم مافە ناسراوە بە "ئازادیی ئەکادیمی." لەم دەیانەی کۆتاییدا بە هۆی کورتهێنانی بودجەوە، کاربەدەستانی دامەزراوە پەروەردەییەکان ناچار بوون موچەی مامۆستاکان کەم بکەنەوە. لەبەر ئەوەی کە ئەو مامۆستایەی مافی وانەوتنەوەی یەکجارەکی بەدەست بهێنێت، موچەکەی زیاترە لە مامۆستاکانی تر، هەر بۆیە دامەزراوەکان گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە هەر لە سەرەتاوە ئەوە لەگەڵ مامۆستا تازەکاندا ببڕنەوە کە لە داهاتوودا ئەو مافە نایانگرێتەوە. لە ئێستادا زۆربەی دامەزراوەکان بۆ زۆربەی بەشەکان پەیڕەوی لە سیستەمی وانەوتنەوەی یەکجارەکی ناکەن، هەر لەبەر ئەم گۆڕانکارییە، کە لە ئێستادا هەر لە بنەڕەتەوە ئەم سیستەمە خراوەتە ژێر پرسیارەوە. هەندێک لەو باوەڕەدان، ئەم سیستەمە بەیەکجارەکی هەڵبوەشێتەوە، لە بەرامبەردا هەندێکی تر دەڵێن گەرەنتی کردنی ئازادیی ئەکادیمی، لە ئێستادا هەر وەکوو پێشوو زۆر گرنگە و دەبێت فەراهەم بکرێت. ڕای تۆ چییە لەم بارەیەوە؟

٤. هەندێک دەڵێن ئەگەر مافی ئەندامبوون لە کۆنگرێسی ئەمەریکی سنووردار بکرێت بۆ جارێک تا سێ جار، ئەوا حکومەتێکی کاراتر و چاکترمان دەبوو. بەلام ئارگومێنتی پێچەوانەی ئەم رایەش هەیە. گفتوگۆی گەرموگوڕی زۆر کراوە و دەکرێت لەسەر ئەم مەسەلەیە. ئایا باشییەکانی "سنووردارکردنی مافی ئەندامبوون لە کۆنگرێس" پارسەنگی خراپییەکانی دەداتەوە یان نا؟

٥. هەر وەک دەڵێن، زۆر کەس ترسناکیی نەخۆشییە سێکسییەکان لەبەرچاو ناگرن، ئەم هەڵوێستە سست و ناجیدییە چۆن لێک دەدرێتەوە، لەبەر رۆشنایی قوربانییەکانی ئایدز و نەخۆشییە سێکس-هۆکارەکان؟ ئایا باشترین رێگە چییە کە پێویستە پەروەردەکاران و بەرپرساران و تەندروستی گشتی بیگرنە بەر لە رووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشەیەدا؟

٦. ئەو کاتەی کە بۆ زنجیرەی هەواڵەکان تەرخان دەکرا لە ماوەی پەخشی تەلەڤیزیۆنەکاندا، بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کرد لە ١٩٦٠ەکانەوە بۆ ناوەڕاستی ١٩٧٠. بە شێوەیەکی گشتی لە ١٩٦٠ەکاندا ٢٥ خولەک تەرخان دەکرا بۆ یەک وێستگەی هەواڵەکان، بەلام ئەم کاتە کەم بۆوە بۆ ٧ خولەک لە ناوەڕاستی ٧٠ کاندا. لەو کاتەشەوە تا دێت کەمتر دەبێتەوە ئایا هۆکاری ئەمە چییە؟ ئایا ئەو کاتەی لە ١٩٦٠ەکاندا تەرخان کرابوو، زیاد لە پێویست بوو؟ یان ئەو کاتەی ئێستا تەرخان دەکرێت، کەمە؟ ئایا پێویست دەکات شتێک لەسەر ئەم مەسەلەیە بکرێت، چۆن بکرێت؟

٧. ئامانج لە سیستەمی رەیتین {ئەو سیستەمەیە کە بە هۆیەوە دایک و باوکان دەتوانن پێشوەختە زانیارییان لەسەر پرۆگرامەکانی میدیا هەبێت، تا بتوانن ئەوانە هەڵبژێرن کە بە گونجاوی دەزانن بۆ منداڵەکانیان} بۆ ئەوەیە کە باوان بەرچاوڕوون بن لە جیاکردنەوەی ئەوەی کە گونجاوە بۆ منداڵەکانیان لەوەی کە گونجاو نییە. لەگەڵ ئەمەشدا، زۆر لە باوان

گلەیی لەوە دەکەن کە ئەم سیستەمە بەرچاوڕوونییەکی وایان پێ نادات تا ئەمان تەواو ئاگاداری ناوەڕۆکی پرۆگرامەکان بن، هەر بۆیە ناتوانن *بڕیاری ورد و بەدیقەت* بدەن لەسەر پرۆگرامەکان. ئایا باوان لەوەها ڕایەکەدا لەسەر حەقن؟ یان پیاچوونەوە بەم سیستەمە پێویستییە؟ ئەگەر ئەم سیستەمە پێویستی بە پیاچوونەوەیە، ئایا ئەو گۆڕانانە چین کە دەبێت لەم سیستەمەدا بکرێت؟

٨. لە ساڵی ١٩٨٢دا دادگای باڵای ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بڕیاری دا سەرۆکی ئێستا و سەرۆکی پێشوو "حەسانەی تەواوەتییان" هەبێت لە ئاست هەر داوایەکی یاساییدا کە لەسەر خراپ هەڵسوکەوتکردنی سەرۆک لە ئۆفیسی سەرۆکایەتیدا تۆمار بکرێت. بیرۆن وایت، کە یەکێک بوو لەو چوار دادوەرەی کە دژی ئەم بڕیارە بوون، ئاوا ڕای خۆی دەر بڕیوە لەسەر مەسەلەکە: "لە دەرئەنجامی ئەم یاسایەوە، ئیدی سەرۆک دەتوانێت لە دەرەوەی ئەو چوارچێوە باوەوە ڕەفتار بکات کە بۆ سەرۆک دانراوە، بەبێ ئەوەی بەرپرسیارێتیی مامەڵەکانیشی بگرێتە ئەستۆ، ئەمە ئەگەر هاوولاتیانیش بریندار بن لە دەرئەنجامی ڕەفتارەکانی سەرۆکەوە، ئەمەش بەئاشکرا پێشێلکردنی مافی دەستووری ئەو کەسەیە کە بە هۆی ڕەفتاری ناجۆری سەرۆکەوە زەرەرمەند بووە." ئایا تۆش هاوڕای لەگەڵ ڕەخنەکەی دادوەر وایتدا؟

٩. یاسا و ڕێسای ئەنجومەنی تۆپی باسکەی نیشتیمانی *ڕێگا نادات* یاریزانەکانی قومار لەسەر وەرزشی باسکە بکەن و هانیشان دەدات کە لەسەر یارییەکانی تریش نەیکەن. ئایا ئەم یاسایە دادپەروەرانەیە، یان نەخێر، دەبێت هەموار بکرێتەوە؟ ئەگەر پێت وایە دەبێت هەموار بکرێتەوە، ئایا دەبێت بە چ شێوەیەک بێت؟

١٠. هەندێک لە تەلەڤزیۆنەکان پەیامنێری خۆیان لە بەرگی کڕیارێکی ئاساییدا دەنارد بۆ شوێنەکانی فرۆشتنی ئۆتۆمبێل و هەندێک کاڵای تر،

بۆ ئەوەی بۆیان دەر بکەوێت کە فرۆشیارەکان بە شێوەیەکی جیاواز مامەڵە لەگەڵ کڕیارە ئافرەتانەکاندا دەکەن وەک لە کڕیارە پیاوەکان. دەرئەنجام پەیامنێرەکان بۆیان دەر کەوت کە زۆربەی فرۆشیارەکان بەگشتی وێنەیەکی نەرێنییان هەبوو لەسەر کڕیارە ئافرەتەکان، لەوانە: ئافرەتەکان بەقەد پیاوەکان زیرەک نین، توانای تێگەیشتنیان لە کێشە ئاڵۆزەکان کەمترە، کەمتر گرنگی بە ناوەڕۆک ئەدەن، هەروەها ناشتوانن کارە ئاڵۆزەکان بەئەنجام بگەیەنن، هەر بۆیە دەتوانن بە کارە ساکارەکانی وەکوو وەلامدانەوەی تەلەفون هەڵبستن. بە ڕای تۆ دەرئەنجامی ئەم ڕاپۆرتانە گوزارشت لە تێگەیشتنی گشتیی کۆمەڵگە دەکات بۆ ئافرەت، یان نەخێر، ئەم ڕاپۆرتانە *تەنها* بۆ دۆخی خۆیان دروستن؟

١١. لەم سالانەی دواییدا دیبەیت و گفتوگۆی گەرموگوڕ ساز دەدرا دەربارەی "بەها خێزانییەکان." تەوەرەی سەرەکی لەو مشتومڕانەدا ئەوە بوو کە ئایا کۆمەڵگەی ئەمەریکی ئەم بەهایانەی لەدەست داوە؟ وە ئایا کێ بەرپرسیارە لەم حاڵەتە؟ هەروەها چ لایەنێکیش دەتوانێت بە باشترین شێوە ئەم بەهایانە بگەڕێنێتەوە؟ زۆربەی بەشداربووانی ناو دیالۆگەکان قسەیان لەسەر پێناسەکردنی خودی چەمکی "بەها خێزانییەکان" نەدەکرد، چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە چەمکەکە لەوە ڕوونترە کە پێویست بە ڕوونکردنەوە بکات. ئایا ئەم بڕوایە دروستە؟ لە مانا و دەلالەتەکانی ئەم چەمکە "بەها خێزانییەکان" بکۆڵەرەوە. ئەگەر بۆت دەر کەوت پێناسە و لێکدانەوەی زۆر جیاواز بۆ ئەم چەمکە کراوە، ئەوا لە نووسینێکدا بەڕوونی باسیان بکە و وەلامی ئەو ڕەخنانەش بدەرەوە کە لەو بڕوایەدایت دژی نووسینەکەت بەرز دەرکرێنەوە.

١٢. زۆربەی گفتوگۆکانی ڕۆژگاری ئێستامان چ لە تەلەڤیزیۆنەکان و چ "لە ژیانی ڕۆژانەشدا" گفتوگۆی لە ئاستی هەستەکاندا نەک ئەقڵدا. گفتوگۆی نێوان هاوڕێ و کەسە نزیکەکان سەر ئەکێشێت بۆ

قیژەقیـژە و دەنـگ بەرزکردنـەوە، هەندێـک جاریـش سـەر دەکێشـێت بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی جەسـتەیی. ڕەخنەگرانـی ئـەم جۆرە بەرنامانـە دەڵێن، پەخشـکردنی ئـەم جۆرە ڕەفتـارە ناکۆمەڵایەتییانـە لـە ڕێـی ئـەم بەرنامانـەوە بـە شـێوەیەک کە هێـز و سـیحرێکی جوانکارییـی پـێ دەبەخشـێت کـە هانـی بینـەران دەدات کـە لاسایی بکەنـەوە. ئایا ئـەم تۆمەتانـە لـە جێی خۆیدایەتـی؟

١٣. زۆربـەی ئەوانـەی کـە دەسـتیان هەیـە لـە بەرهەمهێنـان و بڵاوکردنـەوەی بەرهەمـە هونەرییـەکان، دەڵێـن کـە "ئـەوەی کـە بینـەران دەیبینـن لـە تەلەڤزیـۆن یـان لـە فیلمەکانـەوە، کار ناکاتـە سـەر بیرکردنـەوە و هەڵسوکەوتیان." لـە بەرامبەردا کەسـانێک هـەن، دەڵێن، هـەر خـودی ئـەم پەیامـە و پەیامەکانـی تـری بەرهەمهێنەرانـی بەرنامـە تەلەڤزیۆنـی و فیلمـەکان بـەو ئامانجـە بڵاو دەکرێنـەوە کـە تێڕوانین و گۆشـەنیگای وەرگرەکان بگۆڕن دەربـارەی زۆر شـت، لەوانـە، خواردنـەوەی مـاددە کحولییـەکان، شـۆفێری، سێکسـکردن بەبـێ بەکارهێنانـی کۆنـدۆم، پیسـکردنی ژینگە. ئـەم ڕەخنەگرانە دەڵێـن، مادامێـک ئـەم ناوەندانـە توانـای کاریگـەری دانانیـان هەیـە، کەواتـە باشـترە ئـەم هێزەیـان بـە شـێوەی چاکـە بخەنـە گـەڕ و ڕاسـتگۆیانە پێش بڵاوکردنـەوەی بەرهەمەکانیـان لـە کاریگەریـی ئـەم بەرهەمانـە بکۆڵنـەوە.

١٤. لـەم سـاڵانەی دواییـدا کەناڵەکانـی ڕاگەیانـدن گرنگییەکـی بەرچاویـان داوە بـەو پەیوەسـتنامانەی کـە یاریزانـە نێودارەکان لەگـەڵ یانـە جۆربەجۆرەکانـدا دەیانبەسـتن. ئـەم یاریزانـە بەناوبانگانـە بـە هـۆی ئـەم پەوەسـتنامانەوە دەبنـە خـاوەن موچەیـەک کـە ئەوەنـدە زەبەلاحـە کـە پێش ١٠ یـان ١٥ سـاڵ لەمەوپێش کـەس شـتی وای بـە خەیاڵـدا نەدەهـات. زەبەلاحی پـارەی وەرزشـەوان کۆمـەڵێ پرسـیار دەورووژێنێت، لەوانە: ئایا موچـەی کەسـە بەناوبانگـەکان بـە چ ڕێژەیـەک زیاتـرە لـە موچـەی کەسـە ئاساییەکان؟ ئایـا هیـچ هەڵەیـەک لـەوەدا هەیـە کـە موچـەی وەرزشـەوانێک زیاتـر بێـت لـە سـیناتۆرێک یـان بگـرە لەسـەرۆکی وڵاتێکیـش؟ ئایـا ئـەم

داوا بەردەوامەی وەرزشەوان بۆ پارەی زیاتر و زیاتر چ کاریگەرییەکی لەسەر کایەکانی وەکوو وەرزش، ئابووری دەبێت؟

١٥. لە کولتووری کۆمەڵگە ئاسیاییەکاندا بە شێوەیەکی گشتی پرۆسەی هاوسەرگیری ڕێک دەخرێت بۆ گەنجەکان، بەڵام لە کولتووری وڵاتی خۆماندا {ئەمریکادا}، گەنجەکان خۆیان بۆ خۆیان هاوسەرەکانی خۆیان هەڵدەبژێرن. ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە ئێمەش لەم ڕەهەندەوە بچنە سەر کولتووری ئەوان، چونکە وەک ئاشکرایە، لە وڵاتی ئێمەدا ڕێژەی جیابوونەوە زۆر لە گەشەکردندایە و بارودۆخی خێزان هەڵوەشاوە و نارێکوپێکە؟

١٦. لە کۆتاییی ١٩٤٠ەکان و سەرەتای ١٩٥٠ەکانەوە تەلەڤزیۆن بۆتە سەرەکیترین ناوەندی ئینتەرتەینمێنت، ئەمەش وای کردووە بانگەشەی بازرگانی بە شێوەیەکی بەرچاو لە کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکانەوە ببینرێت. لەگەڵ ئەم ئامادەگییە قورسەی بانگەشەی بازرگانیدا، بەڵام هێشتا بەشێکی کەمی خەڵک هۆشیارییان لەسەری هەیە. بۆ نموونە، ئایا چەندیان پارەی تێدەچێت؟ ئایا کێیە پارەی ئەم بانگەشانە دەدات؟ ئایا چ کاریگەرییەکیان لەسەر ژیانی ئێمە هەیە؟

١٧. بابەتی ڕادەی زیرەکی ئاژەڵان، لانی کەم لە دارووینەوە بەردەوام بابەتی لێکۆڵینەوەی زانستی بووە. پرسیارگەلی زۆر دەرهەق بە زیرەکیی ئەوان کراوە، لەوانە: ئایا ئاژەڵان دەتوانن "بیر بکەنەوە" بە مانای قووڵیی وشەکە؟ ئایا ئەوان دەتوانن پۆلێنبەندی بکەن؟ (بۆ نموونە پۆلێنبەندیی وەکوو: هاوڕێ، گەورە، جۆری خۆم و شتی تریش). ئایا ئەوان دەرهەق بە خۆیان و چالاکییەکانیان بەئاگان؟ ئایا ئەوان دەتوانن کاتەکانی داهاتوو و ڕابردوو جیا بکەنەوە، یان تەنها دەتوانن پەی بە کاتی هەنووکە بەرن؟ ئایا زانستیترین وەڵام کە تا ئێستا بۆ ئەم چەشنە پرسیارانە درابێتنەوە، چین ؟

١٨. کێبرکێی وەرزشی لەنێوان زانکۆکان و بەشە جیاوازەکانی کۆلێژەکان، چالاکییەکی زۆر بەربڵاوی ناو زانکۆکانی ئەمەریکایە. هەر بۆیە هەندێک بەتەواوەتی دژی ئەوەن کە ڕەخنە لەم کێبرکێیانە بگیرێت و داوای کۆتایی پێهێنانی بکرێت. ئایا بەرگریکارانی ئەم کێبرکێیانە پێویست دەکات ئاوا بە ڕەهایی دژی ئەم ڕەخنانە بن؟ ئایا سەرەتای فکرەی ئەم جۆرە کێبرکێیانە بۆ کوێ دەگەڕێتەوە؟ ئایا ئەم کێبرکێیانە کۆنترە لە کێبڕکێی وەرزشیی ناو هەمان بەش؟ خاڵە باش و خراپەکانی ئەم کێبڕکێیانە چین؟

١٩. ئەوانەی کە دەڵێن پێویستە حکومەت موچەیەکی سالانە بە شێوەیەکی دڵنیایی بداتە هەر تاکێکی پێگەیشتوو لەو بڕوایەدان کە بەم کارە حکومەت نەک هەر تەنها کۆمەڵگە لە هەژاری و کاریگەرییە جەهەنەمییەکانی دەپارێزێت، بەڵکوو خۆشی لەو سیستەمە زەبەلاحەی وێڵفێر دەپارێزێت کە لەسەر بیرۆکراسییسەی تاقەتپڕووکێنەر دەڕوات، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڕەنگە حکومەت پارەشی بۆ بمێنێتەوە. بەلام ڕەتکەرەوانی سیستەمی دڵنیایی موچەی سالانە، لەو بڕوایەدان کە سیستەمەکە لایەنە خراپەکانی زۆر زیاترە. ئایا هەندێک لەو خاڵە خراپانە چین؟ ئایا ئەوەندە خراپن کە پارسەنگی لایەنە باشەکانی بدەنەوە.

٢٠. لە چوارچێوەی بەرنامە کۆمیدییەکانی کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکاندا بەرنامەکانی وەکوو شانۆگەریی کۆمیدی {بەرنامەیەکە کە تێیدا کەسێک لەسەر شانۆیە و بە قسەکانی ئامادەبووان دەخاتە پێکەنین} ئامادەگییەکی زۆریان هەیە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، بەشی هەرەزۆی خەڵکی جگە لە پێکەنین، بیرێکی تری لێ ناکەنەوە. بەلام کەسانێک هەن کە بەتوندی ئەم جۆرە بەرنامانە ڕەت دەکەنەوە بە هەڵخەڵەتێنەر و تەشهیرکەری دەدەنە قەڵەم. تەنانەت داوا دەکەن کە قەدەغە بکرێن. بۆ پشتگیری ئەم جۆرە داوایە دەکەیت؟

٢١. هەر لە کۆنەوە لە ولاتێکی وەکوو ئەمەریکادا پارە تەرخان کراوە بۆ پشتگیریکردنی وەرزشەوانە قوتابییەکان لە ئامادەیی و زانکۆکاندا، بەلام بەردەوام ئەو پارەیە بۆ تیپی کوڕان تەرخان کراوە زیاتر بووە لە تیپی کچان. زۆر کەس دژی ئەم دابەشکردنە نایەکسانەن، بەلام زۆر کەسی تر پێیان وایە کە ئەمە ڕەوایەتیی خۆی هەیە، چونکە بەردەوام تیپی کوڕان ئاستێکی بەرزتری وەرزشییان پیشان داوە. ئایا کام دید مەعقولترە؟ ئایا پێویست دەکات قسە لەسەر دووبارە دابەشکردنەوەی پارەکان بکرێت بە شێوەیەکی جیاواز؟

٢٢. پرۆسەی خستنەبەرخوێندنی ناچاری لە ئێستادا ئەوەندە بەربلاو قبوڵ کراوە، کە خەریکە مێژوویەکی زۆر کورتی لەیاد دەکەین. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک لە ڕەخنەگرە کۆمەلایەتییەکان، لەو بڕوایەدان کە بەزۆر خستنەبەرخوێندنی منداڵان چیدی ئایدیایەکی باش نییە. بەپێی بیرکرنەوەی ئەوان بێت، دەبێت منداڵ هەر لە تەمەنی ٦ یان ٧ ساڵییەوە پرس و ڕاوێژی پێ بکرێت، کە ئایا دەیەوێت بخوێنێت یان نا، ئەگەریش بڕیاری خوێندنی دا، ئەوە دەبێت خۆی ئەو شوێن و قوتابخانەیە هەڵبژێرێت، کە دەیەوێت تێیدا بخوێنێت. لەسەر بابەتێکی ئاوا زۆر پرسیاری گرنگ دەبێت وەڵام بدرێنەوە، لەوانە: ئایا هەر لە بنەڕەتەوە بۆچی ئایدیایەکی وەک خوێندنی بەزۆر پەسەند کرا؟ ئایا ئەو کات ئایدیایەکە لەجێی خۆیدا بوو؟ ئایا ئێستا باردۆخی کۆمەلایەتی بەو ئەندازە گەورەیە گۆڕاوە، کە چیدی ئەم پرۆسەیە گرنگییەکی نەمابێت؟

٢٣. پرۆفیسۆرێکی زانکۆی یال، د. جۆسی دیگلادۆ، لە دۆزینەوەیەکی زانستیدا گەیشە ئەو بڕوایەی کە دەتوانرێت بە پەیوەستکردنی مێشک بە تەزووی کارەباوە، دەتوانرێت هەڵسوکەوتەکان کۆنترۆڵ بکرێن {ESB–electricalstimulation of the brain}. ئەو دەڵێت دەتوانێت گایەک لەوپەڕی تووڕەییدا خاو بکەیەتەوە، تەنها بە ناردنی تەزووی

کارەبا بۆ مێشکی گاکە لە ڕێ ئەو "وایەرانەوە،" کە پەیوەست کراون بە کەللەسەرییەوە. هەروەها ئەم پرۆفیسۆرە دەڵێت، بە دووبارەکردنەوەی ئەم پرۆسەیە بۆ چەند جارێک، دەتوانرێت هەر لە بنەڕەتەوە غەریزەی شەڕانیبوون لەگاکەدا بسڕدرێتەوە. د. دیگلادۆ لەڕێی تاقیکردنەوەکانیەوە ئەوەشی پیشان داوە، کە دەتوانرێت بە ڕێگەیەکی تریش هەمان دەرئەنجام بەدەست بهێنردێت، ئەوەیش لە ڕێی ورووژاندنی مێشک، ئەمجارەیان لە ڕێی کارەباوە نا، بەڵکوو لە ڕێی ماددەی کیمایی تایبەتییەوە، کە هێواش هێواش دەتوێتەوە {chemical stimulation of the brain"CSB"}. هەندیک کەس لەو بڕوایەدان، کەم تەکنیک کاریگەرە زانستییانە، باش وایە لەسەر تاوانباران و ئەو قوتابییانەی کە خاون لە پرۆسەی فێربووندا، تاقی بکرێتەوە. بەلام لە بەرمبەردا هەندێک دەڵێن ئەم دۆزینەوە زانستییانە ئەوەی لێ ئەکەوێتەوە، کە جۆرج ئۆروێل لێی دەترسا {ئەم نووسەرە بە دوو کاری زۆر بەناوبانگ بوو: کێڵگەی ئاژەلان، ١٩٨٤}. ئایا ڕەهەندە ترسناکەکانی تاقیرکرندەوەی ئەم تەکنیکانە لەسەر مرۆڤ چی دەبێت؟ ئایا دەشێت بەکار بهێنریت بە شێوەیەک، کە کەمترین دەرهاویشتەی خراپی هەبێت؟

٢٤. زۆر کەس لەو بڕوایەدان ئەو باوانانەی منداڵەکانیان لە قوتابخانەی دینی و تایبەتی دەخوێن، دەبێت مافی ئەوایان هەبێت حکومەت لە بڕێک لە باجەکانیان تایبەت بە خوێندن خۆش ببێت. بەرگریکارانی ئەم بۆچوونە دەڵێن کە داواکەی ئەوان داوایەکی دادپەروەرانەیە، چونکە ئەو دایک و باوکانە بەو باجە گشتییە کە دەیدەن بە حکومەت، پشتگیریی خۆیان بۆ قوتابخانە گشتییەکان دەر دەبڕن، لە لایەکی تریشەوە، بەوەی کە منداڵەکانیان لە قوتابخانەی حکومی ناخوێنن کارئاسانییەک بۆ حکومەت دەکەن. بەلام لەلایەکی ترەوە، ئەوانەی کە بەرەنگاری ئەم بۆچوونە دەبنەوە، دەڵێن، ئەمە پشێلکردنی پرنسیپی جیاکردنەوە دینە لە

دەوڵەت (دیارە ئەمە لە حاڵەتی قوتابخانە دینییەکاندا). هەروەها دەشڵێن کە کاریگەریی خراپیشی دەبێت لەسەر قوتابخانە حکومییەکان. ئایا کام بۆچوونیان مەعولترە؟

٢٥. لە ١٩٩٠کاندا جیهان ئەزموونی دیاردەیەکی تازە و ناوەزەی کرد، ئەویش *تەلاقدانی* باوان لەلایەن منداڵەکانیانەوە. ئایا ئەم دیاردەیە چ کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر پەیوەندیی نێوان باوان و ڕۆڵەکانیان؟ ئەی چ کاریگەرییەکی لەسەر پەیوەندیی نێوان حکومەت و خێزان دەبێت؟ ئایا کام لەم کاریگەرییانە پۆسەتڤ و کامیان نێگەتڤن؟

٢٦. کاربەدەستە باڵاکانی کۆمپانیا زەبەلاحەکان ساڵانە ملیۆنان دۆلار داهاتیانە، ئەمە لە کاتێکدا ئەوانەی کە ئیشیان بۆ دەکەن، مووچەیەکی ئەوەندە کەمیان دەست دەکەوێت، کە هەندێک جار دەگاتە ئەو کەمترین بڕەی کە بەپێی یاسا دیاری کراوە. هەندێک دەڵێن کە دەبێت گۆڕان بەسەر سیستەمێکی ئابووریی وەهادا بێت، کە ڕێگە بە وەها نادادپەروەرییەک دەدات. بەڵام لە بەرامبەردا کەسانێک ئەگەری گۆڕان لە سیتەمی ئابووریدا بەدوور دەزانن، تا ئەو کاتەی باردۆخی چینی هەژاران دەگاتە ئاستێکی ئەوەندە کولەمەرگی، کە شیاوی تەحەمولکردن نابێت. ئایا گۆڕان لە سیستەمی ئابووریدا چۆن ڕوو دەدات؟ ئایا پێویستمان بە وەها گۆڕانێک هەیە؟

٢٧. لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەنووسان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە کۆکردنەوە و گەیاندنی زانیارەیەکان بو خەڵکی، هەر بۆیە ئەوان پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن، کە مافی ئەوەیان هەیە سەرچاوەی زانیارییەکانیان بەنهێنی بهێڵنەوە، تەنانەت لە داداگاش. هەندێک جار ڕۆژنامەنووسان دەستبەسەر کراون لەلایەن دادگاوە بە تۆمەتی ڕێزنەگرتن لە دادگا، چونکە ڕازینەبوون بەوەی سەرچاوەی هەواڵەکانیان بۆ دادگا ئاشکرا بکەن. ئەوی دادوەرانەی وەها بڕیارێکیان داوە، ئەوە ڕەت ناکەنەوە کە

ڕۆژنامەنووسـان مافـی بەنهێنیهێشـتنەوەی سـەرچاوەکانیان نییـە، بەڵکـوو دەڵێـن ئـەم مافـە سـنووردارەوە و ڕەهـا نییـە. ئایـا تـۆ کۆکیـت لەگـەڵ دادوەرەکانـدا؟

٢٨. زۆر کـەس لـەو بـاوەڕەدان کـە ڤیدیـۆ گەیمـەکان کاریگەریـی خـراپ جـێ دەهێڵـن لەسـەر دونیابینیـی منـداڵان. بـەڵام لـە بەرامبـەرەدا کەسـانێک کـە دەروونناس و شـارەزایانی پەروەدەشـیان تێدایـە، دەڵێـن، چەندێـک ئـەم یارییانـە خراپـن، ئەوەنـدەش کاریگەریـی باشـی لەسـەر بیرکردنـەوەی منداڵـەکان دەبێـت. چ باشـە و خراپەیـەک دەبینیـت تۆ لـەم جۆرە یارییانـەدا؟

٢٩. بەلێکدانـەوەی هەندێـک لـە توێـژەران، یەکێـک لـە هـۆکارە گرنگـەکان کـە وای کـردووە ڕەفتـاری ناکۆمەڵایەتیـی زۆر بەربـڵاو فـراوان بێـت، ئەوەیـە کـە میدیـا چیـدی گرنگـی نـادات بـە وێنـەی کلاسـیکیی پاڵـەوان، بەڵکـوو لـە ئێسـتادا میدیـا سـەرقاڵی تەشـویقکردنی گەنجانـە بـۆ مۆدیلێـک، کـە تـەواو دژی وێنـە باوەکـەی پاڵەوانـە. ئـەوان دەڵێـن گـەر میدیـا وێنـەی پاڵەوانێکـی کامڵتـری خـاوەن فەزیڵـەت پیشـان بـدات، تـا گەنجـان وەک ڕۆڵ و مۆدێـل چـاوی لـێ ببـڕن، ئـەوا بەدڵنیاییـەوە ڕێـژەی تـاوان کـەم دەبێتـەوە. ئایـا تـۆ ئـەم بۆچوونـە بـە ڕاسـت دەزانیـت؟

٣٠. هەندێک دەڵێن پێوسیتە کەسـە کامڵەکان بەرپرسـیارێتیی {یاسـای} چاودێریکردنـی دایـک و باوکـە پیـر و پەککەوتەکانـی خۆیـان بگرنـە ئەسـتۆ، چونکـە ئـەوان ناتوانـن لـە کاتـی نەخۆشـیدا بەتەنـگ خۆیانـە بێـن. ئایـا بـە ڕای تـۆ، ئەمـە بۆچوونێکـی ماعقوڵـە؟

٣١. لـەم چەنـد دەیەیـەی ڕابـردوودا، هەڵسـەنگاندی قوتابـی بـۆ مامۆسـتاکەی وەک یەکێـک لـە پێوەرە باوەڕپێکراوەن سـەیر کـراوە بۆ زانینی ڕادەی چالاکبوونـی مامۆسـتاکان. بـە شـێوەیەکی گشـتی، ئـەم هەڵسـەنگاندە لـە کۆتاییـی وەرزەکانـی خوێنـدا دەکرێـت کـە تێیـدا قوتابـی لـە ڕێـی ڕاپرسـییەکەوە دەتوانـن مامۆسـتاکانیان هەڵبسـەنگێنن. ئـەم هەڵسـەنگاندنانە

ڕۆڵێکی گنگیان هەیە لەسەر داهاتووی مامۆستاکان لە ڕووی زیادکردنی مووچە و بەرزکرنەوەی پۆست و پێدانی مافی وانەوتنەوەی هەمیشەیی. دیارە هەموو مامۆستاکان وەک یەک هەڵسەنگاندی ئەرێنی قوتابییەکانیان بەدەست ناهێنن. ئەوانەی کە ڕەخنە لە جۆرە هەڵسەنگاندنانە دەگرن، دەڵێن کە قوتابییان ڕانەهێنراون تا بە شێوەیەکی بابەتی مامۆستاکانیان هەڵسەنگێنن، هەر بۆیە ئەوان زۆر بەئاسایی بەناوبانگبوون و چالاکبوون تێکەڵ دەکەن و دەرئەنجام، ڕەنگە مامۆستایەک سزا بدەن، کە زۆر چالاکە و بە باشترین شێوە خزمەتی قوتابییەکانی دەکات. تۆ دەربارەی ئەمە بابەتە چی دەڵێیت؟

٣٢. با وای دابنێن کە ئافرەتێکی سەڵت بۆی دەر دەکەیت کە سکپڕە، بەلام هەر خۆشی بڕیاڕی لەباربردنی سکەکەی دەدات. با واشی دابنێن کە پیاوەکە کە تەنها لە ڕووی بایلۆجییەوە باوکی منداڵەکەیە، بە بڕیاری ئافرەتەکە دەزانێت. ئایا لە چ بارودۆخێکدا پیاوەکە مافی ڕێگرتنی هەیە لە ئافرەتەکە، کە منداڵەکە لەبار نەبات و داوای خاوەنداریێتیی منداڵەکە بکات؟

٣٣. هەندێک دەڵێن دەوڵەمەندەکان دەبێت بچنە ژێر باری بەرپرسیاریی یارمەتیدانی هەژارەکانەوە. ئایا تۆش هاوڕایت؟ ئایا وەلامەکەت دەگۆڕێت بە زانینی ئەوەی کە سامانەکەیان بە ڕێگەی شەرەفمەندانە یاخود ناشەرەفمەندانە بەدەست هێناوە؟ هەروەها بەوەی کە سامانەکەیان بە هۆی میراتەوە بەدەست هێناوە یاخود خۆیان بەدەستیان هێناوە؟ ئەگەر لەو بڕوایەدایت کە دەوڵەمەندەکان بەرپرسیارن بەلام ناچنە ژێر بارییەوە، ئایا دەبێت بە چ شێوازێک ناچار بکرێن؟ ئایا دەوڵەتە دەوڵەمەندەکانیش دەچنە ژێر باری هەمان بەرپرسیارێتییەوە بەرامبەر دەوڵەتە هەژارەکان؟

٣٤. زۆربەی هەرە زۆری بەرنامە کۆمپوتەرییەکان، پەیامێکی تێدایە بۆ ئاگادارکردنەوەی بەکاربەرەکان، تا بەرنامەکە کۆپی نەکات. زۆر کەس وەها پەیامێک بە شتێکی زیاد و نامەعقوڵ دەزانن. چونکە ئەوان دەڵێن

مادام کەسێک لەبری بەدەستهێنای بەرنامەیەک پارە دەدات، کەواتە ئەوە مافی ئەوە کە بەکاری بهێنێت، بیبەخشێت بە کەسێکی تر یاخود کۆپیی بکات. ئایا ئەوان لەمەدا لەسەر حەقن؟

٣٥. لە سەرەتادا کە تازە دەفری سەتەلایت کەوتوبووە بازارەوە، کڕیارەکان دەیانتوانی بە هۆی کڕینی دەفرێکەوە بەشێک لەو کەنالانەی کە بە پارە دەکرانەوە، بەبێ بەرامبەر ببینن. بەڵام لە دواییدا هێدیهێدی ئەو کەنالانە شەپۆلەکانیان گۆڕدران لەلایەن کۆمپانیاکانیانەوە، تا بینەرەکان ناچار بکەن بە پارە کەناڵەکان بکەنەوە. بە ڕای تۆ ئەمەی کە ڕووی داوە، لە چواچێوەی مافی کۆمپانیاکاندا بووە؟

٣٦. لە هەموو پرۆسەیەکی دادگاییکردندا پارێزەرێک هەیە، کە بەرگری لە تاونبارەکە دەکات و هەوڵی پاکانەکردنی تاوانەکانی دەدات. ئایا ئەخلاقییەن ئەمە شتێکی دروستە؟ ئایا وەڵامەکەت پەیوەستە بە جۆری تاوانەکەوە، بۆ نموونە ئەگەر تاوانەکە شۆفێری بوو بە مەستی هەمان شتە لەگەڵ ئەوەی کە تاوانەکە کوشتن بێت؟

٣٧. هەر لە دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی بەرچاوی نەخۆشیی ئایدزەوە، خەڵکێکی زۆر شاهیدی ئازاری بەسوێی مەرگی ئازیزەکانیان بوون، کە چۆن هێواشهێواش بەڵام بە ئازارێکی تەحەمولنەکراوەوە دەمرن. هەندێک کات کە قوربانییەکان پێش مردنینان لەتاو ئازاری زۆریان پاڕاونەتەوە لە کەسوکاریان تا هەرچی زووە بیانکوژن و ڕزگاریان بکەن، هەندێک لە کەسوکاری نەخۆشەکان داواکەیان جێبەجێ کردووە. جێبەجێکردنی ئەم داوایە لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتەکاندا قەدەغە و نایاساییە. ئایا دەبێت تێڕوانینی یاسا لەمسەر ئەم بابەتە بگۆڕێت؟ ئەی ئایا دەبێت ئەوانەی کە هەڵدەستن بە کوشتنی ئازیزەکانیان تا ڕزگاریان بکەن لە ئازەرەکانیان، یاسا وەکوو بکوژێکی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟

٣٨. ترس لە توشبوون بە نەخۆشیی ئایدز خەڵکانێکی زۆری ناچار

کردووە هەڵوێستی سەیر لە ئاست کەسە تووشبووەکان بگرنە بەر. بۆ نموونە، کەسانێکی زۆر قەتعی هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان دەکەن لەگەڵ ئەو هاوڕێ نزیکەکانیان، کە تووشی نەخۆشییەکە دەبن. پزیشک و ددانسازەکان ئەو نەخۆشانە نابینین، کە تووش بوون. مۆمیاکاران نایانەوێت دەستیان بەر ئەو تەرمانە بکەوێت، کە بە نەخۆشییەکە مردوون. ئایا ئەم چەشنە هەڵوێستانە ڕەوایەتییان هەیە؟

٣٩. بۆ زۆرکەس دەرزیئاژنین acupuncture کە خەڵکی ئاسیا بڕوایان پێیەتی، هیچ نییە جگە لە خورافات، بەڵام بۆ کەسانێکی تر، ئەم دەرزیئاژنینە کاریگەرییەکی تەندروستیی هێجگار باشی هەیە. ئایا کام بۆچوون بۆچوونی ڕاستە؟

٤٠. بۆ ماوەیەکی زۆر بڕوایەک باو بوو، کە ئەگەر منداڵ پێش تەمەنی خۆی {٥ یان ٦ساڵی} بخرێتەوە بەر پرۆسەی خوێندن، ئەوا داهاتوویەکی پرشنگدارتری دەبێت لەوانەی کە لە تەمەنی ئاساییدا دەخرێنە بەر خوێندن. بەڵام لە ئێستادا هەندێک لە شارەزایانی بواری پەروەردە بەتوندی ئەم بۆچوونە ڕەخنە دەکەن. ئەوان دەڵێن، خستنەبەر خوێندنی منداڵ پێش تەمەنی ئاسایی خوێندن، *کاریگەری نێگەتفی* هەم سۆزداری و هەم ئەقڵی جێ دەهێڵێت لەسەر منداڵەکە. ئایا کام بۆچوون مەعقوڵترە تا باوان پەیڕەویی لێ بکەن؟

٤١. زیادبوونی ڕێژەی توندوتیژەی لە ئەمەریکا و لە چەندان وڵاتی ئەوروپادا، دووبارە پرسیارگەلێک لەمەڕ کێشەیەکی کۆن قوت دەکاتەوە: ئایا مرۆڤەکان بە سروشت توندوتیژن یان نەخێر توندوتیژی سروشتی نییە و بەرهەمی *پەروەردەیە*؟

٤٢. زۆر کەس پێیان وایە کە پێویستە دایک و باوک بەرپرسیارێتیی یاسایی کار و کردەوەی منداڵەکانیان لەئەستۆ بگرن. ئەمەش بەو مانایە دێت، هەرکاتێک منداڵێک کارێکی نایاسایی کرد، ئەوا دایک و باوک

دەبێت باجەکەی بدەن. ئایا ئەمە ڕێگەیەکی دادپەروەرانە و کاریگەرە بۆ ڕووبەڕووبوونەی ئەوەی پێی دەوترێت "تاوانی نێوجەوانی؟"

٤٣. هەندێک لە چالاکوانی بواری بەرگریکردن لە مافی ئاژەڵان، داوا دەکەن ئاژەڵان هەمان ئەو مافانەیان هەبێت، کە مرۆڤەکان هەیانە. هەندێکیش لە چالاکوانی بواری بەرگریکردن لە ژینگە، داوای ئەم مافانەش دەکەن بۆ ڕوبار ودەریاچە و زەریا و دارستان و کەناردەریاکان. ئایا ئەم چەشنە داوایانە فەزیڵەتیان تێدایە؟

(Footnotes)

١. ئەو پرسیارانە گرنگیی لەڕادەبەریان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگە بێبایەخ و ڕووکەشی دەر بکەون، چونکە ئەگەر پێشمەرجەکان یەک لەدوای یەک بە پرسیارەکان چێک نەکەین، ئەوا زۆر زەحمەتە دەرئەنجامی ئارگۆمێنتەکە، کە لە کۆکردنەوەی پێشمەرجەکانەوە بەدەست هێنراوە، بە شێوەیەکی ورد هەڵسەنگێنین. و

# کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە



ENDÉŞE

٢٨. ئەخلاقناسی-تەحسین حەمە غریب
٢٩. گەشەسەندنی رامیاری...-د. ک. پێسچانی-و. د. ئارام عەلی
٣٠. مێژووی کۆنی کورد (چ٢)-جەمال رەشید فەوزیە رەشید-و. ملکۆ کەلاری
٣١. منداڵانی گەرەک-هیوا قادر
٣٢. مرۆڤی یاخی-ئەلبێر کامۆ-و. ئازاد بەرزنجی
٣٣. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی...-هێرش جەوهەر مەجید
٣٤. مێژووی گۆرانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢)-فریشتە نورائی-و. هەورامان فەریق کەریم
٣٥. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨)-توانا رەشید کەریم
٣٦. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨)-هەوراز جەوهەر مەجید
٣٧. کتێبی پەراوێزنووسان-عەتا محەمەد
٣٨. فیکر و دونیا (بەرگی ١)-مەریوان وریا قانع
٣٩. فیکر و دونیا (بەرگی ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٠. دین و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤١. کتێب و دونیا (چ٢)-مەریوان وریا قانع
٤٢. کۆمەڵگەی رەش-د. عادل باخەوان
٤٣. زستانێکی درێژ-کولم تویبێن-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٤. فرانسیسکۆس قەدیسی من (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
٤٥. ئاهەنگی تەگەکە-ماریۆ بارگاس یۆسا-و. جەلیل کاکەوەیس
٤٦. شەوی لیشبۆنە-ئێریش ماریا ریمارک-و. کەریم پەرەنگ
٤٧. من و ئەو-ئەلبێرتۆ مۆرافیا-و. کارزان عەلی
٤٨. میرنامە (چ٢)-جان دۆست-و. سەباح ئیسماعیل
٤٩. رووخسارە بەندکراوەکەم-لەتیفە-و. رووناک شوانی
٥٠. قەپێلک-مستەفا خەلیفە-و. هەورامان وریا قانع
٥١. خەونی پیاوە ئێرانییەکان و کەوتنی بۆرە قەلا-و. ماردین ئیبراهیم
٥٢. گرگن-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٣. ١٩٨ (چ٢)-جۆرج ئۆروێل-و. حەکیم کاکەوەیس
٥٤. سوور و رەش-ستاندال-و. سیامەند شاسواری
٥٥. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٥٦. جادەی مێخەک (١)-دلاوەر قەرەداغی
٥٧. جادەی مێخەک (٢)-دلاوەر قەرەداغی
٥٨. ئێوارستان-پێر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
٥٩. دارستانی نەرویجی-هاروکی موراکامی-و. تارا شێخ عوسمان
٦٠. ئێوارەی پەروانە (چ٦)-بەختیار عەلی
٦١. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣)-بەختیار عەلی
٦٢. مەرگی تاقانەی دووەم (چ٥)-بەختیار عەلی

٦٣. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢)-بەختیار عەلی
٦٤. تا ماتەمی گووڵ... تا خوێنی فریشتە (چ٣)-بەختیار عەلی
٦٥. سێوی سێهەم (چ٣)-بەختیار عەلی
٦٦. ئاورەکەی ئۆرفیۆس-بەختیار عەلی
٦٧. غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ (چ٢)-بەختیار عەلی
٦٨. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢)-بەختیار عەلی
٦٩. دواهەمین هەناری دونیا (چ٥)-بەختیار عەلی
٧٠. ئێمەی پەنابەر-کۆمەڵێ نووسەر
٧١. گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢)-عەتا نەهایی
٧٢. عێراقییەک لە پاریس-سەمۆئێل شەمعون-و. سەباح ئیسماعیل
٧٣. جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٤. کچەی پرتەقاڵ (چ٥)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٥. لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٦. کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٧. نهێنی یاری کاغەز (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٨. مایا (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. بەهرۆز حەسەن
٧٩. ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار-کۆمەڵێ نووسەر-و. هەورامان وریا قانع
٨٠. فەلسەفەی بوون-د. محەمەد کەمال
٨١. وەک رووبارە بەخورەکە-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٨٢. دیارییە مەزنەکە-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٨٣. سیشەممان لەگەڵ مۆریی-میچ ئەلبۆم-و. جوتیار ژاژڵەیی
٨٤. دوالیزمی دژ یەک لە هۆنراوە لیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و...-لهۆن قادر عەبدولڕەحمان
٨٥. ڕووناک وەک ئەوین، تاریک وەک مردن-مەمەد ئوزون-و. وریا غەفووری
٨٦. کاندید-ڤۆڵتێر-و. بەیان سەلمان
٨٧. باوکە گۆریۆ-بەلزاک-و. ئەحمەدی مەلا
٨٨. زێبرا-جەبار جەمال غەریب
٨٩. مندالی سووتاو-ستیگ داگەرمان-و. دلاوەر قەرەداغی
٩٠. وڕێنە-ئەنتۆنیۆ تابوکی-و. عەتا محەمەد
٩١. مردن لە ڕوانگەی ئایینەکانەوە-بوساحە ئەحمەد-و. دانا مەلا حەسەن
٩٢. گوێ بگرە، پیاوی بچووک (چ٤)-ویلهێلم ڕایش- و.خەبات عارف
٩٣. ڕێبەری کتێبسازە کوژراوەکان-عەتا محەمەد
٩٤. کچە فیلم گێرەرەوەکە-هێرنان ڕیڤێرا لێتێلییێر-و. عەتا محەمەد
٩٥. باوکی ئەو-پەرینوش سەنیعی-و. ڕووناک شوانی
٩٦. داوێنپیسی-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود
٩٧. کیمیاگەر (چ٢)-پاولۆکۆیلۆ-و. سیروان مەحمود

٩٨. ڕۆژهەڵاتی عەدەن، ڕۆژئاوای خودا-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
٩٩. خۆشی پیشەی من نییە (چ٢)-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠٠. خیانەت لە نیشتمانەکەم دەکەم-محەمەد ماغوت-و. حسەین لەتیف و کارزان عەلی
١٠١. ڕۆژژمێری کیژۆڵەیەک-ئان فرانک-و. عەلی عوسمان یاقووب
١٠٢. جیهانی ڕۆمان-دکتۆر هاشم ئەحمەدزادە
١٠٣. نەفرەت لە دۆستۆیڤسکی (چ٢)-عەتیق ڕەحیمی-و. ئازاد بەرزنجی
١٠٤. فایدۆن (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٥. گۆرگیاس (چ٢)-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٦. سیاتیتۆس-ئەفلاتون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٠٧. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢)-نیکۆس کازانتزاکیس-و. دلاوەر قەرەداغی
١٠٨. تۆ مەچۆ بۆ شەڕ (چ ٢)-ماردین ئیبراهیم
١٠٩. سەگوەڕ (چ ٧)-محەمەد موکری
١١٠. چاوەکانی (چ ١٠)-بوزورگ عەلەوی-و. ئازاد بەرزنجی
١١١. A-6171 من لە ئاوشفیتز دەرباز بووم-فێرێنک گوێندوێر-و. عەتا محەمەد
١١٢. باراباس-پێیر لاگەرکڤیست-و. خەبات عارف
١١٣. تۆڵە (چ ٥)-محەمەد موکری
١١٤. سڵاو؟ کەس لەوێیە؟ (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. سیروان مەحمود
١١٥. هیچ-کۆچەر ئەبوبەکر
١١٦. هەورەکانی دانیال-بەختیار عەلی
١١٧. ئێمە زەریامان بەزاند-جولی ئوتسوکا-و. دلاوەر قەرەداغی
١١٨. بەناوی ژیانەوە-ئەریک فرۆم (چ ٥)-و. ئازاد بەرزنجی
١١٩. کوردستان لە ڕووبەڕووبوونەوەی داعشدا-د. بورهان أ. یاسین
١٢٠. دڵڕەقیی و بێ ماڵیی-مەریوان وریا قانیع
١٢١. دزێکی ڕاستگۆ- دۆستۆیڤسکی-کاروان مەحمود
١٢٢. تیمساح-دۆستۆیڤسکی-کاروان مەحمود
١٢٣. سۆفیست-ئەفلاتوون-و. ئاوات ئەحمەد سوڵتان
١٢٤. چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی-د.کەساس جەباری
١٢٥. نهێنیی کریسمس (چ٢)-یۆستاین گاردەر-و. سیروان مەحمود
١٢٦. لەودیو هەستەکانەوە-ڤینسێنت ڕایان ڕۆگیرۆ-و. هەرێم هادی

